

# هەزار فەرمودە
# لە فەرمودەکانی
# سونەنی ئەبو داود

## بەرگی پێنجەم

**لە فەرمودەی چوار هەزار و بیستەوە**
**بۆ پێنج هەزار و دوو سەد و حەفتاو چوار - کۆتایی**


نوسینی :

أبو داود سليمان بن الأشعث السجستانی

وەرگێڕانی :

ناصح ئیبراهیم سازانی




ناوی کتێب بە کوردی : هەزار فەرموده لە فەرمودەکانی سونەنی ئەبو داود
بەرگی پێنجەم
نوسینی : أبو داود سليمان بن الأشعث السجستانی
وەرگێڕانی : ناصح ئیبراهیم سازانی
بڵاوکردنەوەی : نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
خەت : نەوزاد کۆیی
نەخشەسازی بەرگ : ئەمین موخلیس
نۆرە و ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٧ك - ٢٠١٦ز
تیراژ : ١٥٠٠ دانە



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە
گشتیەکان ژمارەی سپاردنی
(١٨٥٠) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی پۆشاک و جل و بەرگ

## ٢٦- أول كتاب اللباس

### کاتێ کەسێ پۆشاکێکی تازە لەبەردەکات چی بڵێ؟

### ١ - باب مَا يَقُولُ إِذَا لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا.

٤٠٢٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري, قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا سَمَّاهُ بِاسْمِهِ: إِمَّا قَمِيصًا أَوْ عِمَامَةً, ثُمَّ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ, أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ, أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ, وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ, وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ). قَالَ أَبُو نَضْرَةَ: فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا لَبِسَ أَحَدُهُمْ ثَوْبًا جَدِيدًا قِيلَ لَهُ: تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللَّهُ تَعَالَى.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە پۆشاکێکی تازەی لەبەردەکرد ناوی دەبرد بەناوی پۆشاکەکە خۆیەوە: وەک کراس یان مێزەر، لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ منت پۆشتە کردەوە، داوای خێر و چاکەی ئەم پۆشاکەت لێ دەکەم، وە داوای ئەو خێر و چاکەیەت لێ دەکەم کە بۆی دروست کراوە، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەمەو ئەو خراپەیەی کە بۆی دروست کراوە).

(أَبُو نَضْرَةَ) دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر یەكێكیان پۆشاكێكی تازەی لەبەركردایە پێی دەوترا: یا خوا بیبڕزێنیت واتە ئەوەندە لەبەری بكەیت هەتا كۆن دەبێ و ئەڕزێ لەبەرتدا، خوای گەورە پۆشاكی تر بخاتەوە شوێنی بۆت.

٤٠٢١ - عن الجريري, بِإِسْنَادِهِ, نَحْوَهُ.

واتە: لە جورەیرییەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

٤٠٢٢ - عن الجريري, بإسناده, ومعناه. قال أبو داود: عبد الوهاب الثقفي: لم يذكر فيه أبا سعيد, وحماد بن سلمة قال: عن الجريري, عن أبي العلاء, عن النبي صلى الله عليه سلم. قال أبو داود: حماد بن سلمة والثقفي سماعهما واحد.

٤٠٢٣ - (حسن دون زيادة (وما تأخر) في الموضعين) عن سهل بن معاذ بن أنس, عن أبيه: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَكَلَ طَعَامًا ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنِى هَذَا الطَّعَامَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّى وَلاَ قُوَّةٍ, غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ, وَمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى كَسَانِى هَذَا الثَّوْبَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّى وَلاَ قُوَّةٍ, غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ).

واتە: لە سەهلی کوڕی (مُعَاذ)ی کوڕی ئەنەسەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خواردنێ بخوات لەپاشدا بڵێت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی پێ بەخشیم ڕۆزی دام بەبێ گۆڕان و توانای خۆم، ئەوا خوای گەورە لە گوناهی لەوەوپێش و لەوەودواشی خۆش دەبێت، وە هەرکەسێ پۆشاکێ لەبەر بکات لەپاشدا بڵێت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی پۆشتە کردەوە، ڕۆزی دام بەبێ گۆڕان و توانای خۆم، ئەوا خوای گەورە لە گوناهی لەوەوپێش و لەوەودواشی خۆش دەبێت).

## چۆنیەتی پاڕانەوە بۆ کەسێ کە پۆشاکی تازە لەبەربکات.

## ٢ - باب فِيمَا يُدْعَى لِمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا.

٤٠٢٤ - (صحيح) عن أم خالد بنت خالد بن سعيد بن العاص: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِكِسْوَةٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ صَغِيرَةٌ فَقَالَ: (مَنْ تَرَوْنَ أَحَقَّ بِهَذِهِ؟). فَسَكَتَ الْقَوْمُ, فَقَالَ: (ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ). فَأُتِيَ بِهَا, فَأَلْبَسَهَا إِيَّاهَا, ثُمَّ قَالَ: (أَبْلِي وَأَخْلِقِى). مَرَّتَيْنِ, وَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى عَلَمٍ فِي الْخَمِيصَةِ أَحْمَرَ أَوْ أَصْفَرَ وَيَقُولُ: (سَنَاهْ سَنَاهْ يَا أُمَّ خَالِدٍ). وَسَنَاهْ فِي كَلَامِ الْحَبَشَةِ: الْحَسَنُ.

واتە: لە ئوممو خالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە چەند پارچەیە جل و بەرگ دەهێنن بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پارچەیە شاڵی ئاوریشمی ڕەشیان تێدا دەبێت، فەرمووی: (کێ بە شایەن دەزانن ئەم پۆشاکەی بدەنێ؟) خەڵکەکە بێدەنگ بوون، فەرمووی: (ئوممو خالیدم بۆ بێنن)، ئەوانیش هێنایان بۆ لای، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە دەستی خۆی کردیە بەر ئوممو خالید، لەپاشدا پێغەمبەر صلى الله

علیه وسلم دووجار فەرمووی: (ببیڕزی و پۆشاکی تر بخرێتەوە شوێنی بۆت واتە ئەوەندە لەبەری بکەیت هەتا کۆن دەبێ ئەڕزێ لەبەرتدا). پارچە شاڵەکە نەخشی سور یان نەخشی زەردی پێوە بوو، دەیفەرموو: (ئەی ئوممو خالید زۆر جوانە زۆر جوانە). (سَنَاهْ) بە زمانی حەبەشی واتە زۆر جوانە.

## ئەوەی دەربارەی کراس هاتووە.

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي الْقَمِيصِ.

٤٠٢٥ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْقَمِيصُ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خۆشەویسترین پۆشاك بەلای پێغەمبەری خواوە صلى الله علیه وسلم کراس بوو.

٤٠٢٦ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: لَمْ يَكُنْ ثَوْبٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ قَمِيصٍ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هیچ پۆشاکێ ئەوەندەی کراس بەلای پێغەمبەری خواوە صلى الله علیه وسلم خۆشەویست نەبوو.

٤٠٢٧ - (ضعيف) عن أسماء بنت يزيد قالت: كَانَتْ يَدُ كُمِّ قَمِيصِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الرُّصْغِ.

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەر دەستی قۆڵی جل و بەرگ و کراسی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم هەتا موچەی دەست بوو.

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە (أقبية) کە جۆرە پۆشاکێکە.

## ٤ - باب مَا جَاءَ فِي الأَقْبِيَةِ.

٤٠٢٨ - (صحيح) عن المسور بن مخرمة, قال: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْبِيَةً وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا, فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ, قَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي, قَالَ: فَدَعَوْتُهُ, فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قِبَاءٌ مِنْهَا, فَقَالَ: (خَبَأْتُ هَذَا لَكَ). قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ - زَادَ ابْنُ مَوْهَبٍ: مَخْرَمَةُ, ثُمَّ اتَّفَقَا - قَالَ: (رَضِيَ مَخْرَمَةُ).

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جۆرە پۆشاکێکی دابەش دەکرد هیچ شتێکی نەبەخشی بە مەخرەمە، مەخرەمە وتی: ئەی کوڕی خۆم هەستە با بڕۆین بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، منیش لەتەکی رۆشتم، وتی: بڕۆ ژوورەوە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بۆ بانگ بکە، وتی: بۆم بانگ کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەتادەرەوە بۆ لای پۆشاکێکی لەوانە لەبەردا بوو کە دابەشی کردبوون، فەرمووی: (ئەمەم بۆ تۆ شاردۆتەوە). وتی: سەیری کرد واتە مەخرەمە - ئیبنو مەوهەب ئەمەی بۆ زیاد کرد: مەخرەمە، لەپاشدا هەردوو راوی فەرموودەکە رێکن - وتی: (مەخرەمە رازی بوو).

## سەبارەت بە لەبەرکردنی پۆشاکی ناوبانگدار.

## ٥ - باب فِي لُبْسِ الشُّهْرَه.

٤٠٢٩ - (حسن) عن ابن عمر - قال في حديث شريك: يرفعه - قال: (مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَوْبًا مِثْلَهُ). زَادَ عَنْ أَبِي عَوَانَةَ (ثُمَّ تُلَهَّبُ فِيهِ النَّارُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە - لە فەرموودەکەی شەریکدا وتی: فەرموودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەدنیادا جل و بەرگ و پۆشاکی ناوبانگدار لەبەربکات خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا هەمان پۆشاکی لەبەردەکاتەوە). ئیبنو ئەبی عەوانە ئەمەی بۆ زیاد کرد: (لەپاشدا گڕی تێ بەردەدات).

٤٠٣٠ - (حسن) عن أبو عوانة قال: ثَوْبَ مَذَلَّةٍ.

واتە: لە ئەبو عەوانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە قیامەتدا جل و بەرگ و پۆشاکی سەرشۆڕی و ریسوایی لەبەر دەکات.

٤٠٣١ - (حسن صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك خۆی بچوێنێ بەهەر قەومێك ئەوە لەوانە).

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی لە خوری و موو دروستکراو.

## ٦ - باب فِي لُبْسِ الصُّوفِ وَالشَّعْرِ.

٤٠٣٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعْرٍ أَسْوَدَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ چوەدەرەوە شاڵینەیەکی پێچابوو بە خۆیەوە نەخشی پێوە بوو بە وێنەی کۆپانی وشتر، لەمووی ڕەش دروستکرا بوو.

٤٠٣٢ م - (حسن الإسناد) ) عن عتبة بن عبد السلمي قال: اسْتَكْسَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَكَسَانِي خَيْشَتَيْنِ, فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي وَأَنَا أَكْسَى أَصْحَابِي.

واتە: لە عوتبەی کوڕی عەبدجی سولەمییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: داوای پۆشاکم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش دوو دەست پۆشاکی لەخوری دروستکراوی پێ بەخشیم لەبەرم کردن، سەیردەکەم لەهەموو هاوڕێکانم پۆشتەترم.

٤٠٣٣ - (صحيح) عن أبو بردة قال:قَالَ لِي أَبِي: يَا بُنَيَّ, لَوْ رَأَيْتَنَا وَنَحْنُ مَعَ نَبِيِّنَا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ أَصَابَتْنَا السَّمَاءُ, حَسِبْتَ أَنَّ رِيحَنَا رِيحُ الضَّأْنِ.

واتە: لە ئەبو بوردەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: باوکم پێی وتم: ئەی کوڕی خۆم لە خزمەت پێغەمبەرەکەماندا صلی الله علیه وسلم بووین باران تەڕی کردین،

ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە دەتبینین وات دەزانی ئەوە بۆنی جلە خوریەکانی ئێمە نیە بەڵکو بۆنی مەڕ خۆیەتی.

## لەبەرکردنی جل و بەرگی بە نرخ و گرانبەها.

## ٧- باب لبس المرتفع.

٤٠٣٤ - (ضعيف) عن أنس بن مالك: أَنَّ مَلِكَ ذِي يَزَنَ أَهْدَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُلَّةً أَخَذَهَا بِثَلاَثَةٍ وَثَلاَثِينَ بَعِيرًا, أَوْ ثَلاَثٍ وَثَلاَثِينَ نَاقَةً,فَقَبِلَهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پاشای (ذِي يَزَنَ) دەستێ جلی گرانبەهای نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بایی سی و سێ وشتر بوو، یان بایی سی و سێ وشتری مێ بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەریگرت.

٤٠٣٥ - (ضعيف) عن إسحاق بن عبد الله بن الحارث: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اشْتَرَى حُلَّةً بِبِضْعَةٍ وَعِشْرِينَ قَلُوصًا, فَأَهْدَاهَا إِلَى ذِي يَزَنَ.

واتە: لە ئیسحاقی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (حارث)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستێ جل و بەرگی کڕی بە بیست و ئەوەندە نۆبەنە وشتر، بە دیاری ناردی بۆ پاشای(ذِي يَزَنَ).

## سەبارەت بە پۆشاکی ئەستور.

## ٨ - باب لِبَاسِ الْغَلِيظِ.

٤٠٣٦ - (صحيح) عن أبو بردة قال: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ, فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ وَكِسَاءً مِنَ الَّتِي يُسَمُّونَهَا الْمُلَبَّدَةَ, فَأَقْسَمَتْ بِاللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُبِضَ فِي هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ. .

واتە: لە ئەبو بوردەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ لای عائیشە، ئیزارێکی ئەستوری دەرهێنا لەو ئیزارانەی کە لە یەمەن دروست دەکرێن، لە گەڵ دەستێ جلی پینە پینە کراودا، سوێندی خوارد بە (الله) کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەکاتی رۆح کێشاندا ئەم دوو جلەی لەبەردا بوو.

٤٠٣٧ - (حسن الأسناد) عن عبد الله بن عباس قال: لَمَّا خَرَجَتِ الْحَرُورِيَّةُ أَتَيْتُ عَلِيًّا رَضِىَ اللهُ عَنْهُ, فَقَالَ: ائْتِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ, فَلَبِسْتُ أَحْسَنَ مَا يَكُونُ مِنْ حُلَلِ الْيَمَنِ, - قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَجُلاً جَمِيلاً جَهِيرًا - , قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَتَيْتُهُمْ, فَقَالُوا: مَرْحَبًا بِكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ مَا هَذِهِ الْحُلَّةُ؟ قَالَ: مَا تَعِيبُونَ عَلَيَّ؟ لَقَدْ رَأَيْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ مَا يَكُونُ مِنَ الْحُلَلِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە حەروریەکان دەرچوون لەژێر رکێفی خەلافەتی پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ جەنگی لەگەڵ کردن، چوم بۆ خزمەتی وتی: جوانترین جل و بەرگی یەمەنی لەبەربکەو برۆ بۆلایان - ئەبو زومەیل وتی: بێگومان ئیبنو عەباس پیاوێکی جوان و پێکەوتو بوو- ئیبنو عەباس وتی: چوم بۆلایان،

وتیان: مەرحەبات لێ بێ ئەی ئیبنو عەباس ئەم جل و بەرگە چی یە لەبەرتدا، وتی: بۆ ڕەخنە دەگرن لە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ کە جل و بەرگی لەم شێوە لەبەردەکات؟ بێگومان بە چاوی خۆم دیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاکترین و جوانترین جل و بەرگی لەبەردا بوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی (خز) پۆشاکێکە لە خوری و ئاوریشم دروست دەکرێت.

## ٩ - باب مَا جَاءَ فِي الْخَزِّ.

٤٠٣٨ - (ضعيف الأسناد) عن سعد قال: رَأَيْتُ رَجُلاً بِبُخَارَى عَلَى بَغْلَةٍ بَيْضَاءَ عَلَيْهِ عِمَامَةُ خَزٍّ سَوْدَاءُ, فَقَالَ: كَسَانِيهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە سەعدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە بوخارا پیاوێکم دی بەسواری ئێسترێکی سپییەوە مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو تانەکەی ئاوریشم بوو، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم مێزەرەی لەسەر کردوم.

٤٠٣٩ - (صحيح) عن أبو عامر, أو أبو مالك - وَاللَّهِ يَمِينٌ أُخْرَى مَا كَذَبَنِي - أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْخَزَّ وَالْحَرِيرَ). وَذَكَرَ كَلاَمًا, قَالَ: (يُمْسَخُ مِنْهُمْ آخَرُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَعِشْرُونَ نَفْسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ أَكْثَرُ لَبِسُوا الْخَزَّ, مِنْهُمْ: أَنَسٌ, وَالْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ.

واتە: لە ئەبو عامیرەوە، یان لە ئەبو مالیکەوە دەگێرنەوە، کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ئومەتەکەمدا کەسانێك پەیدا دەبن پۆشینی جل و بەرگی (خز) و ئاوریشم حەڵاڵ دەکەن و بەحەرامی

نازانن). قسەیەکی تری کرد، فەرمووی: (لەو کەسانە هەیانە مەسخ دەکرێن بە مەیمون و بەراز هەتا رۆژی قیامەت). ئەبو داود دەڵێت: بیست کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یان زیاتر پۆشاکی (خز)یان لەبەر دەکرد لەوانە: ئەنەس و بەرائی کوڕی عازیب بوون.

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم.

## ٩ - باب مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ.

٤٠٤٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ تُبَاعُ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ). ثُمَّ جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا حُلَلٌ, فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهَا حُلَّةً, فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا). فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَخًا لَهُ مُشْرِكًا بِمَكَّةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ (حُلَّةً سِيَرَاءَ )ی بینی - پۆشاکێکە لە ئاوریشم - لەبەردەم مزگەوتدا دەیانفرۆشت وتی: خۆزگە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قاتێ لەم پۆشاکەت دەکڕی و لە رۆژانی هەینی دا لەبەرت دەکرد، هەروەها لە کاتێکیشدا کە نوێنەرەکان دێنەلات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بێگومان تەنها ئەو کەسانە لەبەری دەکەن کە بەشی باشیان نیە لە دوارۆژدا). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند پۆشاکێکی لەو جۆرە بۆ هات، یەکێکیانی دا

بە پێشەوا عومەر، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەری بکەم لە کاتێکدا کە تۆ دەربارەی لەبەرکردنی (حُلَّةِ عُطَارِدَ). ئاواو ئاوات فەرموو؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بۆ ئەوە پێم نەدایت کە لەبەری بکەیت!). - بەڵکو بۆ ئەوە پێم دایت کە سوودی لێ ببینی - عومەریش ڕەزای خوای لێ بێ برایەکی دایکی هەبوو لەمەککە (موشریك) هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر بوو دای بەو.

٤٠٤١ - (صحيح) عن سالم بن عبد الله عن أبيه بهذه القصة قال: حُلَّةَ: إِسْتَبْرَقٍ. وَقَالَ فِيهِ: ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ, وَقَالَ: (تَبِيعُهَا وَتُصِيبُ بِهَا حَاجَتَكَ).

واتە: لە سالمی کوڕی (عبد الله)وە، لە باوکیەوە هەمان بەسەرهات هاتووە وتی: (حُلَّةَ) واتە: (إِسْتَبْرَق) ئاوریشمی ئەستور، لە فەرموودەکەیدا وتی: لەپاشدا جبەیەکی لە دیباج - کە جۆرێکە لە ئاوریشم - بۆ ڕەوانە کرد، فەرمووی: (بیفرۆشە بە پارەکەی پێویستی خۆتی پێ جێبەجێ بکە).

٤٠٤٢ - (صحيح) عن أبو عثمان النهدي قال: كَتَبَ عُمَرُ إِلَى عُتْبَةَ بْنِ فَرْقَدٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْحَرِيرِ إِلاَّ مَا كَانَ هَكَذَا وَهَكَذَا: أُصْبُعَيْنِ, وَثَلاَثَةً, وَأَرْبَعَةً.

واتە: لە (أبو عثمان)ی نەهدییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ نامەی نوسی بۆ فەرقەد: کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەداوە بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاویشم مەگەر بە ئەندازەی ئەوەندەو ئەوەندە نەبێت، بە ئەندازەی جێگەی دوو پەنجە یان سیان یا چوار.

٤٠٤٣ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: أُهْدِيَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُلَّةٌ سِيَرَاءُ, فَأَرْسَلَ بِهَا إِلَيَّ, فَلَبِسْتُهَا, فَأَتَيْتُهُ فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ: (إِنِّي لَمْ أُرْسِلْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا). وَأَمَرَنِي فَأَطَرْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي.

واتە: لە پێشەوا عەلییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (حُلَّةً سِيَرَاءَ) کە پۆشاکێکە لە ئاوریشم بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش ناردی بۆ من، لەبەرم کردو، چوم بۆ خزمەتی توڕەییم بە روخسارییەوە دی، فەرمووی: (بۆ ئەوە بۆم نەناردی کە لەبەری بکەیت). فەرمانی پێ کردم دابەشم کرد بەسەر هاوسەرەکانمدا.

## ئەوانەی کە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمیان بەلاوە باش نیە.

## ١١ - باب مَنْ كَرِهَهُ.

٤٠٤٤ - (صحيح) عن علي بن أبو طالب رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ, وَعَنْ لُبْسِ الْمُعَصْفَرِ, وَعَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ, وَعَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی ئەمانەی نەداوە: لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی قەسی و عەصفەراناوی ئەوەی بە گیای گەزنە ڕەنگ دەکرێت، ئەنگوستیلەی زێڕ لەدەست کردن - بۆ پیاوان -، هەروەها قورئان خوێندنیش لە رکوع دا.

٤٠٤٥ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بهذا, قال: عَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ.

واته: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرمودەی پێشو هاتوە، فەرمووی: ڕێگری كردوە لە قورئان خوێندن لە ركوع و سەجدەدا.

٤٠٤٦ - (حسن صحيح) عن إبراهيم بن عبد الله, بهذا, زاد: وَلاَ أَقُولُ نَهَاكُمْ.

واته: لە ئیبراهیمی كوڕی (عبد الله)ەوە فەرمودەی پێشو هاتوە، ئەمەی بۆ زیاد كرد: پێشەوا عەلی وتی: من ناڵێم ڕێگری ئەوانەتان لێ دەكات.

٤٠٤٧ - (ضعيف الأسناد) عن أنس بن مالك: أَنَّ مَلِكَ الرُّومِ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُسْتَقَةً مِنْ سُنْدُسٍ فَلَبِسَهَا فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يَدَيْهِ تَذَبْذَبَانِ, ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إِلَى جَعْفَرٍ فَلَبِسَهَا, ثُمَّ جَاءَهُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهَا لِتَلْبَسَهَا). قَالَ: فَمَا أَصْنَعُ بِهَا؟ قَالَ: أَرْسِلْ بِهَا إِلَى أَخِيكَ النَّجَاشِيِّ.

واته: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پاشای ڕۆم فەروەیەكی قۆڵداری لە سوندوس چنراوی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، لەبەری كرد وەك ئەوەی ئێستا بە بەرچاومەوە بێت قۆڵەكانی دەجولانەوە ئەوەندە درێژ بوون، لەپاشدا ناردی بۆ جەعفەر ئەویش لەبەری كردو ئینجا هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بۆ ئەوە پێم نەداوی لەبەری بكەیت). جەعفەر وتی: ئەی چی لێ بكەم؟، فەرمووی: (بەدیاری بینێرە بۆ نەجاشی برات بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرێت).

٤٠٤٨ - (صحيح) عن عمران بن حصين: أن نبي الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ أَرْكَبُ الأُرْجُوَانَ, وَلاَ أَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ, وَلاَ أَلْبَسُ الْقَمِيصَ الْمُكَفَّفَ بِالْحَرِيرِ). قَالَ: وَأَوْمَأَ الْحَسَنُ إِلَى جَيْبِ قَمِيصِهِ. قَالَ: وَقَالَ: (أَلاَ وَطِيبُ الرِّجَالِ رِيحٌ لاَ لَوْنَ لَهُ, أَلاَ وَطِيبُ النِّسَاءِ لَوْنٌ لاَ رِيحَ لَهُ). قَالَ سَعِيدٌ: أُرَاهُ قَالَ: إِنَّمَا حَمَلُوا قَوْلَهُ فِي طِيبِ النِّسَاءِ عَلَى أَنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ, فَأَمَّا إِذَا كَانَتْ عِنْدَ زَوْجِهَا فَلْتَطَّيَّبْ بِمَا شَاءَتْ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من سواری زینێك نابم لە ئاوریشمی سور بێت، پۆشاکی عەصفەراناوی ئەوەی بە گیای گەزنە ڕەنگ دەکرێت لەبەرناکەم، پۆشاکێ لەبەرناکەم فەقیانەکانی و قەراغەکانی لە ئاوریشم چنرابن). وتی: حەسەن راوی فەرموودەکە ئاماژەی کرد بۆ ئەو شوێنەی کراسەکەی کە سەر یان قۆڵی پێدا دەکرێ، عیمران وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاگاداربن بۆنی خۆشی پیاوان بۆنی هەیەو ڕەنگی نیە، بۆنی خۆشی ئافرەتانیش ڕەنگی هەیەو بۆنی نیە). سەعید وتی: وا ئەزانم وتی: زانایان بۆنی خۆشی ئافرەتانیان حەمل کردوە بەوەی کاتێ کە لەماڵ دەرچوو دروست نیە بۆی بۆنی خۆش لەخۆی بدات ئیتر ڕەنگی هەبێ یان بۆن، بەڵام ئەگەر لەلای مێردەکەی بێ بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی بۆن بدات لە خۆی.

٤٠٤٩ - (ضعيف) عن أبو الحصين - يعني الهيثم بن شفي - قال: خَرَجْتُ أَنَا وَصَاحِبٌ لِي يُكْنَى أَبَا عَامِرٍ رَجُلٌ مِنَ الْمَعَافِرِ لِنُصَلِّيَ بِإِيلْيَاءَ, وَكَانَ قَاصَّهُمْ رَجُلٌ مِنَ الأَزْدِ يُقَالُ لَهُ أَبُو رَيْحَانَةَ, مِنَ الصَّحَابَةِ. قَالَ أَبُو الْحُصَيْنِ: فَسَبَقَنِي صَاحِبِي إِلَى الْمَسْجِدِ, ثُمَّ رَدِفْتُهُ فَجَلَسْتُ إِلَى جَنْبِهِ, فَسَأَلَنِي: هَلْ أَدْرَكْتَ قَصَصَ أَبِي رَيْحَانَةَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ عَشْرٍ: عَنِ الْوَشْرِ, وَالْوَشْمِ, وَالنَّتْفِ, وَعَنْ مُكَامَعَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ بِغَيْرِ شِعَارٍ, وَعَنْ مُكَامَعَةِ الْمَرْأَةِ الْمَرْأَةَ بِغَيْرِ شِعَارٍ, وَأَنْ يَجْعَلَ الرَّجُلُ فِي أَسْفَلِ ثِيَابِهِ حَرِيرًا

مِثْلَ الأَعَاجِمِ, أَوْ يَجْعَلَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ حَرِيرًا مِثْلَ الأَعَاجِمِ, وَعَنِ النُّهْبَى, وَرُكُوبِ النُّمُورِ, وَلُبُوسِ الْخَاتَمِ إِلاَّ لِذِى سُلْطَانٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الَّذِى تَفَرَّدَ بِهِ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ ذِكْرُ الْخَاتَمِ.

واتە: لە ئەبو حوصەین - واتە: (هیثم)ی کوڕی شەفی -ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و هاوڕێیەکم کە بە ئەبا عامیر ناسراو بوو پیاوێ بوو لە خەڵکی مەعافیر دەرچوین نوێژ بکەین لە شاری ئیلیا (بیت المقدس)، ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری دەکردن و بەسەرهاتی بۆ دەگێڕانەوە پیاوێکی خەڵکی یەزد بوو پیاوێ بوو لە هاوەڵان بە ئەبو ڕەیحانە ناسراو بوو، ئەبو حوصەین وتی: هاوڕێکەم پێش من کەوت بۆ مزگەوت، لەپاشدا منیش هاتم لەتەنیشتیەوە دانیشتم، لێی پرسیم وتی: ئایا گەیشتی بە بەسەرهاتەکەی ئەبو ڕەیحانەدا کە بۆی باس کردین، وتم: نەخێر، وتی: گوێم لێی بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگەی ئەم دە شتەی نەداوە: ددان تەنك و شاش کردن بۆ جوانی، خاڵ کوتان، هەڵکێشانی مووی روخسار واتە دەم و چاو هەڵگرتن، پێکەوە خەوتنی دوو پیاو بە رووتی لەژێر یەك لێفە یان یەك بەتانی یان هەرشێکی لەوجۆرەدا، هەروەها پێکەوە خەوتنی دوو ئافرەت بە رووتی لەژێر یەك لێفە یان یەك بەتانی دا، بەشی خوارەوەی پۆشاکی پیاو لە ئاوریشم بێت وەك عەجەمەکان، یان ئاوریشم بدات بە سەرشانیدا وەك عەجەمەکان - ئەندازەی جێگەی ئاوریشمەکە لە چوار پەنجە زیاتر بێت -، فڕاندنی ماڵی خەڵك و بە زۆر لێ زەوت کردنیان، سواربوونی ئەو وڵاخانەی کە کۆپانەکەیان لە پێستی پڵنگە - چونکە بە فیزو دەعیە بووە جل و بەرگی عەجەمەکان بووە،لەدەست کردنی ئەنگوستیلەیە کە مۆری لێ هەڵکنرا بێت مەگەر بۆ خاوەن دەسەڵات.

٤٠٥٠ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: نَهَى عَنْ مَيَاثِرِ الأُرْجُوَانِ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە،

کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رێگری کردوە لەو زینەی لە ئاوریشمی سور دروست دەکرێت.

٤٠٥١ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ, وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ وَالْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رێگری ئەمانەی لێ کردم: لەدەست کردنی ئەنگوستیلەی زێڕ، لەبەرکردنی ئاوریشمی قەسی، هەروەها لەو زینەی کە لە ئاوریشمی سور دروست دەکرێت.

٤٠٥٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ, فَنَظَرَ إِلَى أَعْلَامِهَا, فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: (اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا فِي صَلَاتِي, وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بەرگێکی رەنگاو رەنگدا نوێژی دەکرد، سەیری خەتەکانی کرد، کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە فەرمووی: (ئەم بەرگە بەرنەوە بۆ ئەبو جەهم، بەرگێکی سادە بۆ من بهێنن، چونکە خەیاڵی بردم لە نوێژەکەمدا).

٤٠٥٣ - (صحيح) عن عائشة, نَحْوَهُ, وَالأَوَّلُ أَشْبَعُ.

## روخسەت لە بەکارهێنانی پۆشاکی خەت خەت و بە تاڵی ئاوریشم چنراو.

## ١٢ - باب الرُّخْصَةِ فِي الْعَلَمِ وَخَيْطِ الحَرِيرِ.

٤٠٥٤ - (صحيح) عبد الله أبو عمر مولى أسماء بنت أبي بكر, قال: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي السُّوقِ اشْتَرَى ثَوْبًا شَامِيًّا, فَرَأَى فِيهِ خَيْطًا أَحْمَرَ, فَرَدَّهُ, فَأَتَيْتُ أَسْمَاءَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهَا, فَقَالَتْ: يَا جَارِيَةُ نَاوِلِينِي جُبَّةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخْرَجَتْ جُبَّةَ طَيَالِسَةَ مَكْفُوفَةَ الْجَيْبِ وَالْكُمَّيْنِ وَالْفَرْجَيْنِ بِالدِّيبَاجِ.

واتە: لە (عبد الله) ئەبو عومەر بەندەی رزگارکراوی ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەرم لەبازاڕ دی کاڵایەکی شامی کڕی تاڵێکی ئاوریشمی سوری تێدا بینی، دایەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا، چوم بۆ لای ئەسما بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەی کەنیزەکەکە جبەکەی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بۆ بێنە، جبەکەی دەرهێنا لە قوماشێکی ئەستور بوو یەخەکەی و سەری هەردوو قۆڵی و هەردوو چمکەکەی بە ئاوریشمی ئەستور نەخشێنرابوون.

٤٠٥٥ - (صحيح دون قوله (فَأَمَّا الْعَلَمُ)... عن ابن عباس قال: إِنَّمَا نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الثَّوْبِ الْمُصْمَتِ مِنَ الْحَرِيرِ, فَأَمَّا الْعَلَمُ مِنَ الْحَرِيرِ وَسَدَى الثَّوْبِ: فَلاَ بَأْسَ بِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی پوختی قەدەغەکردوە، بەڵام ئەگەر نەخشەکەی یان خەتەکانی و تاڵەکانی لە ئاوریشم

بێ یا لەگەڵ خوری و لۆکە تێکەڵاو بکرێ ئەوە لەبەرکردنی قەیدی نیەو دروستە.

## سەبارەت بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بەهانەی شەرعی.

## ١٣ - باب فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ لِعُذْرٍ.

٤٠٥٦ - (صحيح) عن أنس قال: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَلِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي قُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێگەی دا بە (عبد الرحمان)ی کوڕی عەوف و زوبێری کوڕی عەوام پۆشاکی ئاوریشم لەبەربکەن لەسەفەردا لەبەر لەشخورانێك کە هەیان بوو.

## سەبارەت بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم لەلایەن ئافرەتانەوە.

## ١٤ - باب فِي الْحَرِيرِ لِلنِّسَاءِ.

٤٠٥٧ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ حَرِيرًا فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ, وَأَخَذَ ذَهَبًا فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ, ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پارچەیە ئاوریشمی بەدەستی راستی هەڵگرت و پارچەیە زێڕیشی بەدەستی چەپ هەڵگرت، لەپاشدا فەرمووی: (ئەم دوانە لەسەر نێرینەی ئوممەتی من حەرامن).

| ٤٠٥٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّهُ رَأَى عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بُرْدًا سِيَرَاءَ. قَالَ: وَالسِّيَرَاءُ الْمُضَلَّعُ بِالْقَزِّ. |
|---|

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پۆشاکێکی ئاوریشمی خەت خەتی دیوە لەبەری (أُمِّ كُلْثُوم)ی کچی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم.

| ٤٠٥٩ - (صحيح) عن جابر قال: كُنَّا نَنْزِعُهُ عَنِ الْغِلْمَانِ, وَنَتْرُكُهُ عَلَى الْجَوَارِي. |
|---|

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە پۆشاکی ئاوریشممان لەبەری کوڕان دادەکەند بەڵام وازمان دەهێنا لە کچان.

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی حیبەرە کە لە یەمەن لە لۆکە یان لە کەتان دروست دەکرا.

## ١٥ - باب فِي لُبْسِ الْحِبَرَةِ.

٤٠٦٠ - (صحيح) عن قتادة قال: قُلْنَا لأَنَسٍ - يَعْنِي ابْنَ مَالِكٍ -: أَيُّ اللِّبَاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَوْ أَعْجَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: الْحِبَرَةُ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتمان بە ئەنەسی کوڕی مالیك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی لە چی جۆرە پۆشاکێك بوو - یان چ پۆشاکێکی بەلاوە چاك و جوان بوو ؟ - ئەنەس وتی: حیبەرە.

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی سپی.

## ١٦ - باب فِي الْبَيَاضِ.

٤٠٦١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ: فَإِنَّهَا خَيْرُ ثِيَابِكُمْ, وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ, وَإِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الإِثْمِدُ: يَجْلُو الْبَصَرَ, وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جل و بەرگی سپی لەبەر بکەن چونکە چاکترین جل و بەرگە بۆ ئێوە، بیکەن بە کفنیش بۆ مردووەکانتان، چاکترین کلی ئێوەش کلی ڕەشە: چاوتان پاك دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، مووی برژانگیشتان دەڕوێنێتەوە).

## دەربارەی پۆشاکی چڵکن و شتنی.

## ١٧ - باب فِي الْخُلْقَانِ وَفِي غَسْلِ الثَّوْبِ.

٤٠٦٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَأَى رَجُلاً شَعِثًا قَدْ تَفَرَّقَ شَعْرُهُ, فَقَالَ: (أَمَا كَانَ يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ؟). وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ فَقَالَ: (أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَاءً يَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان پیاوێکی دی قژەکانی پەرش و بڵاوبوبونەوە، فەرمووی: (ئەوە کەسێ نیە شانەیەکی بداتێ هەتا قژی پێ دابهێنێ). هەروەها پیاوێکی تری بینی جل و بەرگی چڵکنی لەبەردا بوو، فەرمووی: (ئەوە کەسێ نیە ئاوی بداتێ هەتا جلەکانی پێ بشوات).

٤٠٦٣ - (صحيح الإسناد) عن أبو الأحوص, عن أبيه قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَوْبٍ دُونٍ, فَقَالَ: (أَلَكَ مَالٌ؟) قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (مِنْ أَيِّ الْمَالِ؟). قَالَ: قَدْ أَتَانِيَ اللَّهُ مِنَ الإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَالْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ, قَالَ: (فَإِذَا أَتَاكَ اللَّهُ مَالاً فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكَ وَكَرَامَتِهِ).

واتە: لە ئەبو ئەحوەصەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە جل و بەرگێکی شڕەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ماڵ و سامانت هەیە؟)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (چ جۆرە ماڵ و سامانێکە؟)، وتم: خوای گەورە وشتر و مەڕ و بزن و ئەسپ و بەندەی پێی بەخشیوم، فەرمووی: (خوای گەورە ماڵ و سامانی پێ بەخشیویت با شوێنەوای نیعمەتەکانی خوای

گەورەت لەسەر دیار بێت). - واتە جلی جوان تازە لەبەر بکە با خەڵك بزانن دەوڵەمەندی و خوای گەورە جۆرەها نیعمەتی خۆی پێ بەخشیوی -.

## سەبارەت بە رەنگ کردن بە زەرد.

## ١٨ - باب فِي الْمَصْبُوغِ بِالصُّفْرَةِ.

٤٠٦٤ - (صحيح الإسناد) عن زيد - يعني ابن أسلم - أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَصْبُغُ لِحْيَتَهُ بِالصُّفْرَةِ حَتَّى تَمْتَلِئَ ثِيَابُهُ مِنَ الصُّفْرَةِ, فَقِيلَ لَهُ: لِمَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ؟ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْبُغُ بِهَا, وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْهَا, وَقَدْ كَانَ يَصْبُغُ بِهَا ثِيَابَهُ كُلَّهَا حَتَّى عِمَامَتَهُ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێرنەوە، کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ بە رەنگی زەرد ریشی خۆی رەنگ کردبوو تەنانەت جلەکانیشی زەردی تۆخ بوون، پێی وترا: بۆچی بەو رەنگە ریشت رەنگ کردوە؟ وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی بەرەنگی زەرد ریشی رەنگ دەکردو، حەزی لە هیچ رەنگێکی تر نەدەکرد ئەوەندەی ئەو، جل و بەرگەکانی هەموو پێ رەنگ دەکرد تەنانەت مێزەرەکەشی.

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی سەوز.

## ١٩ - باب فِي الْخُضْرَةِ.

٤٠٦٥ - (صحيح) عن أبي رمثة قال: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَأَيْتُ عَلَيْهِ بُرْدَيْنِ أَخْضَرَيْنِ.

واتە: لە ئەبو (رِمْثَة)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ باوکم چوین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، چاوم کەوت بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوو پۆشاکی سەوزی لەبەردا بوو.

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی سور.

## ٢٠- باب فِي الْحُمْرَةِ.

٤٠٦٦ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: هَبَطْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ثَنِيَّةٍ, فَالْتَفَتَ إِلَيَّ وَعَلَيَّ رَيْطَةٌ مُضَرَّجَةٌ بِالْعُصْفُرِ, فَقَالَ: (مَا هَذِهِ الرَّيْطَةُ عَلَيْكَ؟). فَعَرَفْتُ مَا كَرِهَ فَأَتَيْتُ أَهْلِي وَهُمْ يَسْجُرُونَ تَنُّورًا لَهُمْ, فَقَذَفْتُهَا فِيهِ, ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنَ الْغَدِ, فَقَالَ: (يَا عَبْدَ اللَّهِ, مَا فَعَلَتِ الرَّيْطَةُ؟). فَأَخْبَرْتُهُ, فَقَالَ: (أَلاَ كَسَوْتَهَا بَعْضَ أَهْلِكَ فَإِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِهِ لِلنِّسَاءِ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرزایی (أذاخر)

ەوە ئەهاتینە خوارەوە، لای کردەوە بەلامدا (ريطة)یەکم کە وەك کەوا وايەو يەك پارچەيە لەبەردا بوو بە رەنگی زەرد رەنگ کرابوو رەنگی سوريشی تێدا بوو، فەرمووی: (ئەو (ريطة) چيە؟)، زانيم پێی ناخۆشە چوومەوە بۆ ناو خاو خێزانەکەم لەوکاتەدا تەنوريان تاودابوو بۆ نان کردن، فڕێم دايە ناوی، بۆ سبەينێ هاتمەوە، فەرمووی: (ئەی (عبدالله) (ريطة)کەت چی لێ کرد؟)، منيش بەسەرهاتەکەم بۆ باس کرد کە فڕێم داوەتە ناو تەنورەکەوەو سوتاوە، فەرمووی: (ئەی بۆ نەتدا بە يەکێ لە ئافرەتانی خانەوادەکەت لەبەری بکات چونکە ئەوە بۆ ئافرەتان قەيدی نيەو دروستە).

٤٠٦٧ - (صحيح مقطوع) عن الوليد قال: قَالَ هِشَامٌ - يَعْنِى ابْنَ الْغَازِ -: الْمُضَرَّجَةُ: الَّتِى لَيْسَتْ بِمُشَبَّعَةٍ وَلاَ الْمُوَرَّدَةُ.

واتە: لە وەليدەوە دەگێڕنەوە، کە وتويەتی: هيشام وتی: (الْمُضَرَّجَةُ) رەنگ کراو: واتە نە رەنگی سوری تێرەو نە کاڵە وەك رەنگی گوڵ.

٤٠٦٨ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: رَآنِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ أَبُو عَلِىٍّ اللُّؤْلُؤِىُّ: أُرَاهُ وَعَلَىَّ ثَوْبٌ مَصْبُوغٌ بِعُصْفُرٍ مُوَرَّدٍ - فَقَالَ: (مَا هَذَا؟). فَانْطَلَقْتُ فَأَحْرَقْتُهُ, فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا صَنَعْتَ بِثَوْبِكَ؟). فَقُلْتُ: أَحْرَقْتُهُ. قَالَ: (أَفَلاَ كَسَوْتَهُ بَعْضَ أَهْلِكَ؟).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم بينيمی پۆشاکێکی رەنگ کراوم پۆشی بوو، فەرمووی: (ئەمە چی يە؟). رۆشتم سوتاندم، پێغەمبەر صلی الله عليه وسلم فەرمووی: (پۆشاکەکەت چی لێ کرد؟). وتم: سوتاندم، فەرمووی: (ئەی بۆچی نەتبەخشی بە يەکێ لە ئافرەتانی خانەوادەکەت هەتا لەبەری بکات؟).

٤٠٦٩ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو قال: مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَحْمَرَانِ, فَسَلَّمَ عَلَيْهِ, فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ بەلای پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم تێپەڕی دوو پۆشاکی سوری لەبەردا بوو، سڵاوی کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەڵام ئەو وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە.

٤٠٧٠ - (ضعيف الأسناد) عن رافع بن خديج قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ, فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَوَاحِلِنَا وَعَلَى إِبِلِنَا أَكْسِيَةً فِيهَا خُيُوطُ عِهْنٍ حُمْرٌ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ أَرَى هَذِهِ الْحُمْرَةَ قَدْ عَلَتْكُمْ؟). فَقُمْنَا سِرَاعًا لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى نَفَرَ بَعْضُ إِبِلِنَا! فَأَخَذْنَا الأَكْسِيَةَ فَنَزَعْنَاهَا عَنْهَا.

واتە: لە رافعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەرچوین، بەسەر وڵاخ و وشترەکانمانەوە سەرجلی خەت خەتی سوری لە خوری بینی، فەرمووی: (ئەوە چی یە ئەو سەرجلە سورانە بەسەر وڵاخەکانتانەوە). لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەندە بە پەلە دەرۆیشتین هەندێ لە وشترەکانمان تار بوون لە کاروانیەکە، جا سەرجلەکانمان لێ کردنەوە ئیتر بەکارمان نەهێنانەوە.

٤٠٧١ - (ضعيف الأسناد) عن حريث بن الأبج السليحي: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ بَنِى أَسَدٍ قَالَتْ: كُنْتُ يَوْمًا عِنْدَ زَيْنَبَ امْرَأَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَصْبُغُ ثِيَابًا لَهَا بِمَغْرَةٍ, فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا رَأَى الْمَغْرَةَ رَجَعَ, فَلَمَّا رَأَتْ ذَلِكَ زَيْنَبُ عَلِمَتْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ كَرِهَ مَا فَعَلَتْ فَأَخَذَتْ فَغَسَلَتْ ثِيَابَهَا وَوَارَتْ كُلَّ حُمْرَةٍ, ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجَعَ, فَاطَّلَعَ, فَلَمَّا لَمْ يَرَ شَيْئًا دَخَلَ.

واتە: لە ئەبو (حريث)ی کوڕی ئەبەجی سەلیحییەوە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێکی بەنی ئەسەد وتویەتی: رۆژێ لەلای زەینەبی هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووم، بە گڵی سور پۆشاکێکی زەینەبمان رەنگ دەکرد، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێمانەوە دەرکەوت، کە گڵە سورەکەی بینی گەڕایەوە، کاتێ کە زەینەب ئەوەی بینی زانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی ناخۆش بووە ئەو کارەی کردوە بۆیە گەڕایەوە، زەینەب پۆشاکەکەی وەرگرت و شتی هەتا رەنگەکەی کاڵ بویەوە، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەڕایەوە بۆ لای ئەمجارە هیچی نەدی چوەژوورەوە.

## روخسەت لە پۆشینی پۆشاکی سوردا.

## ٢١ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٤٠٧٢ - (صحيح) عن البراء قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُ شَعْرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ, وَرَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ, لَمْ أَرَ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ.

واتە: لە (براء)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قژی دەگەیشتە نەرمایی هەردوو گوێچکەی، جارێ بینیم پۆشاکێکی جوانی تازەی سوری لەبەردا بوو، هیچ کەسێکم نەدیوە ئەوەندە جوان بێت.

٤٠٧٣ - (صحيح) عن هلال بن عامر, عن أبيه قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى يَخْطُبُ عَلَى بَغْلَةٍ, وَعَلَيْهِ بُرْدٌ أَحْمَرُ, وَعَلِيٌّ رَضِىَ اللهُ عَنْهُ أَمَامَهُ يُعَبِّرُ عَنْهُ.

واتە: لە هیلالی کوڕی عامیرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە مینا پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بەسواری ئێسترێکەوە بینی وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵك، (بوردە) پۆشاکێکی سوری خەتی لەبەردا بوو، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ لەبەردەمیدا بوو بە دەنگی بەرز وتەکانی رادەگەیاند بەوانەی کە دووربون لێیەوەو دەنگیان نەدەبیست.

## سەبارەت بە پۆشاکی ڕەش.

## ٢٢ - باب فِي السَّوَادِ.

٤٠٧٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: صَنَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بُرْدَةً سَوْدَاءَ فَلَبِسَهَا, فَلَمَّا عَرَقَ فِيهَا وَجَدَ رِيحَ الصُّوفِ فَقَذَفَهَا, قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَكَانَ تُعْجِبُهُ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پۆشاکێکی ڕەشیان دروست کرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەری کرد، کاتێ کە ئارەقی کردەوە بۆنی خوری لێ دەهات فرێی دا، راوی وتی: پێم وایە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەمیشە حەزی لە بۆنی خۆش بوو.

## سەبارەت بە دامێنی پۆشاك.

## ٢٣ - باب فِي الْهُدْبِ.

٤٠٧٥ - (ضعيف) عن جابر - يعنى ابن سليم - قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُحْتَبٍ بِشَمْلَةٍ وَقَدْ وَقَعَ هُدْبُهَا عَلَى قَدَمَيْهِ.

واتە: لە جابرەوە - واتە ئیبنو سولەیم - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا دەستەو ئەژنۆ دانیشتبوو - واتە سمتی خستبوە سەرزەوی و ئەژنۆی هاتبوەوە بەرەو سنگی - پۆشاکێکی دابوو بە خۆیدا دامێنی ئەو بەشەی کە شۆڕبوو بوەوە دەگەیشتە سەر قاچەکانی.

## سەبارەت بە مێزەر.

## ٢٤ - باب فِي الْعَمَائِمِ.

٤٠٧٦ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَامَ الْفَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، لە ساڵی رزگارکردنی شاری مەککەدا کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆشتە ناو شارەوە مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بوو.

٤٠٧٧ - (صحيح) عن جعفر بن عمرو بن حريث, عن أبيه قال: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَيْهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی (حريث)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەر مینبەر پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دی مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بوو چمکەکەی بەناو شانیا شۆڕکردبۆوە.

٤٠٧٨ - (ضعيف) عن أبو جعفر بن محمد بن علي بن ركانة, عن أبيه: أَنَّ رُكَانَةَ صَارَعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَصَرَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ رُكَانَةُ: وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (فَرْقُ مَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْمُشْرِكِينَ الْعَمَائِمُ عَلَى الْقَلاَنِسِ).

واتە: لە ئەبو جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی روکانەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم زۆرانمان گرت ئەو منی دا بە زەوی دا، روکانە وتی: گوێم لێ بوو فەرمووی: (جیاوازی لەنێوان ئێمەو ئەواندا - واتە بت پەرستەکان - ئێمە لەسەر کڵاوەوە مێزەر دەبەستین).

٤٠٧٩ - (ضعيف) عن عبد الرحمن بن عوف قال: عَمَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَدَلَهَا بَيْنَ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مێزەرێکی بەستەوە بۆم، چمکێکی لە پێشمەوەو چمکەکەی تری لەپشتمەوە شۆڕکردەوە.

## دەربارەی خۆشەتەکدان(الصماء).

## ٢٥ - باب فِي لِبْسَةِ الصَّمَّاءِ.

٤٠٨٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ لِبْسَتَيْنِ: أَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ مُفْضِيًا بِفَرْجِهِ إِلَى السَّمَاءِ, وَيَلْبَسَ ثَوْبَهُ وَأَحَدُ جَانِبَيْهِ خَارِجٌ وَيُلْقِي ثَوْبَهُ عَلَى عَاتِقِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری کردوە لەوەی کە پیاو بە چیچکانەوە جلێ بئاڵێنێ بەخۆیەوە هیچ نەدات بە شەرمگەی خۆیدا، هەروەها لەوەیش جلێ لەبەر بکات لایەکی شانی داپۆشێ و لاکەی تری بەدەرەوە بێت.

٤٠٨١ – (صحيح) عن جابر: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصَّمَّاءِ وَعَنْ الاِحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە جابرەوە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری کردوە لەوە مرۆڤ خۆی شەتەك بدات بە پارچە جلێ کە نەتوانێ دەستی لێوە دەربێنێ، وە لەوەیش کە پیاو بە چیچکانەوە جلێ بئاڵێنێ بەخۆیەوە هیچ نەدات بە شەرمگەی خۆیدا.

## سەبارەت دانەخستنی دوگمە.

## ٢٦ - باب فِي حَلِّ الأَزْرَارِ.

٤٠٨٢ - (صحيح) عن معاوية بن قرة, حدثني أبي قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَهْطٍ مِنْ مُزَيْنَةَ, فَبَايَعْنَاهُ, وَإِنَّ قَمِيصَهُ لَمُطْلَقُ الأَزْرَارِ, قَالَ: فَبَايَعْناه, ثُمَّ أَدْخَلْتُ يَدِى فِي جَيْبِ قَمِيصِهِ فَمَسِسْتُ الْخَاتَمَ. قَالَ عُرْوَةُ: فَمَا رَأَيْتُ مُعَاوِيَةَ وَلاَ ابْنَهُ قَطُّ إِلاَّ مُطْلِقِى أَزْرَارِهِمَا فِي شِتَاءٍ وَلاَ حَرٍّ, وَلاَ يُزَرِّرَانِ أَزْرَارَهُمَا أَبَدًا.

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: لەگەڵ کۆمەڵێ لە هۆزی موزەینە چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەڵێن و پەیمانمان دایە لەسەر ئیسلام، لەوکاتەدا دوگمەی کراسەکەی کرابوەوە، وتی: بەڵێن و پەیمانمان دایە، لەپاشدا دەستم بردە ژوورەوە بۆ ناو کراسەکەی دەستم دا لە مۆری پێغەمبەرایەتی کە بەناو شانیەوە بوو، عوروە وتی: هەرگیز موعاویەو کوڕەکەی بە هاوین و بە زستان لە سەرماو لە گەرمادا دوگمەی کراسیان دانەدەخست.

## سەبارەت بە سەرداپۆشین هەندێ لەدەم و چاو.

## ٢٧ - باب فِي التَّقَنُّعِ.

٤٠٨٣ - (صحيح) عن عائيشة رضى الله عنها قالت: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي بَيْتِنَا فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ, قَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُقْبِلاً مُتَقَنِّعًا فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا, فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَأْذَنَ, فَأُذِنَ لَهُ, فَدَخَلَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەسەرەتای نیوەڕۆدا لەماڵەوە دانیشتبوین، یەکێ بە ئەبو بەکری رەزای خوای لێ بێ وت: ئەوە پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم تەشریفی هێنا سەری و هەندێ لە پێشەوەی دەم و چاوی داپۆشیوە بە ئیزارەکەی لەکاتێکدا کە پێشتر لەم کاتەدا نەدەهات بۆ لامان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی کرد، مۆڵەتیان پێ دا، هاتەژوورەوە.

## دەربارەی بەردانەوەی جل و بەرگ.

## ٢٨ - باب مَا جَاءَ فِي إِسْبَالِ الإِزَارِ.

٤٠٨٤ - (صحيح) عن أبي جري جابر بن سليم قال: رَأَيْتُ رَجُلاً يَصْدُرُ النَّاسُ عَنْ رَأْيِهِ لاَ يَقُولُ شَيْئًا إِلاَّ صَدَرُوا عَنْهُ, قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . قُلْتُ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَرَّتَيْنِ. قَالَ: (لاَ تَقُلْ عَلَيْكَ السَّلاَمُ, فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَيِّتِ, قُلِ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ). قَالَ: قُلْتُ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: (أَنَا رَسُولُ اللَّهِ الَّذِى إِذَا أَصَابَكَ ضُرٌّ فَدَعَوْتَهُ كَشَفَهُ عَنْكَ, وَإِنْ أَصَابَكَ عَامُ سَنَةٍ فَدَعَوْتَهُ أَنْبَتَهَا لَكَ, وَإِذَا كُنْتَ بِأَرْضٍ قَفْرَاءَ أَوْ فَلاَةٍ فَضَلَّتْ رَاحِلَتُكَ فَدَعَوْتَهُ رَدَّهَا عَلَيْكَ). قال: قُلْتُ: اعْهَدْ إِلَيَّ, قَالَ: (لاَ تَسُبَّنَّ أَحَدًا). قَالَ: فَمَا سَبَبْتُ بَعْدَهُ حُرًّا وَلاَ عَبْدًا وَلاَ بَعِيرًا وَلاَ شَاةً. قَالَ (وَلاَ تَحْقِرَنَّ شَيْئًا مِنَ الْمَعْرُوفِ وَأَنْ تُكَلِّمَ أَخَاكَ وَأَنْتَ مُنْبَسِطٌ إِلَيْهِ وَجْهُكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنَ الْمَعْرُوفِ وَارْفَعْ إِزَارَكَ إِلَى نِصْفِ السَّاقِ, فَإِنْ أَبَيْتَ فَإِلَى الْكَعْبَيْنِ, وَإِيَّاكَ وَإِسْبَالَ الإِزَارِ فَإِنَّهَا مِنَ الْمَخِيلَةِ, وَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمَخِيلَةَ, وَإِنِ امْرُؤٌ شَتَمَكَ وَعَيَّرَكَ بِمَا يَعْلَمُ فِيكَ فَلاَ تُعَيِّرْهُ بِمَا تَعْلَمُ فِيهِ, فَإِنَّمَا وَبَالُ ذَلِكَ عَلَيْهِ).

واتە: لە ئەبو جورەی جابری کوڕی سولەیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکم دی قسەی بۆ کۆمەڵێ خەڵك دەکرد، هەرچی دەوت خەڵکەکە دەست بەجێ وەریان دەگرت و جێ بەجێیان دەکرد،وتم: ئەم پیاوە کێ یە؟ وتیان: ئەوە پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، دوو جار وتم: (عَلَيْكَ السَّلاَم) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (مەڵێ (عَلَيْكَ السَّلاَم) چونکە (عَلَيْكَ السَّلاَم) سڵاوکردن لە مردوو بەو شێوەیە دەکرێت، بەڵکو بڵێ: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ) ). وتی: وتم: تۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (بەڵێ من پێغەمبەری ئەو خوام کە کاتێ توشی بەڵاو تەنگانەیە دەبیت هاواری بۆ دەبەیت

دێت بە هاوارتەوەو دەرووی خێرت لێ دەکاتەوە، کاتێ کە توشی وشکە ساڵی و بێ بارانی هاتی هاواری لێ دەکەیت دێت بە هاوارتەوەو بارانت بۆ دەبارێنێ و گژو گیات بۆ سەوز دەکات، کاتێ کە تۆ لە شوێنێکی چۆڵدا یان لە بیبانێ وڵاخەکەت ون دەبێ لێی دەپاڕێیتەوە وڵاخەکەت بۆ دەگێڕێتەوە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: (جنێو بە کەس مەدە)، وتی: لەدوای ئەوە ئیتر جنێوم نەداوە نە بە ئازاد و نە بە بەندەو نە بە وشترو نەبە مەڕو بزن و هیچی تریش، فەرمووی: (ئەوەی چاکە بێ بە سوکی مەزانە، قسەکردن لەگەڵ برای خۆتا بەڕووی خۆشەوە ئەویش لە چاکەیە، جلەکانیشت هەتا نیوەی لاقت بێ، ئەگەر بەوەش رازی نیت با هەتا قولە پێکانت بێ، ئاگاداری بەردانەوەی جل و بەرگ بە، چونکە ئەوە لە فیز و لەخۆبایی بونەوەیە، خوای گەورە خۆشی لێی نایە، ئەگەر کەسێ جنێوی پێ دای یان تانەیەکی لێ دای لەتۆدا هەبوو ئەو ئاگادار بوو، تۆ تانەی لێ مەدە جنێوی پێ مەدە کە لەودا هەبێ و ئاگاداری، ئیتر ئۆباڵی ئەوە بە ئەستۆی ئەوەو ئەو پێی گوناهبار دەبێت).

٤٠٨٥ - (صحيح) عن سالم بن عبد الله, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ أَحَدَ جَانِبَىْ إِزَارِى يَسْتَرْخِى, إِنِّى لأَتَعَاهَدُ ذَلِكَ مِنْهُ, قَالَ: (لَسْتَ مِمَّنْ يَفْعَلُهُ خُيَلاَءَ).

واتە: لە سالمی کوڕی (عبد الله)وە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بۆ فیز و لەخۆبایی بوون جلی خۆی بەرداتەوە لەزەوی بخشێ و راکێشێ بەدوای خۆیدا، لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە تەماشای ناکات). ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ وتی: خۆ من لایەکی بەرکۆشەکەم شۆڕدەبێتەوە، مەگەر لەمەودوا هەموو کاتێ ئاگام لێی بێ، فەرمووی: (ئەوە بۆ فیز و لەخۆبایی بوون نیە).

٤٠٨٦ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: بَيْنَمَا رَجُلٌ يُصَلِّي مُسْبِلاً إِزَارَهُ, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اذْهَبْ فَتَوَضَّأْ). فَذَهَبَ فَتَوَضَّأَ, ثُمَّ جَاءَ, ثُمَّ قَالَ: (اذْهَبْ فَتَوَضَّأْ). فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَا لَكَ أَمَرْتَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ ثُمَّ سَكَتَّ عَنْهُ, قَالَ: (إِنَّهُ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ مُسْبِلٌ إِزَارَهُ, وَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَقْبَلُ صَلاَةَ رَجُلٍ مُسْبِلٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پیاوێ بە جلی شۆڕەوە نوێژی دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بڕۆ دەستنوێژ بگرەوە). چوو دەستنوێژی گرت لەپاشدا هاتەوە، پاشان فەرمووی: (بڕۆ دەستنوێژ بگرەوە). چوو دەستنوێژی گرت لەپاشدا هاتەوە، پیاوێ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆچی فەرمانت پێ کرد کە دەستنوێژ بگرێتەوە؟ فەرمووی: (چونکە بە جلی شۆڕەوە نوێژی دەکرد، خوای گەورەش نوێژی پیاوێ وەرناگرێت بە جلی شۆڕەوە بیکات).

٤٠٨٧ - (صحيح) عن أبو ذر, عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: (ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ, وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, وَلاَ يُزَكِّيهِمْ, وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ). قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ, قَدْ خَابُوا وَخَسِرُوا؟ أَعَادَهَا ثَلاَثًا. قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ, خَابُوا وَخَسِرُوا؟ فَقَالَ: (الْمُسْبِلُ, وَالْمَنَّانُ, وَالْمُنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ). أَوِ (الْفَاجِرِ).

واتە: لە (أبو ذر)ەوە، دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ کەس لە رۆژی قیامەتدا خوا نایان دوێنێ و روویان تێ ناکات، وە لە تاوان پاکیان ناکاتەوە، وە سزای سەخت و توندیان بۆ هەیە). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوانە کێن رەنجەڕۆ و خەسارۆمەند بوون؟ فەرمووی: (کەسێك جلی شۆڕ لەبەر بکات، وە کەسێك خێر بکات و دوایی منەت بکات و بیداتەوە بەناوچاودا، کەسێ شمەك و کەلوپەلی بە سوێندی درۆ بفرۆشێت و ساغی بکاتەوە) یان (خراپەکار).

٤٠٨٨ - (صحيح) عن أبي ذر, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا, وَالأَوَّلُ أَتَمُّ, قَالَ: (الْمَنَّانُ الَّذِى لاَ يُعْطِى شَيْئًا إِلاَّ مَنَّهُ).

واتە: لە (أبو ذر)وە, لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی ناوبراو هاتوە, بەڵام فەرموودەی یەکەم تەواو ترە, فەرمووی: ((منان) کەسێکە کە شتێ دەبەخشێت بە کەسێك ئیللا منەت دەکات بەسەر ئەو کەسەداو خێر و پاداشتەکەی پوچ و بەتاڵ دەکاتەوە).

٤٠٨٩ - (ضعيف) عن قيس بن بشر التغلبي قال: أَخْبَرَنِى أَبِى, وَكَانَ جَلِيسًا لأَبِى الدَّرْدَاءِ, قَالَ: كَانَ بِدِمَشْقَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, يُقَالُ لَهُ ابْنُ الْحَنْظَلِيَّةِ, وَكَانَ رَجُلاً مُتَوَحِّدًا قَلَّمَا يُجَالِسُ النَّاسَ, إِنَّمَا هُوَ صَلاَةٌ, فَإِذَا فَرَغَ فَإِنَّمَا هُوَ تَسْبِيحٌ وَتَكْبِيرٌ حَتَّى يَأْتِىَ أَهْلَهُ, فَمَرَّ بِنَا وَنَحْنُ عِنْدَ أَبِى الدَّرْدَاءِ, فَقَالَ لَهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةً تَنْفَعُنَا وَلاَ تَضُرُّكَ, قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً, فَقَدِمَتْ, فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَجَلَسَ فِى الْمَجْلِسِ الَّذِى يَجْلِسُ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لِرَجُلٍ إِلَى جَنْبِهِ: لَوْ رَأَيْتَنَا حِينَ الْتَقَيْنَا نَحْنُ وَالْعَدُوُّ فَحَمَلَ فُلاَنٌ فَطَعَنَ, فَقَالَ: خُذْهَا مِنِّى وَأَنَا الْغُلاَمُ الْغِفَارِىُّ, كَيْفَ تَرَى فِى قَوْلِهِ؟ قَالَ: مَا أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ بَطَلَ أَجْرُهُ, فَسَمِعَ بِذَلِكَ آخَرُ, فَقَالَ: مَا أَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا فَتَنَازَعَا, حَتَّى سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ لاَ بَأْسَ أَنْ يُؤْجَرَ وَيُحْمَدَ). فَرَأَيْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ سُرَّ بِذَلِكَ, وَجَعَلَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَيْهِ وَيَقُولُ: أَنْتَ سَمِعْتَ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَمَا زَالَ يُعِيدُ عَلَيْهِ حَتَّى إِنِّى لأَقُولُ لَيَبْرُكَنَّ عَلَى رُكْبَتَيْهِ. قَالَ: فَمَرَّ بِنَا يَوْمًا آخَرَ, فَقَالَ لَهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةً تَنْفَعُنَا وَلاَ تَضُرُّكَ, قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمُنْفِقُ عَلَى الْخَيْلِ كَالْبَاسِطِ يَدَهُ بِالصَّدَقَةِ لاَ يَقْبِضُهَا). ثُمَّ مَرَّ بِنَا يَوْمًا آخَرَ, فَقَالَ لَهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةً تَنْفَعُنَا وَلاَ تَضُرُّكَ. قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نِعْمَ الرَّجُلُ خُرَيْمٌ الأَسَدِىُّ لَوْلاَ طُولُ جُمَّتِهِ وَإِسْبَالُ

إِزَارِهِ). فَبَلَغَ ذَلِكَ خُرَيْمًا فَعَجِلَ فَأَخَذَ شَفْرَةً فَقَطَعَ بِهَا جُمَّتَهُ إِلَى أُذُنَيْهِ, وَرَفَعَ إِزَارَهُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ. ثُمَّ مَرَّ بِنَا يَوْمًا آخَرَ, فَقَالَ لَهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةً تَنْفَعُنَا وَلاَ تَضُرُّكَ, فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّكُمْ قَادِمُونَ عَلَى إِخْوَانِكُمْ, فَأَصْلِحُوا رِحَالَكُمْ, وَأَصْلِحُوا لِبَاسَكُمْ, حَتَّى تَكُونُوا كَأَنَّكُمْ شَامَةٌ فِي النَّاسِ, فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْفُحْشَ وَلاَ التَّفَحُّشَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ قَالَ أَبُو نُعَيْمٍ, عَنْ هِشَامٍ, قَالَ: حَتَّى تَكُونُوا كَالشَّامَةِ فِي النَّاسِ.

واتە: لە قەیسی کوڕی بیشری تەغلیبییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم کە خۆی یەکێ بوو لەوانەی لە کۆڕ و مەجلیسی ئەبو (درداء)دا دادەنیشت، بۆی باس کردم، وتی: لە دیمەشق پیاوێ هەبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێیان دەوت: (ابْنُ الْحَنْظَلِيَّة)، پیاوێکی خواناس بوو دوور لە خەڵك دەژیا زۆر کەم تێکەڵی دەکردن و لەگەڵیان دادەنیشت، هەر خەریکی نوێژکردن بوو، کە لە نوێژ دەبۆوە زیکر و یادی خوای گەورەی دەکرد وك: (الحمد لله) و (الله اکبر)، هەتا دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، راوی وتی: جارێ ئێمە لەلای ئەبو (درداء) بووین دای بەلاماندا، ئەبو (درداء) وتی: وشەیەکمان پێ بڵێ سودی بۆ ئێمە دەبێ و زیانی بۆ تۆ نابێ، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سریەیەکی نارد بۆ غەزایە، کە گەڕایەوە پیاوێکیان لەو کۆڕەدا دانیشت کە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم تێدا دانیشتبوو، پیاوێ لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو پێی وت: خۆزگە چاوت لێمان دەبوو کاتێ کە لەگەڵ دوژمن بەرەنگاری یەك بووینەوە، فڵان کەسمان هەڵمەتی بردە سەر یەکێکیان لەدوای ئەوەی کە رمەکەی لێ دا وتی: ها بیگرە من فڵانی رۆڵەی هۆزی غیفارم، جا تۆ بۆ ئەم خۆهەڵکێشانەی رات چۆنە، وتی: من وا ئەزانم پاداشتەکەی پوچەڵ دەکاتەوە، کەسێکی تر گوێی لێ بوو وتی: من وا ئەزانم ئەوە هیچی تێدا نیە، ئیتر لەسەر ئەوە بوو بە مقۆ مقۆیان، هەتا پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم گوێی لێ بوو فەرمووی: ( (سبحان الله) قەیدی نیە ستایش بکرێ و پاداشتی چاکیش وەربگرێ). ئەبو (درداء)م بینی بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بوو، سەری بەرزکردەوە بۆ لای و وتی: تۆ خۆت ئەم فەرمایشتەت بیست لە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ وتی: بەڵێ، بەردەوام ئەم قسەیەی ئەوەندە دووبارە کردەوەو لێی نزیك بویەوە هەتا من دەموت: ئەبو (درداء) چۆکی لەسەر چۆکی (ابْنُ الْحَنْظَلِيَّة) دادەنێ. راوی وتی: رۆژێکی تر دای بەلاماندا ئەبو (درداء) پێی وت: وشەیەکمان پێ بڵێ سودی بۆ ئێمە دەبێ و زیانی بۆ تۆ نابێ، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووین: (هەرکەسێ وڵاخی بەرزە بەخێو بکات بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورەدا وەك ئەو کەسە وایە بەردەوام خەریکی بەخشین بێ و دەستی لێ هەڵنەگرێت). رۆژێکی تر دای بەلاماندا ئەبو (درداء) پێی وت: وشەیەکمان پێ بڵێ سودی بۆ ئێمە دەبێ و زیانی بۆ تۆ نابێ، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووین: (خورەیمی ئەسەدی پیاوێکی چاکە خۆزگە کاکۆڵەکەی درێژ نەدەبوو، جلەکانیشی شۆڕنەدەبووەوە، وتی: هەرکە خورەیمی ئەسەدی ئەوەی بیستەوە شفرەیەکی هێنا لە ئاست هەردوو گوێی کاکۆڵەکانی بڕی و، جلەکانی هەتا ناوەڕاستی هەردوو لاقی هەڵکرد، لەپاشدا رۆژێکی تر دای بەلاماندا ئەبو (درداء) پێی وت: وشەیەکمان پێ بڵێ سودی بۆ ئێمە دەبێ و زیانی بۆ تۆ نابێ، وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئێوە لەم سەفەری غەزایە دەگەڕێنەوە بۆ ناو براکانتان، وڵاخەکانی ژێرتان رێك بخەن و، پۆشاکەکانتان رێکوپێك بکەن، لەناو خەڵکدا قنج و قیت و رێکوپێك و خاوێن بن وەك نیشانە چۆن بە جەستەوە دیارە ئێوەش ئاوەها دیار بن، چونکە بەڕاستی خوا حەزی لە مرۆڤی خراپەکار و نارێکی شڕو شێواو هەرزەگۆ نیە).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی خۆ بەگەورەزانین.

## ٢٩ - باب مَا جَاءَ فِي الْكِبْرِ.

٤٠٩٠ - (صحيح) عن أبي هريرة, قال هناد: قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: قال الله عز وجل: (قَالَ اللَّهُ تَعالى: الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي, وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي, فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، هەناد وتی: کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (گەورەیی و مەزنایەتی پۆشاك و کاڵای منن و مافی کەسی تریان پێوە نی یە، ئەو کەسەی لەسەر یەکێ لەم دووانە بەربەرەکانێ و دژایەتیم بکات ئەوە فڕێی دەدەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

٤٠٩١ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ, وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ خَرْدَلَةٍ مِنْ إِيمَانٍ).

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیە خۆبەگەورەزانینی لە دڵدا بێ ناچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیە ئیمانی دڵدا بێ ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە).

٤٠٩٢ - (صحيح الإسناد) عن أبي هريرة: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَكَانَ رَجُلاً جَمِيلاً, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي رَجُلٌ حُبِّبَ إِلَيَّ الْجَمَالُ, وَأُعْطِيتُ مِنْهُ مَا تَراه, حَتَّى مَا أُحِبُّ أَنْ يَفُوقَنِي أَحَدٌ, إِمَّا قَالَ: بِشِرَاكِ نَعْلِي

وَإِمَّا قَالَ: بِشِسْعِ نَعْلِي, أَفَمِنَ الْكِبْرِ ذَلِكَ؟ قَالَ: (لاَ وَلَكِنَّ الْكِبْرَ مَنْ بَطَرَ الْحَقَّ, وَغَمَطَ النَّاسَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی زۆر جوان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من پیاوێکم زۆر حەزم لە جوانی یە، ئەوەندەیشم پێ بە خشراوە کە دەیبینی، هەتا حەز ناکەم کەس لەخۆم جوانتر بێ، تەنانەت نەعلەکانیش چاکتر بێ لە نەعلەکانم، ئایا ئەوە لە خۆ بەگەورەزانینەوەیە؟ فەرمووی: (نا خۆ بەگەورەزانین هەق پێشێل کردن و خەڵك بە سوك دانانە).

## جل و بەرگ هەتا کوێ شۆڕ بێ.

## ٣٠- في قدر موضع الإزار.

٤٠٩٣ - (صحيح) عن العلاء بن عبد الرحمن, عن أبيه قال: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ عَنِ الإِزَارِ, فَقَالَ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِزْرَةُ الْمُسْلِمِ إِلَى نِصْفِ السَّاقِ وَلاَ حَرَجَ - أَوْ: لاَ جُنَاحَ - فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ, وَمَا كَانَ أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ فَهُوَ فِي النَّارِ, مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ).

واتە: لە (علاء)ی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی جل و بەرگ پرسیارم کرد لە ئەبو سەعیدی خودری، وتی: باش بوو لە کەسێکی شارەزات پرسی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پۆشاکی موسوڵمان هەتا نیوەی لاقە هیچی تێدا نیە، گوناهی نیە هەتا قولە پێ، بەڵام لە خوار قولە پێوە ئەوە جێگەی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێت، هەرکەسێك بۆ فیزو دەعیەو رۆح زلی جلی خۆی کێش بکاو بیخشێنێ لەزەوی، لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە تەماشای ناکات).

٤٠٩٤ - (صحيح) عن سالم بن عبد الله, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الإِسْبَالُ فِي الإِزَارِ وَالْقَمِيصِ وَالْعِمَامَةِ, مَنْ جَرَّ مِنْهَا شَيْئًا خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە سالمی کوڕی (عبد الله)ەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شۆڕکردنەوەی نادروست بۆ بەرکۆش و کراس و مێزەرە، هەرکەسێ یەکێ لەوانە کێش بکاو بیخشێنێ لەزەوی، لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە تەماشای ناکات).

٤٠٩٥ - (صحيح الإسناد) عن يزيد بن أبو سمية قال: سمعت ابن عمر يقول: مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الإِزَارِ فَهُوَ فِي الْقَمِيصِ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئەبو سومەییەوە دەگێرنەوە، بیستم لە ئیبنو عومەر دەیوت ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی حوکمی بەرکۆش فەرموویەتی کراس و جل و بەرگیش دەگرێتەوە واتە یەك حوکمیان هەیە.

٤٠٩٦ - (صحيح الإسناد) عن عكرمة: أَنَّهُ رَأَى ابْنَ عَبَّاسٍ يَأْتَزِرُ فَيَضَعُ حَاشِيَةَ إِزَارِهِ مِنْ مُقَدَّمِهِ عَلَى ظَهْرِ قَدَمَيْهِ, وَيَرْفَعُ مِنْ مُؤَخَّرِهِ, قُلْتُ: لِمَ تَأْتَزِرُ هَذِهِ الإِزْرَةَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْتَزِرُهَا.

واتە: لە عیکریمەوە دەگێرنەوە، کە ئیبنو عەباسی رەزای خوایان لێ بێ دیوە بەرکۆشی لەبەرکردوە دامێنی بەرکۆشەکەی لەپێشەوە گەیشتۆتە سەر پشتی پێی، بەڵام لەدواوە هەڵی کردوە بە شێوەیە نەگەیشتۆتە قاپەکانی، عیکریمە دەڵێ: وتم: بۆچی بەو شێوەیە بەرکۆش لەبەردەکەی؟ وتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دیوە بەم شێوەیە لەبەری دەکرد.

## سەبارەت بە پۆشاکی ئافرەتان.

## ٣٠ - باب في لِبَاسِ النِّسَاءِ.

٤٠٩٧ - (صحيح) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ لَعَنَ الْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ, وَالْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان، هەروەها نەفرەتیشی کردوە لەو پیاوانەی کە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

٤٠٩٨ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ, وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لەو پیاوانەی جلی ئافرەتان لەبەردەکەن، هەروەها لەو ئافرەتانەی کە جلی پیاوان لەبەردەکەن.

٤٠٩٩ - (صحيح) عن ابن أبو مليكة قال: قيل لعائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : إِنَّ امْرَأَةً تَلْبَسُ النَّعْلَ! فَقَالَتْ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلَةَ مِنَ النِّسَاءِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو مولەیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وترا: ڕات چی یە دەربارەی ئافرەتێ نەعلی پیاوانە لەپێ بکات؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان لە هەڵسوکەوت و شکڵ و شێوە و قسەکردن و هەڵسان و دانیشتنیاندا.

## سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾.

## ٣٢ - باب فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾.

٤١٠٠ - (ضعيف الإسناد) عن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : أَنَّهَا ذَكَرَتْ نِسَاءَ الأَنْصَارِ فَأَثْنَتْ عَلَيْهِنَّ وَقَالَتْ لَهُنَّ مَعْرُوفًا, وَقَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ سُورَةُ النُّورِ عَمَدْنَ إِلَى حُجُورٍ أَوْ حُجُوزٍ - شَكَّ أَبُو كَامِلٍ - فَشَقَقْنَهُنَّ فَاتَّخَذْنَهُ خُمُرًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە باسی ئافرەتانی ئەنصاری کرد ستایشی چاکی کردن و زۆر بە جوانی لەبارەیانەوە دوا، هەروەها وتی: کاتێ کە سورەتی (النور) دابەزی واتە ئایەتی باڵاپۆشی ئیتر بە جوانی سەرتاپای خۆیان دادەپۆشی بە چارشێو و سەرپۆش بەشێوەیە کە سەر و گەردن و سنگ و بەرۆکیان بەدەرەوە نەبوو.

٤١٠١ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: لَمَّا نَزَلَتْ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلاَبِيبِهِنَّ) خَرَجَ نِسَاءُ الأَنْصَارِ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِهِنَّ الْغِرْبَانُ مِنَ الأَكْسِيَةِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾ سورة الأحزاب: ٥٩.
واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بڵێ بە هاوسەرانت و بەکچانت و بە ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان و جوانیانی پێ داپۆشن).
جا ئافرەتانی (ئەنصار)یاریدەدەران کاتێ کە لەماڵ دەهاتنەدەرەوە لەبەر لەچك و پەچە و چارشێوی رەشیان دەتوت قەلەڕەش وا بەسەر سەریانەوە نیشتۆتەوە ئاوا سەریاندا گەردن و سنگ و بەرۆکی خۆیان دادەپۆشی.

## سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾

## ٣٣ - باب فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾.

٤١٠٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: يَرْحَمُ اللَّهُ نِسَاءَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلَ لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ). شَقَقْنَ أَكْنَفَ - قَالَ ابْنُ صَالِحٍ: أَكْثَفَ - مُرُوطِهِنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ڕەحمەتی خوا لە ژنە کۆچەرە پێشینەکان بێت ئەوانەی لەسەرەتاوە کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾. سورة النور: ٣١.
واتە: با گۆشەی سەرپۆش و لەچکەکانیان بدەن بەسەر سنگیاندا تا گەردن و سنگ و بەرۆکیان دەرنەکەوێت.
چارۆکەو شاڵینەکانی خۆیان لەت لەت دەکردو دەیان کرد بە لەچك و سەرپۆش بۆ خۆیان. - ئیبنو صالح لە جیاتی (أَكْنَف) وتی: (أَكْثَف) - .

٤١٠٣ - عن ابن السرح قال: رَأَيْتُ فِي كِتَابِ خَالِي، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ.

## ئافرەتی باڵغ تا کوێی جوانی خۆی دەربخات دروستە.

## ٣٤ - باب فِيمَا تُبْدِى الْمَرْأَةُ مِنْ زِينَتِهَا.

٤١٠٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ, فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَقَالَ: (يَا أَسْمَاءُ إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا). وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا مُرْسَلٌ, خَالِدُ بْنُ دُرَيْكٍ لَمْ يُدْرِكْ عَائِشَةَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر جلێکی تەنکی لەبەردا بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕووی لێ وەرچەرخان و فەرمووی: (ئەی ئەسماء ئافرەت کە کەوتە حاڵەتی بێ نوێژیەوەو باڵغ بوو ئیتر دروست نیە هیچ شوێنێکی بەدەرەوە بێت و ببینرێت جگە لەمەو لەمە). ئاماژەی کرد بۆ ڕوخساری و هەردوو دەستی.

## سەبارەت بە کۆیلە دروستە بۆی سەیری قژی هاوسەری گەورەکەی بکات.

## ٣٥ - باب فِي الْعَبْدِ يَنْظُرُ إِلَى شَعْرِ مَوْلاَتِهِ.

٤١٠٥ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ اسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْحِجَامَةِ, فَأَمَرَ أَبَا طَيْبَةَ أَنْ يَحْجُمَهَا. قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ أَخَاهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ, أَوْ غُلاَمًا لَمْ يَحْتَلِمْ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە ئوممو سەلەمە مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەڵەشاخ بگرێت، ئەویش فەرمانی دا بە (أَبَا طَيْبَة) کەڵەشاخی بۆ بگرێت، وتی: وا ئەزانم راوی وتی: (أَبَا طَيْبَة) برای شیری ئوممو سەلەمە بوو، یان غولامێ بوو هێشتا بالغ نەبوو بوو.

٤١٠٦ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى فَاطِمَةَ بِعَبْدٍ قَدْ وَهَبَهُ لَهَا, قَالَ: وَعَلَى فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ثَوْبٌ إِذَا قَنَّعَتْ بِهِ رَأْسَهَا لَمْ يَبْلُغْ رِجْلَيْهَا, وَإِذَا غَطَّتْ بِهِ رِجْلَيْهَا لَمْ يَبْلُغْ رَأْسَهَا, فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تَلْقَى, قَالَ: (إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكِ بَأْسٌ إِنَّمَا هُوَ أَبُوكِ وَغُلاَمُكِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەندەیەکی بەدیاری هێنا بۆ (فَاطِمَة)ی کچی، راوی وتی: لەوکاتەدا (فَاطِمَة) رەزای خوای لێ بێ جلێکی لەبەردا بوو بەشی ئەوەی نەدەکرد هەموو جەستەی پێ داپۆشی کە سەری پێ دادەپۆشی نەدەگەیشتە قاچەکانی، کە قاچەکانی پێ دادەپۆشی نەدەگەیشتە سەری، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو شەرمەی لە (فَاطِمَة) بینی، فەرمووی: (قەیدی نیە من و غولامەکەتین).

## دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ ﴾

## ٣٦ - باب فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ ﴾

٤١٠٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُخَنَّثٌ, فَكَانُوا يَعُدُّونَهُ مِنْ غَيْرِ أُولِي الإِرْبَةِ, فَدَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا وَهُوَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ, وَهُوَ يَنْعَتُ امْرَأَةً, فَقَالَ: إِنَّهَا إِذَا أَقْبَلَتْ أَقْبَلَتْ بِأَرْبَعٍ, وَإِذَا أَدْبَرَتْ أَدْبَرَتْ بِثَمَانٍ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ أَرَى هَذَا يَعْلَمُ مَا هَا هُنَا لاَ يَدْخُلَنَّ عَلَيْكُنَّ هَذَا). فَحَجَبُوهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی سەرژنانی هاتوچۆی هاوسەرەکانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەکرد، خەڵك وایان دانابوو لەو جۆرە پیاوانەیە کە شوێن ژنان دەکەون بەبێ نیاز و ئارەزوو، ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان ئەو پیاوە لە ماڵی یەکێ لە هاوسەرەکانی بوو، بەسەر ئافرەتێکدا هەڵی دەدا دەیوت: چۆن شۆخ و شەنگێکە، لەپێشەوە نەرم و نۆڵەو چوار لۆیە، لەدواوە خڕ و خەپانەو هەشت لۆیە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لەو قسانەی بوو فەرمووی: (نەم ئەزانی کە ئەمە ئەم قسانە دەزانێ مەهێڵن ئەمە هاتوچۆتان بکات). ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ڕێگەیان نەدا هاتوچۆیان بکات و خۆیان نیشانی نەدەدا.

٤١٠٨ - عن الزهري, عن عروة, عن عائشة, بمعناه.

٤١٠٩ - (صحيح) عن عائشة, بِهَذَا الْحَدِيثِ, زَادَ: وَأَخْرَجَهُ, فَكَانَ بِالْبَيْدَاءِ يَدْخُلُ كُلَّ جُمُعَةٍ يَسْتَطْعِمُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هەمان فەرموودە هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: لە شاری مەدینە دەری کرد، لە چۆڵەوانی دەژیا، ڕۆژانی هەینی دەهاتە ناو شار داوای خواردنی دەکرد خواردنیان دەدایەو دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

٤١١٠ - (صحيح) عن الأوزاعي, فِي هذه القصة, فقيل: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّهُ إِذًا يَمُوتُ مِنَ الْجُوعِ, فَأَذِنَ لَهُ أَنْ يَدْخُلَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّتَيْنِ فَيَسْأَلَ ثُمَّ يَرْجِعَ.

واتە: لە ئەوزاعیەوە هەمان بەسەرهات هاتوە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر لەبرسان مرد، ئەویش مۆڵەتی دایە هەفتەی دووجار بێتە ناو شار سواڵ بکات و لەپاشدا بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

## دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ ﴾

## ٣٧ - باب فِي قَوْلِهِ تعالى: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ ﴾

٤١١١ - (حسن الأسناد) عن ابن عباس: (وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ) الآيَةَ فَنُسِخَ وَاسْتُثْنِيَ مِنْ ذَلِكَ: (وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللاَّتِي لاَ يَرْجُونَ نِكَاحًا) الآيَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەبارەی ئەم ئایەتەوە وتویەتی: ( وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ ). سورة النور: ٣١. واتە: بە ژنانی باوەڕدار بڵێ: با چاویان دابخەن لە تەماشای نامەحرەم.

خوای گەورە ئەو ئافرەتانەی جیاکردەوە کە پیر و پەککەوتەن و ئارەزوویان نەماوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا ). سورة النور: ٦٠. واتە: ئەو ژنانەی لەئیش و کار کەوتون ئوفتادەبون و لەبەر پیری و نەمانی ئارەزوو بە تەمای شوکردن نین.

٤١١٢ - (ضعيف) عن أم سلمة قالت: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَعِنْدَهُ مَيْمُونَةُ, فَأَقْبَلَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ, وَذَلِكَ بَعْدَ أَنْ أُمِرْنَا بِالْحِجَابِ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (احْتَجِبَا مِنْهُ). فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَلَيْسَ أَعْمَى لاَ يُبْصِرُنَا وَلاَ يَعْرِفُنَا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَفَعَمْيَاوَانِ أَنْتُمَا؟ أَلَسْتُمَا تُبْصِرَانِهِ؟). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا لأَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاصَّةً أَلاَ تَرَى إِلَى اعْتِدَادِ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ, قَدْ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِفَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ: (اعْتَدِّى عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى تَضَعِينَ ثِيَابَكِ عِنْدَهُ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: من لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووم صلى الله عليه وسلم، لەوکاتەدا مەیمونەی هاوسەریشی لێ بوو، ئیبنو مەکتوم کە پیاوێکی کوێر بوو هات پێشوازیمان لێ کرد، ئەمەش لەپاش ئەوەوە بوو کە فەرمانمان پێ کرابوو بە باڵاپۆشی، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (پەردەدادەنەوەو خۆتان داپۆشن)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە کوێرە ئێمە نابینێ و نامان ناسێ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئێوە کوێرن و ئەو نابینن؟!).

ئەبو داود دەڵێت: ئەمە تایبەتە بە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم، وەك لە فەرموودەی ژمارە: (٢٢٩٠) هاتوە کە (فاطمة)ی کچی قەیس تەلاق درا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لەماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم بمێنەرەوە چونکە پیاوێکی کوێرە جلەکانت دادەنێی لەلای ئەو ناتبینێ).

- ئیتر (فاطمة) لەماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم بوو هەتا عیددەکەی تەواو بوو-.

٤١١٣ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا زَوَّجَ أَحَدُكُمْ عَبْدَهُ أَمَتَهُ فَلاَ يَنْظُرْ إِلَى عَوْرَتِهَا).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە کەنیزەکەی خۆی مارە کرد بۆ بەندەکەی یان بۆ خزمەتکارەکەی ئەو کەسەی کە بەکرێ کاری بۆ دەکات، ئەوا با سەیری نێوان ئەژنۆ و ناوکی کەنیزەکەکەی نەکات. - چونکە لەو حاڵەتەدا دەبێتە کەنیزەکێکی بێگانە، بە مانایەکی تر با کەنیزەکەکە سەیری نێوان ئەژنۆ و ناوکی گەورەکەی نەکات).

٤١١٤ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا زَوَّجَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ عَبْدَهُ أَوْ أَجِيرَهُ, فَلاَ يَنْظُرْ إِلَى مَا دُونَ السُّرَّةِ وَفَوْقَ الرُّكْبَةِ).

واتە: لە عەمریَ کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ( (ئەگەر یەکێ لە ئێوە کارەکەرەکەی خۆی مارە کرد بۆ بەندەکەی یان بۆ خزمەتکارەکەی ئەو کەسەی کە بەکرێ کاری بۆ دەکات، ئەوا با سەیری نێوان ئەژنۆ و ناوکی کەنیزەکەکەی نەکات.

## چۆنیەتی پەچە ئەوەی سەرو دەم و چاوی پێ دادەپۆشرێت.

## ٣٨ - باب كيف الاِخْتِمَارِ.

٤١١٥ - (ضعيف) عن أم سلمة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَهِيَ تَخْتَمِرُ, فَقَالَ: (لَيَّةً لاَ لَيَّتَيْنِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَعْنَى قَوْلِهِ: (لَيَّةً لاَ لَيَّتَيْنِ). يَقُولُ: لاَ تَعْتَمَّ مِثْلَ الرَّجُلِ, لاَ تُكَرِّرْهُ طَاقًا أَوْ طَاقَيْنِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە بۆ لای لەوکاتەدا پەچەکەی یان لەچکەکەی دەدا بەسەریدا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (یەك پێچ تێوەی ئاڵێنە نەك دوو پێچ).
ئەبو داود دەڵێت: مانای: (لَيَّةً لاَ لَيَّتَيْنِ). واتە: مەیپێچەرەوە وەك چۆن پیاو مێزەر دەپێچێتەوە.

## سەبارەت بە پۆشینی پۆشاكی (قباطي) لەلایەن ئافرەتانەوە.

## ٣٩ - باب فِي لُبْسِ الْقَبَاطِيِّ لِلنِّسَاءِ.

٤١١٦ - (ضعيف) عن دحية بن خليفة الكلبي قال: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَبَاطِيَّ, فَأَعْطَانِي مِنْهَا قُبْطِيَّةً, فَقَالَ: (اصْدَعْهَا صَدْعَيْنِ, فَاقْطَعْ أَحَدَهُمَا قَمِيصًا, وَأَعْطِ الآخَرَ امْرَأَتَكَ تَخْتَمِرُ بِهِ). فَلَمَّا أَدْبَرَ, قَالَ: (وَأْمُرِ امْرَأَتَكَ أَنْ تَجْعَلَ تَحْتَهُ ثَوْبًا لاَ يَصِفُهَا).

واتە: لە دیحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قوماشێکی سپی تەنکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە لە میصر لەلایەن قیبتیەکانەوە دروست دەکرا، پارچەیەکی دا بە من، فەرمووی: (بیکە بە دوو بەشەوە بەشێکی بۆ جلی خۆت، بەشەکەی تریشی بدە بە ژنەکەت با خۆی پێ داپۆشێت). کاتێ کە دیحیە رووی وەرچەرخان بڕوات، فەرمووی: (فەرمان بکە بە ژنەکەت با لەژێریەوە کراسێ لەبەربکات بۆ ئەوەی جەستەی دیار نەبێت لەبەر تەنکی قوماشەکە).

## سەبارەت بە ئەندازەی درێژی پۆشاکی ئافرەتان.

## ٤٠ - باب فِي قَدْرِ الذَّيْلِ.

٤١١٧ - (صحيح) عن أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت لرسول الله صلى الله عليه وسلم حين ذكر الإزار: فَالْمَرْأَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (تُرْخِي شِبْرًا). قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: إِذًا يَنْكَشِفُ عَنْهَا, قَالَ: (فَذِرَاعًا, لاَ تَزِيدُ عَلَيْهِ).

واتە: لەکاتێکدا کە سەرزەنشتی شۆڕکردنەوەی پۆشاکی پیاوان کرا، کە دەبێت شۆڕ نەبێ و تا نیوەی لاقیان بێت، ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی دامێنی ئافرەتان؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بستێ شۆڕی بکەنەوە). ئوممو سەلەمە وتی: ئەی ئەگەر قاچیان دەرکەوت؟ فەرمووی: (دەی یەك باڵ شۆڕی بکەنەوەو بەس لەوە زیاتر نا).

٤١١٨ - عن أم سلمة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا الْحَدِيثِ.

٤١١٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ فِي الذَّيْلِ شِبْرًا, ثُمَّ اسْتَزَدْنَهُ, فَزَادَهُنَّ شِبْرًا, فَكُنَّ يُرْسِلْنَ إِلَيْنَا, فَنَذْرَعُ لَهُنَّ ذِرَاعًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی دا بە دایکانی باوەڕداران دامێنیان بستێ شۆڕ بکەنەوە، لەپاشدا زیادی کرد، بستێکی تریان بۆ زیاد کرد، پۆشاکەکەنیان نارد بۆمان ئێمەش بە باڵ پێوامان بۆیان باڵێ لە هی پیاوان زیاتر.

## سەبارەت بە خۆشەکردنی پێستەی ئاژەڵی مردو.

## ٤١ - باب فِي أُهُبِ الْمَيْتَةِ.

٤١٢٠ - (صحيح) عن ميمونة, قالت: أُهْدِيَ لِمَوْلاَةٍ لَنَا شَاةٌ مِنَ الصَّدَقَةِ, فَمَاتَتْ, فَمَرَّ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَلاَ دَبَغْتُمْ إِهَابَهَا فَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ!). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّهَا مَيْتَةٌ, قَالَ: (إِنَّمَا حُرِّمَ أَكْلُهَا).

واتە: لە مەیمونەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ مەڕێکیان بە دیاری دا بە بەندەیەکی ئازادکراومان، مەڕەکە مرداربووەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای لاکی مەڕەکەدا فەرمووی: (ئەوە بۆچی پێستەکەیتان خۆشەنەکردوە هەتا کەڵکی لێ وەربگرن؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە مرداربۆتەوە چۆن کەڵکی لێ وەربگرین، فەرمووی: (خواردنی گۆشتەکەی حەرام کراوە دەتوانن سوود لە پێستەکەی وەربگرن).

٤١٢١ - (صحيح) عن الزهري, بِهَذَا الْحَدِيثِ, لَمْ يَذْكُرْ مَيْمُونَةَ, قَالَ: فَقَالَ: (أَلَا انْتَفَعْتُمْ بِإِهَابِهَا). ثُمَّ ذَكَرَ مَعْنَاهُ, لَمْ يَذْكُرِ الدِّبَاغَ.

واتە: لە زوهریەوە فەرمودەی پێشو هاتوە، بەڵام باسی مەیمونەی نەکرد، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە بۆچی کەڵکتان لە پێستەکەی وەرنەگرتوە). لەپاشدا راوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی گێڕایەوە، بەڵام باسی خۆشەکردنی نەکرد.

٤١٢٢ - (صحيح الإسناد مقطوع) عبد الرزاق قال: قَالَ مَعْمَرٌ: وَكَانَ الزُّهْرِيُّ يُنْكِرُ الدِّبَاغَ, وَيَقُولُ: يُسْتَمْتَعُ بِهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَذْكُرِ الأَوْزَاعِيُّ وَيُونُسُ وَعُقَيْلٌ فِي حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ الدِّبَاغَ, وَذَكَرَهُ الزُّبَيْدِيُّ وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَحَفْصُ بْنُ الْوَلِيدِ: ذَكَرُوا الدِّبَاغَ.

واتە: لە (عبد الرزاق)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: مەعمەر وتی: زوهری نکولی کرد لە خۆشەکردن(الدباغ)، وتی: بە هەرحاڵ سوودی لێ وەربگرن ئتر خۆشەکرابێ یان نا. ئەبو داود دەڵێت: ئەوزاعی و یونوس و عوقەیل لە فەرمودەکەی زوهری دا باسی خۆشەکردنیان نەکرد. بەڵام زوبەیدی و سەعیدی کوڕی (عبد العزیز) و حەفصی کوڕی وەلید باسی خۆشەکردنیان کرد.

٤١٢٣ - (صحيح) عن ابن عباس قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەر کەوڵێکی مردارەوە بوو ئەگەر خۆشەکرا ئەوە پاك دەبێتەوە).

٤١٢٤ - (ضعيف) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ أَنْ يُسْتَمْتَعَ بِجُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ.

واتە: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی داوە کەڵك وەربگیرێت لە کەوڵی مردارەوە بوو ئەگەر خۆشەکرا).

٤١٢٥ - (صحيح) عن سلمة بن المحبق: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ أَتَى عَلَى بَيْتٍ فَإِذَا قِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ, فَسَأَلَ الْمَاءَ, فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّهَا مَيْتَةٌ, فَقَالَ (دِبَاغُهَا طُهُورُهَا).

واتە: لە سەلەمەی کوڕی موحەببەقەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای تەبوك دا جەوەنەیەکی هەڵواسراوی بینی، داوای ئاوی کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەو جەوەنەیە لە کەوڵی مردارەوە بووە، فەرمووی: (خۆشەکردنی پاك بوونەوەیەتی واتە بە خۆشەکردن پاك دەبێتەوە).

٤١٢٦ - (صحيح) عن عبد الله بن مالك بن حذافة, حدثه عن أمه العالية بنت سبيع أنها قالت: كَانَ لِي غَنَمٌ بِأُحُدٍ, فَوَقَعَ فِيهَا الْمَوْتُ, فَدَخَلْتُ عَلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهَا, فَقَالَتْ لِي مَيْمُونَةُ: لَوْ أَخَذْتِ جُلُودَهَا فَانْتَفَعْتِ بِهَا, فَقَالَتْ: أَوَيَحِلُّ ذَلِكَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. مَرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِجَالٌ مِنْ قُرَيْشٍ يَجُرُّونَ شَاةً لَهُمْ مِثْلَ الْحِمَارِ, فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا). قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يُطَهِّرُهَا الْمَاءُ وَالْقَرَظُ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مالیکی کوڕی (حذافة) لە دایکیەوە عالیەی

کچی سوبەیع دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: لە چیای ئوحود هەندێ مەڕم هەبوو قڕیان تێ کەوت، چوم بۆ لای مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، باسەکەم بۆ گێڕایەوە، مەیمونە وتی: کەوڵەکانیانت بهێنایەتەوە کەڵکت لێ وەربگرتایە، عالیە وتی: ئایا ئەوە دروستە؟ مەیمونە وتی: بەڵێ دروستە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای کۆمەڵێ لە پیاوانی قورەیش دا مەڕێکی مردارەوەبوویان وەك گوێ درێژ رادەکێشا، پێی فەرموون: (کەڵکتان وەربگرتایە لە کەوڵەکەی). وتیان: ئەوە مردار بۆتەوە، فەرمووی: (بە ئاو و (قَرَظ) پاکی بکەنەوە واتە خۆشەی بکەن). (قَرَظ) درەختێکە کەوڵی مردارەوە بووی پێ خۆش دەکرا.

## ئەوانەی دەگێڕنەوە کە کەڵك وەرناگیرێت لە کەوڵی مردارەوە بوو.

## ٤٢ - باب مَنْ رَوَى أَنْ لاَ يُنْتَفَعَ بِإِهَابِ الْمَيْتَةِ.

٤١٢٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عكيم قال: قُرِئَ عَلَيْنَا كِتَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَرْضِ جُهَيْنَةَ وَأَنَا غُلاَمٌ شَابٌّ: (أَنْ لاَ تَسْتَمْتِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلاَ عَصَبٍ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عوکەیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و غوڵامێکی گەنج لە خاکی جوهەینە بووین نامەی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم بۆ خوێندینەوە: (کە کەڵك وەرنەگرین لە کەوڵی مردارەوە بوو هەروەها لە رەگیشی).

٤١٢٨ - (صحيح) عن الحكم ابن عتيبة: أَنَّهُ انْطَلَقَ هُوَ وَنَاسٌ مَعَهُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ - رَجُلٍ مِنْ جُهَيْنَةَ - قَالَ الْحَكَمُ: فَدَخَلُوا وَقَعَدْتُ عَلَى الْبَابِ, فَخَرَجُوا

إِلَيَّ فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُكَيْمٍ أَخْبَرَهُمْ, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ إِلَى جُهَيْنَةَ قَبْلَ مَوْتِهِ بِشَهْرٍ: أَنْ لاَ يَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلاَ عَصَبٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: فَإِذَا دُبِغَ لاَ يُقَالُ لَهُ إِهَابٌ, إِنَّمَا يُسَمَّى شَنًّا وَقِرْبَةً, قَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: يُسَمَّى إِهَابًا مَا لَمْ يُدْبَغْ.

واتە: لە حەکەمی کوڕی عوتەیبەوە دەگێڕنەوە، کە خۆی و چەند کەسێ ڕۆشتون بۆ لای (عبد الله)ی کوڕی عوکەیم — کە پیاوێ بوو لە هۆزی جوهەینە - حەکەم وتی: ئەوان چونە ژوورەوە بۆ لای (عبد الله) منیش لەبەر دەرگا دانیشتم، هاتنەدەرەوە بۆ لام پێیان ڕاگەیاندم کە (عبد الله)ی کوڕی عوکەیم پێی ڕاگەیاندون: کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مانگێ پێش لە وەفات کردنی نامەی نوسیوە بۆ جوهەینە: کە کەڵك وەرنەگرن لەکەوڵی مردارەوە بوو هەروەها لە ڕەگیشی. ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر خۆشەکرا پێی ناوترێت کەوڵ، بەڵکو پێی دەوترێت مەشکە کوندە جەوەنە، (نضر)ی کوڕی شومەیل وتی: پێی دەوترێت کەوڵ ئەگەر خۆشە نەکرا بێت.

## سەبارەت بە کەوڵی پڵنگ و ئاژەڵە دڕندەکان.

## ٤٣ - باب فِي جُلُودِ النُّمُورِ وَالسِّبَاعِ.

٤١٢٩ - (صحيح) عن معاوية قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَرْكَبُوا الْخَزَّ, وَلاَ النِّمَارَ). قَالَ: وَكَانَ مُعَاوِيَةُ لاَ يُتَّهَمُ فِي الْحَدِيثِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە موعاویەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سواری وڵاخێ مە بن کۆپان و سەرزینەکەی لە ئاوریشم و کەوڵی پڵنگ بێت).

٤١٣٠ - (حسن) عن أبي هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جِلْدُ نَمِرٍ).

واته: له ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیکە هاوڕێیەتی کاروانیە ناکات کۆیان و سەرزینی وڵاخەکانیان لە کەوڵی پڵنگ بێت).

٤١٣١ - (صحيح) عن خالد قال: وَفَدَ الْمِقْدَامُ بْنُ مَعْدِيكَرِبَ وَعَمْرُو بْنُ الأَسْوَدِ وَرَجُلٌ مِنْ بَنِى أَسَدٍ مِنْ أَهْلِ قِنَّسْرِينَ إِلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ, فَقَالَ مُعَاوِيَةُ لِلْمِقْدَامِ: أَعَلِمْتَ أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ تُوُفِّيَ؟ فَرَجَّعَ الْمِقْدَامُ, فَقَالَ لَهُ فلان: أتعدها مُصِيبَةً؟ قَالَ لَهُ: وَلِمَ لاَ أَرَاهَا مُصِيبَةً وَقَدْ وَضَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حِجْرِهِ فَقَالَ: (هَذَا مِنِّى وَحُسَيْنٌ مِنْ عَلِيٍّ؟!). فَقَالَ الأَسَدِيُّ: جَمْرَةٌ أَطْفَأَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ: فَقَالَ الْمِقْدَامُ: أَمَّا أَنَا فَلاَ أَبْرَحُ الْيَوْمَ حَتَّى أُغِيظَكَ وَأُسْمِعَكَ مَا تَكْرَهُ. ثُمَّ قَالَ: يَا مُعَاوِيَةُ إِنْ أَنَا صَدَقْتُ فَصَدِّقْنِى, وَإِنْ أَنَا كَذَبْتُ فَكَذِّبْنِى, قَالَ: أَفْعَلُ. قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لُبْسِ جُلُودِ السِّبَاعِ وَالرُّكُوبِ عَلَيْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ فَوَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ هَذَا كُلَّهُ فِي بَيْتِكَ يَا مُعَاوِيَةُ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: قَدْ عَلِمْتُ أَنِّي لَنْ أَنْجُوَ مِنْكَ يَا مِقْدَامُ, قَالَ خَالِدٌ: فَأَمَرَ لَهُ مُعَاوِيَةُ بِمَا لَمْ يَأْمُرْ لِصَاحِبَيْهِ, وَفَرَضَ لابْنِهِ فِي الْمِائَتَيْنِ فَفَرَّقَهَا الْمِقْدَامُ فِي أَصْحَابِهِ, قَالَ: وَلَمْ يُعْطِ الأَسَدِيُّ أَحَدًا شَيْئًا مِمَّا أَخَذَ, فَبَلَغَ ذَلِكَ مُعَاوِيَةَ فَقَالَ: أَمَّا الْمِقْدَامُ فَرَجُلٌ كَرِيمٌ بَسَطَ يَدَهُ, وَأَمَّا الأَسَدِيُّ فَرَجُلٌ حَسَنُ الإِمْسَاكِ لِشَيْئِهِ.

واتە: لە خالیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب و عەمری کوڕی ئەسوەد و پیاوێ لە بەنی ئەسەد کە خەڵکی قینەسرین بوو شوێنێکە لە نزیك حەڵەب بە نوێنەری چون بۆ خزمەت موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، موعاویە وتی بە میقدام: زانیومە کە حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ وەفاتی کردوە، میقدام وتی: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). فلانە کەس یەکێ لە ئامادەبوان پێی وت: بۆ تۆ ئەوە بە ناخۆشی و کارەسات دەزانی، وتی: ئەی بۆ نا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە باوەشی خۆیدا دایناو فەرمووی: (ئەمە لە منە واتە حەسەن لەمن دەکات و حوسەینیش لە عەلی!). کابرای ئەسەدی وتی: حەسەن پشکۆیە بوو خوای گەورە کوژاندیەوە، میقدام وتی: بەڵکو من قسەیەکی پوچ و بەتاڵ ناکەم کە ببێتە هۆی توڕەبونی خوای گەورە وەك ئەو پیاوە ئەسەدیە کردی بۆ ماڵی دونیاو ڕەزامەندی موعاویە بەڵکو قسەی هەق و ڕاست دەکەم، لەپاشدا وتی: ئەی موعاویە! چەند قسەیە دەکەم ئەگەر ڕاستم کرد بە ڕاستم بخەرەوە، خۆ ئەگەر درۆشم کرد بە درۆم بخەرەوە، موعاویە وتی: ئادەی بڵێ، میقدام وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) ئایا نەتبیستوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە زێڕی حەرام کردوە بۆ پیاوان لەدەستی بکەن و بیکەن بە خۆیاندا، وتی: بەڵێ وایە، وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) ئایا ئەزانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کە پیاوان جلی ئاوریشم لەبەربکەن؟ وتی: بەڵێ ئەزانم، وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) ئایا ئەزانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کە پیاوان کەوڵی دڕندە لەبەربکەن و سواری وڵاخێ ببن کە کۆپانەکەی و سەرزینەکەی لە کەوڵی دڕندە بێ؟ وتی: بەڵێ ئەزانم، وتی: دەی سوێند بە (الله) ئەی موعاویە! ئەمانە هەموویانم لە ماڵی تۆدا دیوە، موعاویە وتی: بەڕاستی هەر خۆم زانیم لەدەستی تۆ ڕزگارم نابێت ئەی میقدام، خالید وتی: موعاویە فەرمانی دا بە بەخشین پێی، بەڵام فەرمانی نەدا بەدوانەکەی تر ببەخشن کە نوێنەر بوون لەگەڵی، ناوی کوڕەکەشی تۆمار کرد لە دیوان لەڕیزی ئەو کەسانەی کە زیاد لە دوو سەد درهەمیان هەبوو، میقدام دابەشی کرد بەسەر هاوڕێکانیدا ئەوانەی کە لەوێ ئامادەبون، هیچ کەس لەوانە لەوەی وەریان گرت هیچی نەدا بە کابرای ئەسەدی - ئەوەی کە وتی: حەسەن پشکۆیە

بوو خوای گەورە کوژاندیەوە - . هەواڵەکە گەیشتەوە بە موعاویە وتی: میقدام پیاوێکی بەڕێز و بەخشندەیە دەست کراوەیە، پیاوە ئەسەدیەکەش پیاوێکی چاکە دەست پێوەگرە هەموو ماڵەکەی نابەخشێ وەك چۆن میقدام بەخشی.

٤١٣٢ - (صحيح) عن أبي المليح بن أسامة, عن أبيه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ.

واتە: لە ئەبو مەلیحی کوڕی ئوسامەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کە کەوڵی دڕندە کەڵکی لێ وەربگیرێت.

## سەبارەت بە پێڵاو لەپێ کردن.

## ٤٤ - باب فِي الاِنْتِعَالِ.

٤١٣٣ - (صحيح) عن جابر قال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ, فَقَالَ: (أَكْثِرُوا مِنَ النِّعَالِ, فَإِنَّ الرَّجُلَ لاَ يَزَالُ رَاكِبًا مَا انْتَعَلَ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا بوین صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پێڵاو زۆرکەن، چونکە ئەگەر پیاو پێڵاوی لەپێ دابێ وەك ئەوە وایە بەسواری رێ بکات).

٤١٣٤ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ نَعْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لَهَا قِبَالاَنِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە نەعلەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو زوێڵ قایشیان پێوە بوو. پارچەیەکیان سەرێکی بەند کرابوو بە سەربەنی

نەعلەکەوەو سۆڵەکەوەو ئەو سەرەکەی تری بە لوتی نەعلەکەوە دەکەوتە نێوان پەنجە کەڵەو پەنجەکەی تەنیشتیەوە، پارچەکەی تریشیان هەروەها بوو، بەڵام دەکەوتە نێوان پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی براتوتەوە.

٤١٣٥ - (صحيح) عن جابر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائِمًا.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی پیاو بە پێوە پێڵاو لەپێ بکات - لەبەرئەوە بە دانیشتنەوە ئاسانتر لەپێ دەکرێن - .

٤١٣٦ - (صحيح) عن أبي هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي النَّعْلِ الْوَاحِدَةِ, لِيَنْتَعِلْهُمَا جَمِيعًا, أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لە ئێوە بە تاکە پێڵاوێکەوە رێ نەکات، یان هەردوو تاکەکەی لەپێ بکات، یان هەردووکیان داکەنێ و بەپێی پەتی رێ بکات).

٤١٣٧ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَمْشِ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ حَتَّى يُصْلِحَ شِسْعَهُ, وَلاَ يَمْشِ فِي خُفٍّ وَاحِدٍ, وَلاَ يَأْكُلْ بِشِمَالِهِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر جێگەی نێوان پەنجەی تاکێ لە نەعلەکانتان یان چەرمی سەرپەنجەی تاکێ لە پێڵاوەکانتان پچڕا بە تاکەکەی ترەوە رێ مەکەن هەتا تاکەکەی تر چاك دەکەنەوە، وە با کاڵەیەکەوە رێ نەکات و، بەدەستتی چەپیشی نەخوات).

٤١٣٨ - (ضعيف الأسناد) عن ابن عباس قال: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ أَنْ يَخْلَعَ نَعْلَيْهِ فَيَضَعَهُمَا بِجَنْبِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وەها سوننەتە پیاو ئەگەر دانیشت پێڵاوەکانی داکەنێ و لەتەنیشتیەوە دایان بنێ.

٤١٣٩ - (صحيح) عن أبي هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ, وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ, لِتَكُنِ الْيَمِينُ أَوَّلَهُمَا يَنْتَعِلُ, وَآخِرَهُمَا يَنْزِعُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە ویستی پێڵاوەکانی لەپێ بکات با لەلای ڕاستیەوە دەست پێ بکات واتە یەکەم جار تاکی ڕاستی پێڵاوەکە لەپێ بکات، لەکاتی داکەندنیشدا با لەلای چەپیەوە دەست پێ بکات واتە یەکەم جار تاکی پێی چەپی لەپێ داکەنێت، وە با پێی ڕاستی یەکەم بێ لەکاتی لەپێ کردندا، دواهەم بێ لەکاتی داکەندندا).

٤١٤٠ - (صحيح) عن عائشة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ: فِي طُهُورِهِ, وَتَرَجُّلِهِ, وَنَعْلِهِ. قَالَ مُسْلِمٌ: وَسِوَاكِهِ, وَلَمْ يَذْكُرْ: فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ عَنْ شُعْبَةَ مُعَاذٌ وَلَمْ يَذْكُرْ: سِوَاكَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەموو هەڵسوکەوت و کاروباێکی خۆیدا بەپێی توانا حەزی دەکرد لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکات وەك: دەستنوێژ گرتن، شانەکردنی مووی سەر و ڕیشی، پێڵاو لەپێ کردن، موسلیم وتی: سیواك کردنیش، بەڵام باسی (فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ) نەکرد، ئەبو داود دەڵێت: شوعبە لە (معاذ)ەوە گێڕایەوە بەڵام باسی (سِوَاكِهِ) نەکرد.

٤١٤١- (صحيح) عن أبي هريرة قال, قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِأَيَامِنِكُمْ).

واتە: لە هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ کە پۆشاکتان پۆشی وە هەرکاتێ دەستنوێژتان گرت، لەلای ڕاستانەوە دەست پێ بکەن).

## سەبارەت بە فەرش و جێگەوبان.

## ٤٥ - باب فِي الْفُرُشِ.

٤١٤٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْفُرُشَ فَقَالَ (فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ, وَفِرَاشٌ لِلْمَرْأَةِ, وَفِرَاشٌ لِلضَّيْفِ, وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی نوێن و پێخەفی کرد فەرمووی: (نوێنی یەکەم بۆ پیاو خۆی، نوێنی دووەم بۆ ژنەکەی، نوێنی سێیەم بۆ میوان، نوێنی چوارەم بۆ شەیتان).

٤١٤٣ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِهِ فَرَأَيْتُهُ مُتَّكِئًا عَلَى وِسَادَةٍ, زَادَ ابْنُ الْجَرَّاحِ: عَلَى يَسَارِهِ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵەکەی خۆیدا بوو چوومە خزمەتی بینیم پاڵی داوەتەوە بە پشتیەکەوە.ئیبنو جەڕاح ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەسەر لای چەپی شانی دادا بوو.

٤١٤٤ - (صحيح الإسناد) عن ابن عمر: أَنَّهُ رَأَى رُفْقَةً مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ رِحَالُهُمُ الأَدَمُ, فَقَالَ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى أَشْبَهِ رُفْقَةٍ كَانُوا بِأَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَؤُلاَءِ.

واته: له ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، کە چاوی کەوت بە کاروانیەکی خەڵکی یەمەن کۆپانی ولاخەکانین چەرم بوو، وتی: هەرکەسیٚ حەز دەکات تەماشای کاروانیە بکات لە کاروانی هاوەڵانی پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بچیٚت، با سەیری ئەوانە بکات و ئەوانە بکاتە سەرمەشق و پیٚشەنگ بۆ خۆی.

٤١٤٥ - (صحيح) عن جابر قال, قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَتَّخَذْتُمْ أَنْمَاطًا؟). قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا الأَنْمَاطُ, قَالَ: (أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ لَكُمْ أَنْمَاطٌ).

واته: له جابرەوە ئیبنو دەگیٚڕنەوە، کە وتویەتی: پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیٚی فەرمووم: (مافورتان هەیە؟). وتم: مافورمان لەکویٚ بوو، فەرمووی: (لەمەولا خوای گەورە دەرووی خیٚرتان لیٚ دەکاتەوەو مافور پەیدا دەبیٚت).

٤١٤٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ وِسَادَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ ابْنُ مَنِيعٍ: الَّتِى يَنَامُ عَلَيْهَا بِاللَّيْلِ, ثُمَّ اتَّفَقَا - مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ.

واته: له عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، کە وتویەتی: پشتیەکەی پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە شەو لەسەری دەخەوت، بەرگەکەی چەرم بوو، ناواخنەکەی ریشوی دارخورما بوو.

٤١٤٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَتْ ضِجْعَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژێرەخەرەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە لەسەری رادەکشا، لە چەرم بوو ناواخنەکەی ریشوی دارخورما بوو.

٤١٤٨ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: كَانَ فِرَاشُهَا حِيَالَ مَسْجِدِ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جێگە خەوتنەکەی و پێخەفەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تەنیشت نوێژگاکەیەوە بوو لە هۆدەکەی خۆیدا.

## سەبارەت بە دانانی پەردە.

## ٤٦ - باب فِي اتِّخَاذِ السُّتُورِ.

٤١٤٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى فَاطِمَةَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهَا فَوَجَدَ عَلَى بَابِهَا سِتْرًا, فَلَمْ يَدْخُلْ, قَالَ: وَقَلَّمَا كَانَ يَدْخُلُ إِلاَّ بَدَأَ بِهَا, فَجَاءَ عَلِيٌّ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ فَرَآهَا مُهْتَمَّةً, فَقَالَ: مَا لَكِ؟ قَالَتْ: جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيَّ فَلَمْ يَدْخُلْ, فَأَتَاهُ عَلِيٌّ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَاطِمَةَ اشْتَدَّ عَلَيْهَا أَنَّكَ جِئْتَهَا فَلَمْ تَدْخُلْ عَلَيْهَا, قَالَ: (وَمَا أَنَا وَالدُّنْيَا؟ وَمَا أَنَا وَالرَّقْمَ؟!). فَذَهَبَ إِلَى فَاطِمَةَ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: قُلْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا يَأْمُرُنِي بِهِ. قَالَ: (قُلْ لَهَا فَلْتُرْسِلْ بِهِ إِلَى بَنِى فُلاَنٍ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چو بۆ لای (فاطمة)ی کچی پەردەیەکی ڕازاوەی بینی بە دەرگاکەیەوە، گەڕایەوەو نەچوە ژوورەوە، ئیبنو عومەر وتی: کە لەسەرفەر دەگەڕایەوە یەکەم جار سەری ماڵی (فاطمة)ی دەدا کەم جار لەپێش ماڵی (فاطمة)وە دەچووەوە بۆ ماڵی هاوسەرەکانی، کاتێ کە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ هاتەوە (فاطمة)ی بینی بێ تاقەت و غەمبار بوو، وتی: ئەوە چیتە بۆ غەمباری؟ وتی: باوکم هات بۆلام نەهاتەژوورەوە، پێشەوا عەلی چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! (فاطمة)ی کچت بەلایە زۆر قورس و گرانە چویت بۆ ماڵی و نەچویتەتە ژوورەوەو بۆ لای؟ فەرمووی: (من و خۆشیەکانی دونیایان نەوتوە، من و نەخش و نیگاری ڕازاوەیان نەوتوە!). پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ ڕۆشت بۆ لای (فاطمة)، فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێ ڕاگەیاند، (فاطمة) وتی: هەستە بڕۆرەوە بۆ خزمەتی پێی بڵێ: فەرمانم بەچی پێ دەکات پەردەکە چی لێ بکەم؟ پێشەوا عەلی ڕۆشتەوە بۆ خزمەتی، قسەکەی (فاطمة)ی پێ ڕاگەیاند، فەرمووی: (با بینێرێ بۆ بەنی فلان بەکاری بهێنن بۆ خۆیان و بیکەن بە جل و بەرگ).

٤١٥٠ - (صحيح) عن ابن فضيل, عن أبيه, بِهَذَا الْحَدِيثِ, قَالَ: وَكَانَ سِتْرًا مَوْشِيًّا.

واتە: لە ئیبنو (فُضَيْل)ەوە، لە باوکیەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، وتی: پەردەکە نەخش و نیگاری ڕازاوەی لەسەر بوو.

## ئەوەی دەربارەی پۆشاکێ هاتووە
## کە وێنەی خاچی لەسەر بێت

## ٤٧ - باب ما جاء فِي الصَّلِيبِ فِي الثَّوْبِ.

٤١٥١ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا فِيهِ تَصْلِيبٌ إِلاَّ قَضَبَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرچی لەناو ماڵەکەیدا خاچ و وێنەی لەسەر بوایە وازی لێ نەدەهێنا هەتا هەڵی ئەوەشاندەوەو لای ئەبرد.

## باسی سەبارەت بە وێنەکان.

## ٤٧ - باب فِي الصُّوَرِ.

٤١٥٢ - (ضعيف) عن علي رضي الله عنه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَلاَ كَلْبٌ وَلاَ جُنُبٌ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە وێنە و سەگ و لەشگرانی تێدا بێت).

٤١٥٣ - (صحيح) عن أبي طلحة الأنصاري قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ تِمْثَالٌ). وَقَالَ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ نَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ. فَانْطَلَقْنَا, فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّ أَبَا طَلْحَةَ حَدَّثَنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِكَذَا وَكَذَا, فَهَلْ سَمِعْتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ ذَلِكَ؟ قَالَتْ: لاَ, وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكُمْ بِمَا رَأَيْتُهُ فَعَلَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ, وَكُنْتُ أَتَحَيَّنُ قُفُولَهُ فَأَخَذْتُ نَمَطًا كَانَ لَنَا فَسَتَرْتُهُ عَلَى الْعَرَضِ, فَلَمَّا جَاءَ اسْتَقْبَلْتُهُ فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَعَزَّكَ وَأَكْرَمَكَ, فَنَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ فَرَأَى النَّمَطَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا, وَرَأَيْتُ الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِهِ, فَأَتَى النَّمَطَ حَتَّى هَتَكَهُ, ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَأْمُرْنَا فِيمَا رَزَقَنَا أَنْ نَكْسُوَ الْحِجَارَةَ وَاللَّبِنَ). قَالَتْ فَقَطَعْتُهُ وَجَعَلْتُهُ وِسَادَتَيْنِ وَحَشَوْتُهُمَا لِيفًا, فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ.

واتە: لە ئەبو (طلحة)ی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە سەگ و پەیکەری تێدا بێت). - زەیدی کوڕی خالید و سەعیدی کوڕی یەسار کە هەردوکیان راوی فەرموودەکەن یەکێکیان - وتی: وەرە لەگەڵمان با بڕۆین بۆ خزمەت عائیشەی دایکی باوەڕداران رەزای خوای لێ بێ، لەوبارەوە پرسیاری لێ بکەین، رۆشتین وتمان: ئەی دایکی باوەڕداران! ئەبو (طلحة) لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئاواو ئاوای بۆ گێڕاوینەتەوە، ئایا تۆ بیستوتە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی ئەمەی کردبێ؟ وتی: نەخێر، بەڵام ئەمەتان بۆ دەگێڕمەوە کە بینیم کردی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرچو بۆ یەکێ لە غەزاکانی، منیش چاوەڕێی گەڕانەوەیم دەکرد، مافورێ یان پۆشاکێکمان هەبوو هەم رادەخرا وەك ژێرەخەر هەم وەك پەردە بەکاردەهێنرا، کردم بە پەردە دام بەسەر رایەڵی خانوەکەدا، کاتێ کە گەڕایەوە لە غەزا پێشوازیم لێ کرد، وتم: سڵاوی خوات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەگەڵ رەحمەت و میهر و بەرەکاتی خوایی دا، سوپاس و ستایش بۆ ئەو

خوایەی کە سەرکەوتوی کردی و ڕێزی لێ نای. سەیری ناوماڵەکەی کرد بینی پەردەکە وێنەی پێوەیە، وەڵامی سڵاوەکەی دامەوەو بێدەنگ بوو هیچی نەوت، بەڵام پێ ناخۆش بوونم بە نێوچاوانیەوە دی، پەردەکەی هێنا وێنەکانی بڕی و هەڵیوەشاندنەوە، لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردوین لەو رۆزیەی کە پێی داوین جل و بەرگ بکەین بۆ بەرد و خشت). - واتە: بۆ دیوار، بێگومان دیواری کەعبە تایبەتمەندی خۆی هەیە - . عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: منیش بڕیم وکردم بە دوو پشتی، ریشوی دارخورمام کردە ناوەخنەکەی، ئەویش نکولی ئەو کارەی لێ نەکردم.

٤١٥٤ - (صحيح الإسناد) عن سهل, فذكر مثله, قال: فقلت: يَا أُمَّهْ, إِنَّ هَذَا حَدَّثَنِي أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ. وَقَالَ فِيهِ: سَعِيدُ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِي النَّجَّارِ.

واتە: لە سەهلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، وتی: وتم: ئەی دایە، ئەمە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی. لە فەرموودەکەیدا وتی: سەعیدی کوڕی یەسار بەندەی ئازادکراوی بەنی نەجار بوو.

٤١٥٥ - (صحيح) عن أبي طلحة قال: إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ). قَالَ بُسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ, فَعُدْنَاهُ, فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ, فَقُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ الْخَوْلاَنِيِّ رَبِيبِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّوَرِ يَوْمَ الأَوَّلِ؟ فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ حِينَ قَالَ: إِلاَّ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ.

واتە: لە ئەبو (طلحة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت). بوسر

وتی: لەپاشدا زەید نەخۆش بوو سەردانمان کرد، پەردەیە بە دەرگاکەیانەوە بوو وێنەی پێوە بوو، وتم بە (عبيد الله)ی خەولانی بەخێوکراوی مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: ئەی یەکەم ڕۆژ زەید خۆی باسی خراپی وێنەی پێ ڕانەگەیاندین؟ (عبيد الله) وتی: ئایا گوێت لێی نەبوو وتی: مەگەر نەخشێ کە بە جل و بەرگەوە بێ.

٤١٥٦ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ زَمَنَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِالْبَطْحَاءِ أَنْ يَأْتِيَ الْكَعْبَةَ فَيَمْحُوَ كُلَّ صُورَةٍ فِيهَا, فَلَمْ يَدْخُلْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى مُحِيَتْ كُلُّ صُورَةٍ فِيهَا.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەردەمی ڕزگارکردنی مەککەدا فەرمانی دا بە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ کە لە (بَطْحَاء) بوو بچێ بۆ کەعبە هەرچی وێنەی تێدایە لایبات و پاکی بکاتەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەچوە ژوورەوە هەتا هەرچی وێنەی تێدا بوو لابراو پاك کرایەوە.

٤١٥٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: حدثتني ميمونة زوج النبي صلى الله عليه وسلم, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ كَانَ وَعَدَنِي أَنْ يَلْقَانِيَ اللَّيْلَةَ فَلَمْ يَلْقَنِي). ثُمَّ وَقَعَ فِي نَفْسِهِ, جَرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ بِسَاطٍ لَنَا, فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ, ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ بِهِ مَكَانَهُ, فَلَمَّا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ, قَالَ: (إِنَّا لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ), فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ, حَتَّى إِنَّهُ لَيَأْمُرُ بِقَتْلِ كَلْبِ الْحَائِطِ الصَّغِيرِ, وَيَتْرُكُ كَلْبَ الْحَائِطِ الْكَبِيرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی:

مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جیبریل سڵاوی خوای لەسەر بێ بەڵێنی پێ داوم ئەم شەو بێت بۆ سەردانم کەچی نەهات). لەپاشدا شتێ کەوتە دڵیەوە کە لە ماڵیاندا توتەڵە سەگ هەیە بۆیە جیبریل نەهاتوە بۆ سەردانی، توتەڵە سەگەکە لەژێر دەوارێکی خۆمانا بوو، فەرمانی دا فڕێیان دایە دەرەوە، ئینجا بەدەستی خۆی ئاوی پژان لە جێگەکەی، کاتێ کە جیبریل سەردانی کرد فەرمووی: (ئێمەی مەلائیکە ناچینە ناو ماڵێکەوە سەگ و وێنەی تێدا بێت).کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رۆژی لێ بوویەوە فەرمانی دا بە کوشتنی سەگەکان، تەنانەت فەرمانی دا سەگی باخی بچوکیش بکوژرێت. بەڵام وازی هێنا لە سەگی باخی گەورە - واتە لە سەگێ پاسی باخی گەورە بکات -.

٤١٥٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ فَقَالَ لِي أَتَيْتُكَ الْبَارِحَةَ فَلَمْ يَمْنَعْنِى أَنْ أَكُونَ دَخَلْتُ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ عَلَى الْبَابِ تَمَاثِيلُ, وَكَانَ فِي الْبَيْتِ قِرَامُ سِتْرٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ, وَكَانَ فِي الْبَيْتِ كَلْبٌ, فَمُرْ بِرَأْسِ التِّمْثَالِ الَّذِى فِي الْبَيْتِ يُقْطَعُ فَيَصِيرُ كَهَيْئَةِ الشَّجَرَةِ, وَمُرْ بِالسِّتْرِ فَلْيُقْطَعْ فَلْيُجْعَلْ مِنْهُ وِسَادَتَيْنِ مَنْبُوذَتَيْنِ تُوطَآنِ, وَمُرْ بِالْكَلْبِ فَلْيُخْرَجْ). فَفَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِذَا الْكَلْبُ لِحَسَنٍ أَوْ حُسَيْنٍ, كَانَ تَحْتَ نَضَدٍ لَهُمْ فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَالنَّضَدُ شَيْءٌ تُوضَعُ عَلَيْهِ الثِّيَابُ شِبْهُ السَّرِيرِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جیبریل هات بۆ لام پێی فەرمووم: دوێنێ هاتم بۆ سەردانت واتە شەوی رابردوو، هیچ شتێ رێگری ئەوەی لێ نەکردم کە بێمە ژوورەوە بۆ ئەو ماڵەی کە تۆی لێ بوو ئەوە نەبێ کە پەیکەرێ لەبەر دەرگاکە بوو، لەناو ماڵەکەدا پەردەیە هەبوو وێنەی لەسەر بوو. هەروەها ماڵەکە سەگێکی تێدا بوو، بۆیە فەرمان بکە با سەری پەیکەرەکە ببڕدرێت تا وەك درەختی لێ بێت، وە فەرمان بکە پەردەکە بدڕێنرێت و بکرێتە دوو راخەر پێی بخرێتە سەر

هاتوچۆ بکرێت بەسەریدا، فەرمانیش بکە سەگەکە دەربکرێت). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو ئەو کارانەی ئەنجام دا سەگەکە هی حەسەن و حوسەین بوو لەژێر تەرواڵەکەدا بوو فەرمانی دا کرایەدەرەوە. ئەبو داود دەڵێت: (نضد) تەرواڵە جل و بەرگی لەسەر هەڵئەچنن وەك قەرمەوێڵە وەهایە.

کۆتایی پەرتوکی جل و بەرگ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوكی قژداهێنان.

## ٣٤ - أول كتاب الترجل

٤١٥٩- (صحيح) عن عبد الله بن مغفل قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلاَّ غِبًّا.

واته: له (عبد الله)ی كوڕی موغەففەلەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە سەر شانەكردن مەگەر ڕۆژێ نارۆژێ هەتا بۆ پاك و خاوێنی بێ بۆ شەوق و زەوق نەبێ.

٤١٦٠- (صحيح) عن عبد الله بن بريدة: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ وَهُوَ بِمِصْرَ, فَقَدِمَ عَلَيْهِ, فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ آتِكَ زَائِرًا, وَلَكِنِّي سَمِعْتُ أَنَا وَأَنْتَ حَدِيثًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَكَ مِنْهُ عِلْمٌ, قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا, قَالَ: فَمَا لِي أَرَاكَ شَعِثًا وَأَنْتَ أَمِيرُ الأَرْضِ, قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْهَانَا عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الإِرْفَاهِ, قَالَ: فَمَا لِي لاَ أَرَى عَلَيْكَ حِذَاءً, قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا أَنْ نَحْتَفِيَ أَحْيَانًا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە هاتووە، کە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆشت بۆ لای (فَضَالَة)ی کوڕی عوبەید کە لە میصر بوو، گەیشت بە (فَضَالَة)، وتی: من بۆ سەردانت نەهاتووم، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم من و تۆ فەرموودەیەکمان بیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئومێد دەکەم زانیاریت لەبارەیەوە هەبێت، وتی: کام فەرموودە؟ وتی: ئەمەو ئەمە، وتی: ئەوە بۆ دەبینم قژت تێك چوە لەکاتێکدا کە تۆ کاربەدەستی زەویت، (فَضَالَة)، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆچون لە خۆشگوزەرانی لێ قەدەغەکردوین واتە زۆر گرنگی دانی بە خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگی لێ قەدەغەکردوین، وتی: ئەی بۆچی پێت پەتی یە؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردوین جار جارێ بە پێی پەتی رێ بکەین.

٤١٦١ - (صحيح) عن أبو امامة قال: ذَكَرَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا عِنْدَهُ الدُّنْيَا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ تَسْمَعُونَ أَلاَ تَسْمَعُونَ إِنَّ الْبَذَاذَةَ مِنَ الإِيمَانِ, إِنَّ الْبَذَاذَةَ مِنَ الإِيمَانِ). يَعْنِى التَّقَحُّلَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هُوَ أَبُو أُمَامَةَ بْنُ ثَعْلَبَةَ الأَنْصَارِىُّ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: رۆژێ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خزمەتی دا باسی دونیایان کرد، ئەویش فەرمووی: (گوێتان لێ بێ، گوێتان لێ بێ بێگومان خاکێتی لە باوەڕەوەیە، بێگومان خاکێتی لە باوەڕەوەیە). واتە: پۆشینی جل و بەرگی هەژارانە.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## باشی بەکارهێنانی بۆنی خۆش.

## ٢ - باب مَا جَاءَ فِي اسْتِحْبَابِ الطِّيبِ.

٤١٦٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەفرێکی هەبوو بۆنی خۆشی تێدا بوو لەو بۆنەی لەخۆی دەدا.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی چاکسازی موو.

## ٣ - باب فِي إِصْلَاحِ الشَّعْرِ.

٤١٦٣ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ كَانَ لَهُ شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك مووی هەیە با ڕێزی بگرێت).

# سەبارەت بە بۆیەکردنی قژ لەلایەن ئافرەتانەوە.

## ٤ - باب فِي الْخِضَابِ لِلنِّسَاءِ.

٤١٦٤ - (ضعيف) عن كريمة بنت همام: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَسَأَلَتْهَا عَنْ خِضَابِ الْحِنَّاءِ, فَقَالَتْ: لاَ بَأْسَ بِهِ, وَلَكِنِّى أَكْرَهُهُ, كَانَ حَبِيبِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْرَهُ رِيحَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: تَعْنِى خِضَابَ شَعْرِ الرَّأْسِ.

واتە: لە (کریمة)ی کچی هەممامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێ هاتە خزمەت عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەربارەی بۆیەکردن بە خەنە یان خەنە گرتنە سەر و دەست و پێ پرسیاری لێ کرد، وتی: قەیدی نیە، بەڵام من خۆشیم لێی نایە، خۆشەویستم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆشی لە بۆنەکەی نەدەهات. ئەبو داود دەڵێت: واتە بۆیەکردنی مووی سەر.

٤١٦٥ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها, أن هند بنت عتبة قالت: يَا نَبِىَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بَايِعْنِى, قَالَ: (لاَ أُبَايِعُكِ حَتَّى تُغَيِّرِى كَفَّيْكِ كَأَنَّهُمَا كَفَّا سَبُعٍ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە هیندی کچی عوتبە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەڵێن و پەیمانم لێ وەربگرە لەسەر ئیسلام، فەرمووی: (بەڵێن و پەیمانت لێ وەرناگرم هەتا ڕەنگی دەستەکانت دەگۆڕی ئەڵێی دەستی دڕندەن واتە هەتا دەستەکانت دەگریتە خەنە).

٤١٦٦ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها, قالت: أَوْمَتِ امْرَأَةٌ مِنْ وَرَاءِ سِتْرٍ بِيَدِهَا كِتَابٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَبَضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ, فَقَالَ: (مَا أَدْرِي أَيَدُ رَجُلٍ أَمْ يَدُ امْرَأَةٍ؟). قَالَتْ: بَلِ امْرَأَةٌ. قَالَ: (لَوْ كُنْتِ امْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفَارَكِ). يَعْنِي: بِالْحِنَّاءِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێ لەودیوی پەردەوە نامەیەکی پێ بوو بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی درێژ کرد بیداتە دەستی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی گرت، فەرمووی: (نازانم ئەمە دەستی پیاوە یان دەستی ئافرەتە؟). وتی: بەڵکو دەستی ئافرەتە، فەرمووی: (ئەگەر تۆ دروشمی ئافرەتانت ڕەچاو بکردایە دەستت دەگرتە خەنە).

## سەبارەت بە قژ دانە دەم قژ.

## ٥ - باب فِي صِلَةِ الشَّعْرِ.

٤١٦٧ - (صحيح) عن حميد بن عبد الرحمن: أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ عَامَ حَجَّ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ, وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعْرٍ كَانَتْ فِي يَدِ حَرَسِيٍّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ وَيَقُولُ: (إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ).

واتە: لە حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە دەگێڕنەوە، گوێی لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو لەسەر مینبەری مەدینە لەساڵی حەج دا پارچەیە مووی لە دەستی پاسەوانەکەی وەرگت دەیوت: ئەی خەڵکی مەدینە زاناکانتان لە کوێن؟ من بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە ڕێگەی شتی وەهای نەداوەو دەیفەرموو: (نەوەی ئیسرائیل لەکاتێکدا سەریان تێدا چوو

کە ژنەکانیان ئەم کارانەیان ئەنجام دەداو قژیان دەدایە دەم قژیان).

٤١٦٨ - (صحيح) عن عبدالله قال: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ, وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەعلەتی کردوە لەو ژنەی قژ دەداتە دەم قژی کەسێکی تر، وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەش کە قژ دەداتە دەم قژی خۆی، هەروەها نەعلەتی کردوە لەو ژنەی کە خاڵ دەکوتێ بۆ کەسێکی تر، وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەش کە خاڵی بۆ دەکوتن.

٤١٦٩ - (صحيح) عن عبدالله قال: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَالْوَاصِلاَتِ, وَقَالَ عُثْمَانُ: وَالْمُتَنَمِّصَاتِ, ثُمَّ اتَّفَقَا - وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ, الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ!, قال: فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِى أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ. زَادَ عُثْمَانُ: كَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ ثُمَّ اتَّفَقَا - , فَأَتَتْهُ فَقَالَتْ: بَلَغَنِى عَنْكَ أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ - قَالَ مُحَمَّدٌ: وَالْوَاصِلاَتِ, وَقَالَ عُثْمَانُ: وَالْمُتَنَمِّصَاتِ ثُمَّ اتَّفَقَا - وَالْمُتَفَلِّجَاتِ - قَالَ عُثْمَانُ: لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ تَعَالَى. فَقَالَ: وَمَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى؟ قَالَتْ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ! فَقَالَ: وَاللَّهِ لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ, ثُمَّ قَرَأَ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا). قَالَتْ: إِنِّي أَرَى بَعْضَ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ, قَالَ: فَادْخُلِي فَانْظُرِي, فَدَخَلَتْ, ثُمَّ خَرَجَتْ, فَقَالَ: مَا رَأَيْتِ, وَقَالَ عُثْمَانُ: فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ. فَقَالَ: لَوْ كَانَ ذَلِكَ مَا كَانَتْ مَعَنَا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خوای گەورە نەعلەتی کردوە لەو ژنەی کە خاڵ دەکوتێ بۆ کەسێکی تر، وە نەعلەتی کردوە

لەو ژنەش کە خاڵی بۆ دەکوتن. - موحەممەد وتی: وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەی قژ دەداتە دەم قژ، (عثمان) وتی: لە دەم و چاو هەڵگر، لەپاشدا هەردوو راوی موحەممەد و (عثمان) رێکن - وتیان: وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەش کە ددانەکانی خۆی تەنك و شاش دەکات بۆ جوانی و بۆشایی دەخاتە نێوانی ددانەکانیەوە، دروستکراوانی خوای گەورە دەگۆڕن، ئەم هەواڵە گەیشت بە ئافرەتێکی بەنی ئەسەد کە ناوی ئوممو یەعقوب بوو، - (عثمان) ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئافرەتێکی قورئان خوێن بوو، لەپاشدا هەردوو راوی رێکن - وتیان: ژنە بەنی ئەسەدیەکە هات بۆ لای (عبد الله) وتی: پێم گەیشتوە کە نەعلەتت کردوە لەوانەی کە باسکران. (عبد الله) وتی: کەسێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەعلەتی لێ بکات من چۆن نەعلەتی لێ ناکەم، لە قورئانەکەی خوای گەورەدایە؟ وتی: قورئانم خوێندۆتەوەو ئەوەم تێدا نەدیوە، وتی: سوێند بە (الله) ئەگەر بەهۆش و بیرەوە بتخوێندایەتەوە دەتدی، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴾.

واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەتانداتێ وەری بگرن، ئەوەشی کە رێگری لێ کردوون مەیکەن و وازی لێ بهێنن.

ژنەکە وتی: من هەندێ لەم شتانە بە ژنەکەتەوە دەبینم،وتی: دە برۆ تەماشای بکە، ئەویش چوەژوورەوە بۆ لای سەیری کرد هیچی نەدی، لەپاشدا هاتەدەرەوە وتی: هیچم نەدی، (عبد الله) وتی: ئەگەر شتی وەهای بکردایە لەگەڵ من نەدەبوو.

٤١٧٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: لُعِنَتِ الْوَاصِلَةُ وَالْمُسْتَوْصِلَةُ, وَالنَّامِصَةُ وَالْمُتَنَمِّصَةُ, وَالْوَاشِمَةُ وَالْمُسْتَوْشِمَةُ, مِنْ غَيْرِ دَاءٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَتَفْسِيرُ الْوَاصِلَةِ: الَّتِي تَصِلُ الشَّعْرَ بِشَعْرِ النِّسَاءِ, وَالْمُسْتَوْصِلَةُ: الْمَعْمُولُ بِهَا, وَالنَّامِصَةُ: الَّتِي تَنْقُشُ الْحَاجِبَ حَتَّى تَرِقَّهُ, وَالْمُتَنَمِّصَةُ: الْمَعْمُولُ بِهَا, وَالْوَاشِمَةُ: الَّتِي تَجْعَلُ الْخِيلاَنَ فِي وَجْهِهَا بِكُحْلٍ أَوْ مِدَادٍ, وَالْمُسْتَوْشِمَةُ: الْمَعْمُولُ بِهَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نەعلەت کراوە لەو ژنەی قژ دەداتە دەم قژی کەسێکی تر، وە لەو ژنەش کە قژ دەداتە دەم قژی خۆی، وە لەو ژنەی کە دەم و چاوی کەسێکی تر هەڵدەگرێ، وە لەو ژنەش کە دەم و چاوی خۆی هەڵدەگرێ، هەروەها لەو ژنەی کە خاڵ دەکوتێ بۆ کەسێکی تر، وە لەو ژنەش کە خاڵی بۆ دەکوتن، بەبێ ئەوەی کە دەرد و نەخۆشیەکی هەبێت. ئەبو داود دەڵێت: راڤەی (الواصلة) بەم شێوەیە: قژ دەداتە دەم قژی خۆی و ئافرەتان، (مستوصلة): ئەوەی داوا دەکات قژ بدەنە دەم قژی، (نامصة) مووی برۆ هەڵدەکەنێ و لایدەبات هەتا باریکی دەکاتەوە، (متنمصة) مووی برۆی بۆ هەڵدەکەنن و لایدەبەن بۆی، (واشمة) خاڵ کوت، (مستوشمة) ئەوەی کە خاڵی بۆ دەکوتن.

٤١٧١ - (ضعيف مقطوع منكر) عن سعيد بن جبير قال: لاَ بَأْسَ بِالْقَرَامِلِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَأَنَّهُ يَذْهَبُ إِلَى أَنَّ الْمَنْهِيَّ عَنْهُ شُعُورُ النِّسَاءِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَانَ أَحْمَدُ يَقُولُ: الْقَرَامِلُ لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بە قەرمەل قەیدی نیە. ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی رێگەی پێ نەدراوە قژی ئافرەتانە. ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا ئەحمەد دەیوت: بە قەرمەل قەیدی نیە. واتە: تەڵی ئاوریشم یان خوری بدرێتە دەم قژ.

## سەبارەت بە رەتکردنەوەی بۆنی خۆش.

## ٦ - باب فِي رَدِّ الطِّيبِ.

٤١٧٢ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ طِيبٌ فَلاَ يَرُدَّهُ, فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرِّيحِ خَفِيفُ الْمَحْمَلِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بۆنی خۆشی پێشکەش کرا با نەیگێڕێتەوە، چونکە هەڵگرتنی ئاسانەو بۆنیشی خۆشە).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی ئافرەت بۆنی خۆش لەخۆی بدات و لەماڵ دەرچێت.

## ٧ - باب مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ تَتَطَيَّبُ لِلْخُرُوجِ.

٤١٧٣ - (حسن) عن أبو موسى, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا اسْتَعْطَرَتِ الْمَرْأَةُ فَمَرَّتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِيَ كَذَا وَكَذَا). قَالَ قَوْلاً شَدِيدًا.

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئافرەت بۆنی خۆش لەخۆی بدات بەلای کۆمەڵێ خەڵکدا تێپەڕێ بۆئەوەی بۆنی بکەن ئەوە ئەوەو ئەوەیە). فەرمایشتێکی توندی فەرموو - وەك لە ریوایەتی تردا هاتوە فەرموویەتی ئەوە داوێن پیسە - .

٤١٧٤ - (صحيح) عن عبيد مولى لأبي وُهْمٍ, عن أبي هريرة قال: لَقِيَتْهُ امْرَأَةٌ وَجَدَ مِنْهَا رِيحَ الطِّيبِ يُنْفَحُ وَلِذَيْلِهَا إِعْصَارٌ, فَقَالَ: يَا أَمَةَ الْجَبَّارِ, جِئْتِ مِنَ الْمَسْجِدِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: وَلَهُ تَطَيَّبْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: إِنِّى سَمِعْتُ حِبِّى أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ لاِمْرَأَةٍ تَطَيَّبَتْ لِهَذَا الْمَسْجِدِ حَتَّى تَرْجِعَ فَتَغْتَسِلَ غُسْلَهَا مِنَ الْجَنَابَةِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الإِعْصَارُ: غُبَارٌ.

واتە: لە ئەبو عوبەیدی بەندەی ئازادکراوی ئەبو وهمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، عوبەید وتی: ئافرەتێ گەیشت بە ئەبو هورەیرە بۆنی خۆشی لێ دەهات و لە دامێنی تۆز بەرزدەبۆوە. وتی: ئەی (أَمَةَ الْجَبَّارِ) بۆ ترساندنی و هۆشیارکردنەوەی بەو ناوەوە بانگی کرد، هاتویت بۆ مزگەوت، وتی: بەڵێ، وتی: بۆنی خۆشیشت لەخۆت داوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: من بۆ خۆم لە خۆشەویستم ئەبو قاسمم صلی الله علیه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (نوێژی ئەو ئافرەتە وەرناگیرێ بۆنی خۆش لەخۆی بدات و بێت بۆ ئەم مزگەوتە، هەتا نەگەڕێتەوە خۆی نەشوات وەك چۆن بۆ لەشگرانی خۆی دەشوات).

٤١٧٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُورًا فَلاَ تَشْهَدَنَّ مَعَنَا الْعِشَاءَ). قَالَ ابْنُ نُفَيْلٍ: (عِشَاءَ الآخِرَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر ئافرەتێك بخور بەکاربهێنێت با نوێژی عیشامان لەگەڵ نەکات).

## سەبارەت بە خەلوق بۆ پیاوان بۆنێکە بە زەعفەران دەگیرێتەوە.

## ٨ - باب فِي الْخَلُوقِ لِلرِّجَالِ.

٤١٧٦ - (حسن) عن عمار بن ياسر قال: قَدِمْتُ عَلَى أَهْلِي لَيْلاً وَقَدْ تَشَقَّقَتْ يَدَايَ فَخَلَّقُونِي بِزَعْفَرَانٍ فَغَدَوْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ وَلَمْ يُرَحِّبْ بِي فَقَالَ: (اذْهَبْ فَاغْسِلْ هَذَا عَنْكَ). فَذَهَبْتُ فَغَسَلْتُهُ, ثُمَّ جِئْتُ وَقَدْ بَقِيَ عَلَيَّ مِنْهُ رَدْعٌ, فَسَلَّمْتُ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ وَلَمْ يُرَحِّبْ بِي, وَقَالَ: (اذْهَبْ فَاغْسِلْ هَذَا عَنْكَ). فَذَهَبْتُ فَغَسَلْتُهُ, ثُمَّ جِئْتُ, فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ عَلَيَّ وَرَحَّبَ بِي, وَقَالَ: (إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَحْضُرُ جَنَازَةَ الْكَافِرِ بِخَيْرٍ, وَلاَ الْمُتَضَمِّخَ بِالزَّعْفَرَانِ, وَلاَ الْجُنُبَ). قَالَ: وَرَخَّصَ لِلْجُنُبِ إِذَا نَامَ أَوْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ أَنْ يَتَوَضَّأَ.

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەو گەیشتمەوە ماڵ دەستەکانمام قڵیشیان بردبوو زەعفەرانیان دا لە قڵیشەکان بەیانی چوم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سڵاوم لێ کرد نە وەڵامی دامەوەو نە خۆشحاڵ بوو پێم و نە مەرحەبای لێ کردم فەرمووی: (بڕۆ دەستەکانت بشۆ و ئەوەی لێ بکەرەوە)، رۆشتم شۆردم، لەپاشدا هاتمەوە شوێنەواری هەر مابوو سڵاوم لێ کرد نە وەڵامی دامەوەو نە خۆشحاڵ بوو پێم و نە مەرحەبای لێ کردم فەرمووی: (بڕۆ دەستەکانت بشۆ و ئەوەی لێ بکەرەوە)، رۆشتم شۆردم هیچی پێوە نەما، لەپاشدا هاتمەوە سڵاوم لێ کرد، وەڵامی دامەوەو خۆشحاڵ بوو پێم و مەرحەبای لێ کردم فەرمووی: (مەلائیکە ئامادەی تەرمی کافر نابێت بە خێر و چاکە، وە لەلای ئەو کەسەش کە زەعفەران بدات لە شوێنێکی جەستەی هەتا لێی دەکاتەوە، هەروەها ناچێتە ماڵێکەوە لەشگرانی تێدا بێت).

وتی: روخسەتی داوە بە لەشگران ئەگەر ویستی بخەوێت یان بخوات یا بخواتەوە بەمەرجێ دەستنوێژ بگرێت.

٤١٧٧ - (حسن) عن عمار قال: تَخَلَّقْتُ, بِهَذِهِ الْقِصَّةِ. وَالأَوَّلُ أَتَمُّ بِكَثِيرٍ, فِيهِ ذَكَرَ الْغُسْلَ, قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ: وَهُمْ حُرُمٌ, قَالَ: لاَ الْقَوْمُ مُقِيمُونَ.

واتە: لە عەمارەوە هەمان بەسەرهات هاتوە، وتی: خەلوقم بەکارهێنا، بەڵام فەرموودەی یەکەم زیاتر تەواوترە، باسی شۆردنی تێدایە. وتی: وتم بە عومەر: لە خانەوادەی عەمار لە ئیحرامدا بوون، وتی: نەخێر، لەماڵی خۆیاندا بوون.

٤١٧٨ – (ضعيف) عن أبو موسا قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ تَعَالَى صَلاَةَ رَجُلٍ فِي جَسَدِهِ شَيْءٌ مِنْ خَلُوقٍ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە نوێژی پیاوێ وەرناگرێت شتێ لە خەلوق بە جەستەیەوە بێت).

٤١٧٩ - (صحيح) عن أنس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّزَعْفُرِ لِلرِّجَالِ. وَقَالَ عَنْ إِسْمَاعِيلَ: أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەی نەداوە پیاو زەعفەران بدات لەخۆی یان بیدات لە جل و بەرگی.

٤١٨٠ - (حسن) عن عمار بن ياسر قال: ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (ثَلاَثَةٌ لاَ تَقْرَبُهُمُ الْمَلاَئِكَةُ: جِيفَةُ الْكَافِرِ, وَالْمُتَضَمِّخُ بِالْخَلُوقِ, وَالْجُنُبُ إِلاَّ أَنْ يَتَوَضَّأَ).

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ کەس مەلائیکەت نزیکی نابنەوە: لاشەی کافر بە مردوویی، ئەو کەسەش کە خەلوق بدات لە شوێنێکی جەستەی هەتا لێی دەکاتەوە، هەروەها لەشگران مەگەر دەستنوێژ بگرێت).

٤١٨١ - (منكر) عن الوليد بن عقبة قال: لَمَّا فَتَحَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ جَعَلَ أَهْلُ مَكَّةَ يَأْتُونَهُ بِصِبْيَانِهِمْ فَيَدْعُو لَهُمْ بِالْبَرَكَةِ وَيَمْسَحُ رُءُوسَهُمْ, قَالَ: فَجِيءَ بِي إِلَيْهِ وَأَنَا مُخَلَّقٌ فَلَمْ يَمَسَّنِي مِنْ أَجْلِ الْخَلُوقِ.

واتە: لە وەلیدی کوڕی عوقبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مەککەی رزگارکرد خەڵکی مەککە بە منداڵەکانیانەوە هاتن بۆ خزمەتی ئەویش دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ کردن و دەستی هێنا بەسەری منداڵەکانیاندا، وەلید وتی: منیان برد بۆ خزمەتی خەلوقم پێوە بوو دەستی نەهێنا بەسەری مندا بەهۆی ئەو خەلوقەوە.

٤١٨٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ, وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَلَّمَا يُوَاجِهُ رَجُلاً فِي وَجْهِهِ بِشَيْءٍ يَكْرَهُهُ, فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ: (لَوْ أَمَرْتُمْ هَذَا أَنْ يَغْسِلَ هَذَا عَنْهُ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ چووەژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم زۆر کەم پێشوازی لە کەسێك دەکرد کە شتێ بە روخساریەوە بوایە پێی ناخۆش بوایە، کاتێ کە چوودەرەوە فەرمووی: (فەرمانتان بکردایە بەم پیاوە بیشۆردایەو زەعفەرانەکەی لێ بکردایەتەوە).

## باسی ئەوەی دەربارەی قژ هاتوە.

## ٩ - باب مَا جَاءَ فِي الشَّعْرِ.

٤١٨٣ - (صحيح) عن البراء قال: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. زَادَ مُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمَانَ: لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا رَوَاهُ إِسْرَائِيلُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ, قَالَ: يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ. وَقَالَ شُعْبَةُ: يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قژی لە نەرمەی گوێی زیاتر بوو پۆشاکێکی سوری تازەی لەبەردا بوو کەسم نەدیوە ئەوەندە جوان بێت. موحەممەدی کوڕی سولەیمان ئەمەی بۆ زیاد کرد: قژی دەیدا لە شانەکانی. شوعبە دەڵێت: قژی دەگەیشتە نەرمایی گوێچکەکانی.

٤١٨٤ - (صحيح) عن البراء قال كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُ شَعْرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: قژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگەیشتە نەرمایی گوێکانی.

٤١٨٥ - (صحيح) عن أنس قال: كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: مووی سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەتا نەرمەی هەردوو گوێی دەبوو.

٤١٨٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: مووی سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەتا نیوەی هەردوو گوێی دەبوو.

٤١٨٧ - (حسن صحيح) عن عائشة قالت: كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوْقَ الْوَفْرَةِ وَدُونَ الْجُمَّةِ.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە هاتووە، کە وتویەتی: مووی سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نەرمەی گوێی زیاتربووەو، نەگەیشتۆتە سەر شانی.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی قژکردن بە دوو بەشەوە لەناوەڕاستدا

## ١٠ - باب مَا جَاءَ فِي الْفَرْقِ.

٤١٨٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ - يَعْنِي - يَسْدِلُونَ أَشْعَارَهُمْ, وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ, وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُعْجِبُهُ مُوَافَقَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ بِهِ, فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاصِيَتَهُ, ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خاوەن نامە ئاسمانیەکان واتە گاور و جولەکە قژی خۆیان شۆڕدەکردەوە بەم لاو لای سەریاندا، هاوبەش بۆ خو دانەرانیش قژی خۆیان لەناوەڕا ستدا دەکرد بە دوو بەشەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەر شتێکدا کە فەرمانی پێ

نەکرایە حەزی دەکرد وەك خاوەن نامە ئاسمانیەکان بکات و رێك بێ لەگەڵ دەستوری ئەواندا، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قژی خۆی شۆڕدەکردەوە، بەڵام لەپاشدا لەناوەڕاستدا کردی بە دوو بەشەوە.

٤١٨٩ - (صحيح) عن عائشة قالت: كُنْتُ إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَفْرِقَ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدَعْتُ الْفَرْقَ مِنْ يَافُوخِهِ وَأُرْسِلُ نَاصِيَتَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر بم ویستایە قژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بکەم بە دوو بەشەوە ئەوا لە بەشی سەرەوەی سەریەوە هەتا پێشی سەری دەمکرد بە دوو بەشەوە بەلای راست و چەپدا.

## دەربارەی قژی سەرشان.

## ١١ - باب فِي تَطْوِيلِ الْجُمَّةِ.

٤١٩٠ - (صحيح) عن وائل بن حجر قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلِي شَعْرٌ طَوِيلٌ, فَلَمَّا رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (ذُبَابٌ ذُبَابٌ). قَالَ: فَرَجَعْتُ فَجَزَزْتُهُ, ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنَ الْغَدِ, فَقَالَ: (إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ وَهَذَا أَحْسَنُ).

واتە: لە وائیلی کوڕی حوجرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قژێکی درێژم هەبوو، کاتێ کە بینیمی فەرمووی: (شومە شومە). وتی: رۆشتم کورتم کردەوە، لەپاشدا سبەینێ هاتمەوە خزمەتی، فەرمووی: (مەبەستی خراپەم نەبوو بۆت بەڵام ئەم شکڵ و شێوەیەی ئێستات چاکتر و جوانترە).

## دەربارەی پیاوێ قژی بهۆنێتەوە.

## ١٢ - باب فِي الرَّجُلِ يَضْفِرُ شَعْرَهُ.

٤١٩١ - (صحيح) عن مجاهد قال: قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَكَّةَ وَلَهُ أَرْبَعُ غَدَائِرَ تَعْنِى عَقَائِصَ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (أُمُّ هَانِئ) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە مەککە پرچی هۆنیبووەوە چوار پەلکی هەبوو.

## سەبارەت بە سەرتاشین.

## ١٣ - باب فِي حَلْقِ الرَّأْسِ.

٤١٩٢ - (صحيح) عن عبد الله بن جعفر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْهَلَ آلَ جَعْفَرٍ ثَلاَثًا أَنْ يَأْتِيَهُمْ, ثُمَّ أَتَاهُمْ, فَقَالَ: (لاَ تَبْكُوا عَلَى أَخِى بَعْدَ الْيَوْمِ). ثُمَّ قَالَ: (ادْعُوا لِي بَنِى أَخِى). فَجِىءَ بِنَا كَأَنَّا أَفْرُخٌ, فَقَالَ: (ادْعُوا لِي الْحَلاَّقَ). فَأَمَرَهُ, فَحَلَقَ رُءُوسَنَا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی دا بە خانەوادەی جەعفەر هەتا سێ ڕۆژ بۆی بگرین بەبێ دەنگی بەبێ شین و شەپۆڕ، لەپاشدا چو بۆ لایان و فەرمووی: (لەمڕۆ بەدواوە مەگرین بۆ براکەم). لەپاشدا فەرمووی: (برازاکانم بۆ بانگ بکەن)، جا ئێمەیان هێنا بۆ خزمەتی دەتگوت بێچوی باڵندەی بێ

دایك و باوكین، فەرمووی: (ئادەی سەرتاشەكەم بۆ بانگ بكەن)، سەرتاشەكە هات، فەرمانی پێ كرد، سەری هەر هەموومانی تاشی.

## سەبارەت بە منداڵێ کە پەلکی هەبێت.

## ١٤ - باب فِي الصَبي لَه ذؤابة.

٤١٩٣ - (صحيح) عن ابن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْقَزَعِ. وَالْقَزَعُ: أَنْ يُحْلَقَ رَأْسُ الصَّبِيِّ فَيُتْرَكَ بَعْضُ شَعْرِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری كردوە لە (قزع). (قزع) واتە: سەری منداڵ هەندێكی بتاشرێ و هەندێكی بهێڵرێتەوە.

٤١٩٤ - (صحيح) عن ابن عمر قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْقَزَعِ. وَهُوَ: أَنْ يُحْلَقَ رَأْسُ الصَّبِيِّ فَتُتْرَكَ لَهُ ذُؤَابَةٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری كردوە لە (قزع). ئەوەیە: كە سەری منداڵ هەندێكی بتاشرێ و پرچی بهێڵرێتەوە.

٤١٩٥ - (صحيح) عن ابن عمر قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى صَبِيًّا قَدْ حُلِقَ بَعْضُ شَعْرِهِ وَتُرِكَ بَعْضُهُ, فَنَهَاهُمْ عَنْ ذَلِكَ, وَقَالَ: (احْلِقُوهُ كُلَّهُ أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کوڕێکی منداڵی دی هەندێ لە سەری تاشرا بوو هەندێکیشی نەتاشرابو، رێگری ئەو کارەی لێ کردن و فەرمووی: (یان سەری بەتەواوەتی بتاشن، یا هەمووی مەتاشن).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## روخسەت لە پەلکی منداڵ دا.

## ١٥ - باب مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ.

٤١٩٦ - (ضعيف الأسناد) عن أنس بن مالك قال: كَانَتْ لِي ذُؤَابَةٌ, فَقَالَتْ لِي أُمِّي: لاَ أَجُزُّهَا, كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمُدُّهَا وَيَأْخُذُ بِهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پەلکێکم هەبوو، دایکم پێی وتم: نایقرتێنم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم درێژی دەکردو دەی گرت.

٤١٩٧ - (ضعيف الأسناد) عن الحجاج بن حسان قال: دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ, فَحَدَّثَتْنِي أُخْتِي الْمُغِيرَةُ قَالَتْ: وَأَنْتَ يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ وَلَكَ قَرْنَانِ, أَوْ قُصَّتَانِ, فَمَسَحَ رَأْسَكَ, وَبَرَّكَ عَلَيْكَ, وَقَالَ: (احْلِقُوا هَذَيْنِ, أَوْ قُصُّوهُمَا, فَإِنَّ هَذَا زِيُّ الْيَهُودِ).

واتە: لە حەجاجی کوڕی حەسانەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خۆم و خانەوادەکەم چوین بۆ خزمەت ئەنەسی کوڕی مالیك، خوشکەکەی موغیرە بۆی گێڕاینەوە وتی: لەوکاتەدا تۆ منداڵێ بووی دوو پەلکت هەبوو، یان بەشی پێشەوەی سەرت لەدوو شوێن نەتاشرابوو ئەنەس دەستی هێنا بەسەرتاو، دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ کردی، وتی: (ئەو دوانە بتاشن، چونکە ئەمە عادەت و دەستوری جولەکەکانە).

## سەبارەت بە بەرسمێڵ کردن.

## ١٦ - باب فِي أَخْذِ الشَّارِبِ.

٤١٩٨ - (صحيح) عن أبو هريرة, يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم: (الْفِطْرَةُ خَمْسٌ - أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ - : الْخِتَانُ, وَالاِسْتِحْدَادُ, وَنَتْفُ الإِبْطِ, وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ, وَقَصُّ الشَّارِبِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رەفتارە سروشتیە ساغەکان پێنجن - یان پێنج شت لە رەفتارە سروشتیە ساغەکانن - : خەتەنەکردن، بەرتاشین، هەڵکێشان و لابردنی مووی بن باڵ، نینۆك کردن، سمێڵ کورتکردنەوە).

٤١٩٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِإِحْفَاءِ الشَّوَارِبِ وَإِعْفَاءِ اللِّحَى.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کردوە بە سمێڵ کورتکردنەوە و ریش بەردانەوە.

٤٢٠٠ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: وَقَّتَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَلْقَ الْعَانَةِ, وَتَقْلِيمَ الأَظْفَارِ, وَقَصَّ الشَّارِبِ, وَنَتْفَ الإِبْطِ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا مَرَّةً.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا

صلى الله عليه وسلم بۆ بەرتاشین و، نینۆك كردن و، سمێڵ كورتكردنەوەو، هەڵكێشان و لابردنی مووی بن باڵ كاتی بۆ دانایین كە بریتی بوو لە چل رۆژ جارێك.

٤٢٠١ - (ضعيف الأسناد) عن جابر قال: كُنَّا نُعْفِى السِّبَالَ إِلاَّ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ئێمە ئەو مووەی ریشمان كە لەبستێ زیاتر بوایە وازمان لێ دەهێناو بەرمان دەدایەوە مەگەر لە حەج یان لە عومرە كورتمان بكردایەتەوە.

## سەبارەت بە هەڵكەندن و لابردنی مووی سپی.

## ١٧ - باب فِي نَتْفِ الشَّيْبِ.

٤٢٠٢ - (حسن صحيح) عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَنْتِفُوا الشَّيْبَ, مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَشِيبُ شَيْبَةً فِي الإِسْلاَمِ). قَالَ عَنْ سُفْيَانَ (إِلاَّ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ). وَقَالَ فِي حَدِيثِ يَحْيَى: (إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً, وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مووی سپی سەر و ریش هەڵمەكەنن، هیچ موسوڵمانێ نیە موویەكی سپی كردبێ لە ئیسلامدا). سوفیان وتی: (ئیللا دەبێتە نورو روناكی بۆی لەرۆژی قیامەتدا). لە فەرموودەكەی یەحیادا فەرمووی: (ئیللا خوای گەورە چاكەیەكی بۆ دەنوسێت و، تاوان و خراپەیەكی لەسەر دەكوژێنێتەوە).

## سەبارەت بە بۆیەکردنی مووی سەر و ریش.

## ١٨ - باب فِي الْخِضَابِ.

٤٢٠٣ - (صحيح) عن أبو هريرة, يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جولەکەو گاورەکان مووی سەر و ریشی خۆیان رەنگ ناکەن، ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە بۆیەی بکەن).

٤٢٠٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضًا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ, وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە رۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا ئەبو قوحافەی باوکی ئەبو بەکریان هێنا سەر و ریشی وەك قارچك سپی بوو بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەم سپێتیە بە رەنگی شتێ بگۆڕن، بەڵام بە رەنگی رەش نا).

٤٢٠٥ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ هَذَا الشَّيْبُ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ).

واتە: لە (أبو ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی باشترین شتێك مووی سپی پێ بگۆڕن خەنەو وسمەیە).

٤٢٠٦ - (صحيح) عن أبو رمثة قال: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي, نَحْوَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَإِذَا هُوَ ذُو وَفْرَةٍ بِهَا رَدْعُ حِنَّاءَ, وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ.

واتە: لە (أبو رمثة)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ باوکم کەوتینەڕێ بەرەو رووی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەری یان ریشی بە خەنە رەنگ کردبوو، دوو پۆشاك(بوردە)ی سەوزیشی پۆشی بوو.

٤٢٠٧ - (صحيح) عن أبو رمثة, فِي هَذَا الْخَبَرِ, قَالَ: فَقَالَ لَهُ أَبِي: أَرِنِي هَذَا الَّذِي بِظَهْرِكَ فَإِنِّي رَجُلٌ طَبِيبٌ, قَالَ: (اللَّهُ الطَّبِيبُ, بَلْ أَنْتَ رَجُلٌ رَفِيقٌ, طَبِيبُهَا الَّذِي خَلَقَهَا).

واتە: لە (أبو رمپە)ەوە هەمان هەواڵ هاتوە، وتی: باوکم پێی وت: ئەوەی بە پشتەوەیە پیشانم بدە، چونکە من پزیشکم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە خۆی دکتۆرە، بەڵکو تۆ پیاوێکی بە بەزەیی و دڵنەرمی بەرامبەر بە نەخۆش، پزیشکەکەی ئەوەیە کە دروستی کردوە، واتە خوای گەورە خۆی شیفای هەموو نەخۆشێك دەدات و چاکی دەکاتەوە).

٤٢٠٨ - (صحيح) عن أبي رمثة قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَأَبِي, فَقَالَ لِرَجُلٍ أَوْ لأَبِيهِ (مَنْ هَذَا؟). قَالَ: ابْنِي. قَالَ: (لاَ تَجْنِي عَلَيْهِ). وَكَانَ قَدْ لَطَخَ لِحْيَتَهُ بِالْحِنَّاءِ.

واتە: لە (أبو رمپە)ەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: خۆم و باوکم چووینە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بە باوکمی فەرموو: (ئەوە کێ یە؟). وتی: ئەوە کوڕی منە، فەرموو: (گوناهو تاوانی خۆت نەخەیتە سەری) - واتە کەس گوناهو تاوانی کەس هەڵناگرێت و هەرکەسە لەسەر گوناهو تاوانی خۆی سزا دەدرێت -، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ریشی بە خەنە رەنگ کردبوو.

٤٢٠٩ - (صحيح) عن أنس: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ خِضَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ أَنَّهُ لَمْ يَخْضِبْ, وَلَكِنْ قَدْ خَضَبَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی سەر و ریش بۆیە کردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێ کرا، ئەویش باسی کردو وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەر و ریشی بۆیە نەدەکرد، بەڵام هەردوو پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ سەر و ریشی خۆیان بۆیە دەکرد.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## زەردکردنی سەر و ریش بە زەعفەران.

## ١٩ - باب مَا جَاءَ فِي خِضَابِ الصُّفْرَةِ.

٤٢١٠ - (صحيح) عنِ ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ, وَيُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ بِالْوَرْسِ وَالزَّعْفَرَانِ, وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەعلی سیبتی لەپێ دەکرد - نەعلێ بوو مووی پێوە نەبوو -، بە وەرس و زەعفەران ریشی خۆی زەرد دەکرد، ئیبنو عومەریش هەمان شتی دەکرد.

٤٢١١ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ, فَقَالَ: (مَا أَحْسَنَ هَذَا). قَالَ: فَمَرَّ آخَرُ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ فَقَالَ: (هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا). قَالَ فَمَرَّ آخَرُ قَدْ خَضَبَ بِالصُّفْرَةِ فَقَالَ: (هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا كُلِّهِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ دای بەلای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم سەر و ریشی بە خەنە بۆیە کردبوو، فەرمووی: (ئەمە چەند شتێکی چاکە). وتی: پیاوێکی تر دای بەلایدا سەر و ریشی بە خەنەو وسمە بۆیە کردبوو، فەرمووی: (ئەمە چەند شتێکی چاکە). وتی: پیاوێکی تر دای بەلایدا سەر و ریشی بە زەعفەران زەرد کردبوو، فەرمووی: (ئەمە لە هەردووکیان چاکترە).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی بۆیەکردن بە ڕەش.

## ٢٠ - باب مَا جَاءَ فِي خِضَابِ السَّوَادِ.

٤٢١٢ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ, لاَ يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ئاخر زەمانا کەسانێك پەیدا دەبن مووی سپی سەرو ریشیان بۆیە دەکەن بە دەرمانی ڕەش وەك پەڕی سەرسنگی کۆتر کە بە زۆری پەڕی سنگیان ڕەش دەنوێنێ، ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی سود وەرگرتن لە عاج، کە بریتیە لە: ئێسکی فیل یان ماسی یان گیاندارێکی دەریا بۆ جوانی بەکارهێنراوە

## ٢١ - باب مَا جَاءَ فِي الاِنْتِفَاعِ بِالْعَاجِ.

٤٢١٣ - (ضعيف الأسناد منكر) عن ثوبان مولى رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَافَرَ كَانَ آخِرُ عَهْدِهِ بِإِنْسَانٍ مِنْ أَهْلِهِ فَاطِمَةَ, وَأَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ عَلَيْهَا إِذَا قَدِمَ فَاطِمَةَ, فَقَدِمَ مِنْ غَزَاةٍ لَهُ وَقَدْ عَلَّقَتْ مِسْحًا أَوْ سِتْرًا عَلَى بَابِهَا, وَحَلَّتِ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ قُلْبَيْنِ مِنْ فِضَّةٍ, فَقَدِمَ فَلَمْ يَدْخُلْ! فَظَنَّتْ أَنَّ مَا مَنَعَهُ أَنْ يَدْخُلَ مَا رَأَى, فَهَتَكَتِ السِّتْرَ وَفَكَّكَتِ الْقُلْبَيْنِ عَنِ الصَّبِيَّيْنِ, وَقَطَعَتْهُ بَيْنَهُمَا, فَانْطَلَقَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمَا يَبْكِيَانِ, فَأَخَذَهُ مِنْهُمَا وَقَالَ: (يَا ثَوْبَانُ اذْهَبْ بِهَذَا إِلَى آلِ فُلاَنٍ).
- أَهْلِ بَيْتٍ بِالْمَدِينَةِ - (إِنَّ هَؤُلاَءِ أَهْلُ بَيْتِي أَكْرَهُ أَنْ يَأْكُلُوا طَيِّبَاتِهِمْ فِي حَيَاتِهِمُ الدُّنْيَا, يَا ثَوْبَانُ, اشْتَرِ لِفَاطِمَةَ قِلاَدَةً مِنْ عَصَبٍ وَسِوَارَيْنِ مِنْ عَاجٍ).

واتە: لە (ثوبان)ی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەفەری بکردایە دواهەمین کەس لە خانەوادەکەی کە خوا حافیزی لێ دەکرد (فاطمة)ی کچی بوو، کاتێکیش کە دەگەڕایەوە یەکەم کەس دەچوو بۆ لای ئەو، جارێ لە غەزایەکی گەڕایەوە یەکەمجار چو بۆ ماڵیان، بینی (فاطمة) پەڵاسێ کە لە موو دروست دەکرا یان پەردەیەکی بە دەرگای ماڵەکەیانەوە بوو بۆ جوانی و، حەسەن و حوسەینیشی رازێنرابونەوەو دوو بازنەی زیویان لەدەستابوو نەچوە

ژوورەوەو گەڕایەوە، (فاطمة) زانی بە هۆی پەردەو بازنەکانەوە نەهاتەژوورەوە هەستا پەلاسەکە یان پەردەکەی کرد بە دوو بەشەوەو بازنەکانی لەدەست حەسەن و حوسەین داکەندو کردنی بە دوو پارچەوە، حەسەن و حوسەین چون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بازنەکانیان بەدەستەوە بوو دەگریان، لێی وەرگرتن و فەرمووی: (ئەی (ثوبان) ئەمە بەرە بۆ فلانە خانەوادە) - خانەوادەیەکی هەژار بوون لە مەدینە - (حەسەن و حوسەین لە خانەوادەی منن پێم خۆش نیە لە ژیانی دونیادا خۆراکی خۆش بخۆن و بە شتی بە نرخ و بە بەها خۆیان بڕازێننەوە) - حەزدەکەم وەك هەژاران بژین بۆ ئەوەی پلەیان بەرز بێ لە بەهەشتدا -، (ئەی (ثوبان) ملوانکەیە بکڕە بۆ (فاطمة) و، دوو بازنەی عاج بکڕە بۆ حەسەن و حوسەین).

# سەرەتای پەرتوکی ئەنگوستیلە
# ٢٨ - أول كتاب الخاتم

## ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەنگوستیلە

## ١ - باب مَا جَاءَ فِي اتِّخَاذِ الْخَاتَمِ.

٤٢١٤ - (صحيح) عن أنس قال: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى بَعْضِ الأَعَاجِمِ, فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلاَّ بِخَاتَمٍ, فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ, وَنَقَشَ فِيهِ: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی نامە بنوسێ بۆ هەندێ لە عەجەمەکان، پێی وترا: ئەوانە هەر نامەیە مۆر نەکرابێ نایخوێننەوە، ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروستکرد و نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر هەڵکەند.

٤٢١٥ - (صحيح الأسناد) عن أنس, بِمَعْنَى حَدِيثِ عِيسَى بْنِ يُونُسَ, زَادَ: فَكَانَ فِي يَدِهِ حَتَّى قُبِضَ, وَفِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى قُبِضَ, وَفِي يَدِ عُمَرَ حَتَّى قُبِضَ, وَفِي يَدِ عُثْمَانَ فَبَيْنَمَا هُوَ عِنْدَ بِئْرٍ إِذْ سَقَطَ فِي الْبِئْرِ, فَأَمَرَ بِهَا فَنُزِحَتْ, فَلَمْ يُقْدَرْ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بە هەمان مانای فەرموودەکەی عیسای کوڕی یونوس هاتوە بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئیتر هەتا لە ژیاندا بوو لەدەستی خۆیدا بوو، لەپاشدا پێشەوا ئەبو بەکر لەدەستی کرد هەتا وەفاتی کرد، ئینجا پێشەوا عومەر لەدەستی کرد هەتا وەفاتی کرد، پاشان پێشەوا (عثمان)

لەدەستی کرد هەتا کەوتە بیری ئەریسەوە، فەرمانی کرد ئاوەکەی دەربکەن و بۆی بدۆزنەوە، بەڵام نەیانتوانی و ئەنگوستیلەکەیان نەدۆزیەوە.

٤٢١٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ وَرِقٍ فَصُّهُ حَبَشِيٌّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە زیو بوو نقێمەکەی لەخۆی بوو.

٤٢١٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ فِضَّةٍ, كُلُّهُ فَصُّهُ مِنْهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە زیو بوو، هەموو نقێمەکەی لەخۆی بوو.

٤٢١٨ - (صحيح) عن ابن عمر قال: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ, وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي بَطْنَ كَفِّهِ, وَنَقَشَ فِيهِ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِمَ الذَّهَبِ فَلَمَّا رَآهُمْ قَدِ اتَّخَذُوهَا رَمَى بِهِ وَقَالَ: (لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا). ثُمَّ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ نَقَشَ فِيهِ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). ثُمَّ لَبِسَ الْخَاتَمَ بَعْدَهُ أَبُو بَكْرٍ, ثُمَّ لَبِسَهُ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ عُمَرُ, ثُمَّ لَبِسَهُ بَعْدَهُ عُثْمَانُ حَتَّى وَقَعَ فِي بِئْرِ أَرِيسَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەنگوستیلەیەکی زێڕی دروستکرد، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی دەستی، نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر

هەڵکەندبوو. خەڵکیش ئەنگوستیلەی زێڕیان دروستکرد، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خەڵکەکەی بینی بەو شێوەیە ئەنگوستیلەکەی خۆی فڕێداو فەرمووی: ئیتر لەدەستی ناکەم). لەپاشدا ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروستکردو نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر هەڵکەند. ئیتر هەتا لە ژیاندا بوو لەدەستی خۆیدا بوو، لەدوای خۆی پێشەوا ئەبو بەکر لەدەستی کرد، لەدوای پێشەوا ئەبو بەکر پێشەوا عومەر لەدەستی کرد، لەدوای پێشەوا عومەر پێشەوا (عثمان) لەدەستی کرد هەتا کەوتە بیری ئەریسەوە.

٤٢١٩ - (صحيح) عن ابن عمر, فِي هَذَا الْخَبَرِ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَنَقَشَ فِيهِ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). وَقَالَ (لاَ يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِ خَاتَمِي هَذَا).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەمان هەواڵ هاتووە، نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر هەڵکەندرابوو. فەرمووی: (با هیچ کەس چاو لە من نەکات نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر ئەنگوستیلە هەڵکەنەکەنێ).

٤٢٢٠ - (ضعيف الأسناد منكر المتن) عن ابن عمر, بِهَذَا الْخَبَرِ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ, فَاتَّخَذَ عُثْمَانُ خَاتَمًا وَنَقَشَ فِيهِ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). قَالَ: فَكَانَ يَخْتِمُ بِهِ أَوْ يَتَخَتَّمُ بِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەمان هەواڵ هاتووە، وتی: بۆی گەڕان نەیاندۆزیەوە لەناو بیرەکەدا، پێشەوا (عثمان) ئەنگوستیلەکەی تازەی دروستکرد لەدەستی دەکرد و مۆریشی پێ دەکرد.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## وازهێنان لە ئەنگوستیلە

## ٢ - باب مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الْخَاتَمِ.

٤٢٢١ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: أَنَّهُ رَأَى فِي يَدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ يَوْمًا وَاحِدًا, فَصَنَعَ النَّاسُ, فَلَبِسُوا, وَطَرَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَطَرَحَ النَّاسُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خەڵك یەك رۆژ ئەنگوستیلەیەکی زیویان لەدەستی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بینی ئەوانیش ئەنگوستیلەی زیویان دروستکردو لەدەستیان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەنگوستیلە زێڕەکەی فڕێی دا، خەڵکەکەش ئەنگوستیلە زێڕەکانیان فڕێ دا.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەنگوستیلەی زێڕ

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي خَاتَمِ الذَّهَبِ.

٤٢٢٢ - (منكر) عن ابن مسعود قال: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْرَهُ عَشْرَ خِلَالٍ: الصُّفْرَةَ - يَعْنِي الْخَلُوقَ -, وَتَغْيِيرَ الشَّيْبِ, وَجَرَّ الإِزَارِ, وَالتَّخَتُّمَ بِالذَّهَبِ, وَالتَّبَرُّجَ بِالزِّينَةِ لِغَيْرِ مَحِلِّهَا, وَالضَّرْبَ بِالْكِعَابِ, وَالرُّقَى إِلاَّ بِالْمُعَوِّذَاتِ, وَعَقْدَ التَّمَائِمِ, وَعَزْلَ الْمَاءِ لِغَيْرِ أَوْ غَيْرِ مَحِلِّهِ أَوْ عَنْ مَحِلِّهِ, وَفَسَادَ الصَّبِيِّ غَيْرَ مُحَرِّمِهِ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی لەم دە شتە نەكردوە: بەكارهێنانی خەلوق كە بۆنێكی خۆشە لە زەعفەران یان غەیری ئەو دروست دەكرێت، گۆڕینی مووی سپی بە رەنگی رەش، شۆڕكردنەوەی پۆشاك، لەدەست كردنی ئەنگوستیلەی زێڕ لەلایەن پیاوانەوە، خۆدەرخستن و خۆڕازاندنەوەی ئافرەتان بۆ غەیری مێردی خۆیان، (الضَّرْبَ بِالْكِعَابِ) جۆرە قومارێكە، نوشتەكردن بە غەیری سورەتی (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)، هەڵواسینی مورو بە جەستەی منداڵەوە بۆ چاوەزار، پیاو تۆوی خۆی نەگاتە شەرمگای خێزانیەوە بۆ ئەوەی منداڵی نەبێت، شتێ بكرێت منداڵ زیانی پێ بگات وەك ئەوەی شیر بخوات لەگەڵ دایكی جوت بێ سكی پڕ بێ و شیردكەی خراپ ببێت. ئەوەش حەرام نیە.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەنگوستیلەی ئاسن.

## ٤ - بباب مَا جَاءَ فِي خَاتَمِ الْحَدِيدِ

٤٢٢٣ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ شَبَهٍ, فَقَالَ لَهُ: (مَا لِي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ الأَصْنَامِ؟!). فَطَرَحَهُ, ثُمَّ جَاءَ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ, فَقَالَ: (مَا لِي أَرَى عَلَيْكَ حِلْيَةَ أَهْلِ النَّارِ؟!). فَطَرَحَهُ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مِنْ أَيِّ شَيْءٍ أَتَّخِذُهُ؟ قَالَ: (اتَّخِذْهُ مِنْ وَرِقٍ وَلاَ تُتِمَّهُ مِثْقَالاً).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە پیاوێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەنگوستیلەیەكی مسی لەدەستا بوو، پێی فەرموو: (ئەوە دەتبینم بۆنی بتت لێ دێ؟!). پیاوەكە ئەنگوستیلە مسەكەی فڕێی دا، لەپاشدا هاتەوە بۆ خزمەتی ئەنگوستیلەیەكی ئاسنی لەدەستا بوو، فەرمووی: (ئەوە دەتبینم خشڵی دۆزەخیەكانت لەخۆت

داوە؟!). پیاوەکە ئەنگوستیلە ئاسنەکەی فڕێی داو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی لەچی دروستی بکەم؟ فەرمووی: (لە زیو دروستی بکە با نەگاتە مسقاڵێ).

٤٢٢٤ - (ضعيف) عن إياس بن الحارث بن المعيقيب, عن جده قال: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ حَدِيدٍ مَلْوِيٌّ عَلَيْهِ فِضَّةٌ. قَالَ: فَرُبَّمَا كَانَ فِي يَدِهِ, قَالَ: وَكَانَ الْمُعَيْقِيبُ عَلَى خَاتَمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە ئیاسی کوڕی (حارث)ی کوڕی موعەیقیبەوە، لە باپیریەوە: دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ئاسن بوو بە زیو روکەش کرا بوو، راوی وتی: زۆر جار لەدەستی موعەیقبدا بوو چونکە ئەو پارێزگاری لێ دەکرد. راوی وتی: موعەیقیب ئەمینی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو.

٤٢٢٥ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (قُلِ اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي, وَاذْكُرْ بِالْهِدَايَةِ هِدَايَةَ الطَّرِيقِ, وَاذْكُرْ بِالسَّدَادِ تَسْدِيدَكَ السَّهْمَ). قَالَ: وَنَهَانِي أَنْ أَضَعَ الْخَاتَمَ فِي هَذِهِ أَوْ فِي هَذِهِ لِلسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى - شَكَّ عَاصِمٌ -, وَنَهَانِي عَنِ الْقَسِّيَّةِ وَالْمِيثَرَةِ. قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَقُلْنَا لِعَلِيٍّ: مَا الْقَسِّيَّةُ؟ قَالَ: ثِيَابٌ تَأْتِينَا مِنَ الشَّامِ أَوْ مِنْ مِصْرَ مُضَلَّعَةٌ فِيهَا أَمْثَالُ الأُتْرُجِّ, قَالَ: وَالْمِيثَرَةُ شَيْءٌ كَانَتْ تَصْنَعُهُ النِّسَاءُ لِبُعُولَتِهِنَّ.

واتە: لە پێشەوا عەلییەوە زای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: بڵێ: خودایە رێگەی هەق و راستم نیشان بدە، ئاراستەی هەموو کاروبارێکی چاکم بکەو بەردەوام بم لەسەری، کە دەڵێی رێگەی هەق و راستم نیشان بدە دڵت ئامادە بکەو ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە چۆن ئەگەر بتەوێ رێگەیە ببڕیت لەسەر رێگەکە راست بڕۆی

دەگەیتە مەنزڵ بەڵام ئەگەر لابدەیت لە رێگەکە بەلای راست و چەپدا سەرت لێ تێك دەچێ و توشی بەڵا دەبیت و ناگەیتە مەنزڵ هەر بەو شێوەیە ئەگەر لەسەر رێگەی هەق و راستی ئیسلام بیت ئیتر سەرت لێ تێك ناچێ و دەگەیتە مەنزڵ، هەروەها ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت ئەگەر تیر بە باشی ئاڕاستەی نیشان بکرێ دەیپێکێ هەر بەو شێوەیە ئەگەر خوای گەورە ئاڕاستەی کاری خێر و چاکەت بکات ئیتر دەیپێکی و لە هەڵە بەدوور دەبی)، وتی: رێگری ئەوەی لێ کردم ئەنگوستیلە بکەمە ئەمە یان ئەمە پەنجەی ناوەڕاست یان پەنجەی شایەتومان - عاصم راوی فەرموودەکە گومانی هەبوو کە کامیانی فەرموو - وە رێگری (الْقَسِّيَّة) و (الْمِيثَرَة)ی لێ کردم. ئەبو بوردە وتی: وتمان بە پێشەوا عەلی زای خوای لێ بێ: (الْقَسِّيَّة) مانی چی یە؟ وتی: قوماشێ بوو لە کەتان دروست دەکرا ئاوریشمی تێکەڵ بوو لەشامەوە یان لە میصرەوە بۆمان دەهات خەتی گەورەی تێدا بوو لە شێوەی پەراسو واتە خەتەکانی رێك نەبوون. وتی: وە (الْمِيثَرَة) شتێ بوو ژنان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان لە دیباج یان لە ئاوریشم دروست دەکرا عەجەمەکان بەکاریان دەهێنا.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## ئەنگوستیلە کردنە دەستی راست یان چەپ.

## ٥ - باب مَا جَاءَ فِي التَّخَتُّمِ فِي الْيَمِينِ أَوِ الْيَسَارِ.

٤٢٢٦ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه, عن النبي صلى الله عليه وسلم. قَالَ شَرِيكٌ: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلییەوە زای خوای لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم شەریك وتی: ئەبو سەلەمەی کوڕی (عبد الرحمن) پێی راگەیاندم کە

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی راستی.

٤٢٢٧ - (شاذ) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَسَارِهِ, وَكَانَ فَصُّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ نَافِعٍ بِإِسْنَادِهِ: فِي يَمِينِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی چەپی، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی. ئەبو داود دەڵێت: لە نافیعەوە بە هەمان سەنەد هاتوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی راستی.

٤٢٢٨ - (صحيح الإسناد) عن نافع: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَلْبَسُ خَاتَمَهُ فِي يَدِهِ الْيُسْرَى.

واتە: لە نافیعەوە دەگێرنەوە، کە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ ئەنگوستیلەکەی دەکردە دەستی چەپی.

٤٢٢٩ - (حسن صحيح) عن محمد بن إسحق قال: رَأَيْتُ عَلَى الصَّلْتِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ خَاتَمًا فِي خِنْصَرِهِ الْيُمْنَى, فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَلْبَسُ خَاتَمَهُ هَكَذَا, وَجَعَلَ فَصَّهُ عَلَى ظَهْرِهَا. قَالَ: وَلاَ يَخَالُ ابْنَ عَبَّاسٍ إِلاَّ قَدْ كَانَ يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَلْبَسُ خَاتَمَهُ كَذَلِكَ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: صەلتی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (عبد المطلب)م دی ئەنگوستیلەی کردبوە پەنجە توتەی دەستی راستی. وتم: ئەمە چی یە؟ وتی: ئیبنو عەباسم رەزای خوایان لێ بێ بینی بەم شێوەیە ئەنگوستیلەی لەدەستا بوو، نقێمەکەی کردبوە پشتی

دەستی. صەلت وتی: وا دەزانم ئیبنو عەباس باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو شێوەیە ئەنگوستیلەی لەدەست دەکرد واتە ئەنگوستیلەی دەکردە پەنجە توتەی دەستی راستی.

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە جەرەس.

## ٦ - باب مَا جَاءَ فِي الْجُلاَجِلِ.

٤٢٣٠ - (ضعيف) عن ابن جريج, قال: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ, أَنَّ عَامِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ - قَالَ عَلِيُّ بْنُ سَهْلٍ ابْنِ الزُّبَيْرِ - أَخْبَرَهُ أَنَّ مَوْلاَةً لَهُمْ ذَهَبَتْ بِابْنَةِ الزُّبَيْرِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَفِي رِجْلِهَا أَجْرَاسٌ, فَقَطَعَهَا عُمَرُ, ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ مَعَ كُلِّ جَرَسٍ شَيْطَانًا).

واتە: لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: عومەری کوڕی حەفص پێی راگەیاندم، کە عامیری کوڕی (عبد الله) - وتی: عەلی کوڕی سەهلی کوڕی زوبێر - پێی راگەیاند بەندەیەکی ئازاد کراویان هەبوو کچێکی زوبێری بردوە بۆ خزمەت پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ چەند جەرەسێ لە قاچی دا بوو، پێشەوا عومەر پچڕی. لەپاشدا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەگەڵ هەموو جەرەسێکدا شەیتانێ هەیە).

٤٢٣١ - (حسن) عن بنانة مولاة عبد الرحمن بن حيان الأنصاري, عن عائشة رضي الله عنها, قالت: بَيْنَمَا هِيَ عِنْدَهَا إِذْ دُخِلَ عَلَيْهَا بِجَارِيَةٍ وَعَلَيْهَا جَلاَجِلُ يُصَوِّتْنَ, فَقَالَتْ: لاَ تُدْخِلْنَهَا عَلَيَّ إِلاَّ أَنْ تَقْطَعُوا جَلاَجِلَهَا, وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ جَرَسٌ).

واتە: لە بونانەی بەندەی ئازاد كراوی (عبد الرحمن)ی كوڕی حەییانی ئەنصاریەوە، لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: جارێ (بُنَانَة)ی لەلا بوو كچێكیان هێنا بۆ لای جەرەسی پێوە بوو كە دەجولا دەنگی لێوە دەهات، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: مەیهێننە ژورەوە بۆ لام هەتا ئەو جەرەسانەی نەپچڕێنن، هەروەها وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (مەلائیكە ناچێتە ماڵێكەوە جەرەسی تێدا بێت).

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە بەستنەوەی ددان بە زێڕ.

## ٧ - باب مَا جَاءَ فِي رَبْطِ الأَسْنَانِ بِالذَّهَبِ.

٤٢٣٢ - (حسن) عن عبد الرحمن بن طرفة, أَنَّ جَدَّهُ عَرْفَجَةَ بْنَ أَسْعَدَ قُطِعَ أَنْفُهُ يَوْمَ الْكُلاَبِ, فَاتَّخَذَ أَنْفًا مِنْ وَرِقٍ فَأَنْتَنَ عَلَيْهِ, فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاتَّخَذَ أَنْفًا مِنْ ذَهَبٍ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی (طرفة)وە دەگێرنەوە، كە باپیری عەرفەجەی كوڕی ئەسعەد لە ڕۆژی (كولاب)دا لوتی بڕا، لوتێكی لە زیو بۆ خۆی دروست كرد، بۆگەنی كرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ كرد لوتێكی لە زێڕ بۆ خۆی دروست كرد.

٤٢٣٣ - عن عرفجة بن أسعد, بِمَعْنَاهُ. قَال يَزِيدُ: قُلْتُ لأَبِي الأَشْهَبِ: أَدْرَكَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ طَرَفَةَ جَدَّهُ عَرْفَجَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ.

واتە: لە عەرفەجەی كوڕی ئەسعەدەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە. یەزید وتی: بە ئەبو ئەشهەبم وت: (عبد الرحمن)ی كوڕی (طرفة) گەیشتوە

بە عەرفەجەی کوڕی ئەسعەد؟ وتی: بەڵێ.

٤٢٣٤ - (حسن) عن عرفجة بن أسعد, عن أبيه: أَنَّ عَرْفَجَةَ, بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە عەرفەجەی کوڕی ئەسعەدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە عەرفەجە، جا راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی دروستی زێڕ بۆ ئافرەتان.

## ٨ - باب مَا جَاءَ فِي الذَّهَبِ لِلنِّسَاءِ.

٤٢٣٥ - (حسن الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِلْيَةٌ مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ أَهْدَاهَا لَهُ فِيهَا خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ, قَالَتْ: فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُودٍ مُعْرِضًا عَنْهُ أَوْ بِبَعْضِ أَصَابِعِهِ, ثُمَّ دَعَى أُمَامَةَ ابْنَةَ أَبِي الْعَاصِ ابْنَةَ ابْنَتِهِ زَيْنَبَ, فَقَالَ: (تَحَلَّيْ بِهَذَا يَا بُنَيَّةُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلایەن نەجاشیەوە خشڵێکی بە دیاری بۆ هات ئەنگوستیلەیەکی زێڕی تێدا بوو نقێمێکی حەبەشی تێدا بوو، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە دارێ گرتی یان بە پەنجەی پشتی تێ کرد، لەپاشدا ئومامەی کچی ئەبو عاصی بانگ کرد کە کچی زەینەبی کچی بوو فەرمووی: (ئەی کچۆڵەکەم بەمە خۆت بڕازێنەوە).

٤٢٣٦ - (حسن) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُحَلِّقَ حَبِيبَهُ حَلْقَةً مِنْ نَارٍ فَلْيُحَلِّقْهُ حَلْقَةً مِنْ ذَهَبٍ, وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُطَوِّقَ حَبِيبَهُ طَوْقًا مِنْ نَارٍ فَلْيُطَوِّقْهُ طَوْقًا مِنْ ذَهَبٍ, وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُسَوِّرَ حَبِيبَهُ سِوَارًا مِنْ نَارٍ فَلْيُسَوِّرْهُ سِوَارًا مِنْ ذَهَبٍ, وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِالْفِضَّةِ فَالْعَبُوا بِهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوکەسەی حەز دەکات خۆشەویستەکەی حەلقەیەکی ئاگر بەکاربهێنێ، ئەوا با حەڵقەیەکی زێڕ بەکاربهێنێ ئیتر هەڵقەی زێڕ بێ بیکاتە پەنجەی یان گوارەی زێڕ بێ بیکاتە گوێی یا لوتەوانەی زێڕ بێ بیکاتە لوتی، ئەوکەسەی حەز دەکات خۆشەویستەکەی ملوانکەیە یان گەردنبەندێ لە ئاگر بکاتە گەردنی ئەوە با ملوانکەیە یان گەردنبەندێکی زێڕ بکاتە گەردنی یان پشتێنی زێڕ ببەستێتە کەمەری، ئەوکەسەی حەز دەکات خۆشەویستەکەی بازنێکی ئاگر بکاتە دەستی ئەوا با بازنێکی زێڕ بکاتە دەستی، بەڵام بە ئارەزووی خۆتان زیو بەکاربهێنن). - پێ دەچێت ئەمە لەسەرەتاوە بوو بێت ئەگینا زێڕ بۆ ئافرەتان دروستە - .

٤٢٣٧ - (ضعيف) عن ربعي بن حراش عن امرأته عن أخت لحذيفة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ, أَمَا لَكُنَّ فِي الْفِضَّةِ مَا تَحَلَّيْنَ بِهِ, أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تَحَلَّى ذَهَبًا تُظْهِرُهُ إِلاَّ عُذِّبَتْ بِهِ).

واتە: لە ربیعی کوڕی حیراشەوە، لە هاوسەرەکەیەوە، لە خوشکێکی (حُذَيْفَة) وە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی کۆمەڵی ژنان، یان دەبێ لە جیاتی زێڕ بە زیو خۆتان بڕازێننەوە یان ئەوەتا هەر ئافرەتێ لە ئێوە بە زێڕ خۆی بڕازێنێتەوەو خۆی پێوە دەربخات بۆ پیاوی بێگانەو بۆ فەخر و شانازی ئیللا ئەو کەسە پێی سزا دەدرێت).

٤٢٣٨ - (ضعيف) عن أسماء بنت يزيد, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ تَقَلَّدَتْ قِلاَدَةً مِنْ ذَهَبٍ قُلِّدَتْ فِي عُنُقِهَا مِثْلَهُ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ جَعَلَتْ فِي أُذُنِهَا خُرْصًا مِنْ ذَهَبٍ جُعِلَ فِي أُذُنِهَا مِثْلُهُ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر ئافرەتێ ملوانکەیەکی زێڕ بکاتە گەردنی، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا ملوانکەیەکی ئاگری لەو شێوە دەکەنە گەردنی. وە هەر ئافرەتێ گوارەی زێڕ بکاتە گوێی ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا گوارەیەکی ئاگری لەو شێوە دەکەنە گوێی).

٤٢٣٩ - (صحيح) عن معاوية بن أبي سفيان: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ رُكُوبِ النِّمَارِ, وَعَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلاَّ مُقَطَّعًا.

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری کردوە لە سواربوونی ئەو وڵاخەی کە کۆپانەکەی لە کەوڵی پڵنگ بێ، هەروەها ڕێگری کردوە لە پۆشینی زێڕ مەگەر پارچەی بچوک.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی فیتنەو ئاژاوەکان و کوشتارە هەرە گەورەکان.

# ٢٩ - أول كتاب الفتن والملاحم.

## باسی فیتنەو ئاژاوەکان و بەڵگە و نیشانەکانیان.

## ١ - باب ذِكْرِ الْفِتَنِ وَدَلاَئِلِهَا.

٤٢٤٠ - (صحيح) عن حذيفة قال: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمًا فَمَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ حَدَّثَهُ, حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ, وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ, قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابُهُ هَؤُلاَءِ, وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ, ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ.

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە لەسەر مینبەر وتارێکی بۆ خوێندینەوە، لەناو ئەو وتارەدا هەرچی رویدابێ و هەرچی رودەدات هەتا هەستانی رۆژی قیامەت باسی کرد، ئەوی لەیادی مابێ لەیادی ماوەو ئەوەشی لەیادی چوبێتەوە لەیادی چۆتەوە، هاوەڵەکانی ئەوە باش دەزانن ئەوانەی کە لەوێ ئامادەبوون، جاری وا دەبێ شتێ لەو بابەتە رودەدات من خۆم لەیادم نەماوە بەڵام کە رودەدات دەیبینم ئینجا یادم دەکەوێتەوە وەك چۆن پیاوێ لەپاش ماوەیە چاوی بە پیاوێکی ناسیاوی خۆی

بکەوێتەوە کە لەیادی نەمابێ بەڵام کە دەیبینێ یادی دەکەوێتەوەو دەیناسێتەوە.

٤٢٤١ - (ضعيف) عن حذيفة بن اليمان قال: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي أَنَسِيَ أَصْحَابِي أَمْ تَنَاسَوْا؟! وَاللَّهِ مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ قَائِدِ فِتْنَةٍ إِلَى أَنْ تَنْقَضِيَ الدُّنْيَا يَبْلُغُ مَنْ مَعَهُ ثَلاَثَمِائَةٍ فَصَاعِدًا إِلاَّ قَدْ سَمَّاهُ لَنَا بِاسْمِهِ وَاسْمِ أَبِيهِ وَاسْمِ قَبِيلَتِهِ!.

واتە: لە (حذيفة)ی کوڕی یەمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سوێند بە (الله) نازانم هاوڕێکانم لەیادیان نەماوە یان خۆیان لەبیری خۆیانی دەبەنەوە؟! سوێند بە (الله) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ شتێکی تەرك نەکرد لەباسی ئەو کەسەی کە سەرکردەی فیتنە و ئاژاوەگێڕی دەکات و بانگەواز بۆ بیدعەو گومڕایی و جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان دەکات و ژمارەی شوێنکەوتوانی بگەنە سێ سەد کەس یان زیاتر هەتا دونیا کۆتایی دێ ئیللا ناوی خۆی و باوکی و هۆزەکەیشی یەك بە یەك پێ وتین و بۆی باس کردین!.

٤٢٤٢ - (ضعيف) عن عبد الله, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (يَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ أَرْبَعُ فِتَنٍ فِي آخِرِهَا الْفَنَاءُ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چوار فیتنەو ئاژاوەی گەورە لەناو ئەم ئومەتی ئیسلامەدا بەرپا دەبێت، لە چوارەمیاندا نەمان و لەناوچوونە).

٤٢٤٣ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: كُنَّا قُعُودًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ الْفِتَنَ, فَأَكْثَرَ فِي ذِكْرِهَا حَتَّى ذَكَرَ فِتْنَةَ الأَحْلاَسِ, فَقَالَ: قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا فِتْنَةُ الأَحْلاَسِ؟ قَالَ: (هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ, ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ

دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَىْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي, يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي وَلَيْسَ مِنِّي, وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِيَ الْمُتَّقُونَ, ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ, ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ لاَ تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ إِلاَّ لَطَمَتْهُ لَطْمَةً, فَإِذَا قِيلَ انْقَضَتْ تَمَادَتْ, يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا, حَتَّى يَصِيرَ النَّاسُ إِلَى فُسْطَاطَيْنِ: فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لاَ نِفَاقَ فِيهِ, وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لاَ إِيمَانَ فِيهِ, فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ مِنْ يَوْمِهِ أَوْ مِنْ غَدِهِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوین باسی فیتنەو ئاژاوەکانی بۆ کردین، زۆر باسی کرد هەتا هاتە سەر فیتنەو ئاژاوەی ئەحلاس واتە ژێر کورتان، یەکێ لە قسەکەران وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵاو فیتنەو ئاژاوەی ئەحلاس چۆنەو چی یە؟ فەرمووی: (بریتی یە لە جەنگ و ئاشوب و فەرتەنەو هەڵهاتن لەترسی یەکتر، لەپاشدا فیتنەو ئاژاوەی (سَّرَّاء) ئاگری ئەم بەڵاو فیتنەیە پیاوێ لە کەسوکاری من هەڵیدەگرسێنێ، پێی وایە لە منە بەڵام ئەو لەمن نیە، بەڵکو پیاوچاکان و لە خوا ترسەکان دۆست و پشتیوانی منن، لەپاشدا خەڵکەکە لەسەر سەرۆکایەتی پیاوێکی خراپ و نالەبار رێك دەکەون و بەڵێن و پەیمانی دەدەنێ کاروبارەکان بە رێك و پێکی بەرێوە نابات و بەردەوام نابێ، لەپاشدا فیتنەو ئاژاوەی رەش(دُهَیمَاء) بەرپا دەبێت هیچ کەسێ لەم گەلی ئیسلامە نامێنێ پشکێکی لەو بەڵاو فیتنەیە بەرنەکەوێت، کاتێ کە وترا ئەو فیتنەو ئاژاوەیە تەواو دەبێت سەرلەنوێ هەڵدەگرسێتەوە بەوشێوەیە بەردەوام دەبێت، کار دەگاتە رادەیە پیاو بەیانی موسوڵمانە کەچی ئێوارە کافر و بێ بڕوایە، هەتا بەرە بەرە خەڵك دەبن بە دوو دەستەوە: دەستەی موسوڵمانی پاك و بێ غەل و غەش کە دووڕوویی و ناپاکی تێیدا نیە، دەستەی دووڕوویی و ناپاکی کە ئیمانی تێیدا نیە، جا کە بارودۆخ گەیشتە ئەم رادەیە ئیتر بۆ سبەینێ یان دووسبەی ئەو رۆژە چاوەڕێی دەرکەوتنی دەجال بکەن).

٤٢٤٤ - (حسن) عن سبيع بن خالد قال: أَتَيْتُ الْكُوفَةَ فِي زَمَنٍ فُتِحَتْ تُسْتَرُ أَجْلُبُ مِنْهَا بِغَالاً, فَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ, فَإِذَا صَدْعٌ مِنَ الرِّجَالِ وَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ تَعْرِفُ إِذَا رَأَيْتَهُ أَنَّهُ مِنْ رِجَالِ أَهْلِ الْحِجَازِ, قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَتَجَهَّمَنِي الْقَوْمُ, وَقَالُوا: أَمَا تَعْرِفُ هَذَا؟! هَذَا حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ حُذَيْفَةُ: إِنَّ النَّاسَ كَانُوا يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْخَيْرِ, وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ, فَأَحْدَقَهُ الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ, فَقَالَ: إِنِّي قَدْ أَرَى الَّذِي تُنْكِرُونَ, إِنِّي قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَرَأَيْتَ هَذَا الْخَيْرَ الَّذِي أَعْطَانَا اللَّهُ أَيَكُونُ بَعْدَهُ شَرٌّ كَمَا كَانَ قَبْلَهُ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قُلْتُ: فَمَا الْعِصْمَةُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: (السَّيْفُ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, ثُمَّ مَاذَا يَكُونُ؟ قَالَ: (إِنْ كَانَ لِلَّهِ خَلِيفَةٌ فِي الأَرْضِ فَضَرَبَ ظَهْرَكَ وَأَخَذَ مَالَكَ فَأَطِعْهُ, وَإِلاَّ فَمُتْ وَأَنْتَ عَاضٌّ بِجِذْلِ شَجَرَةٍ). قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: (ثُمَّ يَخْرُجُ الدَّجَّالُ مَعَهُ نَهْرٌ وَنَارٌ, فَمَنْ وَقَعَ فِي نَارِهِ وَجَبَ أَجْرُهُ وَحُطَّ وِزْرُهُ, وَمَنْ وَقَعَ فِي نَهْرِهِ وَجَبَ وِزْرُهُ وَحُطَّ أَجْرُهُ). قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: (ثُمَّ هِيَ قِيَامُ السَّاعَةِ).

واتە: لە سوبەیعی كوڕی خالیدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەسەردەمی رزگاركردنی شاری توستەردا هاتم بۆ كوفە - ئەمڕۆ گەورەترین شاری ئێستای خوزستانە ئەبو موسای ئەشعەری رزگاری كرد لەسەردەمی خەلیفە عومەردا رەزای خوای لێ بێ -، چومە مزگەوتی كوفەوە، كۆمەڵێ خەڵكی لێ بوو گەنجێ لەوانە بە جل و بەرگ و شكڵ و شێوەیدا لە خەڵكی حیجاز دەچوو، وتی: وتم: ئەم پیاوە كێ یە، خەڵكەكە بە روخساریان شوێنەواری پێ ناخۆش بوونیان نیشاندام، وتیان: ئایا ئەوە ناناسی؟ ئەوە (حذیفة)ی كوڕی یەمانی هاوەڵی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، (حذیفة) وتی: خەڵك دەربارەی خێر و چاكە لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم دەپرسی، بەڵام من لەبارەی شەڕ و خراپەوە لێم دەپرسی، خەڵكەكە روویان تێ كردو سەیریان دەكرد چاوەڕێی بیستنی ئەوەیان دەكرد كە دەیوت، (حذیفة) وتی: دەمبینی خەڵكەكە ئینكاری ئەو پرسیارانەیان دەكرد كە لەبارەی خراپەو شەڕەوە لێم دەپرسی، منیش

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە لە خراپەو نەفامیدا بووین خوای گەورە ئەم خێرو بێرەی هێناوە بۆمان، واتە: ئیسلام. ئایا لەدوای ئەم خێرو بێرە دەوری خراپەو شەڕ دێتەوە وەك چۆن لەپێشەوە هەبوو؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتم: ڕێگەی دەربازبوون و رزگاربوون لەو شەڕو خراپە کامەیە کە دامەزراو بین لەسەری وە چۆن خۆمانی لێ بپارێزین؟ فەرمووی: (شمشێر) واتە جیهادو تێکۆشان و بەکارهێنانی هێزە بەرامبەر بەوانەی کە هەقە لەگەڵیان بجەنگن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەپاش ئەوە چی روو دەدات؟ فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە لەسەر زەوی دا خەلیفەیەکی بۆ دانان بەگوێی بکەو ئەگەر بە توندی لە پشتی دایت واتە زوڵم و ستەمت لێ بکات و ماڵ و سامانەکەت زەوت بکات، لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیامەبەرەوەو ئارام بگرە هەرچەندە زیانت پێ بگات، ئەگەر ئاژاوەو بشێوی و دەستە دەستەیی و گێرەشێوێنی وڵاتی گرتەوەو فەرمانڕەوایە نەبوو کاروباری دین و دونیا بگرێتە دەست و پارێزگاری لە گەل و وڵات بکات ئەو کاتە خۆت کەناربگرە ئەگەر بشمریت لە حاڵێکدا قەپت کردبێت بە ڕەگی درەختێکدا و لەژێریا بمێنەرەوە و بەدور بە لە بەڵاو فیتنە، خۆت مەخەرە ناو ئاژاوەو بەشداری جەنگ مەکە). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی لەپاش ئەوە چی روو دەدات؟ فەرمووی: (لەپاشدا دەججال پەیدا دەبێت دەریایەك و ئاگرێکی پێ یە، ئەو کەسەی فەرمانبەرداری نەکات و بیخاتە ئاگرەکەیەوە ئەوە سەلامەتەو پاداشتی مسۆگەر دەبێت و گوناهەکانیشی لەسەر لادەچێت چونکە ئاگری راستی نیەو سیحرە، ئەو کەسەش فەرمانبەرداری بکات و بیخاتە دەریاکەیەوە ئەوە تاوانباربوونی مسۆگەر دەبێت و پاداشتی لەدەست دەچێت و کردەوە چاکەکانی پوچەڵ دەبنەوە). وتی: وتم: ئەی لەدوای ئەوە چی روو دەدات؟ فەرمووی: (لەدوای ئەوە قیامەت هەڵئەسێ و دونیا کۆتایی پێ دێت).

٤٢٤٥ - (حسن) عن خالد بن خالد اليشكري, بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ: قُلْتُ: بَعْدَ السَّيْفِ؟ قَالَ: (بَقِيَّةٌ عَلَى أَقْذَاءٍ, وَهُدْنَةٌ عَلَى دَخَنٍ). ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ, قَالَ: كَانَ قَتَادَةُ يَضَعُهُ عَلَى الرِّدَّةِ الَّتِي فِي زَمَنِ أَبِي بَكْرٍ (عَلَى أَقْذَاءٍ): يَقُولُ: قَذًى. (وَهُدْنَةٌ). يَقُولُ: صُلْحٌ (عَلَى دَخَنٍ). عَلَى ضَغَائِنَ.

واتە: لە خالیدی کوڕی خالیدی یەشکورییەوە هەمان فەرموودەی پێشو هاتوە، (حذیفة) وتی: وتم: ئەی لەدوای شمشێر؟ فەرمووی: (خەڵك لەسەر تۆز و غوبار دەمێننەوە واتە لەسەر خراپی دڵەکانیان، هەروەها ئاشتەوایی و ئاگربەستێك روودەدات لەسەر خراپەو فرِوفێڵ و ناپاکی واتە لەرِواڵەتدا ئاشتەوایی و ئاگربەستە بەڵام لە ناوەرِۆکدا فرِوفێڵ و ناپاکی یە). لەپاشدا راوی فەرموودەکەی گێرِایەوە، راوی وتی: قەتادە (عَلَى أَقْذَاءٍ)ی لەم فەرموودەدا بەوە داناوە کە ئاماژەیە بۆ هەڵگەرِاوەکانی سەردەمی پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ.

٤٢٤٦ - (حسن) عن نصر بن عاصم الليثي قال: أَتَيْنَا الْيَشْكُرِيَّ فِي رَهْطٍ مِنْ بَنِي لَيْثٍ, فَقَالَ: مَنِ الْقَوْمُ؟ فَقُلْنَا: بَنُو لَيْثٍ, أَتَيْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ حَدِيثِ حُذَيْفَةَ, فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: (فِتْنَةٌ وَشَرٌّ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَلْ بَعْدَ هَذَا الشَّرِّ خَيْرٌ؟ قَالَ: (يَا حُذَيْفَةُ تَعَلَّمْ كِتَابَ اللَّهِ وَاتَّبِعْ مَا فِيهِ). ثَلاَثَ مِرَارٍ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَلْ بَعْدَ هَذَا الشَّرِّ خَيْرٌ؟ قَالَ: (هُدْنَةٌ عَلَى دَخَنٍ, وَجَمَاعَةٌ عَلَى أَقْذَاءٍ فِيهَا أَوْ فِيهِمْ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, الْهُدْنَةُ عَلَى الدَّخَنِ مَا هِيَ؟ قَالَ: (لاَ تَرْجِعُ قُلُوبُ أَقْوَامٍ عَلَى الَّذِى كَانَتْ عَلَيْهِ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَبَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: (فِتْنَةٌ عَمْيَاءُ صَمَّاءُ, عَلَيْهَا دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ النَّارِ, فَإِنْ تَمُتْ يَا حُذَيْفَةُ وَأَنْتَ عَاضٌّ عَلَى جِذْلٍ خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَتَّبِعَ أَحَدًا مِنْهُمْ).

واتە: لە نەصری کوڕی عاصیمی (الليثي)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: یەشکوری لەگەڵ کۆمەڵێ لە (بني ليث) هات، وتی: ئەم هۆزە کێن؟ وتمان: (بنو ليث)ین هاتوین دەربارەی فەرموودەکەی (حذيفة) پرسیارت لێ بکەین، جا (حذيفة) فەرموودەکەی گێڕایەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا لەدوای ئەم خێرو بێرە دەوری خراپەو شەڕ دێتەوە؟ فەرمووی: (فیتنەو ئاژاوەو جەنگ و خراپەکاری). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی

الله عليه وسلم، ئەی لەپاش ئەو فیتنەو ئاژاوەو جەنگ و خراپەکاریە دەوری خێرو بێر دێتەوە؟ سێ جار فەرمووی: (ئەی (حذيفة) قورئانەکەی خوای گەورە فێربەو شوێن ئایەتەکانی بکەوە)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەی لەپاش ئەو جەنگ و ئاژاوەو خراپەکاریە دەوری خێرو بێر دێتەوە؟ فەرمووی: (ئاشتەوایی و ئاگربەستێك روودەدات لەسەر خراپەو فڕوفێڵ و ناپاکی واتە لەڕواڵەتدا ئاشتەوایی و ئاگربەستە بەڵام لە ناوەڕۆکدا فڕوفێڵ و ناپاکی یە خەڵك لەسەری دەمێننەوە، کۆمەڵێ لەسەر تۆز و غوبار دەمێننەوە واتە وەك تۆز و غوبار لە چاویاندا بێت زیانیان پێ دەگەیەنێت و سودی نیە بۆیان بەو شێوەیە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، (الْهُدْنَةُ عَلَى الدَّخَنِ) یانی چی؟ فەرمووی: (خەڵکەکان دڵەکانیان نایەتەوە جێگای خۆی کە پێشتر لەسەری بوون). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئایا لەدوای ئەم خێرو بێرە دەوری خراپەو شەڕ دێتەوە؟ فەرمووی: (فیتنەو ئاژاوەو جەنگەی کەڕ و کوێر واتە خەڵك هەق نابیستن و ئامۆژگاری وەرناگرن لەبەردەم دەرگاکانیدا بانگخواز خەڵك بانگ دەکەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، ئەی (حذيفة) قەپ بکە بە رەگی درەختێکدا و لەژێریا بمێنەرەوە و بەدور بە لە فیتنەو ئاژاوە هەتا دەمریت، ئەوە بۆ تۆ چاکترە وەك لەوەی شوێن یەکێ لەوانە بکەویت).

| ٤٢٤٦ / م - عن عمرو بن العاص, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (كَيْفَ بِكُمْ وَبِزَمَانٍ أَوْ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ زَمَانٌ يُغَرْبَلُ النَّاسُ فِيهِ غَرْبَلَةً تَبْقَى حُثَالَةٌ مِنَ النَّاسِ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَأَمَانَاتُهُمْ, وَاخْتَلَفُوا فَكَانُوا هَكَذَا). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. فَقَالُوا: وَكَيْفَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (تَأْخُذُونَ مَا تَعْرِفُونَ, وَتَذَرُونَ مَا تُنْكِرُونَ, وَتُقْبِلُونَ عَلَى أَمْرِ خَاصَّتِكُمْ, وَتَذَرُونَ أَمْرَ عَامَّتِكُمْ). |
|---|

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوور نیە سەردەمێك خەڵك بە بێژران بێژرێن واتە چاکەکان بڕۆن و هەرچی و پەرچی و خراپەکارەکان بمێننەوە بێ پەیمان و ناپاك، لەنێو

خۆياندا ناكۆكيش دەبن بەم شێوەيە). پەنجەكانى كرد بەناو يەكدا، وتيان: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم ئێمە چى بكەين؟ فەرمووى: (ئەوە وەردەگرن كە دەيزانن، واز لەوە دەهێنن كە نكوڵى لێ دەكەن، خەريكى خۆتان دەبن و واز لە كاروبارى گشتى دەهێنن).

٤٢٤٦ / م - عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: بَيْنَمَا نَحْنُ حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ ذَكَرَ الْفِتْنَةَ - أو ذُكرت عنده - فَقَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَخَفَّتْ أَمَانَاتُهُمْ, وَكَانُوا هَكَذَا). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. قَالَ: فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: كَيْفَ أَفْعَلُ عِنْدَ ذَلِكَ جَعَلَنِى اللَّهُ فِدَاكَ؟ قَالَ: (الْزَمْ بَيْتَكَ, وَامْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ, وَخُذْ بِمَا تَعْرِفُ, وَدَعْ مَا تُنْكِرُ, وَعَلَيْكَ بِأَمْرِ خَاصَّةِ نَفْسِكَ, وَدَعْ عَنْكَ أَمْرَ الْعَامَّةِ).

واتە: لە (عبد الله)ى كوڕى عەمرى كوڕى عاصەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: جارێ لەدەورى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم كۆبوبوينەوە باسى بەڵاو ئاژاوە كرا - يان لەيدا باسكرا - فەرمووى: (ئەگەر خەڵكتان بينى بەڵێن و پەيمانيان نەبردە سەرو، سپاردەو ئەمانەتيان لا سوك بوو بەم شێوەيە بوون). پەنجەكانى كرد بەناو يەكدا، وتى: منيش هەستام لەبەرى و وتم: وتيان: ئەى من چى بكەم ئەو كاتە خواى گەورە بمكات بە قوربانت؟ فەرمووى: (لەماڵى خۆت دانيشەو، زمانى خۆت بگرە، هەرچى چاكە ئەوە بكە، واز لە خراپە بهێنە، واز لە كاروبارى گشتى بهێنە).

٤٢٤٧ - (حسن) عن حذيفة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (فَإِنْ لَمْ تَجِدْ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةً فَاهْرَبْ حَتَّى تَمُوتَ, فَإِنْ تَمُتْ وَأَنْتَ عَاضٌّ). وَقَالَ فِي آخِرِهِ: قَالَ: قُلْتُ: فَمَا يَكُونُ بَعْدَ ذَلِكَ؟ قَالَ: (لَوْ أَنَّ رَجُلاً نَتَجَ فَرَسًا لَمْ تُنْتَجْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ).

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەو کاتەدا خەلیفەت دەست نەکەوت هەڵبێ هەتا دەمریت، ئەگەر بشمریت لە حاڵێکدا قەپت کردبێت بە ڕەگی درەختێکدا). راوی لە کۆتایی فەرموودەکەدا وتی: وتم: ئەی لەدوای ئەوە چی روودەدات؟ فەرمووی: (ئەگەر پیاوێ هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی بێچوە ماینێ بە راستەوخۆی هۆکارەکان بێچوەکە بەرهەم ناهێنێ هەتا قیامەت هەڵئەسێ مەبەست رونکردنەوەی نزیکی قیامەتە). ئەگەر بێچوەکەش بەرهەم بهێنێ بەرهەمی نابێ بۆی ئەوەندە قیامەت نزیك دەبێتەوە فریای ئەوە ناکەوێ ئەو بێچوە گەورە ببێ هەتا سواری ببێ و سودی لێ وەرگرێت، یا لەبەر فیتنەو ئاژاوە بواری نابێ سواری ببێ.

٤٢٤٨ - صحيح) عن عبد الرحمن بن عبد رب الكعبة, عن عبد الله بن عمرو, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ بَايَعَ إِمَامًا فَأَعْطَاهُ صَفْقَةَ يَدِهِ وَثَمَرَةَ قَلْبِهِ, فَلْيُطِعْهُ مَا اسْتَطَاعَ, فَإِنْ جَاءَ آخَرُ يُنَازِعُهُ فَاضْرِبُوا رَقَبَةَ الآخَرِ). قُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي. قُلْتُ: هَذَا ابْنُ عَمِّكَ مُعَاوِيَةُ يَأْمُرُنَا أَنْ نَفْعَلَ وَنَفْعَلَ, قَالَ: أَطِعْهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ, وَاعْصِهِ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی (عَبْدِ رَبِّ الْكَعْبَة)وە، لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەڵێن و پەیمانی دا بە پێشەوایە، دەستی خستە ناو دەستی بە دڵ خۆشی ویست و راستگۆ و دڵسۆز بوو، ئیتر با بەپێی توانا گوێڕایەڵی بکات و لە فەرمانی دەرنەچێت، ئەگەر کەسێکی تر هات و بەربەرەکانێی کردو ویستی خۆی ببێ بە پێشەوا رێگەی پێ مەدەن ئەگەر هەر وازی نەهێنا ئەوە بدەن لە گەردنی). (عبد الرحمن)وتی: وتم: ئەی (عبد الله) تۆ ئا ئەمەت لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیستوە؟ وتی: بەڵێ بەم دوو گوێچکەیە گوێم لەم فەرموودانە بووە، بەدڵیش وەرم گرتوون. وتم: ئەمە موعاویەی ئامۆزاتە فەرمانمان پێ دەکات ئەوە بکەین و ئەوە بکەین - واتە

عەلی پێشتر پێشەوا بووە کەچی موعاویە بەربەرەکانێی دەکات و فەرمانمان پێ دەکات ئێمەش دژی بجولێینەوە -، (عبد الله) وتی: لەو شتانەدا کە موعاویە بە گوێی خوای گەورە دەکات تۆش بە گوێی بکە، لەو شانەشدا کە نافەرمانی خوای گەورە دەکات تۆش نا فەرمانی بکەو بەگوێی مەکە.

٤٢٤٩ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ, أَفْلَحَ مَنْ كَفَّ يَدَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هاوار لە عەرەب بۆ ئەم شەڕە گەورەیەی کە نزیکە بەرپا بێت و ڕوو بدات، سەرفراز و سەرکەوتوە ئەو کەسەی کە دەستی بگرێتەوە و بەشداری ئەو شەڕە نەکات و تێوە نەگلێ).

٤٢٥٠ - (صحيح) عن ابن عمر قال, قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُوشِكُ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يُحَاصَرُوا إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى يَكُونَ أَبْعَدُ مَسَالِحِهِمْ سَلاَحَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نزیکە موسوڵمانان لە کافران هەڵبێن بەرەو شاری مەدینەو لەوێ گەمارۆ بدرێن، بە شێوەیە ناوچەی (سَلاَحَ) کە شوێنێکە لە نزیك خەیبەر دەبێتە دوورترین قەڵاو سنوری خۆحەشاردانیان).

٤٢٥١ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن الزهري قال: وَسَلاَحُ: قَرِيبٌ مِنْ خَيْبَرَ.

واتە: لە پێشەوا زوهریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (سَلاَحَ) شوێنێکە لە نزیك خەیبەر.

٤٢٥٢ - (صحيح) عن ثوبان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ زَوَى لِيَ الأَرْضَ). أَوْ قَالَ: (إِنَّ رَبِّي زَوَى لِيَ الأَرْضَ, فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا, وَإِنَّ مُلْكَ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا, وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ: الأَحْمَرَ وَالأَبْيَضَ, وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي أَنْ لاَ يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ بِعَامَّةٍ, وَلاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ, وَإِنَّ رَبِّي قَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ, إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لاَ يُرَدُّ, وَلاَ أُهْلِكُهُمْ بِسَنَةٍ بِعَامَّةٍ وَلاَ أُسَلِّطُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ, وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا - أَوْ قَالَ بِأَقْطَارِهَا - حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا, وَحَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يَسْبِي بَعْضًا. وَإِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ, وَإِذَا وُضِعَ السَّيْفُ فِي أُمَّتِي لَمْ يُرْفَعْ عَنْهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ, وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ, وَحَتَّى تَعْبُدَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي الأَوْثَانَ, وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي كَذَّابُونَ ثَلاَثُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ, وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي, وَلاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ). - قَالَ ابْنُ عِيسَى: (ظَاهِرِينَ). ثُمَّ اتَّفَقَا -: (لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ).

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە زەوی کۆکردەوە بۆم و هێنایە بەرچاوم رۆژهەڵات و رۆژئاوایم دی، بێگومان قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی من دەگاتە ئەو شوێنانەی کە دیمن، دوو گەنجینەی بەخشیوە پێم گەنجینەیەکی سور و گەنجینەیەکی سپی - گەنجینەی سور واتە ئاڵتون، گەنجینەی سپی واتە زیو مەبەست لە گەنجینەی وڵاتی رۆم و فارسە -، من داوام کرد لە پەروەردگارم بە قات و قڕی و وشکە ساڵی و گرانی گشتی تێکڕا بەجارێ نەیانفەوتێنێ و لەناویان نەبات، دوژمنێکی لە غەیری خۆیان زاڵ نەکات بەسەریاندا لە رەگ وریشە دەریان بێنێ و شکۆی ئیسلام نەهێڵێ، پەروەردگارم پێی فەرمووم: ئەی موحەممەد، بڕیاری من رەدبونەوەی بۆ نیە، من ئەوەم بەخشیوە بە ئوممەتەکەت کە بە قات و قڕی و وشکە ساڵی و گرانی گشتی تێکڕا بەجارێ نەیانفەوتێنم و لەناویان نەبەم، وە دوژمنێکی لە غەیری خۆیان زاڵ نەکەم بەسەریاندا لە رەگ و ریشە دەریان

بهێنێ، ئەگەر دوژمنان لە هەوو لایەکی سەر زەویەوە کۆببنەوە کەلەکۆمەتان لێ بکەن دەرەقەتتان نایەن بەمەرجێ خۆ خۆر نەبن و سەر و ماڵ و ناموسی یەکتر بە تاڵان نەبەن، لە ڕاستی دا مەترسی هەرە گەورەم لە پێشەواو سەرۆکە سەرکەش و گومڕاو ملهوڕەکانە کە خەڵك بانگ دەکەن بۆ تاوان و خراپەکاری و بیدعەو گومڕایان دەکەن، هەرکاتێ شمشێر نرایە سەر ملی ئوممەتی من و جەنگ و ئاژاوەی تێکەوت ئیتر هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت لێرەو لەوێ، قیامەت هەڵناسێ هەتا چەند تیرەو هۆزێك لە ئوممەتی من پەیوەندی دەکەن بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوەو دەچنە ریزی ئەوانەوە، وە هەتا چەند تیرەو هۆزێك لە ئوممەتی من بت دەپەرستنەوە، سی کەسی درۆزن لەناو ئوممەتی من دا پەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن هەر هەموویان بە درۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن و خۆیان بە پێغەمبەر دەزانن. من دواهەمینی پێغەمبەرانم و لەدوای من هەتا هەتایە پێغەمبەری تر نایەت، بەردەوام کۆمەڵێ لە ئومەتەکەم لەسەر هەقن، ئاشکرا و دیارن، ئەوەی دژیان بێت زیانیان پێ ناگەیەنێ هەتا فەرمانی خوای گەورە دێت واتە تا نزیکی قیامەت).

٤٢٥٣ - (ضعيف, لكن الجملة الثالثة صحيح) عن أبو مالك الأشعري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ أَجَارَكُمْ مِنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ: أَنْ لاَ يَدْعُوَ عَلَيْكُمْ نَبِيُّكُمْ فَتَهْلِكُوا جَمِيعًا, وَأَنْ لاَ يَظْهَرَ أَهْلُ الْبَاطِلِ عَلَى أَهْلِ الْحَقِّ, وَأَنْ لاَ تَجْتَمِعُوا عَلَى ضَلاَلَةٍ).

واتە: لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لە سێ شت پاراستونی: پێغەمبەرەکەتان دوعاتان لێ ناکات هەر هەمووتان بە تێکڕا لەناوبچن، ئەهلی دینی ناهەق و پوچ و بەتاڵ - کە بریتین لە کافران - بە تەواوەتی زاڵ نابن بەسەر ئەهلی دینی هەق دا - واتە ئەهلی دینی ئیسلام، لەسەر گومڕایش کۆنابنەوە).

٤٢٥٤ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (تَدُورُ رَحَى الإِسْلاَمِ لِخَمْسٍ وَثَلاَثِينَ, أَوْ سِتٍّ وَثَلاَثِينَ, أَوْ سَبْعٍ وَثَلاَثِينَ فَإِنْ يَهْلِكُوا فَسَبِيلُ مَنْ هَلَكَ, وَإِنْ يَقُمْ لَهُمْ دِينُهُمْ يَقُمْ لَهُمْ سَبْعِينَ عَامًا). قَالَ: قُلْتُ: أَمِمَّا بَقِيَ أَوْ مِمَّا مَضَى؟ قَالَ: (مِمَّا مَضَى).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی موسعودەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (فەرمانڕەوایی ئیسلام تا سی و پێنج یان سی و شەش یا سی و حەوت ساڵ بەڕێوە دەچێت، ئەگەر لەدوای ئەو سی و ئەوەندە ساڵە لەناوچون ئەوە حاڵی ئەوانیش وەك حاڵی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئەوانەوە لەناوچون، بەڵام ئەگەر لەدوای ئەو سی پێنج ساڵە دینەکەیان بە ڕێك و پێکی بۆیان چوو بەڕێوە ئەوە هەتا حەفتا ساڵ پایەدار دەبێ). وتی: وتم: ئایا حەفتا ساڵی تریش، یان بە سی و پێنج ساڵەکەوە تا حەفتا ساڵ پایەدار دەبێ ؟ فەرمووی: (بە سی و پێنج ساڵەکەوە تا حەفتا ساڵ پایەدار دەبێ).

٤٢٥٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ, وَيَنْقُصُ الْعِلْمُ, وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ, وَيُلْقَى الشُّحُّ, وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَيَّةُ هُوَ؟ قَالَ: (الْقَتْلُ الْقَتْلُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕۆژگار نزیك دەبێتەوە، زانستی شەرعی کەم دەبێت، فیتنەو ئاژاوە پەرەدەسێنێ، ڕژدی و چروکی لەدڵدا ڕەگ دادەکوتێ و خەڵك ڕژدو چروك دەبن، (هَرْج) زۆر دەبێ، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چی شتێ (هَرْج)ە؟ فەرمووی: (کوشتن کوشتن).

## سەبارەت بە نەهی کردن لە هەوڵدان بۆ هەڵگرساندنی فیتنەو ئاژاوە.

## ٢ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ السَّعْيِ فِي الْفِتْنَةِ.

٤٢٥٦ - (صحيح) عن مسلم بن أبي بكرة, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ يَكُونُ الْمُضْطَجِعُ فِيهَا خَيْرًا مِنَ الْجَالِسِ, وَالْجَالِسُ خَيْرًا مِنَ الْقَائِمِ, وَالْقَائِمُ خَيْرًا مِنَ الْمَاشِي, وَالْمَاشِي خَيْرًا مِنَ السَّاعِي). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: (مَنْ كَانَتْ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ, وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ, وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ). قَالَ: فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: (فَلْيَعْمِدْ إِلَى سَيْفِهِ فَلْيَضْرِبْ بِحَدِّهِ عَلَى حَرَّةٍ, ثُمَّ لِيَنْجُ مَا اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ).

واتە: لە موسلیمی کوڕی (أَبِي بَكْرَة)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (فیتنەو ئاژاوەی گەورە بەرپادەبێ، خۆتانی لێ بەدوور بگرن ئەوکەسەی راکشێ چاکترە لەو کەسەی کە دانیشتوە، ئەوکەسەی کە دانیشتوە چاکترە لەو کەسەی کە بە پێوەیە، ئەوکەسەی کە بە پێوەیە چاکترە لەو کەسەی کە ڕێ دەکات، ئەوکەسەی کە ڕێ دەکات چاکترە لەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بۆ هەڵگیرسانی و دەستی تێی دایە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانم بە چی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (ئەو کەسە کە وشتری هەیە بچێت بەدەم وشترەکانیەوەو سەرەوکاری وشترەکانی بکات، ئەو کەسە کە مەڕی هەیە بچێت بەدەم مەڕەکانیەوەو سەرپەرشتی مەڕەکانی بکات، ئەو کەسە کە زەوی و زاری هەیە بچێت بەدەم زەوی زارەکەیەوە ئیتر هەتا بۆی دەکرێت بەشداری ئەو فیتنەو ئاژاوەیە نەکات و خۆی بەدوور بگرێت). وتی: ئەی ئەگەر کەسێ ئەو شتانەی

نەبوو چی بكات؟ فەرمووی: (شمشێرەكەی بێنیٚ دەمە تیژەكەی بشكێنیٚ و نەجەنگیٚ، لەپاشدا بە پەلە هەڵبیٚ و خۆی دەرباز بكات).

٤٢٥٧ - (صحيح) عن سعد بن أبي وقاص, عن النبي صلى الله عليه وسلم في هذا الحديث, قال: فقلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَرَأَيْتَ إِنْ دَخَلَ عَلَيَّ بَيْتِي وَبَسَطَ يَدَهُ لِيَقْتُلَنِي؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُنْ كَابْنَيْ آدَمَ). وَتَلاَ يَزِيدُ: (لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ). الآيَةَ.

واتە: لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە. راوی وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەی ئەگەر كەسیٚ هاتە ناو ماڵەكەمەوەو هێرشی بۆ هێنام بمكوژیٚ چی بكەم؟ فەرمووی: (وەك چاكترینی هەردوو كوڕەكەی ئادەم بە) یەزید راوی فەرموودەكە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ سورة المائدة: ٢٨.

واتە: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژكەی بۆ ئەوەی بمكوژی، من دەست درێژ ناكەم بۆ تۆ بۆئەوەی بتكوژم، بەڕاستی من لەخوا ئەترسم.

٤٢٥٨ - (ضعيف الإسناد) عن ابن مسعود قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول, فَذَكَرَ بَعْضَ حَدِيثِ أَبِي بَكْرَةَ, قَالَ: (قَتْلاَهَا كُلُّهُمْ فِي النَّارِ). قَالَ فِيهِ: قُلْتُ: مَتَى ذَلِكَ يَا ابْنَ مَسْعُودٍ؟ قَالَ: تِلْكَ أَيَّامُ الْهَرْجِ حَيْثُ لاَ يَأْمَنُ الرَّجُلُ جَلِيسَهُ. قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ الزَّمَانُ؟ قَالَ: تَكُفُّ لِسَانَكَ وَيَدَكَ, وَتَكُونُ حِلْسًا مِنْ أَحْلاَسِ بَيْتِكَ. فَلَمَّا قُتِلَ عُثْمَانُ طَارَ قَلْبِي مَطَارَهُ, فَرَكِبْتُ حَتَّى أَتَيْتُ دِمَشْقَ, فَلَقِيتُ خُرَيْمَ بْنَ فَاتِكٍ فَحَدَّثْتُهُ فَحَلَفَ بِاللَّهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَسَمِعَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا حَدَّثَنِيهِ ابْنُ مَسْعُودٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: گوێ لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو، ئیبنو مەسعود هەندێ لە فەرمودەکەی (أَبِي بَكْرَة)ی گێڕایەوە، فەرمووی: (هەر هەموو کوژراوەکانی ئەو فیتنەو ئاژاوەیە لە ئاگردان). وابیصە راوی فەرمودەکە لە فەرمودەکەیدا وتی: وتم: ئەی ئیبنو مەسعود ئەوە چۆنە؟ وتی: ئەوە رۆژە رۆژی زۆری کوشت و بڕە بە شێوەیە پیاو ئەمین نیە لەو کەسانەی کە لەدەوری دانیشتوون، لەبەر زۆری خیانەت و ناپاکی و کەمی ئەمانەت و دەستپاکی، وتم: ئەگەر کەوتمە ئەو رۆژگارەوە فەرمانم بە چی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (دەست و زمانت بگرە واتە زمانت بەرەڵا مەکە بە زمان بەشداری مەکەو دەستیشتی بۆ درێژ مەکە واتە کەس مەکوژە، بچۆ کونجی ماڵەکەتەوەو مەیەرە دەرەوەو بێ دەنگ بەو بەشداری فیتنەو ئاژاوە مەکە، وابیصە وتی: کاتێ کە پێشەوا (عثمان) رەزای خوای لێ بێ کوژرا دڵم لەشوێنی خۆی باڵی گرتەوەو وەقرەی نەدەگرت وتم: دەترسم ئەمە ئەو فیتنەو ئاژاوەیە بێت، سواری وڵاخەکەم بووم هەتا گەیشتمە دیمەشق، گەشتم بە خورەیمی کوڕی فاتیك کە یەکێ بوو لە هاوەڵان باسەکەم بۆ گێڕایەوە، خورەیم سوێندی خوارد بەو (الله)یەی کە هیچ (الله)یەکی بە هەق نیە جگە لەو لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئەم فەرمودەم بیستوە، وەك چۆن ئیبنو مەسعود بۆی باس کردویت.

٤٢٥٩ - (صحيح) عن أبو موسى الأشعري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ, يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا! وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا! الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ, وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي, فَكَسِّرُوا قِسِيَّكُمْ وَقَطِّعُوا أَوْتَارَكُمْ, وَاضْرِبُوا سُيُوفَكُمْ بِالْحِجَارَةِ, فَإِنْ دُخِلَ - يَعْنِي عَلَى أَحَدٍ مِنْكُمْ - فَلْيَكُنْ كَخَيْرِ ابْنَيْ آدَمَ).

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕاستیدا بەر لە هاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبێ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبێ،

پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە، ئەوکەسەی کە دانیشتوە چاکترە لەو کەسەی کە بە پێوەیە، ئەوکەسەی کە ڕێ دەکات چاکترە لەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بۆ هەڵگیرسانی و دەستی تێی دایە، تیر و کەوانەکانتان بشکێنن و ژێی کەوانەکانتان بپسێنن و بە بەرد بدەن لە شمشێرەکانتان هەتا کول دەبن یان بیان شکێنن، ئەگەر کەسێ هاتە ناو ماڵی یەکێکتانەوەو هێرشی هێنا بۆی بیکوژێ با وەك چاکترینی هەردوو کوڕەکەی ئادەم بێ) - بڵێ: (سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژکەی بۆ ئەوەی بمکوژی، من دەست درێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم، بەڕاستی من لەخوا ئەترسم) - .

٤٢٦٠ - (ضعيف) عن عبد الرحمن - يعني ابن سمرة - قال: كُنْتُ آخِذًا بِيَدِ ابْنِ عُمَرَ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ إِذْ أَتَى عَلَى رَأْسٍ مَنْصُوبٍ, فَقَالَ: شَقِيَ قَاتِلُ هَذَا. فَلَمَّا مَضَى قَالَ: وَمَا أُرَى هَذَا إِلاَّ قَدْ شَقِيَ, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ مَشَى إِلَى رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي لِيَقْتُلَهُ فَلْيَقُلْ هَكَذَا, فَالْقَاتِلُ فِي النَّارِ وَالْمَقْتُولُ فِي الْجَنَّةِ).

واتە: لە (عبد الرحمن) - واتە ئیبنو سەمورە - وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە یەکێ لە ڕێگاکانی مەدینەدا دەستم بە دەستی ئیبنو عومەرەوە بوو هاتە لای سەرێکی بڕاو کە بەدارەوە بوو وتی: بکوژی ئەمە نەگبەت و بەدبەختە - چونکە موسوڵمانێکی کوشتوە -، کاتێ ئیبنو عومەر ڕۆشت وتی: پێم وایە ئەو کەسەی ئەمەی کوشتووە هەر نەگبەت و بەدبەختە، گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێ بڕوات بۆ کوشتنی پیاوێ لە ئوممەتی من بەم شێوەیە بکات ملی بۆ درێژ بکات بۆ ئەوەی بدات لە گەردنی و بیکوژێ بەم شێوەیە بڵێ: بکوژەکە لە ئاگردایەو کوژراوەکەش لە بەهەشتایە).

٤٢٦١ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَا أَبَا ذَرٍّ). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, قَالَ فِيهِ: (كَيْفَ أَنْتَ إِذَا أَصَابَ النَّاسَ مَوْتٌ يَكُونُ الْبَيْتُ فِيهِ بِالْوَصِيفِ؟). قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ, أَوْ قَالَ: مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ. قَالَ: (عَلَيْكَ بِالصَّبْرِ). أَوْ قَالَ: (تَصْبِرُ). ثُمَّ قَالَ لِي: (يَا أَبَا ذَرٍّ). قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: (كَيْفَ أَنْتَ إِذَا رَأَيْتَ أَحْجَارَ الزَّيْتِ قَدْ غَرِقَتْ بِالدَّمِ؟). قُلْتُ: مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ. قَالَ: (عَلَيْكَ بِمَنْ أَنْتَ مِنْهُ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَفَلَا آخُذُ سَيْفِي وَأَضَعُهُ عَلَى عَاتِقِي؟ قَالَ: (شَارَكْتَ الْقَوْمَ إِذًا). قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: (تَلْزَمُ بَيْتَكَ). قُلْتُ: فَإِنْ دُخِلَ عَلَيَّ بَيْتِي؟ قَالَ: (فَإِنْ خَشِيتَ أَنْ يَبْهَرَكَ شُعَاعُ السَّيْفِ فَأَلْقِ ثَوْبَكَ عَلَى وَجْهِكَ يَبُوءُ بِإِثْمِكَ وَإِثْمِهِ).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی (أبا ذر). وتم: وەڵامی دوای وەڵامم هەیە لە گوێڕایەڵیتدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وە شوێنکەوتەی دوای شوێنکەوتەم بۆ دینەکەت). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، تێیدا فەرمووی: (حاڵت چۆن دەبێ و چی دەکەیت ئەگەر کەوتیتە رۆژگارێکەوە خەڵك لەبەر سەرقاڵی بۆیان ناکرێ مردووەکانیان بنێژن پارە دەدەن بە قەبرهەڵکەن بۆیان بنێژێ وە پارەی جێگە قەبرەکەش دەدەن؟) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، یان خواو پێغەمبەرەکەی بۆم دیاری دەکەن کە چی بکەم، فەرمووی: (لەسەرتە ئارام بگری). یان فەرمووی: (خۆگر بە). لەپاشدا پێی فەرمووم: (ئەی (أبا ذر). وتم: (لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ)، فەرمووی: (حاڵت چۆن دەبێ و چی دەکەیت ئەگەر ببینیت (أَحْجَارَ الزَّيْت)ت بینی نوقمی خوێن بوو بوو - (أَحْجَارَ الزَّيْت) گەڕەکێك یان شوێنێکە لە شاری مەدینە -؟ وتم: خواو پێغەمبەرەکەی بۆم دیاری دەکەن کە چی بکەم، فەرمووی: (پابەند بە کەسوکار و هۆزەکەتەوە کە تۆ یەکێکی لەوان یان پابەند بە ئەمیرەکەتەوەو ئەوەی کە بەڵێن و پەیمانت پێ داوە). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شمشێرەکەم هەڵنەگرم و نەیکەمە سەرشانم؟ فەرمووی: (کەواتە بەشداری قەومەکەت کردوە لە تاواندا).

وتم: فەرمانم بە چی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (بچۆرە کونجی ماڵەکەتەوە). وتم: ئەی ئەگەر یەکێ هاتەژوورە بۆ ئەوەی بمکوژێ چی بکەم؟ فەرمووی: (ئەگەر شمشێرەکەی لێ بەرزکردیتەوە و بریقەی شمشێرەکەیت دی پۆشاکەکەت بدە بەسەر روخسارتدا بۆ ئەوەی نەیبینی و نەترسی، جا ئەگەر کوشتیتی ئەوە گوناهو تاوانی تۆ و خۆشی لە ئەستۆی ئەوە).

٤٢٦٢ - (صحيح) عن أبو موسا قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ, يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا, وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا, الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ, وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي, وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي). قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (كُونُوا أَحْلَاسَ بُيُوتِكُمْ).

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕاستیدا بەر لە هاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبێ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبێ، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە، ئەوکەسەی کە دانیشتوە چاکترە لەو کەسەی کە بە پێوەیە، ئەوکەسەی کە بە پێوەیە چاکترە لەو کەسەی کە ڕێ دەکات، ئەو کەسەی کە ڕێ دەکات چاکترە لەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بۆ هەڵگیرسانی و دەستی تێی دایە). وتیان: فەرمانمان بە چی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (بچنە کونجی ماڵەکانتانەوەو مەیەنە دەرەوە).

٤٢٦٣ - (صحيح) عن المقداد بن الأسود قال: ايم الله لقد سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ, إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ, إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ, وَلَمَنِ ابْتُلِيَ فَصَبَرَ فَوَاهًا).

واتە: لە ئەبو میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (ایم الله)

بەڕاستی گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی بەختەوەر ئەو کەسەیە دوورەپەرێزی لە فیتنەو ئاژاوە بکات، بەڕاستی بەختەوەر ئەو کەسەیە دوورەپەرێزی لە فیتنەو ئاژاوە بکات، بەڕاستی بەختەوەر ئەو کەسەیە دوورەپەرێزی لە فیتنەو ئاژاوە بکات، وە لە تاقیکردنەوەدا ئارام و خۆگر بێت کاروکردەوەکەی چەند چاکە).

## سەبارەت بە زمان گرتن.

## ٣ - بباب فِي كَفِّ اللِّسَانِ.

٤٢٦٤ - (ضعيف) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (سَتَكُونُ فِتْنَةٌ صَمَّاءُ بَكْمَاءُ عَمْيَاءُ, مَنْ أَشْرَفَ لَهَا اسْتَشْرَفَتْ لَهُ, وَإِشْرَافُ اللِّسَانِ فِيهَا كَوُقُوعِ السَّيْفِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فیتنەو ئاژاوەیەکی کەڕ و لاڵ و کوێر بەرپادەبێ واتە خەڵك هەق و ناهەق لەیەك جیاناکەنەوەو ئامۆژگاری وەرناگرن، هەرکەسێ بەرەو رووی بڕوات و لێی نزیك بێتەوە فیتنەو ئاژاوەکە بەرەو رووی دێت بەرەو لای خۆی کێشی دەکات، زمان بەرەڵاکردن لەو فیتنەو ئاژاوەدا لە شمشێر وەشاندن کاریگەر ترە).

٤٢٦٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ تَسْتَنْظِفُ الْعَرَبَ, قَتْلَاهَا فِي النَّارِ, اللِّسَانُ فِيهَا أَشَدُّ مِنْ وَقْعِ السَّيْفِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری

خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبێ عەرەب دەفەوتێن، کوژراوەکانی ئەو فیتنەو ئاژاوەیە لە ئاگردان، زمان تێدا لە شمشێر وەشاندن کاریگەرترە).

٤٢٦٦ - عن عبد الله بن عبد القدوس قال: زِيَادٌ سِيمِينْ كُوشْ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی (عبد القدوس)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: زیاد گوێی سپی بوو.

## روخسەتی رۆشتن بۆ ساراو چۆڵەوانی لەکاتی فیتنەو ئاژاوەدا

## ٤ - باب مَا يُرَخَّصُ فِيهِ مِنَ الْبَدَاوَةِ فِي الْفِتْنَةِ

٤٢٦٧ - - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرُ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمًا يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ وَمَوَاقِعَ المطر، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هاکا ئەو رۆژە هات کە چاکترین ماڵ و سامانی موسوڵمان رانە مەڕە کە شوێنیان دەکەوێ بۆ لوتکەی شاخەکان و لەوەڕگاکان، بە خۆی و دینەکەیەوە هەڵدێ لە فیتنەو ئاژاوە).

# سەبارەت بە نەهی کردن لە جەنگ کردن لەکاتی فیتنەو ئاژاوەدا.

## ٥ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْقِتَالِ فِي الْفِتْنَةِ.

٤٢٦٨ - (صحيح) عن الأحنف ابن قيس قال: خَرَجْتُ وَأَنَا أُرِيدُ - يَعْنِى فِي الْقِتَالِ - فَلَقِيَنِى أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: ارْجِعْ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَذَا الْقَاتِلُ, فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: (إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ).

واتە: لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەماڵ دەرچووم بۆ جەنگ کردن لەڕێگادا ئەبو بەکرەم پێ گەیشت وتی: بگەڕێرەوە گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەگەر دوو موسڵمان شمشێر لەیەکتر راکێشن کوژراو و بکوژ دەچنە ئاگری دۆزەخەوە). وتیان: ئەوە بکوژەکە پیاوێکی کوشتووە ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: (چونکە ئەویش سور بووە لەسەر کوشتنی ئەوی تر). - کەواتە حسابی بکوژەکەی بۆ دەکرێت - .

٤٢٦٩ - عن الحسن, بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ مُخْتَصَرًا.

واتە: لە حەسەنەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا بە کورتی هاتوە.

## سەبارەت بە گەورەیی تاوانی کوشتنی باوەڕدار

## ٦ - باب فِي تَعْظِيمِ قَتْلِ الْمُؤْمِنِ.

٤٢٧٠ - (صحيح) عن خالد بن دهقان قال: كُنَّا فِي غَزْوَةِ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ بِذُلُقْيَةَ فَأَقْبَلَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ فِلَسْطِينَ مِنْ أَشْرَافِهِمْ وَخِيَارِهِمْ, يَعْرِفُونَ ذَلِكَ لَهُ, يُقَالُ لَهُ هَانِئُ بْنُ كُلْثُومِ بْنِ شَرِيكٍ الْكِنَانِيُّ, فَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي زَكَرِيَّا وَكَانَ يَعْرِفُ لَهُ حَقَّهُ, قَالَ لَنَا خَالِدٌ: فَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي زَكَرِيَّا قَالَ: سَمِعْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ تَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلاَّ مَنْ مَاتَ مُشْرِكًا, أَوْ مُؤْمِنٌ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا). فَقَالَ هَانِئُ بْنُ كُلْثُومٍ: سَمِعْتُ مَحْمُودَ بْنَ الرَّبِيعِ يُحَدِّثُ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ أَنَّهُ سَمِعَهُ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا فَاعْتَبَطَ بِقَتْلِهِ لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً). قَالَ لَنَا خَالِدٌ: ثُمَّ حَدَّثَنا ابْنُ أَبِي زَكَرِيَّا, عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ, عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَزَالُ الْمُؤْمِنُ مُعْنِقًا صَالِحًا مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا, فَإِذَا أَصَابَ دَمًا حَرَامًا بَلَّحَ).

واتە: لە خالیدی کوڕی دیهقانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە غەزای (الْقُسْطَنْطِينِيَّةَ) بووین لە (ذُلُقْيَةَ) پیاوێکی چاك و خانەدان لە خەڵکی فەلەستین هات بۆ پێشوازیمان، کە لەلایەن ناوچەکەوە ناسراو بوو بەوە، ناوی (هَانِئ)ی کوڕی (كُلْثُوم)ی کوڕی شەریکی کینانی بوو، سڵاوی کرد لە (عبد الله) ی کوڕی ئەبی زەکەریا ئەویش ئاگاداری پلەو پایەی بوو کە پیاوێکی چاك و خانەدان و خواناسە، (عبد الله)ی کوڕی ئەبی زەکەریا فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، وتی: گوێم لە ئوممو دەرداء بوو دەیوت: گوێم لە ئەبو دەرداء

بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەموو گوناهو تاوانێ بۆی هەیە خوای گەورە لێی خۆش ببێت مەگەر کەسێ بمرێت و هاوبەشی بۆ خوا دانابێ، یان باوەڕدارێ بە ئەنقەست باوەڕدارێ بکوژێ). (هَانِئ)ی کوڕی (كُلْثُوم) وتی: گوێم لە رەبیعی کوڕی مەحمود بوو فەرمودەی دەگێڕایەوە ئەویش لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە بیستبوی، عوبادەیش لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرمودەی دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی: (ئەو کەسەی باوەڕدارێ بە زوڵم بکوژێ خوای گەورە نوێژی فەرز و سوننەتی لێ وەرناگرێ). خالید پێی وتین: لەپاشدا ئیبنو ئەبی زەکەریا بۆی گێڕاینەوە، لە ئوممو دەردائەوە، لە ئەبو دەردائەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (موسوڵمان هەتا خوێنی ناڕەوا نەڕێژێ بەردەوام خۆش رەوتەو هەر باشە، ئەگەر خوێنی بە ناڕەواو ناهەق رشت ئیتر لەپێ دەکەوێ و ناتوانێ رێ بکات بە هۆی ئەو تاوانەوە).

٤٢٧١ - (صحيح مقطوع) عن خالد بن دهقان قال: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ يَحْيَى الْغَسَّانِيَّ عَنْ قَوْلِهِ: (اعْتَبَطَ بِقَتْلِهِ). قَالَ: الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي الْفِتْنَةِ فَيَقْتُلُ أَحَدُهُمْ فَيَرَى أَنَّهُ عَلَى هُدًى لاَ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ تعالى! يَعْنِى مِنْ ذَلِكَ.

واتە: لە خالیدی کوڕی دیهقانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە یەحیای کوڕی یەحیای کوڕی غەسسانی دەربارەی: (اعْتَبَطَ بِقَتْلِهِ). وتی: ئەوانەی لەکاتی فیتنەو ئاژاوەدا دەجەنگن یەکێ لەوان موسوڵمانێ دەکوژێت وا دەبینێ لەسەر رێگەی هەق و هیدایەتە بۆیە تەوبە ناکات لەو تاوانە).

٤٢٧٢ - (صحيح) عن مجالد بن عوف, أن خارجة بن زيد قال: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فِى هَذَا الْمَكَانِ يَقُولُ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا) بَعْدَ الَّتِى فِى الْفُرْقَانِ (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ) بِسِتَّةِ أَشْهُرٍ.

واتە: لە موجالیدی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە خاریجەی کوڕی زەید وتویەتی: گوێم لە زەیدی کوڕی (ثابت) بوو لەم شوێنەدا دەیوت: ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴾. سورة النساء: ٩٣.

واتە: وە هەرکەسێ بە ئەنقەست باوەڕدارێ بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، بە هەمیشەیی تیایدا ئەبێت.

ئەو ئایەتەی سەرەوە شەش مانگ لەدوای ئەم ئایەتەی سورەتی (الفرقان) دابەزی:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ سورة الفرقان: ٦٨.

واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خواداناپەرستن هیچ پەرستراوێکی تر و ناکوژن هیچ کەسێ کەخوا کوشتنی ئەوی یاساغ(حەرام)کردووە، بەهەق و ڕەوا نەبێ.

٤٢٧٣ - (صحيح) عن سعيد بن جبير قال: سألت ابن عباس فقال: لَمَّا نَزَلَتِ الَّتِى فِي الْفُرْقَانِ: (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ) قَالَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ: قَدْ قَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ, وَدَعَوْنَا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ, وَأَتَيْنَا الْفَوَاحِشَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ) فَهَذِهِ لأُولَئِكَ, قَالَ: وَأَمَّا الَّتِى فِي النِّسَاءِ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) الآيَةُ. قَالَ: الرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ شَرَائِعَ الإِسْلاَمِ ثُمَّ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ لاَ تَوْبَةَ لَهُ. فَذَكَرْتُ هَذَا لِمُجَاهِدٍ, فَقَالَ: إِلاَّ مَنْ نَدِمَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەوبارەوە پرسیارم کرد لە ئیبنو عەباس وتی: کاتێ کە ئەم ئایەتەی سورەتی (الفرقان) دابەزی:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا

بِٱلْحَقِّ ﴾. هاوبەش بۆ خوا دانەرانی خەڵکی مەککە وتیان: ئەو نەفسەی کە خوای گەورە حەرامی کردوە خوێنی بڕێژرێت ئێمە خوێنیمان رشت، لەگەڵ خوای گەورەدا هاوارمان کردە خوایەکی تر واتە هاوبەشمان بۆ دانا، کاری فاحیشەگەری و بێ ئابڕویمان ئەنجامدا، لەوبارەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ﴾، سورة الفرقان: ٧٠.

واتە: بێجگە لەکەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ، کارو کردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا ئەوانە خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بەچاکە.

ئیبنو عەباس وتی: بەڵام ئەوەی لە سورەتی (النساء)دایە:

﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴾. سورة النساء: ٩٣.

ئیبنو عەباس لەبارەیەوە وتی: ئەگەر پیاوێ شارەزای شەریعەتی ئیسلام بوو لەپاشدا بەئەنقەست باوەڕدارێ بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، تەوبەی لێ وەرناگیرێت. ئەمەم باس کرد بۆ موجاهید وتی: ئیللا کەسێ نەبێ کە پەشیمان بێتەوە.

٤٢٧٤ - (صحيح) عن ابن عباس, فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ فِي (الَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ) أَهْلُ الشِّرْكِ, قَالَ: وَنَزَلَ: (يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ بەسەرهاتی پێشو هاتوە، دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾. ئیبنو عەباس وتویەتی: مەبەست لە ئەهلی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە. وتی: ئەم ئایەتەش دابەزی:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾. سورة الزمر:٥٣،

واتە: (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی

ئەوانەی کەخۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت.

٤٢٧٥ - (صحيح) عن ابن عباس قال: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا) قَالَ: مَا نَسَخَهَا شَيْءٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا ﴾. ئیبنو عەباس وتی: هیچ ئایەتێکی تر نەسخی نەکردۆتەوە.

٤٢٧٦ - (حسن مقطوع) عن أبي مجلز في قوله: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جهَنَّمُ) قَالَ: هِيَ جَزَاؤُهُ, فَإِنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنْهُ فَعَلَ.

واتە: لە ئەبو میجلەزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا ﴾. ئەبو میجلەز وتی: ئەمە پاداشتەکەیەتی، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێ لێی خۆش بێ لێی خۆش دەبێت.

## ئومێد وایە خوای گەورە لە بکوژ خۆش ببێ.

## ٧ - باب مَا يُرْجَى فِي الْقَتْلِ.

٤٢٧٧ - (صحيح) عن سعيد ابن زيد قال: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ فِتْنَةً فَعَظَّمَ أَمْرَهَا, فَقُلْنَا: - أَوْ قَالُوا - : يَا رَسُولَ اللَّهِ لَئِنْ أَدْرَكَتْنَا هَذِهِ لَتُهْلِكَنَّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَلاَّ إِنَّ بِحَسْبِكُمُ الْقَتْلُ). قَالَ سَعِيدٌ: فَرَأَيْتُ إِخْوَانِي قُتِلُوا.

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووین باسی فیتنەو ئاژاوەی کرد کارەکەی بەلاوە زۆر گەورە بوو، وتمان: - یان وتیانن - ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر بکەوینە ئەو رۆژگارەوە دەفەوتێین و قیامەتمان لەدەست دەچێ. فەرمووی: (نەخێر ئەو زیانەی پێتان دەگات شتێکی تر نیە جگە لە کوشتن، بەڵام قیامەتتان لەدەست دەرناچێت بەڵکو خوای گەورە لێتان خۆش دەبێت). سەعید وتی: بینیم براکانم کوژران.

٤٢٧٨ - (صحيح) عن أبو موسى قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أُمَّتِي هَذِهِ أُمَّةٌ مَرْحُومَةٌ لَيْسَ عَلَيْهَا عَذَابٌ فِي الآخِرَةِ, عَذَابُهَا فِي الدُّنْيَا الْفِتَنُ وَالزَّلاَزِلُ وَالْقَتْلُ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەم ئوممەتەی من رەحمەتی خوای لێ بێ سزای لەسەر نیە لە قیامەتدا، سزای لە دونیادا فیتنەو ئاژاوە و بومەلەرزە و کوشتنە).

کۆتایی پەرتوکی فیتنەو ئاژاوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی مەهدی.

## ٣٠ - أول كتاب المهدي.

٤٢٧٩ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (لَا يَزَالُ هَذَا الدِّينُ قَائِمًا حَتَّى يَكُونَ عَلَيْكُمُ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً كُلُّهُمْ تَجْتَمِعُ عَلَيْهِ الأُمَّةُ). فَسَمِعْتُ كَلَامًا مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ أَفْهَمْهُ, قُلْتُ لأَبِي مَا يَقُولُ؟ قَالَ: (كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ).

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بوو دەیفەرموو: (بەردەوام ئەم دینە پایەدار و سەرکەوتو دەبێت هەتا دوانزە کەس دەبن بە خەلیفەتان سەرجەم ئوممەت کۆکن لەسەر هەر هەموویان و بەڵێن و پەیمانیان پێ دەدەن و فەرمانبەرداریان دەکەن). قسەیەکم بیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەڵام لێی تێ نەگەیشتم، وتم بە باوکم چی دەفەرموێت؟ فەرمووی: (هەموو خەلیفەکان لە قورەیشن).

٤٢٨٠ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (لَا يَزَالُ هَذَا الدِّينُ عَزِيزًا إِلَى اثْنَيْ عَشَرَ خَلِيفَةً). قَالَ: فَكَبَّرَ النَّاسُ وَضَجُّوا, ثُمَّ قَالَ: كَلِمَةً خَفِيَّةً, قُلْتُ لأَبِي: يَا أَبَةِ مَا قَالَ؟ قَالَ: (كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ).

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بوو دەیفەرموو: ( ئەم دینە بەردەوام بە هێز و

شکۆمەند و سەرکەوتوە هەتا دوانزە خەلیفە). وتی: خەڵك دەستیان کرد بە (الله أکبر) کردن و هاواریان کرد، لەپاشدا بە نهێنی وشەیەکی وت، وتم بە باوکم: باوکە گیان چی فەرموو؟ فەرمووی: (هەموو خەلیفەکان لە قورەیشن).

٤٢٨١ - (صحيح دون قوله (فلما رجع ...) ) عن جابر بن سمرة, بِهَذَا الْحَدِيثِ, زَادَ: فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى مَنْزِلِهِ أَتَتْهُ قُرَيْشٌ, فَقَالُوا: ثُمَّ يَكُونُ مَاذَا؟ قَالَ: (ثُمَّ يَكُونُ الْهَرْجُ).

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: کاتێ کە گەڕایەوە بۆ شوێن و مەنزڵی خۆی قورەیشیەکان هاتن بۆ خزمەتی، وتیان: ئەی لەپاش ئەو دوانزە خەلیفە چی رودەدات؟ فەرمووی: (لەپاشدا فیتنەو ئاژاوەو کوشتن زۆر دەبێت).

٤٢٨٢ - (حسن صحيح) عن عبد الله, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ). قَالَ زَائِدَةُ فِي حَدِيثِهِ: (لَطَوَّلَ اللَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ). ثُمَّ اتَّفَقُوا (حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلاً مِنِّى). أَوْ: (مِنْ أَهْلِ بَيْتِي, يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي, وَاسْمُ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي). زَادَ فِي حَدِيثِ فِطْرٍ: (يَمْلأُ الأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ ظُلْمًا وَجَوْرًا). وَقَالَ فِي حَدِيثِ سُفْيَانَ: (لاَ تَذْهَبُ أَوْ لاَ تَنْقَضِي الدُّنْيَا حَتَّى يَمْلِكَ الْعَرَبَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي).

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دونیا تەنها یەك رۆژی مابێ). (زَائِدَة) لە فەرموودەکەیدا وتی: (خوای گەورە ئەو رۆژە درێژ دەکاتەوە). جا هەردوو راوی رێکن لەسەر ئەمە: (تا خوای گەورە پیاوێ دەنێرێ فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست لە منە). یان: (لە خانەوادەو کەسوکاری منە، ناوی وەك ناوی خۆمە، ناوی باوکیشی وەك ناوی باوکمە واتە ناوی موحەممەدی کوڕی (عبد الله)یە). لە فەرموودەکەی (فِطْر)دا ئەمەی

بۆ زیاد كرا: (زەوی پڕدەكات لە دادگەری، لە كاتێكدا كە پێشتر پڕ كرابوو لە زوڵم و ستەم و ناڕەوایی). لە فەرمودەكەی سوفیاندا فەرمووی: (دونیا كۆتایی نایەت هەتا پیاوێك لە بنەماڵەی من دەكرێتە دەسەڵاتدار بەسەر عەرەبدا، ناوی وەك ناوی من وایە).

٤٢٨٣ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدَّهْرِ إِلاَّ يَوْمٌ لَبَعَثَ اللَّهُ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَمْلأُهَا عَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا).

واتە: لە پێشەوا عەلییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ڕۆژگار تەنها یەك ڕۆژی مابێ خوای گەورە لەو ڕۆژەدا پیاوێ لە خانەوادەو كەسوكاری من دەنێرێ زەوی پڕدەكات لە دادگەری، لە كاتێكدا كە پێشتر پڕ كرابوو لە زوڵم و ستەم و ناڕەوایی).

٤٢٨٤ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي, مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (مەهدی لە بنەماڵەو خانەوادەی منە، لە نەوەی (فَاطِمَة)یە).

٤٢٨٥ - (حسن) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْمَهْدِيُّ مِنِّى أَجْلَى الْجَبْهَةِ, أَقْنَى الأَنْفِ, يَمْلأُ الأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلاً, كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا, يَمْلِكُ سَبْعَ سِنِينَ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەهدی لە منە، پێشی سەری ڕوتەو، لوتی درێژە،

زەوی پڕدەكات لە دادگەری، لە كاتێكدا كە پێشتر پڕ كرابوو لە زوڵم و ستەم و ناڕەوایی، حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی دەكات).

٤٢٨٦ - (ضعيف) عن أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم عن النبي صلى الله عليه وسلم قال (يَكُونُ اخْتِلَافٌ عِنْدَ مَوْتِ خَلِيفَةٍ, فَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ هَارِبًا إِلَى مَكَّةَ, فَيَأْتِيهِ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ فَيُخْرِجُونَهُ وَهُوَ كَارِهٌ, فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ, وَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ مِنَ الشَّامِ فَيُخْسَفُ بِهِمْ بِالْبَيْدَاءِ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ, فَإِذَا رَأَى النَّاسُ ذَلِكَ أَتَاهُ أَبْدَالُ الشَّامِ وَعَصَائِبُ أَهْلِ الْعِرَاقِ فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ, ثُمَّ يَنْشَأُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ أَخْوَالُهُ كَلْبٌ, فَيَبْعَثُ إِلَيْهِمْ بَعْثًا فَيَظْهَرُونَ عَلَيْهِمْ, وَذَلِكَ بَعْثُ كَلْبٍ, وَالْخَيْبَةُ لِمَنْ لَمْ يَشْهَدْ غَنِيمَةَ كَلْبٍ, فَيَقْسِمُ الْمَالَ, وَيَعْمَلُ فِي النَّاسِ بِسُنَّةِ نَبِيِّهِمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَيُلْقِي الإِسْلَامُ بِجِرَانِهِ إِلَى الأَرْضِ فَيَلْبَثُ سَبْعَ سِنِينَ, ثُمَّ يُتَوَفَّى وَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەكاتی مردنی خەلیفەیەكدا دەبێ بە كێشەو دووبەرەكی، پیاوێ لە شاری مەدینە هەڵدێ دەڕوات بۆ شاری مەككە، خەڵكی مەككە دەچن بۆ لای لەماڵ دەیهێننە دەرەوە هەرچەندە خۆی فەرمانڕەوایی پێی خۆش نیە لەنێوان روكن و مەقام پەیمانی دەدەنێ و دەیكەن بە فەرمانڕەوای خۆیان، جا لە شامەوە لەشكرێك دەنێرن بۆ سەری، كاتێ كە دەگەنە بیابانەكەی نێوان مەككەو مەدینە رۆدەچن بە ناخی زەویدا، كە خەڵكەكە ئەمە دەبینن، ئیتر پیاو چاكانی شام و كۆمەڵێ لە خەڵكی عێراق دەڕۆن بۆ لای لەنێوان روكن و مەقام پەیمانی دەدەنێ، لەپاشدا پیاوێكی قورەیشی بە پشتیوانی هۆزی كەلبی خاڵوانی لەشكرێك رێك دەخات بۆ سەر مەهدی، مەهدیش لەشكرێ دەنێرێتە سەریان و سەردەكەون بە سەریاندا، لەشكری كەلبی بەرەی خاڵوانی پیاوە قورەیشیەكە پیس دەشكێن و ماڵ و سامانێكی زۆریان لێ بەجێ دەمێنێ، پەشیمانی بۆ ئەو كەسەیە كە ئامادەی ئەو غەنیمەتە

نەبێ، مەهدی خۆی بە دادپەروەرانە ئەو ماڵ و سامانە دابەش دەكات، لەناو خەڵكدا بە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رەفتار دەكات، دینی ئیسلام لەناو خەڵكدا پەلو پۆ دەهاوێ و دادەمەزرێ، ئەم فەرمانڕەوایی یە حەوت ساڵ دەخایەنێت و بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، لەپاشدا مەهدی دەمرێت و موسوڵمانان نوێژی لەسەر دەكەن).

٤٢٨٧ - (ضعيف) عن قتادة, بِهَذَا الْحَدِيثِ, وَقَالَ: (تِسْعَ سِنِينَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ غَيْرُ مُعَاذٍ: عَنْ هِشَامٍ: (تِسْعَ سِنِينَ).

واتە: لە قەتادەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، وە فەرمووی: (نۆ ساڵ فەرمانڕەوایی دەكات). ئەبوداود دەڵێت: وە جگە لە (معاذ) وتی: لە هیشامەوە: (حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی دەكات).

٤٢٨٨ - (ضعيف)عن أم سلمة عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا الْحَدِيثِ, وَحَدِيثُ مُعَاذٍ أَتَمُّ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام فەرموودەكەی (معاذ) تەواوترە.

٤٢٨٩ - (صحيح) عن أم سلمة عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِقِصَّةِ جَيْشِ الْخَسْفِ, قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا؟ قَالَ: (يُخْسَفُ بِهِمْ وَلَكِنْ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بەسەرهاتی ئەو لەشكرە هاتوە كە رۆدەچێ بە ناخی زەوی دا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەی حاڵی ئەو كەسە چۆنە خۆی حەزی لەو هێرشە نیە بۆ سەر مەهدی كەچی بەزۆر دەیهێنن؟ فەرمووی: (لەگەڵ ئەوان رۆدەچێ بەڵام بە پێی نیەتی خۆی زیندودەكرێتەوە لەڕۆژی قیامەتدا).

٤٢٩٠ - (ضعيف) عن أبي إسحق قال: قال علي رضي الله عنه - ونظر إلى ابنه الحسن - فقال: إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ, كَمَا سَمَّاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَسَيَخْرُجُ مِنْ صُلْبِهِ رَجُلٌ يُسَمَّى بِاسْمِ نَبِيِّكُمْ يُشْبِهُهُ فِي الْخُلُقِ وَلاَ يُشْبِهُهُ فِي الْخَلْقِ, ثُمَّ ذَكَرَ قِصَّةَ: يَمْلأُ الأَرْضَ عَدْلاً.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ - سەیری حەسەنی کوڕی کردو - وتی: ئەم کوڕەی من سەیدە، هەروەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوە ناوی بردووە، لەپشتی ئەمە پیاوێ دەردەچێت ناوی وەك ناوی پێغەمبەرەکەتانە، لە خورەوشتت و ئاکاردا لەو دەچێت بەڵام لە شکڵ و شێوەدا لەو ناچێت، لەپاشدا ڕاوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە: زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری.

٤٢٩٠ م - (ضعيف) عن هلال بن عمرو قال: سمعت عليا رضي الله عنه يقول: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ وَرَاءِ النَّهْرِ يُقَالُ لَهُ: الْحَارِثُ بْنُ حَرَّاثٌ, عَلَى مُقَدِّمَتِهِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ مَنْصُورٌ, يُوَطِّئُ, أَوْ يُمَكِّنُ لآلِ مُحَمَّدٍ, كَمَا مَكَّنَتْ قُرَيْشٌ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَجَبَ عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ نَصْرُهُ). أَوْ قَالَ: (إِجَابَتُهُ).

واتە: لە هیلالی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیوت: ( لە (مِنْ وَرَاءِ النَّهْرِ)ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە پیاو چاکێ سەرهەڵدەدات بە ناوی (حَارِث)ی کوڕی (حَرَّاث)ەوە، پیاوێ لەپێش لەشکرەکەیەوەیەتی بە ناوی مەنصور، ڕێ خۆشکەر دەبێ بۆ گێڕانەوەی دەسەڵات بۆ کەسوکار و بنەماڵەی موحەممەد، وەك چۆن قورەیش ڕێ خۆشکەر بوون بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ پشتیوانی بکات و سەری بخات). یان فەرمووی: (بچێت بەدەم بانگەوازەکەیەوە).

# سەرەتای پەرتوکی جەنگ و کوشتارە گەورەکە

# ٣١ – اول كتاب الملاحم

## ئەوەی باسکراوە دەربارەی چەرخ کە سەدساڵە.

## ١ - باب مَا يُذْكَرُ فِي قَرْنِ الْمِائَةِ.

٤٢٩١ - (صحيح) عن أبو هريرة فيما أعلم, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە هەر سەد ساڵ جارێك رێ خۆش دەكات بۆ زانایان و ئەو کەسانەی کە خاوەن دەسەڵاتن هەستن بە سەرخستن و دەرخستن و بڵاوکردنەوەو رونکردنەوەی ئەم دینە هەقەو، سوننەت جیادەکەنەوە لە بیدعەو زانستی شەرعی برەو پێ دەدەن و پشتی ئەهلی بیدعە دەشکێنن و سەرشۆڕ و ریسوایان دەکەن).

# ئەوەی باسکراوە دەربارەی جەنگ و کوشتاری گەورەی رۆم

## ٢ - باب مَا يُذْكَرُ مِنْ مَلاَحِمِ الرُّومِ.

٤٢٩٢ - (صحيح) عن جبير قال: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى ذِي مِخْبَرٍ - رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَأَتَيْنَاهُ, فَسَأَلَهُ جُبَيْرٌ عَنِ الْهُدْنَةِ؟ فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (سَتُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا, فَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِكُمْ, فَتُنْصَرُونَ وَتَغْنَمُونَ وَتَسْلَمُونَ, ثُمَّ تَرْجِعُونَ حَتَّى تَنْزِلُوا بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ, فَيَرْفَعُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ النَّصْرَانِيَّةِ الصَّلِيبَ فَيَقُولُ: غَلَبَ الصَّلِيبُ! فَيَغْضَبُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَدُقُّهُ, فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَجْمَعُ لِلْمَلْحَمَةِ).

واتە: لە جوبەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وەرن لەگەڵم با بڕۆین بۆ خزمەت (ذِي مِخْبَرٍ) — (ذِي مِخْبَرٍ) یەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم —ئێمەش رۆشتین لەگەڵی، جوبەیر دەربارەی رێکەوتن لەگەڵ رۆم پرسیاری لێ کرد، ئەویش وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەگەڵ رۆم رێك دەکەون و پەیمانی ئاشتی دەبەستن و لەیەکتر دڵنیا دەبن و، پێکەوە دەچن بەگژ دوژمنێکی هەردوو لاتاندا، سەردەکەون بە سەریاندا، ماڵ و سامانێکی زۆر دەگرن بە غەنیمەت و، بە سەلامەتی دەگەڕێنەوە، لەپاشدا دەگەڕێنەوە هەتا دەگەنە مێرگێکی گرداوی، پیاوێ لە خاچ پەرستەکان خاچێ بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: خاچ سەرکەوت، پیاوێکی موسوڵمان لێی تورە دەبێت و خاچەکە وردو خاش دەکات، لەوکاتەدا رۆم پەیمانەکەی خۆیان دەشکێنن و کۆدەبنەوە بۆ جەنگ و کوشتارە گەورەکە، موسوڵمانانیش پەلاماریان دەدەن).

٤٢٩٣ - (صحيح) عن حسان بن عطية, بِهَذَا الْحَدِيثِ, زَادَ فِيهِ: (وَيَثُورُ الْمُسْلِمُونَ إِلَى أَسْلِحَتِهِمْ, فَيَقْتَتِلُونَ, فَيُكْرِمُ اللَّهُ تِلْكَ الْعِصَابَةَ بِالشَّهَادَةِ).

واتە: لە حەسسانی كوڕی (عطية)وە فەرمودەی پێشو هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد: (موسوڵمانەكانیش پەلاماری چەكەكانیان دەدەن و دەست دەكەن بە جەنگ و كوشتار، خوای گەورە ڕێز دەگرێت لەو كۆمەڵە موسوڵمانەو پلەی بەرزی شەهیدیان پێ دەبەخشێت).

## سەبارەت بە
## نیشانەكانی جەنگ و كوشتارە گەورەكان.

## ٣ - باب فِي أَمَارَاتِ الْمَلاَحِمِ.

٤٢٩٤ - (حسن) عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (عُمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ, وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ, وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ قُسْطَنْطِينِيَّةَ, وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ). ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِ الَّذِي حَدَّثَ أَوْ مَنْكِبِهِ, ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَقٌّ كَمَا أَنَّكَ هَا هُنَا, أَوْ: كَمَا أَنَّكَ قَاعِدٌ. يَعْنِي مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئاوەدانی (بَيتِ الْمَقْدِس) نیشانەی كاول بوونی شاری مەدینەیە، كاول بوونی مەدینەش بەرپابوونی جەنگ و كوشتارە گەورەكەیە، بەرپابوونی جەنگ و كوشتارە گەورەكە كاتی گرتن و رزگاركردنی شاری (قُسْطَنْطِينِيَّة)یە، رزگاركردنی (قُسْطَنْطِينِيَّة)ش پەیدابوونی دەججالە). لەپاشدا بە دەستی دای لە رانی یان لەسەرشانی ئەو كەسەی كە قسەی بۆ دەكرد، ئینجا وتی: ئەمە هەقەو گومانی تێدا نیە وەك چۆن تۆ لێرەدای هیچ

گومانی تێدا نیە، یان وەك تۆ چۆن لێرەدا دانیشتوی، واتە: (معاذ)ی كوڕی جەبەل.

## سەبارەت بە زۆربوونی جەنگ و كوشتاری گەورەی یەك لەدوای یەك.

## ٤ - باب فِي تَوَاتُرِ الْمَلاَحِمِ.

٤٢٩٥ - (ضعيف) عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْمَلْحَمَةُ الْكُبْرَى وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ وَخُرُوجُ الدَّجَّالِ فِي سَبْعَةِ أَشْهُرٍ).

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەرپابوونی جەنگ و كوشتارە گەورەكەو گرتن و رزگاركردنی شاری (قُسْطَنْطِينِيَّة)و پەیدابوونی دەججال لەماوەی حەوت مانگدا روودەدەن).

٤٢٩٦ - (ضعيف) عن عبد الله بن بسر, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (بَيْنَ الْمَلْحَمَةِ وَفَتْحِ الْمَدِينَةِ سِتُّ سِنِينَ, وَيَخْرُجُ الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ فِي السَّابِعَةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی بوسرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێوانی بەرپابوونی جەنگ و كوشتارە گەورەكەو رزگاركردنی شاری مەدینە شەش ساڵە، لە ساڵی حەوتەم دا دەججال پەیدا دەبێت).

## سەبارەت بە داباریینی گەلان بەسەر ئەهلی ئیسلام دا.

## ٥ - باب فِي تَدَاعِي الأُمَمِ عَلَى الإِسْلاَمِ.

٤٢٩٧ - (ضعيف) عن ثوبان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا). فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: (بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ, وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ, وَلَيَنْزِعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ, وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ). فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, وَمَا الْوَهَنُ؟ قَالَ: (حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ).

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هاکا گەلان یەکتریان بانگ کردو داباریین بە سەرتاندا چواردەوریان لێ گرتن وەك چۆن کۆمەڵە بخۆرێ دادەبارن بەسەر سفرەو خوانێکدا). قسەکەرێك وتی: ئایا لەبەر کەمیمانە پەلامارمان دەدەن لەو کاتەدا؟ فەرمووی: (نەخێر بەڵکو لەو رۆژەدا ئێوە زۆر زۆرن، بەڵام وەك پوش و پەڵاشی سەر لافاو وان - ئاماژەیە بۆ ترسنۆکی و بێ توانایییان - خوای گەورە لەبەر بێ تەقوایتان بێ بایەختان دەکات لەبەر چاوی دوژمن و ترسی ئێوەیان لە دڵدا نامێنێ، ورەیشتان دەبا). قسەکەرێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هۆی ئەو ورە بەردانە چی یە؟ فەرمووی: (خۆشەویستی دونیاو رقبوون و ترسانە لە مردن).

# دەربارەی قەڵای قایمی موسوڵمانان لە كوشتارە گەورەكاندا

## ٦ - باب فِي الْمَعْقِلِ مِنَ الْمَلاَحِمِ.

٤٢٩٨ - (صحيح) عن أبو الدرداء, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا دِمَشْقُ, مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕۆژی كوشتارە گەورەكە قەڵای قایمی موسوڵمانان لە (غوطة) دەبێت، لە نزیك شارێكەوە ناوی دیمەشقە، یەكێكە لە چاكترین شارەكانی وڵاتی شام).

٤٢٩٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال, قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُوشِكُ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يُحَاصَرُوا إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى يَكُونَ أَبْعَدُ مَسَالِحِهِمْ سَلاَحٌ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نزیكە موسوڵمانان لە كافران هەڵبێن بەرەو شاری مەدینەو لەوێ گەمارۆ بدرێن، بە شێوەیە ناوچەی (سَلاَح) كە شوێنێكە لە نزیك خەیبەر دەبێتە دوورترین قەڵاو سنوری خۆحەشاردانیان).

٤٣٠٠ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن الزهري, قال: وَسَلاَحٌ: قَرِيبٌ مِنْ خَيْبَرَ.

واتە: لە پێشەوا زوهریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (سَلَاح) شوێنێکە لە نزیك خەیبەر.

## زۆربونی فیتنەو ئاژاوە لەکاتی کوشتارە گەورەکاندا

### ٧ - باب ارْتِفَاعِ الْفِتْنَةِ فِي الْمَلاَحِمِ.

٤٣٠١ - (صحيح) عن عوف بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَنْ يَجْمَعَ اللَّهُ عَلَى هَذِهِ الأُمَّةِ سَيْفَيْنِ: سَيْفًا مِنْهَا, وَسَيْفًا مِنْ عَدُوِّهَا).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دوو شمشێر لەسەر ئەم ئوممەتە کۆناکاتەوە: شمشێرێ لە خۆیان و، شمشێرێ لە دوژمنانی) - واتە خۆیان لەناو خۆیاندا هەندێکیان هەندێکیان بکوژن و، کافرانیش لەولاوە لەگەڵیان بجەنگن و سەرکەون بە سەریاندا و لەناویان بەرن بە تەواوەتی - .

## سەبارەت بە نەهی کردن لە وروژاندنی تورك و حەبەشە

### ٨ - باب فِي النَّهْيِ عَنْ تَهْيِيجِ التُّرْكِ وَالْحَبَشَةِ.

٤٣٠٢ - (حسن) عن أبي سكينة رجل من المحررين, عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم, عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: (دَعُوا الْحَبَشَةَ مَا وَدَعُوكُمْ, وَاتْرُكُوا التُّرْكَ مَا تَرَكُوكُمْ).

واتە: لە ئەبو سوکەینەوە کە یەکێ بووە لە ئازادکراوەکان، لە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

فەرموویەتی: (هەتا حەبەشیەکان و تورکەکان واز لەئێوە بێنن و هەقیان نەبێت بەسەرتانەوە، ئێوەش زاز لەوان بێنن و هەقتان نەبێ بەسەریانەوە).

## سەبارەت بە جەنگ و کوشتار لەگەڵ تورك

## ٩ - باب فِي قِتَالِ التُّرْكِ.

٤٣٠٣ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ التُّرْكَ, قَوْمًا وُجُوهُهُمْ كَالْمَجَانِّ الْمُطْرَقَةِ, يَلْبَسُونَ الشَّعْرَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا موسوڵمانان جەنگ لەگەڵ تورك دەکەن، نیشانەی ئەو گەلە ئەوەیە: دەم و چاویان وەکو قەڵغانەو بەسیرمەی زۆر دەورە گیراوە، موو لەبەر دەکەن و موو لەپێ دەکەن).

٤٣٠٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعْرُ, وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا صِغَارَ الأَعْيُنِ, ذُلْفَ الآنُفِ, كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا موسوڵمانان جەنگ لەگەڵ گەلێکدا دەکەن نەعلەکانیان لە مووە، هەروەها قیامەت بەرپا نابێت هەتا موسوڵمانان جەنگ لەگەڵ گەلێکدا دەکەن چاو بچکۆلەن، لوتیان فشە، دەم و چاویان وەکو قەڵغانەو بەسیرمەی زۆر دەورە گیراوە).

٤٣٠٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم في حديثِ: (يُقَاتِلُكُمْ قَوْمٌ صِغَارُ الأَعْيُنِ). يَعْنِى التُّرْكَ, قَالَ: (تَسُوقُونَهُمْ ثَلاَثَ مِرَارٍ حَتَّى تُلْحِقُوهُمْ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ, فَأَمَّا فِى السِّيَاقَةِ الأُولَى فَيَنْجُو مَنْ هَرَبَ مِنْهُمْ, وَأَمَّا فِى الثَّانِيَةِ فَيَنْجُو بَعْضٌ وَيَهْلِكُ بَعْضٌ, وَأَمَّا فِى الثَّالِثَةِ فَيُصْطَلَمُونَ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گەلێك جەنگتان لەگەڵ دەكەن چاو بچكۆلەن). واتە: تورك. راوی وتی: (موسوڵمانان سێ جار توركەكان راپێچ دەكەن هەتا دوا جار دەیان گەیەننە دورگەی عەرەب، لە یەكەم جاردا هەر توركێ رابكات رزگاری دەبێت، لە دووەم جاردا هەندێكیان رزگاریان دەبێت و هەندێكی تریان دەفەوتێن و لەناودەچن، لە سێیەم جاردا سەردەكەون بەسەریانداو بە شمشێر دروێنەیان دەكەن و لەرێشە دەریان دەهێنن).

## باسی شاری بەصرە

## ١٠ - بباب فِي ذِكْرِ الْبَصْرَةِ.

٤٣٠٦ - (حسن) عن أبو بكرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (يَنْزِلُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِى بِغَائِطٍ يُسَمُّونَهُ الْبَصْرَةَ, عِنْدَ نَهْرٍ يُقَالُ لَهُ دِجْلَةُ, يَكُونُ عَلَيْهِ جِسْرٌ يَكْثُرُ أَهْلُهَا وَتَكُونُ مِنْ أَمْصَارِ الْمُهَاجِرِينَ). قَالَ ابْنُ يَحْيَى: قَالَ أَبُو مَعْمَرٍ: (وَتَكُونُ مِنْ أَمْصَارِ الْمُسْلِمِينَ, فَإِذَا كَانَ فِى آخِرِ الزَّمَانِ جَاءَ بَنُو قَنْطُورَاءَ عِرَاضُ الْوُجُوهِ صِغَارُ الأَعْيُنِ حَتَّى يَنْزِلُوا عَلَى شَطِّ النَّهْرِ, فَيَتَفَرَّقُ أَهْلُهَا ثَلاَثَ فِرَقٍ: فِرْقَةٌ يَأْخُذُونَ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَالْبَرِّيَّةِ وَهَلَكُوا, وَفِرْقَةٌ يَأْخُذُونَ لأَنْفُسِهِمْ وَكَفَرُوا, وَفِرْقَةٌ يَجْعَلُونَ ذَرَارِيَّهُمْ خَلْفَ ظُهُورِهِمْ وَيُقَاتِلُونَهُمْ وَهُمُ الشُّهَدَاءُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکانێ لە ئوممەتەکەم لە خاکێکی نزمایی و نشێو دادەبەزن پێی دەڵێن بەصرە، لەلای روبارێك دایە پێی دەوترێت دیجلە، پردێکی لەسەر دروست دەکرێت بەرە بەرە خەڵکی ئەو شارە زۆر دەبن و دەبێت بە یەکێ لە شارەکانی کۆچەران). ئیبنو یەحیا وتی: ئەبو مەعمەر وتی: (دەبێتە یەکێ لە شارە گەورەکانی موسوڵمانان، جا کە ئاخر زەمان دێت، نەوەی (قَنْطُورَاء) دێن کەسانێکی دەم و چاو پانن و چاو بچکۆلەن، لەسەر کەناری رووبارەکە دادەبەزن، خەڵکی شارەکە دەبن بە سێ تاقم و کۆمەڵەوە: کۆمەڵێکیان دوای کلکی مانگا دەکەون و خەریکی مانگا بەخێو کردن و ئیش و کاری دەشت و دەر دەبن و دەفەوتێن، کۆمەڵێکیان داوای ئەمان دەکەن لە نەوەی (قَنْطُورَاء) ئەمانیان لێ وەردەگرن و بە حوکمی ئەوان رازی دەبن و کافر دەبن، کۆمەڵەکەی تریشیان خێزان و منداڵەکانیان لەپشت خۆیانەوە دادەنێن و دەجەنگن لەگەڵیان، ئەوانە شەهیدن).

٤٣٠٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال له: (يَا أَنَسُ إِنَّ النَّاسَ يُمَصِّرُونَ أَمْصَارًا, وَإِنَّ مِصْرًا مِنْهَا يُقَالُ لَهُ الْبَصْرَةُ أَوِ الْبُصَيْرَةُ, فَإِنْ أَنْتَ مَرَرْتَ بِهَا أَوْ دَخَلْتَهَا فَإِيَّاكَ وَسِبَاخَهَا وَكِلاَءَهَا وَسُوقَهَا وَبَابَ أُمَرَائِهَا, وَعَلَيْكَ بِضَوَاحِيهَا, فَإِنَّهُ يَكُونُ بِهَا خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَرَجْفٌ, وَقَوْمٌ يَبِيتُونَ يُصْبِحُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی ئەنەس خەڵکی شاری زۆر بنیات دەنێن. یەکێك لەو شارانە پێی دەڵێن بەصرە یان بوصەیرە، ئەگەر بە ناو ئەو شارەدا تێ پەڕیت ئاگاداری ئەم شوێنانە بەو خۆتیان لێ بەدوور بگرە: ئەو شوێنەی کە خوێی زۆرە، کەنار دەریا ئەو شوێنەی کە کەشتیەکانی تێدا دەوەستن، بازاڕەکەی واتە شوێنی سەوداو مامەڵە، بەردەرگای فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران، بەڵکو پابەند بە چواردەوری و کێوەکانی و بەرزاییەکانی مەبەست لە دورەپەرێزیە لە خەڵك

و ناوچە قەرەباڵغەکانی، چونکە رۆچون و بەردباران و بومەلەرزەی تێدا روو دەدات، قەومێکیان شەو حاڵیان باشەو ئاساییین بەڵام بۆ بەیانی دەبن بە مەیمون و بەراز).

٤٣٠٨ - (ضعيف) عن صالح بن درهم قال: انْطَلَقْنَا حَاجِّينَ, فَإِذَا رَجُلٌ فَقَالَ لَنَا: إِلَى جَنْبِكُمْ قَرْيَةٌ يُقَالُ لَهَا: الأُبُلَّةُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: مَنْ يَضْمَنُ لِي مِنْكُمْ أَنْ يُصَلِّيَ لِي فِي مَسْجِدِ الْعَشَّارِ رَكْعَتَيْنِ أَوْ أَرْبَعًا وَيَقُولَ هَذِهِ لأَبِي هُرَيْرَةَ؟ سَمِعْتُ خَلِيلِي أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مِنْ مَسْجِدِ الْعَشَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُهَدَاءَ لاَ يَقُومُ مَعَ شُهَدَاءِ بَدْرٍ غَيْرُهُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْمَسْجِدُ مِمَّا يَلِي النَّهْرَ.

واتە: لە صالحی کوڕی دیرهەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەماڵ دەرچوین بە مەبەستی حەجکردن، توشی پیاوێ بووین وەستا بوو پێی وتین: لەتەنیشت ئێوەوە گوندێ هەیە ناوی ئوبولە بێ؟ وتمان: بەڵێ، وتی: کامتان بەڵێنی ئەوەم پێ دەدەن لە مزگەوتی عەششار دوو رکات یان چوار نوێژ بکات جا بڵێ پاداشتی ئەم نوێژە بۆ ئەبو هورەیرە، چونکە من لە ئەبو قاسمی دۆستی خۆمم بیست کە پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێ شەهید لە مزگەوتەکەی عەششارەوە حەشر دەکات تەنیا ئەوانە لەگەڵ شەهیدانی بەدر حەشر دەکرێن). ئەبو داود دەڵێت: ئەم مزگەوتە دەکەوێتە نزیك دەریاوە واتە نزیك دەریای فورات.

## باسی حەبەشە

## ١١ - باب ذِكْرِ الْحَبَشَةِ.

٤٣٠٩ - (حسن) عن عبد الله بن عمرو, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (اتْرُكُوا الْحَبَشَةَ مَا تَرَكُوكُمْ, فَإِنَّهُ لاَ يَسْتَخْرِجُ كَنْزَ الْكَعْبَةِ إِلاَّ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (واز لە حەبەشە بهێنن تا ئەوکاتەی کە وازتان لێ دەهێنن، چونکە کەس گەنجینەی کەعبە دەرناهێنێت ئیللا بەندەیەکی حەبەشی نەبێت لەقەبەکەی (ذُو السُّوَيْقَتَين)ە).

## باسی نیشانەکانی بەرپابوونی قیامەت.

## ١٢ - باب أَمَارَاتِ السَّاعَةِ.

٤٣١٠ - (صحيح) عن أبو زرعة قال: جَاءَ نَفَرٌ إِلَى مَرْوَانَ بِالْمَدِينَةِ, فَسَمِعُوهُ يُحَدِّثُ فِي الآيَاتِ أَنَّ أَوَّلَهَا الدَّجَّالُ, قَالَ: فَانْصَرَفْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو, فَحَدَّثْتُهُ, فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَمْ يَقُلْ شَيْئًا, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا, أَوِ الدَّابَّةُ عَلَى النَّاسِ ضُحًى, فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا). قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: - وَكَانَ يَقْرَأُ الْكُتُبَ - وَأَظُنُّ أَوَّلَهُمَا خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا.

واتە: لە ئەبو زورعەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ لای مەروان لە مەدینە، گوێی لێ بوو مەروان دەربارەی نیشانەكانی قیامەت دەدوا كە یەكەمینیان دەركەوتنی دەججالە، ئەبو زورعە وتی: چوم بۆ لای (عبد الله) ی كوڕی عەمر باسەكەم بۆ گێڕایەوە، (عبد الله) وتی: شتێكی نەوتوە ئیعتیباری هەبێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (یەكەم نیشانە هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، دەرچونی (دابە)زیندەوەرێك لە چێشتەنگاودا، هەركامیان پێشتر هات ئەوی تریان بەدوایدا دێت). (عبد الله) - كتێبی دەخوێندەوە - وتی: وا ئەزانم یەكەمین نیشانە هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە.

٤٣١١ - (صحيح) عن حذيفة بن أسيد الغفاري قال: كُنَّا قُعُودًا نَتَحَدَّثُ فِي ظِلِّ غُرْفَةٍ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرْنَا السَّاعَةَ, فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَنْ تَكُونَ, أَوْ لَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ, حَتَّى يَكُونَ قَبْلَهَا عَشْرُ آيَاتٍ: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا, وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ, وَخُرُوجُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ, وَالدَّجَّالُ, وَعِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ, وَالدُّخَانُ, وَثَلَاثُ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ, وَخَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ, وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ, وَآخِرُ ذَلِكَ: تَخْرُجُ نَارٌ مِنَ الْيَمَنِ مِنْ قَعْرِ عَدَنَ تَسُوقُ النَّاسَ إِلَى الْمَحْشَرِ).

واتە: لە (حذيفة)ی كوڕی (أَسِيد الْغِفَارِيِّ)یەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەسێبەری هۆدەیەكی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوین باسی قیامەتمان دەكرد، دەنگمان بەرزبویەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا دە لە نیشانەكانی روونەدات لەپێشەوە: هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە، دەرچونی (دابة)زیندەوەرێك، دەركەوتنی یەئجوج و مەئجوج، دەركەوتنی دەججال، هاتنی عیسای كوڕی مەریەم، دوكەڵ، سێ رۆچوونی زەوی: یەكێك لە رۆژئاوا، یەكێك لە رۆژهەڵات، یەكێكیش لە نیوە دوورگەی عەرەبی، كۆتایی ئەوانە ئاگرێكە لە یەمەن پەیدا دەبێت خەڵك بەرەو شوێنی كۆبونەوەیان راپێچ دەكات - كە شامە -).

٤٣١٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا, فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا فَذَاكَ حِينُ: (لا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵنەیەت، کاتێ کە هەڵهات و خەڵك بینیان هەرچی لەسەر زەویدایە باوەڕ دەهێنێ:

﴿ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ﴾. سورة الأنعام:١٥٨.

واتە: ئەو ڕۆژەی هەندێ لەنیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی پەروەدگارت بەدی بێت باوەڕهێنان سوود ناگەیەنێت بەهیچ کەس کەپێشتر بڕوای نەهێنابێ، یان هیچ خێروچاکەیەکی نەکردبێ لەگەڵ ئیمانەکەیدا.

## باسی دەرکەوتنی گەنجێ لە زێڕ لەبن روباری فوراتەوە

## ١٣ - باب حَسْرِ الْفُرَاتِ عَنْ كَنْزٍ.

٤٣١٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ, فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هاکا گەنجێ لە زێڕ لەبن روباری فوراتەوە دەرکەوت، هەرکەس فریا کەوت با هیچی لێ نەبات).

٤٣١٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: عن النبي صلى الله عليه وسلم: مِثْلَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (يَحْسِرُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشو هاتوە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە فەرمووی: (هاکا کێوێ لە زێڕ لەبن روباری فوراتەوە دەرکەوت) واتە لە جیاتی گەنجێ فەرمووی کێوێ.

## باسی دەرکەوتنی دەججال

## ١٤ - باب خُرُوجِ الدَّجَّالِ.

٤٣١٥ - (صحيح) عن ربعى بن حراش قال: اجْتَمَعَ حُذَيْفَةُ وَأَبُو مَسْعُودٍ فَقَالَ حُذَيْفَةُ: لأَنَا بِمَا مَعَ الدَّجَّالِ أَعْلَمُ مِنْهُ إِنَّ مَعَهُ بَحْرًا مِنْ مَاءٍ وَنَهْرًا مِنْ نَارٍ فَالَّذِى تَرَوْنَ أَنَّهُ نَارٌ مَاءٌ, وَالَّذِى تَرَوْنَ أَنَّهُ مَاءٌ نَارٌ, فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَأَرَادَ الْمَاءَ فَلْيَشْرَبْ مِنَ الَّذِى يَرَى أَنَّهُ نَارٌ فَإِنَّهُ سَيَجِدُهُ مَاءً. قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ الْبَدْرِيُّ: هَكَذَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ.

واته: لە ربیعی کوڕی حیراشەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: (حذیفة)و ئەبو مەسعود کۆبونەوە، (حذیفة) وتی: من لەدججال باشتر دەزانم دەریایە ئاو و ئاگری پێیە، ئەوەی کە دیبینن ئاگرە ئەوە ئاوە، ئەوەی کە دیبینن ئاوە ئەوە ئاگرە، هەرکەس لە ئێوە پێی گەیشت ئاوی ویست با لەوە بخواتەوە کە دەیبینێ ئەوە ئاگرە، جا ئاوی دەست دەکەوێت. ئەبو مەسعودە وتی: منیش بەم شێوەیە بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو.

٤٣١٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك, عن النبي عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَا بُعِثَ نَبِىٌّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الدَّجَّالَ الأَعْوَرَ الْكَذَّابَ أَلاَ وَإِنَّهُ أَعْوَرُ, وَإِنَّ

رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ, وَإِنَّ بَيْنَ عَيْنَيْهِ مَكْتُوبًا كَافِرٌ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی رەوانە نەکردوە ئیللا گەلەکەی خۆیانیان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەججالی یەك چاوی درۆزن، بێگومان یەك چاوی هەیە، پەروەردگارتان یەك چاو نیە، لەنێو چاوانی نوسراوە کافر).

٤٣١٧ - عن شعبة: (ك ف ر).

واتە: لە شوعبەوە هاتوە کە بەم شێوەیە نوسراوە: (ك ف ر).

٤٣١٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك: عن النبي صلى الله عليه وسلم, في هذا الحديث قال: (يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُسْلِمٍ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ئەم فەرموودە هاتوە، فەرمووی: (هەموو موسوڵانێ دەیخوێنێتەوە) - خوێندەوار بێ یان نەخوێندەوار - .

٤٣١٩ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال:قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ سَمِعَ بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ عَنْهُ فَوَاللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَأْتِيهِ وَهْوَ يَحْسِبُ أَنَّهُ مُؤْمِنٌ فَيَتَّبِعُهُ مِمَّا يُبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ أَوْ لِمَا يُبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ). هَكَذَا قَالَ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ دەرکەوتنی دەججالی بیست با هەڵبێ و لێی دوور بکەوێتەوە، سوێند بە (الله) پیاو وا دەزانێ ئەمین و

سەلامەت دەبێ لە فیتنەی بەڵام کاتێ کە ئەو شبوهات و سیحر و جادو کارە لەتوانا بەدەرانەی لێ دەبینێ کە دەیکات وەك زیندوکردنی مرۆڤ کاریگەری تێ دەکات و ئەو دڵنیاییەی کە هەیبوە نایمێنێ و دەکەوێتە ناو فیتنەوە و شوێنی دەکەوێت). ئەگەر لێی دورکەوتەوە ئەوا سەلامەت دەبێ.

٤٣٢٠ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنِّى قَدْ حَدَّثْتُكُمْ عَنِ الدَّجَّالِ حَتَّى خَشِيتُ أَنْ لاَ تَعْقِلُوا إِنَّ مَسِيحَ الدَّجَّالِ رَجُلٌ قَصِيرٌ أَفْحَجُ جَعْدٌ أَعْوَرُ مَطْمُوسُ الْعَيْنِ لَيْسَ بِنَاتِئَةٍ وَلاَ جَحْرَاءَ فَإِنْ أُلْبِسَ عَلَيْكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ عَمْرُو بْنُ الأَسْوَدِ وَلِيَ الْقَضَاءَ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من باسی دەجالم بۆ کردن تەنانەت ترسام تێ نەگەن، لەڕاستیدا دەجاڵ پیاوێکی کورتە باڵای قاچ بڵاوی قژ بژ و لولە یەك چاوی هەیە چاوەکەی تری سڕاوەتەوەو ڕەش بۆتەوە و روناکی تێدا نەماوە جا ئەگەر لێتان تێك چوو بزانن پەروەردگارتان کوێر نیە).

٤٣٢١ - (صحيح) عن النواس بن سمعان الكلابي قال: ذكر رسول الله صلى الله عليه وسلم الدجال فقال (إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ, وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ, وَاللَّهُ خَلِيفَتِى عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ, فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ فَإِنَّهَا جِوَارُكُمْ مِنْ فِتْنَتِهِ). قُلْنَا: وَمَا لُبْثُهُ فِى الأَرْضِ؟ قَالَ: (أَرْبَعُونَ يَوْمًا, يَوْمٌ كَسَنَةٍ, وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ). فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْيَوْمُ الَّذِى كَسَنَةٍ أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلاَةُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ؟ قَالَ: (لاَ اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ, ثُمَّ يَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِىَّ دِمَشْقَ فَيُدْرِكُهُ عِنْدَ بَابِ لُدٍّ فَيَقْتُلُهُ).

واتە: لە نەواسی کوڕی سەمعانی کیلابییەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی دەججالی کرد فەرمووی: (ئەگەر بێتو من لەناوتاندا بم خۆم بە بەڵگەوە بەرەنگاری دەبمەوە لە جیاتی ئێوە، ئەگەر منیش لەناوتاندا نەبووم ئەوە هەرکەسە بۆ خۆی دەبێ بە بەڵگەوە رووبەرووی بێتەوەو گفتوگۆی لەگەڵ بکات و سەرکەوێ، خوای گەورە دۆست و پارێزەری هەموو موسوڵمانێکە، هەرکەس لەئێوە گەیشت بە دەججال با سەرەتای سورەتی (کهف) بخوێنێ ئەوە دەبێتە هۆی سەلامەتی و دەیپارێزێ لە فیتنەی دەججال). وتمان: چەنێ دەمێنێتەوە لەسەر زەویدا؟ فەرمووی: (چل رۆژ، رۆژێك وەك ساڵێك و، رۆژێك وەك مانگێك و، رۆژێك وەك هەفتەیەك، رۆژەکانی تریشی ئاسایی وەك رۆژەکانی ئێوە). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو رۆژەی وەك ساڵێکە ئایا نوێژی یەك رۆژی تێدا بەسە؟ فەرمووی: (نەخێر بە مەزەندە بۆی دیاری بکەن، لەپاشدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم رەوانە دەکات لە رۆژهەڵاتی دیمەشق لەلای منارە سپیەکە دادەبەزێت دوای دەکەوێت لە (بَابِ لُدٍّ) پێی دەگات و دەیکوژێت).

٤٣٢٢ - (صحيح بما قبله) عن أبي أمامة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, نَحْوَهُ, وَذَكَرَ الصَّلَوَاتِ مِثْلَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشو هاتوە، باسی نوێژەکانی کرد بە هەمان مانا.

٤٣٢٣ - (صحيح) عن أبو الدرداء, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا قَالَ هِشَامٌ الدَّسْتَوَائِيُّ, عَنْ قَتَادَةَ, إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ (مَنْ حَفِظَ مِنْ خَوَاتِيمِ سُورَةِ الْكَهْفِ). وَقَالَ شُعْبَةُ: عَنْ قَتَادَةَ: (مِنْ آخِرِ الْكَهْفِ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله

علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس دە ئایەتی سەرەتای سورەتی (کهف) لەبەر بکات لە فیتنەو ئاژاوەی دەججال سەلامەت و پارێزراو دەبێت). ئەبو داود دەڵێت: هیشامی دەستەوائیش هەروا دەڵێت، لە قەتادەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت فەرمووی: (لە کۆتایی سورەتی (کهف) ). شوعبە دەڵێت: (لە کۆتایی (کهف) ).

٤٣٢٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ - يَعْنِي عِيسَى ابن مريم - وَإِنَّهُ نَازِلٌ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ, رَجُلٌ مَرْبُوعٌ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ, كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ, فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الإِسْلاَمِ, فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ, وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ, وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ, وَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِسْلاَمَ, وَيُهْلِكُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً, ثُمَّ يُتَوَفَّى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە نێوان من عیسادا پێغەمبەر نیە، بەڕاستی ئەو لە ئاسمانەوە دێتەخوار، جا کە بینیتان با بیناسن، پیاوێکی چوار شانەی باڵا مام ناوەندی سور و سپی یە، لە پۆشاکێکی زەردی کاڵدا دادەبەزێت، دەڵێی ئاو لەسەری دەتکێت، با تەڕیش نەبێت، لەسەر ئیسلام لەگەڵ خەڵك دەجەنگێت، خاچ تێك دەشکێنێ و، بەراز دەکوژێت، سەرانە لادەبات، خوای گەورە هەرچی ئاین هەیە لەناوی دەبات جگە لە دینی ئیسلام، عیسا مەسیحی دەججال لەناو دەبات، چل ساڵ لەسەر زەوی دا دەمێنێتەوە، لەپاشدا دەمرێت و موسوڵمانان نوێژی مردووی لەسەر دەکەن).

## سەبارەت بە هەواڵ و بە سەرهاتی جەسساسە

## ١٥ - باب فِي خَبَرِ الْجَسَّاسَةِ.

٤٣٢٥ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَّرَ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ ذَاتَ لَيْلَةٍ, ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: (إِنَّهُ حَبَسَنِي حَدِيثٌ كَانَ يُحَدِّثُنِيهِ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ عَنْ رَجُلٍ كَانَ فِي جَزِيرَةٍ مِنْ جَزَائِرِ الْبَحْرِ فَإِذَا أَنَا بِامْرَأَةٍ تَجُرُّ شَعْرَهَا, قَالَ: مَا أَنْتِ؟ قَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ, اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ الْقَصْرِ, فَأَتَيْتُهُ فَإِذَا رَجُلٌ يَجُرُّ شَعْرَهُ مُسَلْسَلٌ فِي الأَغْلاَلِ يَنْزُو فِيمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ, فَقُلْتُ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا الدَّجَّالُ, خَرَجَ نَبِيُّ الأُمِّيِّينَ بَعْدُ, قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: أَطَاعُوهُ أَمْ عَصَوْهُ؟ قُلْتُ: بَلْ أَطَاعُوهُ. قَالَ: ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ).

واتە: لە (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە شەوێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی عیشای دواخست لەپاشدا لەماڵ دەرچو فەرمووی: (بەڕاستی ئەوەی ڕێگری دەرچونی لێ کردم بە سەرهاتێ بوو تەمیمی داری بۆی گێڕامەوە دەربارەی حاڵی پیاوێ لە دورگەیە لە دورگەکانی دەریادا، تەمیم وتی: ئافرەتێکم بینی قژێکی درێژی پێوە بوو هەموو جەستەی داپۆشی بوو، وتم: تۆ کێی؟ وتی: من جەساسەم، بڕۆ بۆ لای ئەو کۆشکە، منیش چوم، پیاوێکی قژ درێژی لێ بوو بە کۆت و زنجیر شەتەك درابوو، لەزەوی بەرزدەبوەو دادەبەزی، وتم: تۆ کێی؟ وتی: من دەججالم، پێغەمبەری نەخوێنەوارەکان هاتوە، وتم: بەڵێ، وتی: گوێڕایەڵی دەکەن، یان سەرپێچی دەکەن؟ وتم: گوێڕایەڵی دەکەن، وتی: ئەوە خێر و چاکەیە بۆیان).

٤٣٢٦ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس قال: سَمِعْتُ مُنَادِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنَادِي أَنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ. فَخَرَجْتُ فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ قَالَ: (لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ). ثُمَّ قَالَ (هَلْ تَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ). قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (إِنِّي مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَهْبَةٍ وَلاَ رَغْبَةٍ وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ أَنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيًّا فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ, وَحَدَّثَنِي حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِي حَدَّثْتُكُمْ عَنِ الدَّجَّالِ, حَدَّثَنِي أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ مَعَ ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامٍ فَلَعِبَ بِهِمُ الْمَوْجُ شَهْرًا فِي الْبَحْرِ, وَأَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ حِينَ مَغْرِبِ الشَّمْسِ فَجَلَسُوا فِي أَقْرَبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرَةُ الشَّعْرِ قَالُوا وَيْلَكِ مَا أَنْتِ قَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي هَذَا الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ. قَالَ لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلاً فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا وَأَشَدُّهُ وَثَاقًا مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ). فَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَسَأَلَهُمْ عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ وَعَنْ عَيْنِ زُغَرَ وَعَنِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ قَالَ إِنِّي أَنَا الْمَسِيحُ وَإِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الْخُرُوجِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَإِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّامِ أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ لاَ بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ). مَرَّتَيْنِ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ قِبَلَ الْمَشْرِقِ, قَالَتْ: حَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: جاڕچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جاڕی دا: ئەی موسوڵمانینە کۆببنەوە بۆ نوێژ، منیش چومەدەرەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژم کرد، کاتێ کە لەنوێژ بویەوە چوە سەر مینبەر و دانیشت، پێدەکەنی، فەرمووی: (با هەموو کەس لەجێی خۆ دانیشێ و نەجولێ). لەپاشدا فەرمووی: (ئایا دەزانن کە من لەبەرچی ئێوەم کۆکردۆتەوە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (من بۆ ئەوە کۆمنەکردونەتەوە کە مەترسیم لەشتێ هەبێ یان بە هیوای شتێ بم، بەڵکو بۆ ئەوە کۆکردونەتەوە کە تەمیمی داری جاران پیاوێکی گاور بوو ئێستا هاتوە پەیمانی بە من داوەو موسوڵمان بووە، بەسەرهاتێکی لەبارەی دەججالەوە بۆ باس کردم رێك وەك ئەوەی کە من بۆ ئێوەم باس کرد.

تەمیم بۆی باس کردم کە جارێ لەگەڵ سی پیاو لە هۆزی لەخم و (جُذام) سواری پاپۆڕێکی گەورە دەبن، هەتا مانگێ لەناو دەریادا یارییان پێ دەکات تا سەرەنجام لەکاتی خۆرئاوا بووندا لەناو دەریا لە پەنای دورگەیەکدا لەنگەر دەگرن، ئینجا لەناو بەلەمەکانی کەشتیەکەدا دادەنیشن و دەچنە دورگەیەکەوە، دەعبایەکی کوڵکنی توکنیان توش دەبێت، دەڵێن: هاوار بۆ تۆ کێیت؟ وتی: من جەساسەم، بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە کە لەناو ئەو دێرەدایە، چونکە بەڕاستی ئەو زۆر تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، تەمیم وتی: کە ناوی پیاوی بۆمان هێنا لەو شوێنە چۆڵ و هۆڵەدا ترسمان لێ نیشت کە ئەم دەعبایە شەیتانێ بێ، خێرا رۆشتین هەتا چوینە ناو دێرەکەوە، لەوێ زەلامێکی زەبەلاحمان بینی هەرگیز مرۆڤی ئەوەندە زلمان نەدیوە، زۆر بە توندی کەلەپچە کرابوو، هەردوو دەستی کەلەپچە کرابوون بە ملیەوە، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، پرسیاری لێ کردن دەربارەی باخە خورماکانی بەیسان و، (عین زغر) شوێنێکە لە شام روەکی کەمە، هەروەها دەربارەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێ کردن، جا وتی: من مەسیحی دەججالم، زۆری نەماوە رێگەم پێ بدرێ بۆ دەرچون). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دووجار فەرمووی: (دورگەکە لە شام و یەمەن نیە وەك تەمیم و هاوڕێکانی باسی دەکەن، بەڵکو بەڕاستی لەلای خۆرهەڵاتەوەیە)، ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد کە لێرەوەیە. (فاطمة)ی کچی قەیس وتی: ئەم فەرموودەم لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لەبەر کردوە.

٤٣٢٧ - (ضعيف الإسناد) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ, ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ وَكَانَ لاَ يَصْعَدُ عَلَيْهِ إِلاَّ يَوْمَ جُمُعَةٍ قَبْلَ يَوْمَئِذٍ, ثُمَّ ذَكَرَ هَذِهِ الْقِصَّةَ.

واتە: لە (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشدا سەرکەوتە سەر مینبەر لەکاتێکدا کە پێشتر جگە لە رۆژانی هەینی سەرنەدەکەوتە سەر مینبەر، لەپاشدا بەسەرهاتی پێشوی گێڕایەوە.

٤٣٢٨ - (ضعيف الإسناد) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ذات يوم على المنبر: (إِنَّهُ بَيْنَمَا أُنَاسٌ يَسِيرُونَ فِي الْبَحْرِ, فَنَفِدَ طَعَامُهُمْ, فَرُفِعَتْ لَهُمْ جَزِيرَةٌ, فَخَرَجُوا يُرِيدُونَ الْخُبْزَ فَلَقِيَتْهُمُ الْجَسَّاسَةُ). قُلْتُ لأَبِي سَلَمَةَ: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَ: امْرَأَةٌ تَجُرُّ شَعْرَ جِلْدِهَا وَرَأْسِهَا. قَالَتْ فِي هَذَا الْقَصْرِ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. وَسَأَلَ عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ وَعَنْ عَيْنِ زُغَرَ. قَالَ: هُوَ الْمَسِيحُ. فَقَالَ لِي ابْنُ أَبِي سَلَمَةَ: إِنَّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ شَيْئًا مَا حَفِظْتُهُ, قَالَ: شَهِدَ جَابِرٌ أَنَّهُ هُوَ ابْنُ صَيَّادٍ, قُلْتُ: فَإِنَّهُ قَدْ مَاتَ. قَالَ: وَإِنْ مَاتَ. قُلْتُ: فَإِنَّهُ أَسْلَمَ. قَالَ: وَإِنْ أَسْلَمَ. قُلْتُ: فَإِنَّهُ قَدْ دَخَلَ الْمَدِينَةَ. قَالَ: وَإِنْ دَخَلَ الْمَدِينَةَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر فەرمووی: (جارێ کۆمەڵێ لەدەریادا دەڕۆشتن، خواردنیان لێ بڕا، دورگەیەکیان لێ دەرکەوت چون بۆ دورگەکە، دەرچون بەمەبەستی دەستەبەرکردنی نان، جەسساسەیان پێ گەیشت). راوی وتی: وتم بە ئەبو سەلەمە جەسساسە کێ یە؟ ئافرەتێکە قژی سەری و جەستەی زۆر درێژەو کوڵکنە، وتی: لەو کۆشکەدا.. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

پیاوی ناو کۆشکەکە واتە دەججال پرسیاری لێ کردن دەربارەی باخە خورماکانی بەیسان و، (عین زغر) شوێنێکە لە شام روەکی کەمە، وتی: ئەوە مەسیحی دەججالە. ئیبنو ئەبی سەلەمە پێی وتم: شتێکم لەم فەرموودەدا لەبەر نەکردوە. راوی وتی: جابر شایەتی دا وتی: مەسیحی دەججال ئیبنو صەییادە. وتم: بەڕاستی ئەو مردوە، وتی: ئەگەر مردوش بێت، وتم: ئەو موسوڵمان بووە، وتی: با موسوڵمانیش بوبێت، وتم: بەڕاستی ئەو چۆتە مەدینەوە، وتی: با چوبێتیشە مەدینەوە.

## سەبارەت بە هەواڵ و بە سەرهاتی ئیبنو صائید

## ١٦ - باب فِي خَبَرِ ابْنِ صَائِدٍ.

٤٣٢٩ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِابْنِ صَائِدٍ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ وَهُوَ غُلَامٌ فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ظَهْرَهُ بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ: (أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ). قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. ثُمَّ قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ). ثُمَّ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا يَأْتِيكَ). قَالَ يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئَةً). وَخَبَأَ لَهُ (يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ) قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ). فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنْ يَكُنْ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ). يَعْنِي الدَّجَّالَ (وَإِلاَّ يَكُنْ هُوَ فَلاَ خَيْرَ فِي قَتْلِهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)یان لەناودا بوو دایان بەلای ئیبنو صائید دا لەگەڵ دەستەیە لە منداڵان یاری دەکرد لە قەڵای هۆزی مەغالە - کە هۆزێ بوون لە جولەکەکان -، ئیبنو صائید نزیکی باڵغ بوونی بوو، بە خۆی نەزانی هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپشتەوە دەستی کێشا بەپشتی دا، لەپاشدا فەرموی:

ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم؟ ئیبنو عومەر وتی: ئیبنو صائید سەیری کردو وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێنەوارەکانی، لەپاشدا ئیبنو صائید بە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم وت: ئایا تۆ شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (باوەڕم هەیە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی). پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (لە هەواڵی غەیب چیت بۆ دێ؟) وتی: هەواڵی ڕاست و هەواڵی درۆشم بۆ دێ. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (سەریان لێشێواندویت). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من شتێکم بۆ تۆ گرتۆتە دڵم بزانم تۆ دەیزانیت؟). کە ئەم ئایەتە بوو:
﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴾ سورة الدخان : ١٠.

واتە: ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ.

ئیبنو صائید وتی: ئەوە دوخخە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (چغە! ڕادەت ناکەوێ پلەو پایەی خۆت - کە کاهینیە - سەرکەویت). پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەم بدە با بدەم لە ملی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر دەججال بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژیت، ئەگەر ئەویش نەبێت خێر لە کوشتنی دا نیە).

٤٣٣٠ - (صحيح الإسناد موقوف) عن نافع قال: كان ابن عمر يقول: وَاللَّهِ مَا أَشُكُّ أَنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ ابْنُ صَيَّادٍ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەیوت: سوێند بە (الله) هیچ گومانم نیە کە ئیبنو صەییاد دەججالە.

٤٣٣١ - (صحيح) عن محمد بن المنكدر قال: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَحْلِفُ بِاللَّهِ أَنَّ ابْنَ صَائِدٍ الدَّجَّالُ فَقُلْتُ: تَحْلِفُ بِاللَّهِ؟! فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ يَحْلِفُ عَلَى ذَلِكَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُنْكِرْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: جابری کوڕی (عبد الله)م بینی سوێندی خوارد بە (الله) کە ئیبنو صائید دەججالە، وتم: چۆن سوێند دەخۆی بە (الله)؟ لەسەر ئەوە؟ جابر وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەر بوو ڕەزای خوای لێ بێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سوێندی خوارد کە ئیبنو صائید دەججالە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئینکاری نەکرد.

٤٣٣٢ - (صحيح الإسناد) عن جابر قال: فَقَدْنَا ابْنَ صَيَّادٍ يَوْمَ الْحَرَّةِ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: لە ڕۆژی حەڕڕەدا ئیبنو صائیدمان لێ ون بوو. - حەڕڕە شوێنێکە لە نزیك مەدینە، ئەو ڕۆژەی یەزیدی کوڕی موعاویە سەرکەوت بەسەر خەڵکی مەدینەدا ئیبنو صائید دیار نەما-.

٤٣٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ ثَلاَثُونَ دَجَّالُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا سی درۆزن پەیدا دەبن هەر هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە پێغەمبەری خوان).

٤٣٣٤ - (حسن الإسناد) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ ثَلاَثُونَ كَذَّابًا دَجَّالاً كُلُّهُمْ يَكْذِبُ عَلَى اللَّهِ وَعَلَى رَسُولِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا سی درۆزن و دەججال پەیدا دەبن هەر هەموویان بەناوی خواو پێغەمبەرەکەیەوە درۆدەکەن).

٤٣٣٥ - (ضعيف مقطوع) عن إبراهيم قال: قال عبيدة السلماني, بِهَذَا الْخَبَرِ قَالَ: فَذَكَرَ نَحْوَهُ. فَقُلْتُ لَهُ: أَتَرَى هَذَا مِنْهُمْ - يَعْنِى الْمُخْتَارَ - فَقَالَ عَبِيدَةُ: أَمَا إِنَّهُ مِنَ الرُّءُوسِ.

واتە: لە ئیبراهیمەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: ئەم هەواڵە لە عوبەیدەی سەلمانییەوە هاتوە، وتی: بە هەمان شێوە گێڕایەوە، ئیبراهیم وتی: بە عوبەیدەم وت: پێت وایە موختار یەكێ بێ لەوان؟ عوبەیدە وتی: بەڵێ موختار لە سەر گەورەی دەججالەكانە.

## سەبارەت بە فەرمان
## بە چاكە و نەهی كردن لە خراپە.

## ١٧ - باب في الأَمْرِ وَالنَّهْيِ.

٤٣٣٦ - (ضعيف) عن عبد الله بن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ أَوَّلَ مَا دَخَلَ النَّقْصُ عَلَى بَنِى إِسْرَائِيلَ كَانَ الرَّجُلُ يَلْقَى الرَّجُلَ فَيَقُولُ: يَا هَذَا اتَّقِ اللَّهِ وَدَعْ مَا تَصْنَعُ فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لَكَ, ثُمَّ يَلْقَاهُ مِنَ الْغَدِ فَلاَ يَمْنَعُهُ ذَلِكَ أَنْ يَكُونَ أَكِيلَهُ وَشَرِيبَهُ وَقَعِيدَهُ, فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ ضَرَبَ اللَّهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ). ثُمَّ قَالَ (لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ) إِلَى قَوْلِهِ (فَاسِقُونَ) ثُمَّ قَالَ (كَلاَّ وَاللَّهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ وَلَتَأْخُذُنَّ عَلَى يَدَيِ الظَّالِمِ وَلَتَأْطُرُنَّهُ عَلَى الْحَقِّ أَطْرًا, وَلَتَقْصُرُنَّهُ عَلَى الْحَقِّ قَصْرًا).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (یەكەمین كەموكوڕیە كە رویدا لەناو نەوەی ئیسرائیل دا بەم شێوەیە بووو: كاتێ پیاوێ دەگەیشت بە پیاوێ كارێكی

خراپی بکردایە پێی دەوت: لە خوا بترسە واز لەو کارە خراپە بێنە چونکە ئەوە بۆ تۆ دروست نیە، لەپاشدا بۆ رۆژی دواتر لەسەر ئەو حاڵە پێی دەگەیشتەوە رێگری لێ نەدەکرد، بەڵکو خۆشی لەگەڵی دەیخواردو دەیخواردەوەو دەبوو بە هاونشینی، جا کە حاڵیان گەیشتە ئەو رادەیە خوای گەورە دڵیانی تێکەڵ و پێکەڵ کردو کردنی بە فیتنەو ئاژاوە بۆ یەکتری. لە پاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەم چەند ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ٨٠ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٨١ ﴾

سورة المائدە: ٧٨، ٧٩، ٨٠، ٨١.

واتە: نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم، ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد. ئەوانە بەرگری یەکتری یان نەدەکرد لەهەر کارێکی بێزراوی بێ شەرعی کەدەیانکرد، بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی کەئەیانکرد. ئەبینی (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێگومان زۆر بەدو خراپە ئەوەی کەپێشیان خست بۆخۆیان (کردویانە) کە هۆی خەشم و قینی خوا بوو لێیان، وە ئەوانە لەسزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە. وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بەخوا و پێغەمبەرو ئەو بەرنامەیەی کەنێراوەتە خوارەوە بۆ سەری، ئەو بێبڕوایانە یان نەدەکرد بەدۆست و برادەر بەڵام زۆر بەیان لەئاین دەرچوون ویاخین لەخوا.

لە پاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر سوێند بە (الله) یان دەبێ فەرمان بکەن بە چاکەو نەهی بکەن لە خراپەو، بەری زۆری زۆرداران

دەگرن و نایەڵن زوڵم و ستەم بکەن و دەیانگێڕنەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و نایەڵن لەڕێی ڕاست لابدەن).

٤٣٣٧ - (ضعيف) عن ابن مسعود, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بنحوه, زاد: (أَوْ لَيَضْرِبَنَّ اللَّهُ بِقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ, ثُمَّ لَيَلْعَنَنَّكُمْ كَمَا لَعَنَهُمْ).

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشو هاتوە. بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (یان خوای گەورە دڵتان تێکەڵ و پێکەڵ دەکات و، لەپاشدا وەك چۆن لەعنەتی لە بەنی ئیسرائیل کردوە لەسەر بێ باوەڕی و یاخی بوونیان بەو شێوەیەش نەعلەت لە ئێوە دەکات).

٤٣٣٨ - (صحيح) عن قيس قال: قَالَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ أَنْ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ وَتَضَعُونَهَا عَلَى غَيْرِ مَوَاضِعِهَا: (عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ). قَالَ: عَنْ خَالِدٍ وَإِنَّا سَمِعْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ). وَقَالَ عَمْرٌو عَنْ هُشَيْمٍ وَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (مَا مِنْ قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِى ثُمَّ يَقْدِرُونَ عَلَى أَنْ يُغَيِّرُوا ثُمَّ لاَ يُغَيِّرُوا إِلاَّ يُوشِكُ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ مِنْهُ بِعِقَابٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ كَمَا قَالَ خَالِدٌ أَبُو أُسَامَةَ وَجَمَاعَةٌ. وَقَالَ شُعْبَةُ فِيهِ: (مَا مِنْ قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِى هُمْ أَكْثَرُ مِمَّنْ يَعْمَلُهُ).

واتە: لە قەیسەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ دوای ئەوەی سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد وتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو لە غەیری جێگەی خۆیدا دایدەنێن: ﴿ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ﴾. سورة المائدە: ١٠٥. واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ خەریکی چاکسازی دەروونی خۆتان بن و هەمیشە هۆشتان بە

خۆتانەوە بێ، ئیتر خەڵكانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن. هەرچەندە پیلان بگێڕن.

پێشەوا ئەبو بەكر وتی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو (هەركاتێ زاڵم و ستەمكار بە بەرچاوی خەڵكەوە ستەم بكات خەڵكەكە دەستی نەگرن و رێگری لێ نەكەن ئەوە نزیكە خوای گەورە بە زوویی سزایەكی گشتی بۆ سەرجەمیان بنێرێت).

٤٣٣٩ - (حسن) عن جرير قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَا مِنْ رَجُلٍ يَكُونُ فِي قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِي يَقْدِرُونَ عَلَى أَنْ يُغَيِّرُوا عَلَيْهِ, فَلاَ يُغَيِّرُوا, إِلاَّ أَصَابَهُمُ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَمُوتُوا).

واتە: لە جەریری كوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو (هەر پیاوێك لەناو گەل و هۆزێكدا بێ كاری خراپەو ناپەسەند بكات، ئەوگەل و هۆزە توانای گۆڕینیان هەبێ و نەیگۆڕن و بەرگری لێ نەكەن، ئیللا خوای گەورە لە پێش مردنیاندا سزایان دەدات و تۆڵەیان لێ دەسێنێت پێش ئەوەی بمرن).

٤٣٤٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنْ رَأَى مُنْكَرًا فَاسْتَطَاعَ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ, فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ, فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ بِلِسَانِهِ فَبِقَلْبِهِ, وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو (هەركەس لەئێوە خراپەیەكی بینی توانای هەبوو بەدەستی بیگۆڕێت ئەوە با بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بەدەستی بیگۆڕێت ئەوە با بە زمانی بیگۆڕێت، ئەگەر بە زمانی نەیتوانی بیگۆڕێت ئەوە با بە دڵی بیگۆڕێت، ئەمەش لاوازترینی باوەڕ و ئیمانە).

٤٣٤١ - (ضعيف لكن فقرة أيام الصبر ثابتة) عن أبو أمية الشعباني قال: سَأَلْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيَّ فَقُلْتُ: يَا أَبَا ثَعْلَبَةَ كَيْفَ تَقُولُ فِي هَذِهِ الآيَةِ؟ (عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ) قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْهَا خَبِيراً, سَأَلْتُ عَنْهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (بَلِ ائْتَمِرُوا بِالْمَعْرُوفِ, وَتَنَاهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ, حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا, وَهَوًى مُتَّبَعًا, وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً, وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ, فَعَلَيْكَ - يَعْنِي بِنَفْسِكَ - وَدَعْ عَنْكَ الْعَوَامَّ, فَإِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامَ الصَّبْرِ, الصَّبْرُ فِيهِ مِثْلُ قَبْضٍ عَلَى الْجَمْرِ, لِلْعَامِلِ فِيهِمْ مِثْلُ أَجْرِ خَمْسِينَ رَجُلاً يَعْمَلُونَ مِثْلَ عَمَلِهِ). وَزَادَنِي غَيْرُهُ, قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْهُمْ قَالَ: (أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُمْ).

واتە: لە ئەبو ئومەییەی شەعبانیەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنیم پرسی دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ﴾. سورة المائدة: ١٠٥. واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ خەریکی چاکسازی دەروونی خۆتان بن و هەمیشە هۆشتان بە خۆتانەوە بێ، ئیتر خەڵکانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن. هەرچەندە پیلان بگێڕن.

وتم: ئەی ئەبو (ثعلبة) بەرامبەر بەم ئایەتە چی دەڵێی؟ وتی: سوێند بە (الله) پرسیارم دەربارەی کردوەو شارەزام، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردوە دەربارەی فەرمووی: ( ئێوە هەر فەرمان بە چاکە دەکەن و، نەهی لە خراپە دەکەن، چروکی و ڕەزیلی و سوربوون بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان زاڵ دەبێت بەسەر خەڵکدا، شوێن هەواو ئارەزوو دەکەون و، خۆشەویستی دونیا کاریان لێ دەکات و سوردەبن لەسەری، دونیا پێش قیامەت دەخرێت، هەرکەس رای خۆی لەلا پەسەند دەبێت، ئەو کاتە خەمی خۆتت بێ، واز لەکاری خەڵك بێنە، ڕۆژی ئارامگرتن لە پێشتانەو جگە لە ئارامگرتن هیچ چارەیەکی ترتان نیە، ئارامگرتن لەو کاتانەدا وەك پشکۆ گرتن بەدەستەوە وایە، ئەوەی لەناویاندا کاردەکات لەو سەردەمەدا - واتە فەرمان بە چاکە دەکات و، نەهی لە خراپە دەکات، پاداشتی پەنجا پیاوی جگە لەو ڕۆژگارەی هەیە کە هەمان کار دەکەن).

٤٣٤٢ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو بن العاص: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (كَيْفَ بِكُمْ وَبِزَمَانٍ). أَوْ (يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ زَمَانٌ يُغَرْبَلُ النَّاسُ فِيهِ غَرْبَلَةً تَبْقَى حُثَالَةٌ مِنَ النَّاسِ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَأَمَانَاتُهُمْ وَاخْتَلَفُوا فَكَانُوا هَكَذَا). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. فَقَالُوا: وَكَيْفَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (تَأْخُذُونَ مَا تَعْرِفُونَ, وَتَذَرُونَ مَا تُنْكِرُونَ وَتُقْبِلُونَ عَلَى أَمْرِ خَاصَّتِكُمْ وَتَذَرُونَ أَمْرَ عَامَّتِكُمْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوور نیە سەردەمێك خەڵك بە بێژران ببێژرێن واتە چاکەکان بڕۆن و هەرچی و پەرچی و خراپەکارەکان بمێننەوە بێ پەیمان و ناپاك، لەنێو خۆیاندا ناکۆکیش دەبن بەم شێوەیە). پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئێمە چی بکەین؟ فەرمووی: (ئەوە وەردەگرن کە دەیزانن، واز لەوە دەهێنن کە نکوڵی لێ دەکەن، خەریکی خۆتان دەبن و واز لە کاروباری گشتی دەهێنن).

٤٣٤٣ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: بَيْنَمَا نَحْنُ حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ ذَكَرَ الْفِتْنَةَ فَقَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَخَفَّتْ أَمَانَاتُهُمْ وَكَانُوا هَكَذَا). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ قَالَ فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: كَيْفَ أَفْعَلُ عِنْدَ ذَلِكَ جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ؟ قَالَ: (الْزَمْ بَيْتَكَ وَامْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ وَخُذْ بِمَا تَعْرِفُ وَدَعْ مَا تُنْكِرُ وَعَلَيْكَ بِأَمْرِ خَاصَّةِ نَفْسِكَ وَدَعْ عَنْكَ أَمْرَ الْعَامَّةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەدەوری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆبوینەوە باسی بەڵاو ئاژاوە کرا - یان لەلایدا باسکرا - فەرمووی: (ئەگەر خەڵکتان بینی بەڵێن و پەیمانیان نەبردە سەرو، سپاردەو ئەمانەتیان لا سوك بوو بەم شێوەیە بوون). پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا، وتی: منیش هەستام لەبەری و وتم: ئەی من چی

بکەم ئەو کاتە خوای گەورە بمکات بە قوربانت؟ فەرمووی: (لە ماڵی خۆت دانیشەو، زمانی خۆت بگرە، هەرچی چاکە ئەوە بکە، واز لە خراپە بهێنە، واز لە کاروباری گشتی بهێنە).

٤٣٤٤ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ). أَوْ (أَمِيرٍ جَائِرٍ).

ئەبو سەعیدی خودری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: چاکترین جیهادو تێکۆشان وتنی وتەی هەقە لەبەردەم فەرمانڕەوای زاڵم و ستەمکاردا.

٤٣٤٥ - (حسن) عن العرس بن عميرة الكندي: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الْأَرْضِ كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا). وَقَالَ مَرَّةً: (أَنْكَرَهَا). (كَمَنْ غَابَ عَنْهَا, وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا).

واتە: لە عورسی کوڕی عەمیرەی کیندیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر خراپە کرا لەسەر زەوی ئەو کەسەی کە ئامادەبوو لەلای پێی ناخۆش بوو وەك ئەوە وایە لێی دوربێت، ئەوەی نکولی لێ بکات وەك ئەو کەسە وایە لەوێ ئامادە نەبوبێت، ئەو کەسەی لەوێ ئامادە نەبێ و پێی رازی بێت وەك ئەو کەسە وایە کە لەوێ ئامادە بووە).

٤٣٤٦ - (حسن) عن عدي بن عدي, عن النبي صلى الله عليه وسلم, نحوه. قال: (مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا كَانَ كَمَنْ غَابَ عَنْهَا).

واتە: لە عەدی کوڕی عەدیەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، فەرمووی: (هەرکەس ئامادەبوو لەلای پێی ناخۆش بوو وەك ئەوە وایە لێی دوربێت).

٤٣٤٧ - (صحيح) عن سليمان قال: حدثني رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَنْ يَهْلِكَ النَّاسُ حَتَّى يَعْذِرُوا أَوْ يُعْذِرُوا مِنْ أَنْفُسِهِمْ).

واتە: لە سولەیمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خەڵك لەناو ناچن هەتا گوناهو تاوان لەناویاندا زۆر دەبێت، جا ئەگەر هەقیان بۆ رون کرایەوە ئیتر بەهانەیان نامێنێ بۆ لەناوچون).

## باسی بەرپابوونی قیامەت

### ١٨ - باب قِيَامِ السَّاعَةِ.

٤٣٤٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلاَةَ الْعِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: (أَرَأَيْتُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ). قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَهَلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, تِلْكَ فِيمَا يَتَحَدَّثُونَ عَنْ هَذِهِ الأَحَادِيثِ عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ وَإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ يُرِيدُ أَنْ يَنْخَرِمَ ذَلِكَ الْقَرْنُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەوێکیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کۆتایی ژیانیدا بەرنوێژی نوێژی عیشای بە کۆمەڵ بۆ کردین کاتێ کە سەلامی دایەوە هەستایەوە فەرمووی: (خۆ ئەم شەوەتان دەبینن! هەر یەکێ لەئێوە کە ئەم شەو لەم مزگەوتەدا ئامادەیە سەد ساڵی تر کەستان نامێنێ بەسەر ئەم زەویەوە هەمووتان دەمرن). ئیبنو عومەر وتی: خەڵکەکە بە هەڵە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تێگەیشتن وا حاڵی بوو بوون کە

فەرموویەتی سەد ساڵی تر قیامەت بەرپادەبێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەبەستی ئەوە بوو تەمەن کورتە، هیچ کەس لەوانەی کە ئەم رۆژە لەسەر زەوین لەدوای سەد ساڵی تر کەسیان نامێنێ.

٤٣٤٩ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَنْ يُعْجِزَ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ مِنْ نِصْفِ يَوْمٍ).

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئومێدەوارم ئەم ئوممەتە ئەوەندە رێز و پلەو پایەی هەبێ لەلای خوای گەورە لەم سەردەمەی منەوە هەتا نیو رۆژ واتە پێنج سەد ساڵ مۆڵەتیان بدات بە شێوەیە لەوە کەمتر نەبێ هەتا رۆژی قیامەت)[1].

٤٣٥٠ - (صحيح) عن سعد بن أبي وقاص: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنِّي لأَرْجُو أَنْ لاَ تُعْجِزَ أُمَّتِي عِنْدَ رَبِّهَا أَنْ يُؤَخِّرَهُمْ نِصْفَ يَوْمٍ). قِيلَ لِسَعْدٍ وَكَمْ نِصْفُ يَوْمٍ؟ قَالَ: خَمْسُمِائَةِ سَنَةٍ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئومێدەوارم ئەم ئوممەتە ئەوەندە رێز و پلەو پایەی هەبێ لەلای پەروەردگاری نیو رۆژ واتە پێنج سەد ساڵ دوایان بخات). بە سەعد وترا: ئەو نیو رۆژە دەکاتە چەند؟ وتی: دەکاتە پێنج سەد ساڵ. - بێگومان سەعد لەم ئایەتەوە وەری گرتوە: (وإن يوما عند ربك كألف سنه مما تعدون) - .

- بەم شێوەیەش راڤەکراوە ئومێدەوارم خوای گەورە ئارامی ببەخشێت بە دەوڵەمەندەکانی ئوممەتەکەم لەکاتێکدا کە نیو رۆژ رادەوەستێنرێن بۆ لێپرسینەوە، بێگومان دەوڵەمەندەکان پێنج سەد ساڵ لەدوای هەژارەکان دەچنە بەهەشتەوە - .

کۆتایی پەرتوکی ئاژاوە گەورەکان.

---

(١) عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي علق عليه وخرج أحاديثه شيخ مشهور (٦/ ٣٧٠).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی سنورەکان واتە سزاو تۆڵەی تاوانەکان
## ٣٩ - أول كتاب الحدود

### حوکمی ئەو کەسەی کە لەدین پاشگەز دەبێتەوە.

### ١ - باب الْحُكْمِ فِيمَنِ ارْتَدَّ.

٤٣٥١ - (صحيح) عن عكرمة: أَنَّ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَحْرَقَ نَاسًا ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ, فَقَالَ: لَمْ أَكُنْ لأَحْرِقَهُمْ بِالنَّارِ, إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللَّهِ). وَكُنْتُ قَاتِلَهُمْ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ). فَبَلَغَ ذَلِكَ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلاَمُ فَقَالَ: وَيْحَ ابْنَ عَبَّاسٍ.

واتە: لە عیکرمەوە دەگێرنەوە، کە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) ڕەزای خوای لێ بێ خەڵکانێکی سوتاند بە ئاگر، هەواڵەکە گەیشتەوە بە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: نەدەبوو بە ئاگر بیانسوتێنێ، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بە سزای تایبەتی خوای گەورە سزای خەڵك مەدەن کە بریتیە لە سزادان بە ئاگر). من لەجیاتی پێشەوا عەلی بومایە دەمکوشتن بە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس دینی خۆی گۆڕی بیکوژن) جا کە هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ، وتی: وەیحە ئیبنو عەباس.

٤٣٥٢ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَحِلُّ دَمُ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَنِّى رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِى, وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ, وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ, الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەڵاڵ نیە خوێن ڕشتنی مرۆڤی موسوڵمان کە شایەتومانی بهێنێ و بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَنِّى رَسُولُ اللَّهِ). واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله)، وە منیش نێرراوی خوای گەورەم. تەنها لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت: زەواجی کردبێت و زینای کردبێت، گیان لەتۆڵەی گیان واتە موسڵمانێکی بە ناڕەوا کوشتبێت، یان پاشگەزبووبێتەوە لە ئیسلام و، لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیابوبێتەوە).

٤٣٥٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانٍ, فَإِنَّهُ يُرْجَمُ, وَرَجُلٌ خَرَجَ مُحَارِبًا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ, فَإِنَّهُ يُقْتَلُ أَوْ يُصْلَبُ أَوْ يُنْفَى مِنَ الأَرْضِ, أَوْ يَقْتُلُ نَفْسًا فَيُقْتَلُ بِهَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەڵاڵ نیە خوێن ڕشتنی مرۆڤی موسوڵمان کە شایەتومانی بهێنێ و بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ). واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله)، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد صلی الله علیه وسلم پێغەمبەری خوایە. تەنها لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت: پیاوێ زەواجی کردبێت و زینای کردبێت، ئەوە بەردباران دەکرێت هەتا دەمرێت، پیاوێ لە ئیسلام دەرچوبێ و جەنگ دژی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە دەکوژرێت یان هەڵەواسرێت، یا لەزەوی دەردەکرێ واتە لەو وڵاتەوە دەردەکرێ بۆ وڵاتێکی تر، یان مەسڵمانێکی بە ناڕەوا کوشتبێت ئەوە لەجیاتیدا دەکوژرێتەوە).

٤٣٥٤ - (صحيح) عن أبو بردة قال: قال أبو موسا: أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعِى رَجُلاَنِ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِى, وَالآخَرُ عَنْ يَسَارِى, فَكِلاَهُمَا سَأَلاَ الْعَمَلَ, وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاكِتٌ فَقَالَ: (مَا تَقُولُ يَا أَبَا مُوسَى؟). أَوْ (يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ؟). قُلْتُ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَطْلَعَانِى عَلَى مَا فِى أَنْفُسِهِمَا وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ. قَالَ وَكَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى سِوَاكِهِ تَحْتَ شَفَتِهِ قَلَصَتْ قَالَ (لَنْ نَسْتَعْمِلَ - أَوْ لاَ نَسْتَعْمِلُ - عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ وَلَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ يَا أَبَا مُوسَى أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ). فَبَعَثَهُ عَلَى الْيَمَنِ ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ قَالَ فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ مُعَاذٌ قَالَ انْزِلْ. وَأَلْقَى لَهُ وِسَادَةً فَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ قَالَ مَا هَذَا قَالَ هَذَا كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السُّوءِ. قَالَ لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. قَالَ: اجْلِسْ نَعَمْ. قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ. ثُمَّ تَذَاكَرَا قِيَامَ اللَّيْلِ, فَقَالَ أَحَدُهُمَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: أَمَّا أَنَا فَأَنَامُ وَأَقُومُ - أَوْ أَقُومُ وَأَنَامُ - وَأَرْجُو فِى نَوْمَتِى مَا أَرْجُو فِى قَوْمَتِى.

واتە: لە ئەبو بوردەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو موسای ئەشعەری وتی: خۆم و دوو پیاو لە ئەشعەریەکان چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، یەکێکیان لەلای راستمەوە بوو، ئەوی تریان لەلای چەپمەوە بوو، هەردوکیان داوای ئەوەیان دەکرد کە بکرێن بە بەرپرس و سەرەوکاری کارێ بکەن، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەریکی سیواك کردن بوو بێ دەنگ بوو، فەرمووی: (ئەی ئەبو موسا تۆ دەڵێی چی؟) یان (ئەی (عبد الله)ی کوڕی قەیس تۆ دەڵێی چی؟)، وتم: بەو (الله)یەی کە تۆی بە هەق ناردوە ئاگام لەم نیازەیان نەبووە و هەستم نەکردووە داوای ئیشوکار بکەن، ئەبو موسا وتی: ئێستاش ئەڵێی بە بەرچاومەوەیە سیواکەکەی لە ژێر لێویەوە بوو، لێوی گرژەوە بوو بوو، فەرمووی: (ئێمە ئەو کەسانە ناکەین بە سەرەوکاری کارەکانمان کە خۆیان داوای دەکەن، بەڵام تۆ ئەی ئەبو موسا یان ئەی (عبد الله)ی کوڕی قەیس بڕۆ ببە بە کاربەدەستی ئێمە). ناردی بۆ یەمەن، لەپاشدا (معاذ)ی کوڕی جەبەلی ناردو

کردی بە کاربەدەستی یەکێ لە دوو ناوچەکەی یەمەن، راوی وتی: کاتێ کە (معاذ) گەیشتە خزمەتی، ئەبو موسا وتی: دابەزە، دۆشکلەیەکی بۆ راخست، لەوکاتەدا پیاوێ لەلایدا کۆت و زنجیر کرابوو، (معاذ) وتی: ئەم پیاوە کێ یە بۆ وا کۆت و زنجیر کراوە؟ وتی: ئەمە جولەکە بوەو موسوڵمان بووە، لەپاشدا چوەتەوە سەر ئاینە خراپەکەی خۆی و بۆتەوە بە جولەکە، (معاذ) وتی: نەخێر دانانیشم هەتا نەکوژرێت بەپێی حوکم و بڕیاری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی، ئەبو موسا وتی: دانیشە، (معاذ) وتی: نەخێر دانانیشم هەتا نەکوژرێت بەپێی حوکم و بڕیاری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی، سێ جار ئەمەی دووپات کردەوە، جا ئەبو موسا فەرمانی دا بەکوشتنی و، پیاوەکە کوژرا. ئینجا لەناو خۆیاندا باسی شەونوێژیان کرد، (معاذ) وتی: من لەپێشدا دەخەوم بۆ ئەوەی بەهێزبم بۆ شەونوێژ، جا هەم لە شەونوێژەکەمدا بە هیوای پاداشتم، وە هەم لە خەوتنەکەمدا بە هیوای پاداشتم.

٤٣٥٥ - (صحيح) عن أبو موسى قال: قَدِمَ عَلَيَّ مُعَاذٌ وَأَنَا بِالْيَمَنِ, وَرَجُلٌ كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ فَارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ, فَلَمَّا قَدِمَ مُعَاذٌ قَالَ: لاَ أَنْزِلُ عَنْ دَابَّتِي حَتَّى يُقْتَلَ. فَقُتِلَ. قَالَ أَحَدُهُمَا: وَكَانَ قَدِ اسْتُتِيبَ قَبْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ لە یەمەن بووم (معاذ) هات بۆلام، لەوکاتەدا پیاوێ کە پێشتر جولەکە بوو موسوڵمان بوو بوو لەپاشدا لەئیسلام پاشگەزبوبوەوە، کاتێ کە (معاذ) بە سواری گەیشت وتی: لەسواری وڵاخەکەم دانابەزم هەتا دەکوژرێت، کابرای جولەکە کوژرا، یەکێکیان وتی: بێگومان پێشتر تەوبەی کردبوو.

٤٣٥٦ - (صحيح الإسناد) عن أبو بردة بهذه القصة, قال: فَأُتِيَ أَبُو مُوسَى بِرَجُلٍ قَدِ ارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ فَدَعَاهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً أَوْ قَرِيبًا مِنْهَا, فَجَاءَ مُعَاذٌ فَدَعَاهُ فَأَبَى فَضُرِبَ عُنُقُهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ, عَنْ أَبِي بُرْدَةَ, لَمْ يَذْكُرْ الاِسْتِتَابَةَ, وَرَوَاهُ ابْنُ فُضَيْلٍ, عَنِ الشَّيْبَانِيِّ, عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ, عَنْ أَبِيهِ, عَنْ أَبِي مُوسَى وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ الاِسْتِتَابَةَ.

واتە: لە ئەبو بوردەوە هەمان بەسەرهات هاتوە وتی: پیاوێکیان هێنا بۆ ئەبو موسای ئەشعەری لەئیسلام پاشگەزبوبوەوە، هەتا بیست رۆژ یان نزیکەی بیست رۆژ داوای لێ کرد کە پەشیمان ببێتەوە، کاتێ کە (معاذ) هات داوای لێ کرد کە تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە بەڵام پەشیمان نەبوەوە بۆیە درا لە ملی.
ئەبو داود دەڵێت: لە (عبد الملك)ی کوڕی عومەیرەوە، لە ئیبنو ئەبو بوردەوە هاتوە، بەڵام باسی تەوبەو پەشیمان بوونەوەی نەکرد. وە لە (ابن فضیل)ەوە، لە شەیبانیەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبو بوردەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو موساوە هاتوە، بەڵام لە فەرمودەکەیدا باسی تەوبەو پەشیمان بوونەوەی نەکرد.

٤٣٥٧ - (صحيح الإسناد) عن القاسم بهذه القصة, قال: فَلَمْ يَنْزِلْ حَتَّى ضُرِبَ عُنُقُهُ, وَمَا اسْتَتَابَهُ.

واتە: لە ئەبو قاسیمەوە هەمان بەسەرهات هاتوە، وتی: (معاذ) لەسەر وڵاخەکەی دانەبەزی هەتا درا لە ملی کابرا، داوای تەوبەو پەشیمان بونەوەشی لێ نەکرد.

٤٣٥٨ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ يَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَزَلَّهُ الشَّيْطَانُ فَلَحِقَ بِالْكُفَّارِ, فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُقْتَلَ يَوْمَ الْفَتْحِ, فَاسْتَجَارَ لَهُ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ, فَأَجَارَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (عبد الله)ی کوڕی سەعدی کوڕی ئیبنو سەرح کە یەکێ بوو لەوانەی وەحی بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەنوسیەوە، شەیتان لەخشتەی بردو گومڕای کرد هەڵهات بۆ مەککە و پەیوەندی کرد بە کافرەکانی قورەیشەوە، لەرۆژی رزگارکردنی مەککەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بکوژرێت، بەڵام پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ داوای ئەمانی بۆ کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمانی دایەو نەیکوشت.

٤٣٥٩ - (صحيح) عن سعد قال: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ اخْتَبَأَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ عِنْدَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ فَجَاءَ بِهِ حَتَّى أَوْقَفَهُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! بَايِعْ عَبْدَ اللَّهِ. فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَنَظَرَ إِلَيْهِ ثَلاَثًا, كُلُّ ذَلِكَ يَأْبَى فَبَايَعَهُ بَعْدَ ثَلاَثٍ, ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: (أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ يَقُومُ إِلَى هَذَا حَيْثُ رَآنِي كَفَفْتُ يَدِي عَنْ بَيْعَتِهِ فَيَقْتُلَهُ). فَقَالُوا: مَا نَدْرِي يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا فِي نَفْسِكَ أَلاَّ أَوْمَأْتَ إِلَيْنَا بِعَيْنِكَ, قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ أَنْ تَكُونَ لَهُ خَائِنَةُ الأَعْيُنِ).

واتە: لە سەعدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەرۆژی رزگارکردنی مەککەدا (عبد الله)ی کوڕی سەعدی کوڕی ئیبنو سەرح لەلای پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ خۆی شاردەوە، پێشەوا (عثمان) هێنای هەتا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم رایوەستاند، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەیمان(بیعة) لە (عبد الله) وەربگرە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ جار سەری بەرزکردەوەو، سەیری (عبد الله)ی کرد، نەیویست پەیمان(بیعة)ی لێ وەربگرێت، لەپاش سێ جارەکە پەیمان(بیعة)ی لێ وەرگرت، ئینجا ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵانیدا فەرمووی: (ئەوە پیاوێکی هۆشیار و عاقڵتان تێدا نەبوو لەکاتێکدا کە من سێ جار دەستم گێڕایەوەو پەیمان(بیعة)م لێ وەرنەگرت بدات لەملی و بیکوژێ؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەمانزانی چی لەدڵتدایەو مەبەستت چی یە، بۆچی بە چاو ئاماژەت پێ نەکردین، فەرمووی: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە چاوی خیانەتکار بێت).

٤٣٦٠ - (ضعيف) عن جرير قال: سمعت النبي صلى الله عليه و سلم يقول (إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ إِلَى الشِّرْكِ فَقَدْ حَلَّ دَمُهُ).

واتە: لە جەریرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەگەر کۆیلەیە هەڵهات بۆ وڵاتی هاوبەش بۆ خوا دانەران واتە (دار الحرب) ئەوە بەڕاستی خوێنی حەڵاڵە).

## حوکمی ئەو کەسەی کە جنێو دەدات بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

## ٢ - باب الْحُكْمِ فِيمَنْ سَبَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

٤٣٦١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: أَنَّ أَعْمَى كَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدٍ تَشْتُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَقَعُ فِيهِ فَيَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي وَيَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ! قَالَ: فَلَمَّا كَانَتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ جَعَلَتْ تَقَعُ فِي النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَشْتِمُهُ, فَأَخَذَ الْمِغْوَلَ فَوَضَعَهُ فِي بَطْنِهَا وَاتَّكَأَ عَلَيْهَا فَقَتَلَهَا, فَوَقَعَ بَيْنَ رِجْلَيْهَا طِفْلٌ, فَلَطَخَتْ مَا هُنَاكَ بِالدَّمِ, فَلَمَّا أَصْبَحَ ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَمَعَ النَّاسَ فَقَالَ: (أَنْشُدُ اللَّهَ رَجُلاً فَعَلَ مَا فَعَلَ لِي عَلَيْهِ حَقٌّ إِلاَّ قَامَ). فَقَامَ الأَعْمَى يَتَخَطَّى النَّاسَ وَهُوَ يَتَزَلْزَلُ حَتَّى قَعَدَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَنَا صَاحِبُهَا كَانَتْ تَشْتِمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ فَأَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي, وَأَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ, وَلِي مِنْهَا ابْنَانِ مِثْلُ اللُّؤْلُؤَتَيْنِ, وَكَانَتْ بِي رَفِيقَةً فَلَمَّا كَانَتِ الْبَارِحَةَ, جَعَلَتْ تَشْتِمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ فَأَخَذْتُ الْمِغْوَلَ فَوَضَعْتُهُ فِي بَطْنِهَا وَاتَّكَأْتُ عَلَيْهَا حَتَّى قَتَلْتُهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی کوێر کەنیزەکێکی هەبوو منالّی لێی بوو بوو، دەم درێژی دەکرد بەرامبەر بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و جنێوی پێ دەدا، ئاگادار کرایەوەو لۆمەو سەرزەنشت کراو قەدەغەی ئەو کارەی لێ کراو پیاویا هەڵشاخان بەلّام کۆڵی نەداو وازی نەهێنا. ڕاوی وتی: شەوێکیان جنێوی دا بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پیاوە کوێرەکە تیغێکی نایە سەر ورگی و خۆی دا بەسەریاو کوشتی،

کەنیزەکەکە سکی پڕ بوو منداڵەکە کەوتە نێوان قاچەکانی و ئەو ناوە خوێناوی بوو، کاتێ کە ڕۆژ بویەوە باسەکە گێڕرایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، خەڵکی کۆکردەوەو فەرمووی: (تکا دەکەم لەو کەسەی کە ئەم کارەی کردوە کە مافم بەسەریەوەیەتی با هەستێ)، پیاوە کوێرەکە هەستا بە لەرزەوە دڕی بە خەڵکەکە دا هەتا گەیشتە بەردەم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و دانیشت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! من خاوەنی ئەو کەنیزەکەم، دەم درێژی دەکرد بەرامبەر بە تۆ جنێوی پێ دەدای، ئاگادارم کردەوەو ڕێگریم لێ کردو لۆمەو سەرزەنشتم کردو پیایا هەڵشاخام بەڵام ئەو هەر کۆڵی نەداو وازی نەهێنا. دوو منداڵی جوانم لێی هەیە دەڵێی مروارین هەتا دوێنێ هاوڕێی ژیان بوو، کە دەم درێژی بەرامبەر کردی و جنێوی پێ دای تیغەکەم هەڵگرت و نامە سەر ورگی و خۆم دا بەسەریا هەتا کوشتم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەسا ئێوە بە شایەت بن کە خوێنی ئەم ژنە حەڵاڵە).

٤٣٦٢ - (ضعيف الإسناد) عن علي رضي الله عنه: أَنَّ يَهُودِيَّةً كَانَتْ تَشْتِمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَتَقَعُ فِيهِ, فَخَنَقَهَا رَجُلٌ حَتَّى مَاتَتْ, فَأَبْطَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَمَهَا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە وتویەتی: ئافرەتێکی جولەکە دەم درێژی دەکرد بەرامبەر بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و جنێوی پێ دەدا، پیاوێ دەستی نایە بینە قاقای هەتا خنکاندی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوێنەکەی پوچەڵ کردەوە.

٤٣٦٣ - (صحيح) عن أبو برزة قال: كُنْتُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَتَغَيَّظَ عَلَى رَجُلٍ فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ, فَقُلْتُ: تَأْذَنُ لِي يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ, قَالَ: فَأَذْهَبَتْ كَلِمَتِي غَضَبَهُ فَقَامَ فَدَخَلَ, فَأَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ: مَا الَّذِي قُلْتَ آنِفًا؟ قُلْتُ: ائْذَنْ لِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ. قَالَ: أَكُنْتَ فَاعِلاً لَوْ أَمَرْتُكَ,

قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا كَانَتْ لِبَشَرٍ بَعْدَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا لَفْظُ يَزِيدَ, قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: أَىْ لَمْ يَكُنْ لأَبِى بَكْرٍ أَنْ يَقْتُلَ رَجُلاً إِلاَّ بِإِحْدَى الثَّلاَثِ الَّتِى قَالَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُفْرٌ بَعْدَ إِيمَانٍ, أَوْ زِنًا بَعْدَ إِحْصَانٍ, أَوْ قَتْلُ نَفْسٍ بِغَيْرِ نَفْسٍ, وَكَانَ لِلنَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَقْتُلَ.

واتە: لە ئەبو بەرزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: واتە: لەلای پێشەوا ئەبو بەکر بووم پیاوێ قسەی پێ وت پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ لێی تووڕە بوو، وتم: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتم بدە با بدەم لەگەردنی، قسەکەم ئەوەندە گەورە بوو بەلایەوە تووڕە بوو هەستا ڕۆشتە ماڵەوە، جا ناردی بە دواما، منیش ڕۆشتم بۆ لای، پێی وتم: کاتێ کە من تووڕە بووم لەو پیاوە تۆ وتت چی؟ وتم: مۆڵەتم بدە با بدەم لەگەردنی، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەگەر مۆڵەتم پێ بدایتایە جێبەجێت دەکردو دەتدا لە گەردنی؟ وتم: بەڵێ، وتی: نا سوێند بە (الله) لەدوای موحەممەد صلی الله علیه وسلم هیچ مرۆڤێ بۆی نیە کاری لەوجۆرە بکات. ئەبو داود دەڵێت: ئەمە گۆ(لفظ)ی یەزیدە. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی: واتە: بۆ ئەبو بەکر نیە پیاوێ بکوژێت ئیللا لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: کافربوون لەدوای باوەڕهێنان، یان زیناکردن لەدوای هاوسەرگیری، یا کوشتنی کەسێ بە ناڕەوا بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆی هەیە بیکوژێت.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی دژایەتی کردن و ڕێگرتن

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي الْمُحَارِبَةِ.

٤٣٦٤ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ قَوْمًا مِنْ عُكْلٍ - أَوْ قَالَ مِنْ عُرَيْنَةَ - قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ, فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلِقَاحٍ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا, فَانْطَلَقُوا, فَلَمَّا صَحُّوا, قَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ, فَبَلَغَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَبَرُهُمْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ, فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي آثَارِهِمْ فَمَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ حَتَّى جِيءَ بِهِمْ, فَأَمَرَ بِهِمْ, فَقُطِعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ, وَسُمِّرَ أَعْيُنُهُمْ, وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلَا يُسْقَوْنَ. قَالَ أَبُو قِلَابَةَ: فَهَؤُلَاءِ قَوْمٌ سَرَقُوا وَقَتَلُوا وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ, وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کۆمەڵێ لە هۆزی عوکل - یان وتی: لە هۆزی عورەینە - هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت و نەخۆشکەوتن، بۆیە شاری مەدینەیان پێ ناخۆش بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردن کە بڕۆن بۆ دەرەوەی شار بۆ ناو ڕانە وشترە شیردەرەکان لەوێ شیر و میزی وشترەکان بخۆن هەتا چاك دەبنەوە، ئەوانیش ڕۆشتن، کاتێ کە چاك بوونەوە شوانەکەی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم کوشت و وشترەکانیان برد بۆ وڵاتی خۆیان، لەسەرەتای ڕۆژەوە هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆمەڵێ پیاوی نارد بەشوێنیاندا، هێشتا ڕۆژ بەرزنەبوبوەوە لەڕێ گرتنیانەوەو دیلیان کردن و هێنانیانەوە بۆ مەدینە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا دەست و قاچیان بڕین و چاویان دەرهێنان و

بە بسماری سورەکراو چاویان رشتن و، فڕێیان دانە ناو بەردەڵانەکەی دەرەوەی شاری مەدینە کە پێی دەوترێت (الْحَرَّة)، جا داوای ئاویان دەکرد کەس ئاوی نەدەدانێ. ئەبو قیلابە وتی: ئەوانە دزییان کردو شوانەکەیان کوشت و لەدوای باوەڕهێنان کافربوونەوەو، دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەشیان کرد.

٤٣٦٥ - (صحيح) عن أيوب بإسناده بهذا الحديث قال فيه: فَأَمَرَ بِمَسَامِيرَ فَأُحْمِيَتْ فَكَحَلَهُمْ, وَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ, وَمَا حَسَمَهُمْ.

واتە: لە ئەیوبەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان سەنەد هاتوە، لە فەرموودەکەیدا وتی: فەرمانی دا چاویان دەرهێنان و بسماریان سورکردەوەو بە بسماری سورکراوە چاویان رشتن و، دەست و قاچیان بڕین، برینەکانیان نەبرژاندنەوە هەتا مردن.

٤٣٦٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك بهذا الحديث قال فيه: فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَلَبِهِمْ قَافَةً فَأُتِيَ بِهِمْ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ذَلِكَ: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا) الآيَةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، لە فەرموودەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆمەڵێ پیاوی نارد بەشوێنیاندا لەوانەی کە جێگە پێیان دەناسیەوە لەڕێ گرتنیانەوەو هێنانیانەوە بۆ مەدینە، راوی وتی: خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ سورة المائدة:٣٣.

واتە: بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی کە جەنگ و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا، وە هەوڵ ئەدەن لەزەویدا خراپە بڵاوبکەنەوە (ئەوە تۆڵەیان) ئەوەیە بکوژرێن یا هەڵبواسرێن بەدارا یان دەست و قاچیان ببڕدرێت بەپێچەوانەوە (راست و چەپ) یان دوور بخرێنەوە لەووڵات.

٤٣٦٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: أَنَسٌ فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمْ يَكْدِمُ الأَرْضَ بِفِيهِ عَطَشًا حَتَّى مَاتُوا.

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: یەكێكیانم دی لە تینواندا قەپی كردبو بە زەویدا هەتا مردن.

٤٣٦٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك, بِهَذَا الْحَدِيثِ نَحْوَهُ, زَادَ: ثُمَّ نَهَى عَنِ الْمُثْلَةِ, وَلَمْ يَذْكُرْ مِنْ خِلاَفٍ. وَرَوَاهُ شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ وَسَلاَّمِ بْنِ مِسْكِينٍ عَنْ ثَابِتٍ جَمِيعًا عَنْ أَنَسٍ: لَمْ يَذْكُرَا مِنْ خِلاَفٍ. وَلَمْ أَجِدْ فِي حَدِيثِ أَحَدٍ قَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ مِنْ خِلاَفٍ. إِلاَّ فِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ.

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە. بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد: لەپاشدا رێگری كرد لە شێواندنی جەستەی دوژمن وەك لوت و گوێ برین، هەروەها باسی عیبارەتی (مِنْ خِلاَف)ی نەكرد واتە: دەست و قاچیان ببڕدرێت بەپێچەوانەوە (راست و چەپ). هەروەها شوعبە لە قەتادەوە، سەلامی كوڕی میسكین لە (ثابت)ەوە، هەر هەموویان لە ئەنەسەوە، باسی عیبارەتی (مِنْ خِلاَف)یان نەكرد. وە لە فەرموودەی هیچ كامیاندا نەمدیوە كە دەست و قاچیان ببرڕدرێت بەپێچەوانەوە، ئیللا لە فەرموودەكەی حەممادی كوڕی سەلەمەدا نەبێت.

٤٣٦٩ - (حسن صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ نَاسًا أَغَارُوا عَلَى إِبِلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَاسْتَاقُوهَا, وَارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ, وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُؤْمِنًا, فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ, فَأُخِذُوا, فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ. قَالَ وَنَزَلَتْ فِيهِمْ آيَةُ الْمُحَارَبَةِ, وَهُمُ الَّذِينَ أَخْبَرَ عَنْهُمْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الْحَجَّاجَ حِينَ سَأَلَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەندێ کەس دەدەن بەسەر وشترەکانی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، وشترەکان دەدەنەبەر و دەیانبەن بۆ وڵاتی خۆیان و، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوەو، شوانە باوەڕدارەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەکوژن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆمەڵێ پیاوی نارد بەشوێنیاندا لەڕێ دەیانگرنەوەو دەیاهێنن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەست و قاچیان دەبڕن و چاویان دەردەهێنن و بە بسماری سورەکراو چاویان دەڕێژن. راوی وتی: خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ سورة المائدة:٣٣.

راوی وتی: ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە ئەنەس هەواڵەکەیانی راگەیاند بە حەجاج لەکاتێکدا کە دەربارەیان پرسیاری لێ کرد.

٤٣٧٠ - (ضعيف) عن أبو الزناد: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا قَطَعَ الَّذِينَ سَرَقُوا لِقَاحَهُ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ بِالنَّارِ، عَاتَبَهُ اللَّهُ تَعَالَى فِي ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ( إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا) الآيَةَ.

واتە: لە ئەبو زینادەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەست و قاچی ئەوانەی بڕی وشترە شیردەرکانیان دزی و چاوی دەرهێنان و بسماری سورەکراو چاویان رشتن، خوای گەورە لەسەر ئەو کارە سەرزەنشتی کردو لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ سورة المائدة:٣٣.

٤٣٧١ - (ضعيف موقوف) عن محمد بن سيرين قال: كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الْحُدُودُ. يَعْنِى: حَدِيثَ أَنَسٍ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەم بەسەرهات پێش ئەوەی ئایەتی (سنورەکان) سزاو تۆڵەی تاوان دابەزێت روویداوە واتە فەرموودەکەی ئەنەس.

٤٣٧٢ - (حسن) عن ابن عباس قال: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الأَرْضِ) إِلَى قَوْلِهِ (غَفُورٌ رَحِيمٌ). نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي الْمُشْرِكِينَ, فَمَنْ تَابَ مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يُقْدَرَ عَلَيْهِ لَمْ يَمْنَعْهُ ذَلِكَ أَنْ يُقَامَ فِيهِ الْحَدُّ الَّذِى أَصَابَهُ.

واتە: واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم وتویەتی: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ). ئیبنو عەباس وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی هاوبەش بۆ خوا دانەران دابەزی، هەرکەس لەوانە تەوبەی کردو گەڕایەوە پێش ئەوەی دەستیان بیگاتێ و بیگرن رێگری ئەوەی لێ ناکات کە سزاو تۆڵەی بەسەردا جێبەجێ بکەن، ئەگەر هەق و مافی خەڵك بێ و داوای هەق و مافی خۆیان بکەن، بەڵام ئەگەر هەق و مافی خوای گەورە بێ ئەوە سزاو تۆڵەی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت.

## دەربارەی حەدێ تکای بۆ بکرێت

## ٤ - باب فِي الْحَدِّ يُشْفَعُ فِيهِ.

٤٣٧٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِى سَرَقَتْ: فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا تَعْنِى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أُسَامَةُ أَتَشْفَعُ فِى حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟). ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ فَقَالَ: (إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ, وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قورەیش زۆر بە پەرۆش بوون بۆ ئەو ئافرەتە مەخزومیەی کە دزی کردبوو دەستی ببڕدرێت چونکە لە هۆزێکی ناودار بوو، وتیان: کێ لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تکای بۆ بکات بۆ ئەوەی دەستی نەبڕدرێت جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە خۆشەویستی ئەوە، ئوسامە لەوبارەوە قسەی لەگەڵ کردو تکای بۆ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئوسامە! تکا بۆ حەدێ لە حەدەکانی خوای گەورە دەکەیت؟). لەپاشدا هەستا وتارێکی خوێندەوەو فەرمووی: (ئەوانەی پێش ئێوە کە لەناوچون بەهۆی ئەوەوە بوو ئەگەر یەکێکی نەجیب زادەو دەوڵەمەند و خانەدان دزی بکردایە وازیان لێ ئەهێنا، بەڵام ئەگەر هەژارێك دزی بکردایە حەدیان لێ دەدا، سوێند بە (اللە) ئەگەر (فاطمة)ی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم).

٤٣٧٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: كَانَتِ امْرَأَةٌ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ, فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَطْعِ يَدِهَا, وَقَصَّ نَحْوَ حَدِيثِ اللَّيْثِ. قَالَ: فَقَطَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى ابْنُ وَهْبٍ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ يُونُسَ, عَنِ الزُّهْرِيِّ, وَقَالَ فِيهِ كَمَا قَالَ اللَّيْثُ: إِنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ. وَرَوَاهُ اللَّيْثُ, عَنْ يُونُسَ, عَنِ ابْنِ شِهَابٍ, بِإِسْنَادِهِ, فَقَالَ: اسْتَعَارَتِ امْرَأَةٌ. وَرَوَى مَسْعُودُ بْنُ الأَسْوَدِ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا الْخَبَرِ. قَالَ: سُرِقَتْ قَطِيفَةٌ مِنْ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ أَبُو الزُّبَيْرِ, عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ, فَعَاذَتْ بِزَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێکی مەخزومی کەلوپەلی لە ماڵان دەخواست و دوایی نکولی لێ دەکردو نەیدەدایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا دەستی ببڕن. جا راوی وەك فەرمودەکەی گێڕایەوە وەك فەرمودەکەی (لیث)، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی بڕی. ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو وەهەب ئەم فەرمودەی لە یونوسەوە، لە زوهریەوە گێڕایەوە، (لیث) چی وت ئەویش تێیدا وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە غەزای فەتح دا ئافرەتێك دزی کرد. وە (لیث) لە یونوسەوە، لە ئیبنو شیهابەوە، بە سەنەدی خۆی گێڕایەوە وتی: ئافرەتێك کەلوپەلی لە ماڵان دەخواست. لە مەسعودی کوڕی ئەسودەوە، لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەمان بەسەرهات هاتوە. وتی: قەیفەیەکی دزی لەماڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم. ئەبو داود دەڵێت: ئەبو زوبێر لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە، ئافرەتێك دزی کرد پەنای برد بۆ زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

٤٣٧٥ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَقِيلُوا ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ إِلاَّ الْحُدُودَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە هەڵەی پیاوچاکان چاوپۆشی بکەن جگە لە حەدی شەرعی).

## چاوپۆشی و لێبوردن لە سزا و تۆڵە پێش ئەوەی بگاتە کاربەدەست.

## ٥ - باب الْعَفْوِ عَنِ الْحُدُودِ مَا لَمْ تَبْلُغِ السُّلْطَانَ.

٤٣٧٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو بن العاص: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال (تَعَافَوُا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەناو خۆتاندا لەحەدی شەرعی خۆش ببن پێش ئەوەی بگاتە لای من، بەڵام هەر حەدێ گەیشتە لای من بەجێهێنانی واجبەو جێبەجێی دەکەم).

# سەبارەت بە داپۆشینی تاوانی ئەو کەسانەی کە سزاو تۆڵە دەیانگرێتەوە.

## ٦ - باب فِي السَّتْرِ عَلَى أَهْلِ الْحُدُودِ.

٤٣٧٧ - (صحيح لغيره) عن يزيد بن نعيم, عن أبيه: أَنَّ مَاعِزًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَقَرَّ عِنْدَهُ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ, فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ, وَقَالَ لِهَزَّالٍ: (لَوْ سَتَرْتَهُ بِثَوْبِكَ كَانَ خَيْرًا لَكَ).

واتە: لە یەزیدی کوڕی نوعەیمەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە ماعیز هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوار جار دانی نا بە تاوانەکەیدا کە زینای کردوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە بەردباران کردنی، بە هەزاڵی فەرموو: (ئەگەر بە پۆشاکەکەت داتپۆشیایە ئەوە خێر تر بوو بۆت). - هەزال سەرپەرشتیاری ماعیز بووە -.

٤٣٧٨ - (ضعيف مرسل وهو صحيح لغيره بما سبق) عن ابن المنكدر: أَنَّ هَزَّالاً أَمَرَ مَاعِزًا أَنْ يَأْتِيَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَيُخْبِرَهُ.

واتە: لە ئیبنو مونکەدیرەوە دەگێرنەوە، کە هەزال فەرمانی دا بە ماعیز بڕوات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەواڵەکەی پێ رابگەیەنێت.

## سەبارەت بە خاوەنی سزا و تۆڵە دێت و دان دەنێ بە تاوانەکەیدا

## ٧ - باب فِي صَاحِبِ الْحَدِّ يَجِيءُ فَيُقِرُّ.

٤٣٧٩ - (حسن دون قوله: (ارجموه) والأرجح أنه لم يرجم). عن علقمة بن وائل عن أبيه: أَنَّ امْرَأَةً خَرَجَتْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُرِيدُ الصَّلاَةَ, فَتَلَقَّاهَا رَجُلٌ فَتَجَلَّلَهَا فَقَضَى حَاجَتَهُ مِنْهَا, فَصَاحَتْ وَانْطَلَقَ فَمَرَّ عَلَيْهَا رَجُلٌ, فَقَالَتْ: إِنَّ ذَاكَ فَعَلَ بِي كَذَا وَكَذَا, وَمَرَّتْ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ, فَقَالَتْ: إِنَّ ذَلِكَ الرَّجُلَ فَعَلَ بِي كَذَا وَكَذَا. فَانْطَلَقُوا فَأَخَذُوا الرَّجُلَ الَّذِي ظَنَّتْ أَنَّهُ وَقَعَ عَلَيْهَا فَأَتَوْهَا بِهِ, فَقَالَتْ: نَعَمْ هُوَ هَذَا. فَأَتَوْا بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا أَمَرَ بِهِ قَامَ صَاحِبُهَا الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهَا, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا صَاحِبُهَا. فَقَالَ: (اذْهَبِي فَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكِ). وَقَالَ لِلرَّجُلِ قَوْلاً حَسَنًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي الرَّجُلَ الْمَأْخُوذَ. وَقَالَ لِلرَّجُلِ الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهَا: (ارْجُمُوهُ). فَقَالَ: (لَقَدْ تَابَ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا أَهْلُ الْمَدِينَةِ لَقُبِلَ مِنْهُمْ).

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئافرەتێك لەماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت بە مەبەستی نوێژکردن لەڕێگا پیاوێ ڕێی پێ گرت و بەزۆر لەگەڵی جوت بوو، ئافرەتەکە هاواری کرد، کابرا بۆی دەرچوو، پیاوێکی تر دای بەلایدا وتی: ئەم پیاوە بوو ئەوەو ئەوەی لەگەڵ کردم - پێ دەچێ شەو بوو بێت و تاریك بوو بێت -، کۆمەڵێ لە کۆچەران دایان بەلایدا وتی: ئەم پیاوە بوو ئەوەو ئەوەی لەگەڵ کردم، ئەوانیش ڕۆشتن گرتیان و هێنایان وتی: بەڵێ ئەم پیاوە بوو، پیاوەکەیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ

کە فەرمانی دا بە بەردباران کردنی، ئەو پیاوەی کە کەتنەکەی کردبوو هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، من ئەو تاوانەم کردووە ئەو پیاوە نەبووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە ئافرەتەکەی فەرموو: (تۆ برۆ بەڕاستی خوای گەورە لێت خۆش بووە). فەرمایشتێکی جوانی فەرموو بە پیاوە بێ تاوانەکە، بەو پیاوەی کە کەتنەکەی کردبوو فەرمووی: (بەردبارانی بکەن). لەپاشدا فەرمووی: (بەڕاستی تەوبەیەکی کرد ئەگەر هەموو خەڵکی مەدینە بەو شێوەیە تەوبەیان بکردایە خوای گەورە لێی وەردەگرتن و لە هەر هەموویان خۆش دەبوو). - یان تەوبەیەکی کرد ئەگەر دابەش بکرایە بەسەر خەڵکی مەدینەدا بەشی هەر هەموویانی دەکرد - .

## دەربارەی تاوانبار فێری شتێ بکرێت بۆ ئەوەی حەدەکەی لەکۆڵ بکەوێت.

## ٨ - باب فِي التَّلْقِينِ فِي الْحَدِّ.

٤٣٨٠ - (ضعيف) عن أبو أمية المخزومي: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِلِصٍّ قَدِ اعْتَرَفَ اعْتِرَافًا وَلَمْ يُوجَدْ مَعَهُ مَتَاعٌ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ). قَالَ بَلَى. فَأَعَادَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا, فَأَمَرَ بِهِ فَقُطِعَ وَجِيءَ بِهِ, فَقَالَ: (اسْتَغْفِرِ اللَّهَ وَتُبْ إِلَيْهِ). فَقَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ, فَقَالَ: (اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ). ثَلاَثًا.

واتە: لە ئەبو ئومەییەی مەخزومیەوە دەگێڕنەوە، کە دزێکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانی نا بە تاوانەکەیداو ئیعتیرافی کرد، بەڵام کەلوپەلەکەی پێ نەبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (پێم وا نیە کە تۆ دزیت کردبێت)، وتی: بەڵێ دزیم کردووە، دوو تا سێ جار دوپاتی کردەوە لێی، هەر وتی: بەڵێ دزیم کردووە، فەرمانی دا

دەستیان بڕی و، هێنایان بۆ خزمەتی، فەرمووی: (داوای لێ بووردن بکە لە خوای گەورەو بگەڕێرەوە بۆ لای). وتی: (داوای لێ بووردن دەکەم لە خوای گەورەو دەگەڕێمەوە بۆ لای). فەرمووی: (خوایە لێی خۆشبەو دامەزراوی بکەو تەوبەی لێ قبوڵ بفەرموو) سێ جار.

## دەربارەی پیاوێ ئیعتیراف بکات لەسەر حەدێك و ناوی نەهێنێت.

## ٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَعْتَرِفُ بِحَدٍّ, وَلاَ يُسَمِّيهِ.

٤٣٨١ - (صحيح) عن أبو أمامة: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. قَالَ: (تَوَضَّأْتَ حِينَ أَقْبَلْتَ؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (هَلْ صَلَّيْتَ مَعَنَا حِينَ صَلَّيْنَا؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (اذْهَبْ فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ عَفَا عَنْكَ).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم کەتنێکم کردوە حەدم بەسەردا جێبەجێ بکە، فەرمووی: (کاتێ کە هاتیت بۆلام دەستنوێژت گرت؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (کاتێ کە نوێژمان کرد تۆش نوێژت لەگەڵ کردین؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (دەی بڕۆ بەڕاستی خوای گەورە لێت خۆش بووە).

## دەربارەی ئایا تۆمەتبار تاقی دەکرێتەوە بە لێدان.

## ١٠ - باب فِي الاِمْتِحَانِ بِالضَّرْبِ.

٤٣٨٢ - (حسن) عن أزهر بن عبد الله الحرازي: أَنَّ قَوْمًا مِنَ الْكَلاَعِيِّينَ سُرِقَ لَهُمْ مَتَاعٌ, فَاتَّهَمُوا أُنَاسًا مِنَ الْحَاكَةِ, فَأَتَوُا النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ صَاحِبَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَبَسَهُمْ أَيَّامًا, ثُمَّ خَلَّى سَبِيلَهُمْ, فَأَتَوُا النُّعْمَانَ, فَقَالُوا: خَلَّيْتَ سَبِيلَهُمْ بِغَيْرِ ضَرْبٍ وَلاَ امْتِحَانٍ.قَالَ النُّعْمَانُ: مَا شِئْتُمْ, إِنْ شِئْتُمْ أَنْ أَضْرِبَهُمْ فَإِنْ خَرَجَ مَتَاعُكُمْ فَذَاكَ, وَإِلاَّ أَخَذْتُ مِنْ ظُهُورِكُمْ مِثْلَ مَا أَخَذْتُ مِنْ ظُهُورِهِمْ. فَقَالُوا: هَذَا حُكْمُكَ؟ فَقَالَ هَذَا حُكْمُ اللَّهِ وَحُكْمُ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِنَّمَا أَرْهَبَهُمْ بِهَذَا الْقَوْلِ, أَىْ لاَ يَجِبُ الضَّرْبُ إِلاَّ بَعْدَ الاِعْتِرَافِ.

واتە: لە ئەزهەری کوڕی (عبد الله)ی حەرازییەوە دەگێرنەوە، کە کۆمەڵێ لە هۆزی کەلاعیەکان هەندێ کەلوپەلیان دزرا بوو. ئەوانیش چەند جۆلایەکیان تۆمەتبار کردبوو، هێنانیان بۆ خزمەت نوعمانی کوڕی بەشیر کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، نوعمان چەند رۆژێ زیندانی کردن، لەپاشدا بەرەڵای کردن و چوون بەرێی خۆیانەوە، کەلاعیەکان هاتن بۆ خزمەت نوعمان وتیان: بەرەڵات کردن بەبێ لێدان و تاقیکردنەوە، نوعمان وتی: چیتان دەوێت، ئەگەر دەتانەوێ لێیان دەدەم، ئەگەر ئیعتیرافیان کردو کەلوپەلەکانی ئێوەیان دەرخست ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر ئیعتیرافیان نەکرد ئەوە چۆن بدەم لەوان بەو شێوەش دەدەم لە ئێوە، وتیان: ئەوە حوکم و بڕیاری تۆیە؟ وتی: ئەمە حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیەتی. ئەبو داود دەڵێت: بەو وتەیە ترساندنی، واتە لێدان پێویست ناکات مەگەر لەدوای ئیعتیراف کردن.

# ماڵەکە بایی چەند بێ
# لە ئاڵتون دەستی دزی لەسەر دەبڕدرێت.

## ١١ - باب مَا يُقْطَعُ فِيهِ السَّارِقُ.

٤٣٨٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْطَعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر روبعە دینارێك و زیاتر دەستی دزی بڕیوە.

٤٣٨٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا). قَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: لەسەر روبعە دینارێك و زیاتر دەستی دز دەبڕدرێت. ئەحمەدی کوڕی صالح وتی: دەست بڕین لەسەر روبعە دینارێك و زیاترە.

٤٣٨٥ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی دزی دەبڕی لەسەر قەڵغانێ بایی سێ درهەم بوو.

٤٣٨٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَطَعَ يَدَ رَجُلٍ سَرَقَ تُرْسًا مِنْ صُفَّةِ النِّسَاءِ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی پیاوێكی بڕی لەسەر قەڵغانێ كە دزی بووی لە شوێنێكی مزگەوتدا كە تایبەت بوو بە ئافرەتانەوە بایی سێ درهەم بوو.

٤٣٨٧ - (شاذ) عن ابن عباس قال: قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَ رَجُلٍ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ دِينَارٌ أَوْ عَشَرَةُ دَرَاهِمَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی پیاوێكی بڕی لەسەر قەڵغانێ كە نرخەكەی بایی دینارێ یان دە درهەم بوو.

## ئەو شتانەی كە دەستی دزی لەسەر نابڕدرێت.

## ١٢ - باب مَا لاَ قَطْعَ فِيهِ.

٤٣٨٨ - (صحيح) عن محمد بن يحيى بن حبان: أَنَّ عَبْدًا سَرَقَ وَدِيًّا مِنْ حَائِطِ رَجُلٍ فَغَرَسَهُ فِي حَائِطِ سَيِّدِهِ فَخَرَجَ صَاحِبُ الْوَدِيِّ يَلْتَمِسُ وَدِيَّهُ فَوَجَدَهُ فَاسْتَعْدَى عَلَى الْعَبْدِ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ يَوْمَئِذٍ, فَسَجَنَ مَرْوَانُ الْعَبْدَ وَأَرَادَ قَطْعَ يَدِهِ, فَانْطَلَقَ سَيِّدُ الْعَبْدِ إِلَى رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ, فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ). فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنَّ مَرْوَانَ أَخَذَ غُلاَمِي وَهُوَ يُرِيدُ قَطْعَ يَدِهِ, وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ تَمْشِيَ مَعِي إِلَيْهِ فَتُخْبِرَهُ بِالَّذِي سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ,

فَمَشَى مَعَهُ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ حَتَّى أَتَى مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ, فَقَالَ لَهُ رَافِعٌ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ). فَأَمَرَ مَرْوَانُ بِالْعَبْدِ فَأُرْسِلَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْكَثَرُ: الْجُمَّارُ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببانەوە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەندەیە لە باخی پیاوێ نەمامە خورمایەکی دزی لەباخی گەورەکەیدا ناشتی، خاوەنی نەمامەکە دەرچو گەڕا بەدوای نەمامەکەدا سەرنجام لەباخی دراوسێکەیدا دۆزیەوەو زانی ئەو بەندەیە دزیویەتی، هانای بردە لای مەروانی کوڕی حەکەم لەدەست ئەو بەندەیە، ئەو کاتە مەروان کاربەدەستی مەدینە بوو لەلایەن موعاویەوە، مەروان بەندەکەی زیدانی کردو ئەیویست دەستی ببڕێت، گەورەی بەندەکە ڕۆشت بۆ لای رافیعی کوڕی خەدیج لەوبارەوە پرسیاری لێ کرد، رافیع پێی راگەیاند کە بۆ خۆی گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بووە دەیفەرموو: (دەست نابڕرێ لەسەر بەر بەدارەوە هەروەها لەسەر کرۆکی خورمایش). پیاوەکە وتی: مەروان غولامەکەی منی گرتوەو لەبەر نەمامە خورمایە دەیەوێ دەستی ببڕێت، پێم خۆشە بێی لەگەڵم بچین بۆ لای مەروان و ئەوەی پێ رابگەیەنی کە بیستوتە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، رافیع لەگەڵی ڕۆشت هەتا گەیشتنە لای مەروان، رافیع وتی: بۆ خۆم گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بوو دەیفەرموو: (دەست نابڕرێ لەسەر بەر بەدارەوە هەروەها لەسەر کرۆکی خورمایش). مەروان فەرمانی دا بەرەڵایان کرد. ئەبو داود دەڵێت: (الكثر) جوماری پێ دەوترێت.

٤٣٨٩ - (شاذ) عن محمد بن يحيى بن حبان, بِهَذَا الْحَدِيثِ, قَالَ: فَجَلَدَهُ مَرْوَانُ جَلَدَاتٍ وَخَلَّى سَبِيلَهُ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببانەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، راوی وتی: مەروان چەند شەلاقێکی لێ داو بەرەڵای کرد.

٤٣٩٠ - (حسن) عمرو بن العاص: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم أنه سئل عن الثمر المعلق فقال: (مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ, وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ وَمَنْ سَرَقَ مِنْهُ شَيْئًا بَعْدَ أَنْ يُئْوِيَهُ الْجَرِينُ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ, وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْجَرِينُ: الْجُوخَانُ.

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە دەربارەی بەر بەدارەوە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش فەرمووی: (کەسێ هەژار بێ و لەو بەرە بخوات بەدارەوەیەو نەچنراوە بەمەرجێ کۆشی لێ پڕ نەکات ئەوە گوناهی ناگات و هیچی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر کەسێ ئەوەندەی لێ ڕنی بیکاتە بەرکۆشی ئەوە دوو چەندانە غەرامە دەکرێ و پێی دەبژێررێت و تۆڵەیەکی ئاسایی لێ دەسێنرێ، بەڵام ئەگەر بەروبوم کۆکرایەوەو لە گەنجینە یان لەسەر خەرمان دانرا کەسێ لێی دزی بەهاکەی دەگەیشتە نرخی قەڵغانێ ئەوە دەستی دەبڕدرێ، بەڵام ئەگەر لەوە کەمتر بوو ئەوە دوو چەندانە غەرامە دەکرێ و پێی دەبژێررێت و تۆڵەیەکی ئاسایی لێ دەسێنرێ). ئەبو داود دەڵێت: (الجرین) شوێنێکە خورمای تێدا کۆدەکرێتەوە بۆ وشك کردنەوە.

## دەربارەی دەست بڕین لەسەر ماڵ فڕاندن و خیانەت.

## ١٣ - باب الْقَطْعِ فِي الْخُلْسَةِ وَالْخِيَانَةِ.

٤٣٩١ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَيْسَ عَلَى الْمُنْتَهِبِ قَطْعٌ, وَمَنِ انْتَهَبَ نُهْبَةً مَشْهُورَةً فَلَيْسَ مِنَّا).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دەستی تالآنکەر نابڕرێت، ئەوەی ماڵێك تالآن بکات ماڵەکە بەدەرەوە بێت و نەشاردرابێتەوە ئەوە لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە).

٤٣٩٢ - (صحيح) وبهذا الإسناد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَيْسَ عَلَى الْخَائِنِ قَطْعٌ).

واتە: بە هەمان ئیسناد فەرمودەی پێشو هاتوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دەستی خائین نابڕرێت). — ئەو کەسەی ئەمانەتێك لایەو خیانەتی لێ بکات ئەوە دەستی نابڕرێت - .

٤٣٩٣ - (صحيح) عن جابر عن النبي صلى الله عليه وسلم بمثله. زاد: (وَلاَ عَلَى الْمُخْتَلِسِ قَطْعٌ).

واتە: لە جابرەوە: : فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (دەستی ماڵ فڕێن نابڕرێت).

## ئەوکەسەی دزی دەکات
## لە شوێنێکدا کە ماڵەکە قایم کرابێ.

## ١٤ - باب مَنْ سَرَقَ مِنْ حِرْزٍ.

٤٣٩٤ - (صحيح) عن صفوان بن أمية رضي الله عنه قال: كُنْتُ نَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ عَلَى خَمِيصَةٍ لِي ثَمَنُ ثَلاَثِينَ دِرْهَمًا, فَجَاءَ رَجُلٌ فَاخْتَلَسَهَا مِنِّى, فَأُخِذَ الرَّجُلُ فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَمَرَ بِهِ لِيُقْطَعَ. قَالَ: فَأَتَيْتُهُ, فَقُلْتُ: أَتَقْطَعُهُ مِنْ أَجْلِ ثَلاَثِينَ دِرْهَمًا, أَنَا أَبِيعُهُ وَأُنْسِئُهُ ثَمَنَهَا, قَالَ: (فَهَلاَّ كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِى بِهِ!). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ زَائِدَةُ, عَنْ سِمَاكٍ, عَنْ جُعَيْدِ بْنِ جُحَيْرٍ قَالَ: نَامَ صَفْوَانُ. وَرَوَاهُ مُجَاهِدٌ وَطَاوُسٌ أَنَّهُ كَانَ نَائِمًا فَجَاءَ سَارِقٌ فَسَرَقَ خَمِيصَةً مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ. وَرَوَاهُ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: فَاسْتَلَّهُ مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ فَاسْتَيْقَظَ فَصَاحَ بِهِ فَأُخِذَ . وَرَوَاهُ الزُّهْرِيُّ, عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: فَنَامَ فِي الْمَسْجِدِ وَتَوَسَّدَ رِدَاءَهُ فَجَاءَهُ سَارِقٌ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ, فَأُخِذَ السَّارِقُ, فَجِيءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەمزگەوت لەسەر کراسێکی ڕەشی خۆم خەوتبوم بایی سی درهەم دەبوو، پیاوێ هات فڕاندی لێم، دزەکەمات گرت و، بردمان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانی دا دەستی ببڕن، منیش چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتم: لە پیناوی سی درهەمدا دەستی دەبڕی، من پێی دەفرۆشم و پەلەی نرخەکەی لێ ناکەم، فەرمووی: (نەدەبوو پێش ئەوەی بیهێنی بۆلام ئەو کارەت بکردایە!). ئەبو داود دەڵێت: زائدە، لە سیماکەوە، لە جوعەیدی کوڕی حوجەیرەوە ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردوە،

وتی: صەفوان خەوتبوو. وە (طاوس) و موجاهید ئەم فەرمودەیان ریوایەت کردوە: (صەفوان خەوتبوو دزێك هات کراسەکەی دزی کە لەژێر سەریدا بوو). ئەبو سەلەمەی کوڕی (عبد الرحمن) ئەم فەرمودەی ریوایەت کردوە، وتی: بە شێنەیی لەژێر سەریا دەریهێناو بردی خەبەری بویەوە و هاواری کردو گرتیان. زوهری لە صەفوانی کوڕی (عبد الله)وە ریوایەتی کردوە، وتی: (لەمزگەوت خەوتبوو، پۆشاکەکەی خستبوە ژێر سەری، دزێ هات و بردی، دزەکەیان گرت و بردیان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

## دەست بڕین لەسەر ماڵی خواستن ئەگەر نکولی کردو نەیدایەوە.

## ١٥ - باب فِي الْقَطْعِ فِي الْعَارِيَةِ إِذَا جُحِدَتْ.

٤٣٩٥ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ امْرَأَةً مَخْزُومِيَّةً كَانَتْ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهَا فَقُطِعَتْ يَدُهَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ جُوَيْرِيَةُ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَوْ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ زَادَ فِيهِ وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ خَطِيبًا فَقَالَ (هَلْ مِنِ امْرَأَةٍ تَائِبَةٍ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَرَسُولِهِ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, وَتِلْكَ شَاهِدَةٌ فَلَمْ تَقُمْ وَلَمْ تَتَكَلَّمْ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَرَوَاهُ ابْنُ غَنْجٍ عَنْ نَافِعٍ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ فِيهِ: فَشَهِدَ عَلَيْهَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە ئافرەتێکی مەخزومی کەلوپەلی لە ماڵان دەخواست و دوایی نکولی لێ دەکردو نەیدەدایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا دەستیان بڕی. ئەبو داود دەڵێت: جوەیریە لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە، یان لە صەفیەی کچی ئەبی عوبەیدەوە ئەم فەمودەی ریوایەت کردوە، بەڵام ئەمەی تێدا بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا وتاری خوێندەوە سێ جار

فەرمووى: (ئايا ئەو ئافرەتە تەوبەى كردەوەو گەڕاوەتەوە بۆ لاى خواى گەورەو پێغەمبەرەكەى؟). ئافرەتەكە لەوێ ئامادە بوو نە هەستايەوەو نە قسەشى كرد. ئەبو داود دەڵێت: ئيبنو غەنەج لە نافيعەوە، لە صەفيەى كچى ئەبى عوبەيدەوە، ئەم فەرموودەى ريوايەت كردوە، لە فەرموودەكەيدا وتى: (شايەتى دا لەسەر دزيەكەى).

٤٣٩٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: اسْتَعَارَتِ امْرَأَةٌ - تَعْنِى - حُلِيًّا عَلَى أَلْسِنَةِ أُنَاسٍ يُعْرَفُونَ وَلاَ تُعْرَفُ هِىَ, فَبَاعَتْهُ, فَأُخِذَتْ, فَأُتِىَ بِهَا النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَمَرَ بِقَطْعِ يَدِهَا, وَهِىَ الَّتِى شَفَعَ فِيهَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ, وَقَالَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا قَالَ.

واتە: لە عائيشەوە ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ دەگێرنەوە، كە وتويەتى: ئافرەتێك بەناوى خەڵكى ناسراو و بەناوبانگەوە كەلوپەلى لە ماڵان دەخواست نەيدەدانەوەو دەيفرۆشتن و سودى لىٚ وەردەگرتن، گرتيان و برديان بۆ خزمەت پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمانى دا دەستى ببڕن، ئەو ئافرەتە بوو كە ئوسامەى كوڕى زەيد تكاى بۆ كردو، پێغەمبەرى خواش صلى الله عليه وسلم ئەوەى فەرموو كە دەربارەى فەرمووى - : (ئەگەر فاتمەى كچم دزى بكات دەستى دەبڕم) -.

٤٣٩٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَتِ امْرَأَةٌ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ, فَأَمَرَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَطْعِ يَدِهَا. وَقَصَّ نَحْوَ حَدِيثِ قُتَيْبَةَ, عَنِ اللَّيْثِ, عَنِ ابْنِ شِهَابٍ زَادَ: فَقَطَعَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهَا.

واتە: لە عائيشەوە ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ دەگێرنەوە، كە وتويەتى: ئافرەتێكى مەخزومى كەلوپەلى لە ماڵان دەخواست لەپاشدا نكولى لىٚ دەكردو نەيدەدايەوە. پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانى دا دەستى ببڕن، جا راوى

بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی قوتەیبە، لە (لیث)ەوە، لە ئیبنو شیهابەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی بڕی.

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە شێت ئەگەر دزی کرد یان حەدی کەوتە سەر ئایا جێبەجێ دەکرێت؟ .

## ١٦ - باب فِي الْمَجْنُونِ يَسْرِقُ أَوْ يُصِيبُ حَدًّا.

٤٣٩٨ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ, وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ, وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبَرَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قەڵەم لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوە واتە گوناهو تاوانیان بۆ نانوسرێت: خەوتو هەتا هەڵئەسێ لەخەو، شێت هەتا چاك دەبێتەوە، منداڵ هەتا گەورە دەبێ و باڵغ دەبێ).

٤٣٩٩ - (صحيح) عن ابن عباس قال: أُتِيَ عُمَرُ بِمَجْنُونَةٍ قَدْ زَنَتْ, فَاسْتَشَارَ فِيهَا أُنَاسًا فَأَمَرَ بِهَا عُمَرُ أَنْ تُرْجَمَ, فَمُرَّ بِهَا عَلَى عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَقَالَ: مَا شَأْنُ هَذِهِ؟ قَالُوا: مَجْنُونَةُ بَنِي فُلاَنٍ زَنَتْ فَأَمَرَ بِهَا عُمَرُ أَنْ تُرْجَمَ. قَالَ: فَقَالَ: ارْجِعُوا بِهَا, ثُمَّ أَتَاهُ, فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْقَلَمَ قَدْ رُفِعَ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَبْرَأَ, وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ, وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَعْقِلَ. قَالَ: بَلَى. قَالَ؟ فَمَا بَالُ هَذِهِ تُرْجَمُ؟ قَالَ: لاَ شَيْءَ. قَالَ: فَأَرْسِلْهَا. قَالَ: فَأَرْسَلَهَا. قَالَ: فَجَعَلَ يُكَبِّرُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێکی شێت زینای کردبوو هێنایان بۆ لای پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، ئەویش پرس و ڕای کرد بە خەڵکانێکی شارەزاو فەرمانی دا بەردەباران(ڕەجم) بکرێت، پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) ڕەزای خوای لێ بێ دای بەلایدا، وتی: حاڵی ئەمە چییەو ئەم ئافرەتە چی کردووە؟ وتیان: ئەمە شێتێکی فلانە هۆزە زینای کردوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمانی داوە بەردەباران بکرێت، ڕاوی وتی: پێشەوا عەلی وتی: بیگەڕێننەوە بۆ لای، لەپاشدا خۆشی چوو بۆ خزمەت پێشەوا عومەر وتی: ئەی خەلیفەی باوەڕداران ئایا نازانی قەڵەم لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوە واتە گوناهو تاوانیان بۆ نانوسرێت: شێت هەتا چاك دەبێتەوە، خەوتو هەتا لەخەو هەڵئەسێ، منداڵ هەتا عاقڵ دەبێ و باڵغ دەبێ؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی ئیتر حاڵی ئەمە چۆنە بەردەبارانی دەکەیت؟ وتی: هیچی لەسەر نی یە، وتی: بەرەڵای بکە، ڕاوی وتی: بەرەڵای کردو بەردبارانی نەکرد، وتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ (الله أکبر)ی کرد.

٤٤٠٠ - (صحيح) عن الأعمش نحوه. وَقَالَ أَيْضًا: حَتَّى يَعْقِلَ. وَقَالَ: وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ. قَالَ: فَجَعَلَ عُمَرُ يُكَبِّرُ.

واتە: لە ئەعمەشەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە. وە وتی: لە شێت هەتا هۆش دەکاتەوە و دێتەوە سەرخۆی و چاك دەبێتەوە، وتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ (الله أکبر)ی کرد.

٤٤٠١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: مُرَّ عَلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضى الله عنه, بِمَعْنَى عُثْمَانَ. قَالَ: أَوَمَا تَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الْمَجْنُونِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ حَتَّى يُفِيقَ, وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ, وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ). قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَخَلَّى عَنْهَا سَبِيلَهَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیَ بیَ دەگیَرنەوە، کە وتویەتی: پیَشەوا پیَشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) رەزای خوای لیَ بیَ دای بەلایدا، جا راوی فەرمودەکەی گیَڕایەوە بە هەمان مانای فەرمودەکەی (عثمان). پیَشەوا عەلی وتی: ئایا بە بیرت نایەتەوە کە پیَغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (قەڵەم لەسەر ئەم سیَ کەسە هەڵگیراوە واتە گوناهو تاوانیان بۆ نانوسریَت: شیَت هەتا چاك دەبیَتەوە، خەوتو هەتا لەخەو هەڵئەسیَ، منداڵ هەتا باڵغ دەبیَ). وتی: تۆ راست دەکەیت، راوی وتی: ئیتر بەرەڵای کردو بەردبارانی نەکرد.

٤٤٠٢ - صحيح دون قوله (لعل الذي...). عن أبو ظبيان قال هناد الجنبي قال: أُتِيَ عُمَرُ بِامْرَأَةٍ قَدْ فَجَرَتْ, فَأَمَرَ بِرَجْمِهَا, فَمَرَّ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ, فَأَخَذَهَا فَخَلَّى سَبِيلَهَا, فَأُخْبِرَ عُمَرُ قَالَ: ادْعُوا لِي عَلِيًّا. فَجَاءَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ , فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَبْلُغَ, وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ, وَعَنِ الْمَعْتُوهِ حَتَّى يَبْرَأَ). وَإِنَّ هَذِهِ مَعْتُوهَةُ بَنِي فُلاَنٍ لَعَلَّ الَّذِى أَتَاهَا, أَتَاهَا وَهِىَ فِي بَلاَئِهَا. قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: لاَ أَدْرِى. فَقَالَ عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: وَأَنَا لاَ أَدْرِى.

واتە: لە ئەبو (ظبيان)ەوە، هەنناد وتی: لە ئەبو (ظبيان)ی جەنبیەوە دەگیَرنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتیَکی شیَتیان هیَنا بۆ لای پیَشەوا عومەر رەزای خوای لیَ بیَ زینای کردبوو، ئەویش فەرمانی دا بە بەردەباران (رەجم) کردنی، پیَشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) رەزای خوای لیَ بیَ دای بەلایدا، بەرەڵای کرد، وتی: ئەی خەلیفەی باوەڕداران ئایا نازانی پیَغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (قەڵەم لەسەر ئەم سیَ کەسە هەڵگیراوە واتە گوناهو تاوانیان بۆ نانوسریَت: منداڵ هەتا باڵغ دەبیَ، خەوتو هەتا لەخەو هەڵئەسیَ، شیَت هەتا چاك دەبیَتەوە). ئەم شیَتە لە هۆزی فلانە لەوانەیە لەحاڵی شیَتیەکەیدا هیَنابیَتیان، راوی وتی: پیَشەوا عومەر رەزای خوای لیَ بیَ وتی: نازانم، پیَشەوا عەلیش وتی: منیش نازانم.

٤٤٠٣ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ, وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ, وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ). زَادَ فِيهِ: (وَالْخَرِفِ).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قەڵەم لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوە واتە گوناهو تاوانیان بۆ نانوسرێت: خەوتو هەتا لەخەو هەڵئەسێ، منداڵ هەتا باڵغ دەبێ، شێت هەتا چاك دەبێتەوە). ئەمەشی بۆ زیاد کرد: (وە کەسی خەڵەفاو).

## دەربارەی غولامێ حەدی بکەوێتە سەر.

## ١٧ - باب فِي الْغُلَامِ يُصِيبُ الْحَدَّ.

٤٤٠٤ - (صحيح) عن عطية القرظي قال: كُنْتُ مِنْ سَبْيِ بَنِي قُرَيْظَةَ فَكَانُوا يَنْظُرُونَ فَمَنْ أَنْبَتَ الشَّعْرَ قُتِلَ, وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ لَمْ يُقْتَلْ, فَكُنْتُ فِيمَنْ لَمْ يُنْبِتْ.

واتە: لە (عطية القرظي)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من یەکێك بووم لە دیل و سەبایاکانی هۆزی (قُرَيْظَةَ) سەیریان دەکرد کێ شەرمگەی مووی پێوە ببوایە دەیانکوشت چونکە ئەوە نیشانەی باڵغ بوونی بوو، ئەوەشی شەرمگەی مووی پێوە نەبوایە نەیاندەکوشت، منیش یەکێك بووم لەوانەی شەرمگەم مووی پێوە نەبوو.

٤٤٠٥ - (صحيح) عن عبد الملك بن عمير بهذا الحديث, قال: فَكَشَفُوا عَانَتِي فَوَجَدُوهَا لَمْ تَنْبُتْ, فَجَعَلُونِي فِي السَّبْيِ.

واتە: لە (عبد الملك)ی کوڕی عومەیرەوە فەرموودەکەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە وتی: شەرمگەی منیان دەرخست بینیان مووی پێوە نیە، نەیانکوشتم و حسابی دیلیان بۆ کردم.

٤٤٠٦ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُرِضَهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْهُ, وَعُرِضَهُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَهُوَ ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە لە ڕۆژی غەزای ئوحود دا نیشاندرا تەمەنی چواردە ساڵان بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەدا بەشداری جەنگ بکات، بەڵام لەرۆژی غەزای خەندەق دا نیشاندرا تەمەنی پانزە ساڵان بوو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگەی دا بەشداری جەنگ بکات.

٤٤٠٧ - (صحيح) عن عبيد الله بن عمر قال: قال نافع: حَدَّثْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا الْحَدُّ بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ.

واتە: لە (عبيد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نافیع وتی: عومەری کوڕی (عبد العزیز) ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە وتویەتی: ئەمە سنوری نێوان گەورەو بچوکە.

## ئەگەر کەسێ لە غەزادا دزی بکات، ئایا دەستی دەبڕدرێت؟

## ١٨ - باب السَّارِقِ يَسْرِقُ فِي الْغَزْوِ أَيُقْطَعُ؟

٤٤٠٨ - (صحيح) عن جنادة بن أمية قال: كُنَّا مَعَ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ فِي الْبَحْرِ فَأُتِيَ بِسَارِقٍ, يُقَالُ لَهُ مِصْدَرٌ قَدْ سَرَقَ بُخْتِيَّةً, فَقَالَ: قَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي السَّفَرِ). وَلَوْلاَ ذَلِكَ لَقَطَعْتُهُ.

واتە: لە جونادەی کوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە سەفەرێکدا لەگەڵ بوسری کوڕی (أَرْطَاةَ)دا بووین لەدەریادا دزێکیان هێنا، ناوی (مِصْدَرٌ) بوو وشترێکی مل درێژی دوو کۆپارەی دزی بوو، وتی: بەڕاستی بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەسەفەردا دەستی دز نابڕدرێت). ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئەوا دەستیم دەبڕی.

## سەبارەت بە دەست بڕینی کفن دز.

## ١٩ - باب فِي قَطْعِ النَّبَّاشِ.

٤٤٠٩ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَا أَبَا ذَرٍّ). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. فَقَالَ: (كَيْفَ أَنْتَ إِذَا أَصَابَ النَّاسَ مَوْتٌ يَكُونُ الْبَيْتُ فِيهِ بِالْوَصِيفِ). يَعْنِي الْقَبْرَ. قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ, أَوْ مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ. قَالَ: (عَلَيْكَ بِالصَّبْرِ). أَوْ قَالَ: (تَصْبِرُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ حَمَّادُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ: يُقْطَعُ النَّبَّاشُ لأَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْمَيِّتِ بَيْتَهُ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی (أَبَا ذرّ). وتم: وەڵامی دوای وەڵامم هەیە لە گوێڕایەڵیتدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وە شوێنکەوتەی دوای شوێنکەوتەم بۆ دینەکەت). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، تێیدا فەرمووی: (حاڵت چۆن دەبێ و چی دەکەیت ئەگەر کەوتیتە رۆژگارێکەوە خەڵك لەبەر سەرقاڵی بۆیان ناکرێ مردووەکانیان بنێژن پارە دەدەن بە قەبرهەڵکەن بۆیان بنێژێ وە پارەی جێگە قەبرەکەش دەدەن؟) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، یان خواو پێغەمبەرەکەی بۆم دیاری دەکەن کە چی بکەم، فەرمووی: (لەسەرتە ئارام بگری). یان فەرمووی: (خۆگر بە). ئەبو داود دەڵێت: حەمادی کوڕی ئەبو سولەیمان وتی: دەستی کفن دز دەبڕدرێت چونکە مردوو چۆتە ماڵی خۆیەوە کە گۆڕەکەیەتی.

## سەبارەت بە دز جار لەدوای جار دزی بکاتەوە.

## ٢٠ - بِاب فِي السَّارِقِ يَسْرِقُ مِرَارًا.

٤٤١٠ - (حسن) عن جابر بن عبد الله قال: جِيءَ بِسَارِقٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّمَا سَرَقَ. فَقَالَ: (اقْطَعُوهُ). قَالَ: فَقُطِعَ, ثُمَّ جِيءَ بِهِ الثَّانِيَةَ, فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا سَرَقَ. فَقَالَ: (اقْطَعُوهُ). قَالَ: فَقُطِعَ, ثُمَّ جِيءَ بِهِ الثَّالِثَةَ, فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا سَرَقَ. قَالَ: (اقْطَعُوهُ). ثُمَّ أُتِيَ بِهِ الرَّابِعَةَ, فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا سَرَقَ. قَالَ: (اقْطَعُوهُ). فَأُتِيَ بِهِ الْخَامِسَةَ, فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ).قَالَ جَابِرٌ: فَانْطَلَقْنَا بِهِ فَقَتَلْنَاهُ, ثُمَّ اجْتَرَرْنَاهُ فَأَلْقَيْنَاهُ فِي بِئْرٍ, وَرَمَيْنَا عَلَيْهِ الْحِجَارَةَ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکوژن). وتیان: ئەی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە دزی کردوە، فەرمووی: (دەستی ببڕن). وتی: دەستیان بڕی، لەپاشدا بۆ دووەم جار هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکوژن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە دزی کردوە، فەرمووی: (دەستی ببڕن). وتی: دەستیان بڕی. لەپاشدا بۆ سێیەم جار هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکوژن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە دزی کردوە، فەرمووی: (دەستی ببڕن). وتی: دەستیان بڕی لەپاشدا بۆ چوارەم جار هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکوژن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە دزی کردوە، فەرمووی: (دەستی ببڕن). وتی: دەستیان بڕی، لەپاشدا بۆ پێنجەم جار هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکوژن). جابر وتی: دەرچوین کوشتمان، لەپاشدا رامانکێشاو خستمانە بیرەوە بەردبارانیشمان کرد.

## سەبارەت بە دەستی بڕاوی دز هەڵئەواسرێت بە ملیدا.

## ٢١ - باب فِي السَّارِقِ تُعَلَّقُ يَدُهُ فِي عُنُقِهِ.

٤٤١١ - (ضعيف) عن عبد الرحمن بن محيريز قال: سَأَلْنَا فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ عَنْ تَعْلِيقِ الْيَدِ فِي الْعُنُقِ لِلسَّارِقِ أَمِنَ السُّنَّةِ هُوَ؟ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَارِقٍ فَقُطِعَتْ يَدُهُ, ثُمَّ أُمِرَ بِهَا فَعُلِّقَتْ فِي عُنُقِهِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی موحەیریزەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارمان کرد لە (فَضَالَةَ)ی کوڕی عوبەید دەربارەی دز دەستی دەبڕدرێت و هەڵی ئەواسن بە ملیا کە ئایا سوننەتە یان نا؟ (فَضَالَةَ) وتی: دزێکیان هێنا بۆ لای

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستیان بڕی، لەپاشدا فەرمانی دا بە بڕاوی هەڵیواسن بە ملیەوە.

## باسی فرۆشتنی بەندە ئەگەر دزی کرد.

## ٢٢ - باب بَيْعِ الْمَمْلُوكِ إِذَا سَرَقَ.

٤٤١٢ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا سَرَقَ الْمَمْلُوكُ فَبِعْهُ وَلَوْ بِنَشٍّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بەندە دزی کرد بیفرۆشن با بە نیو ئوقیەش بێت واتە با بەنرخێکی کەمیش بێت).

## سەبارەت بە بەردباران(رەجم)کردن.

## ٢٣ - باب فِي الرَّجْمِ.

٤٤١٣ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: (وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً). وَذَكَرَ الرَّجُلَ بَعْدَ الْمَرْأَةِ, ثُمَّ جَمَعَهُمَا فَقَالَ: (وَاللَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا) فَنَسَخَ ذَلِكَ بِآيَةِ الْجَلْدِ فَقَالَ: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی:
﴿ وَٱلَّـٰتِى يَأْتِينَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴾ سورة النساء:١٥.

واتە: ئەوانەی کەکاری زۆر پیس و ناشیرین (زینا) دەکەن لەئافرەتان(ی بڕوادار) یان ئەوە چوار شایەت لەخۆتان لەسەریان بگرن، ئینجا ئەگەر شایەتیاندا ئەوە ئەو ژنە(زیاناکار)انە بەند بکەن لەماڵەکانتاندا، هەتا (مەلائیکە)ی مەرگ گیانیان دەکێشێت، یان خوا رێگایەك (ی رزگاربوون)یان بۆ دائەنێ.

خوای گەورە باسی پیاوی کرد لەدوای ئافرەتان، لەپاشدا کۆیکردنەوە فەرمووی:
﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ ﴾ سورة النساء:١٦.

واتە: وە ئەو دوانەی (کوڕ و کچەی) ئەو کارە پیسە (زینا) دەکەن لەئێوە ئەوە ئازاریان بدەن، جا ئەگەر گەڕانەوەو تەوبەیان لێ کرد وە چاك بوون، ئەوا وازیان لێ بێنن.

ئەم ئایەتەش بە ئایەتی شەلاق لێدان نەسخ بۆتەوە:
﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾ سورة النور:٢.
واتە: کچ و کوڕی زیناکەر هەریەکێکیان سەد دار(شەلاق)یان لێ بدەن.

٤٤١٤ - (حسن مقطوع) عن مجاهيد قال: السَّبِيلُ الْحَدُّ. قَالَ سُفْيَانُ: (فَآذُوهُمَا): الْبِكْرَانِ, (فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ): الثَّيِّبَاتِ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (السَّبِيلُ) کە لە ئایەتەکەدا باسکراوە (أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلا). بریتیە لە حەد واتە سزاو تۆڵەی لێ دەسێنرێت. سوفیان وتی: (فَآذُوهُما) واتە: ئازاریان بدەن. مەبەست لە کوڕ و کچی زیناکارە. (فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ) واتە: ئەو ژنە(زیاناکار)انە بەند بکەن

لەماڵەکانتاندا. ئەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کە شویان کردوە.

٤٤١٥ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (خُذُوا عَنِّى, خُذُوا عَنِّى, قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً: الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ, وَرَمْىٌ بِالْحِجَارَةِ, وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْىُ سَنَةٍ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، (قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً): واتە ئەگەر ژن و پیاوێ هاوسەرگیریان کردبوو زینایان کرد سزاکەیان بریتیە لەوەی هەریەکێکیان سەد دار(شەلاق)ی لێ بدرێت، وە بەردبارانیش بکرێن. کوڕ و کچیش ئەگەر زینایان کرد ئەوە یەکی سەد دار(شەلاق)یان لێ دەدرێت، وە ساڵێکیش دوردەخرێنەوە.

٤٤١٦ - (صحيح) عن الحسن بإسناد يحيى ومعناه, قالا: (جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ).

واتە: لە حەسەنەوە بە ئیسنادی یەحیا فەرموودەی پێشو هاتوە وتیان: هەریەکێکیان سەد دار(شەلاق)ی لێ دەدرێت، وە بەردبارانیش دەکرێن.

٤٤١٧ - (ضعيف) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم, بهذ الحديث. فَقَالَ نَاسٌ لِسَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ: يَا أَبَا ثَابِتٍ قَدْ نَزَلَتِ الْحُدُودُ لَوْ أَنَّكَ وَجَدْتَ مَعَ امْرَأَتِكَ رَجُلاً كَيْفَ كُنْتَ صَانِعًا؟ قَالَ: كُنْتُ ضَارِبَهُمَا بِالسَّيْفِ حَتَّى يَسْكُتَا, أَفَأَنَا أَذْهَبُ, فَأَجْمَعُ أَرْبَعَةَ شُهَدَاءَ؟ فَإِلَى ذَلِكَ قَدْ قَضَى الْحَاجَةَ. فَانْطَلَقُوا, فَاجْتَمَعُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَلَمْ تَرَ إِلَى أَبِي ثَابِتٍ, قَالَ: كَذَا وَكَذَا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَفَى بِالسَّيْفِ شَاهِدًا). ثُمَّ قَالَ: (لاَ لاَ أَخَافُ أَنْ يَتَتَابَعَ فِيهَا السَّكْرَانُ وَالْغَيْرَانُ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرمودەی پێشو هاتوە. خەڵك بە سەعدی کوڕی عوبادەیان وت: ئەی ئەبا (ثابت) ئایەتی سنورەکان دابەزی، ئەگەر تۆ کەسێکت بینی لەگەڵ خێزانەکەت زینای کرد چی دەکەیت؟ وتی: بە شمشێر لێیان دەدەم هەتا دەمرن، هەتا من بڕۆم چوار شایەت بێنم بێن بەچاوی خۆیان ببینن و شایەتی بدەن، کابرا زیناکار کاری خۆی دەکات و بۆی دەردەچێت. خەڵکەکە ڕۆشتن، لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم کۆبونەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، ئایا دەزانی ئەبا (ثابت) ئاواو ئاوا دەڵێت؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (شمشێر بەسە بۆ شاهیدی). لەپاشدا فەرمووی: (نەخێر نەخێر، ئەترسم ئەوانەی کە توڕەن و بەغیرەتن پەلە بکەن کەسەکە شایەنی کوشتن نەبێ و بیکوژن).

٤٤١٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عباس: (أن عمر - يعني ابن الخطاب رضي الله عنه - خطب فقال: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ عُمَرَ يَعْنِى ابْنَ الْخَطَّابِ رضى الله عنه خَطَبَ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ, وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ, فَكَانَ فِيمَا أَنْزَلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ فَقَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا, وَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَرَجَمْنَا مِنْ بَعْدِهِ, وَإِنِّى خَشِيتُ - إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ الزَّمَانُ - أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِى كِتَابِ اللَّهِ, فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ تَعَالَى, فَالرَّجْمُ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا كَانَ مُحْصَنًا, إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ أَوْ كَانَ حَمْلٌ أَوِ اعْتِرَافٌ, وَايْمُ اللَّهِ لَوْلاَ أَنْ يَقُولَ النَّاسُ زَادَ عُمَرُ فِى كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَكَتَبْتُهَا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جارێ پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتاری دەخوێندەوە دەیوت: خوای گەورە موحەممەدی صلی الله علیه وسلم بەهەق ڕەوانەکرد، قورئانیشی بۆ دابەزاند، یەکێ لەو ئایەتانەی کە بۆی دابەزاند ئایەتی

بەردباران(رەجم)کردنە، ئێمەش خوێندمانەوەو لێی تێگەیشتین و لەبەرمان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی زیناکارانی بەردباران(رەجم) دەکرد، ئەوەتا ئێمەش لەدوای ئەو زیناکاران بەردباران(رەجم) دەکەین، بەڵام ئەترسم رۆژگار درێژە بکێشێ و بکەونە چەرخێکەوە کەسێ بڵێ: ئایەتی بەردباران(رەجم) کردن لە قورئاندا نیە، جا بەهۆی وازهێنان لە فەرزێك کە خوای گەورە ئایەتی لەبارەوە دابەزاندوە تەوانبار دەبن و لە رێگە دەردەچن، جا بەردباران(رجم)کردن هەقەو شتێکی راست و دروستە لەسەر ئەو ژن و پیاوانەی کە باڵغ و ئاقڵن و هاوسەرگیریان ئەنجام دابێ و زینا بکەن، هەرکاتێ شایەت و بەڵگەی رۆشن و سکی پڕی دیاری بداو (ئیعتیراف)دانپیانان هەبێ، سوێند بە (الله) ئەگەر خەڵك نەیان وتایە عومەر لە قورئانەکەی خوای زیاد کردوە، ئەوا دەمنوسی.

## باسی بەردبارانکردنی ماعیزی کوڕی مالیك.

## ٢٤ - باب رَجْمِ مَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ.

٤٤١٩ - (صحيح دون قوله: لعله أن ...) عن نعيم بن هزال قال: كَانَ مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ يَتِيمًا فِي حِجْرِ أَبِي. فَأَصَابَ جَارِيَةً مِنَ الْحَيِّ, فَقَالَ لَهُ أَبِي: ائْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبِرْهُ بِمَا صَنَعْتَ لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ لَكَ وَإِنَّمَا يُرِيدُ بِذَلِكَ رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ لَهُ مَخْرَجًا فَأَتَاهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي زَنَيْتُ فَأَقِمْ عَلَيَّ كِتَابَ اللَّهِ. فَأَعْرَضَ عَنْهُ, فَعَادَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي زَنَيْتُ فَأَقِمْ عَلَيَّ كِتَابَ اللَّهِ. حَتَّى قَالَهَا أَرْبَعَ مِرَارٍ. قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّكَ قَدْ قُلْتَهَا أَرْبَعَ مَرَّاتٍ فَبِمَنْ). قَالَ بِفُلاَنَةَ. قَالَ (هَلْ ضَاجَعْتَهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ (هَلْ بَاشَرْتَهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ (هَلْ جَامَعْتَهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ, فَأُخْرِجَ بِهِ إِلَى الْحَرَّةِ. فَلَمَّا رُجِمَ فَوَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ جَزِعَ, فَخَرَجَ يَشْتَدُّ, فَلَقِيَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُنَيْسٍ وَقَدْ عَجَزَ أَصْحَابُهُ فَنَزَعَ لَهُ بِوَظِيفِ بَعِيرٍ فَرَمَاهُ بِهِ فَقَتَلَهُ, ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: (هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ لَعَلَّهُ أَنْ يَتُوبَ, فَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَيْهِ).

واتە: لە نوعەیمی کوڕی هەزالەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ماعیزی کوڕی مالیك هەتیوێ بوو لە کۆشی باوکم دا گەورە بوو واتە باوکم پەروەردەی کرد، لەگەڵ کەنیزەکێکی هۆزی حەی زینای کرد، باوکم پێی وت: بڕۆ بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەکەی پێ رابگەیەنە بەڵکو لێت خۆش بێت، مەبەستی ئەوە بوو رێگا چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوەو لەو تاوانە رزگاری ببێ، وتی: رۆشت بۆ خزمەتی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زینام کردووە حوکمی خوای گەورە جێبەجێی بکە بەسەرما، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم روی کرد بەولاوەو پشتی تێ کرد بەڵکو واز لەو وتەیە بێنێ، دیسانەوە هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زینام کردووە حوکمی خوای گەورە جێبەجێی بکە بەسەرما، هەتا چوار جار بەو شێوەیەی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (چوار جار ئەم وتەیەت دووبارە کردەوە لەگەڵ کێ زینات کردوە؟ وتی: لەگەڵ فلانە کەنیزەك، فەرمووی: (لەژێر پێخەفێکدا بە تەنیشت یەکەوە راکشان؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (جەستەت کەوت لە جەستەی؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (لەتەکی جوت بویت؟) وتی: بەڵێ، راوی وتی: فەرمانی دا کە رەجمی بکەن، بردیانەدەرەوە بۆ حەڕڕە بۆ ناو بەردە رەشەکان، کاتێ کە بەردبارانیان کرد بەردەکان ئازاریان پێ گەیاند بەپەلە هەڵهات و بۆی دەرچوو، (عبد الله)ی کوڕی ئونەیسی پێگەیشت هاوڕێکانی دواکەوتبون سمە وشترێکی پێدا کێشاو کوشتی، لەپاشدا (عبد الله)ی کوڕی ئونەیس هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسەکەی بۆ گێڕایەوە فەرمووی: (بریا وازتان لێ دەهێنا بەڵکو تەوبەی بکردایەو خوای گەورەش لێی خۆش ببوایە).

٤٤٢٠ - (حسن) عن محمد بن اسحاق قال: ذَكَرْتُ لِعَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قِصَّةَ مَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ لِي: حَدَّثَنِي حَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ حَدَّثَنِي ذَلِكَ مِنْ قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ). مَنْ شِئْتُمْ مِنْ رِجَالِ أَسْلَمَ مِمَّنْ لاَ أَتَّهِمُ. قَالَ: وَلَمْ أَعْرِفْ هَذَا الْحَدِيثَ. قَالَ: فَجِئْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فَقُلْتُ: إِنَّ رِجَالاً مِنْ أَسْلَمَ يُحَدِّثُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُمْ حِينَ ذَكَرُوا لَهُ جَزَعَ مَاعِزٍ مِنَ الْحِجَارَةِ حِينَ أَصَابَتْهُ: (أَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ). وَمَا أَعْرِفُ الْحَدِيثَ. قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِهَذَا الْحَدِيثِ, كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَ الرَّجُلَ إِنَّا لَمَّا خَرَجْنَا بِهِ فَرَجَمْنَاهُ فَوَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ صَرَخَ بِنَا يَا قَوْمِ رُدُّونِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّ قَوْمِي قَتَلُونِي وَغَرُّونِي مِنْ نَفْسِي, وَأَخْبَرُونِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرُ قَاتِلِي, فَلَمْ نَنْزِعْ عَنْهُ حَتَّى قَتَلْنَاهُ, فَلَمَّا رَجَعْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَخْبَرْنَاهُ قَالَ: (فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ وَجِئْتُمُونِي بِهِ). لِيَسْتَثْبِتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُ, فَأَمَّا لِتَرْكِ حَدٍّ فَلاَ, قَالَ: فَعَرَفْتُ وَجْهَ الْحَدِيثِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەسەرهاتەکەی ماعیزی کوڕی مالیکم گێڕایەوە بۆ عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەپێی وتم: حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە وتی: لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ لە پیاوانی هۆزی ئەسلەم ئەمەیان بۆ گێڕامەوە: (فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ). واتە: بریا وازتان لێ دەهێنا. حەسەن وتی: من هیچ لەبارەی (فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ)ی ئەم فەرموودەوە نازانم. وتی: چوم بۆ لای جابری کوڕی (عبد الله) وتم: پیاوانێ لە هۆزی ئەسلەم باسی ئەوە دەکەن کە گوایە کاتێ ماعیز بەردەکان ئازاریان پێ گەیاند هەواڵەکەیان ڕاگەیاندوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش فەرموویەتی: (أَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ). من هیچ دەربارەی ئەمە نازانم؟ جابر وتی: ئەی برازا خۆشەویستەکەم من لەهەموو کەس زیاتر شارەزای ئەم فەرمودەم، بۆ خۆم یەکێك بووم لەوانەی ماعیزمان بەردباران کرد، کاتێ کە بردمانەدەرەوەو بەردبارانمان کرد بەردەکان ئازاریان پێ گەیاند هاواری کرد وتی: ئەی قەومەکە بم گەڕێننەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قەومەکەم دەمکوژن و فێڵم لێ دەکەن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من ناکوژێت!! دەستمان لێ هەڵنەگرت و کۆتاییمان پێ نەهێنا هەتا کوشتمان، کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەکەمان پێ ڕاگەیاند، فەرموی: (بۆچی وازتان لێ نەهێناو، نەتانهێنا





بۆلام). بۆ ئەوە بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دامەزرای بکات - یان وەك لە ریوایەتێکی تردا هاتوە تەوبە بکات -، نەك بۆ ئەوەی حەدەکەی لەکۆڵ بخات و بەردباران نەکرێت، حەسەن وتی: ئێستا تێگەیشتم.

٤٤٢١ - (صحيح الإسناد) عن ابن عباس: أَنَّ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: إِنَّهُ زَنَى. فَأَعْرَضَ عَنْهُ, فَأَعَادَ عَلَيْهِ مِرَارًا, فَأَعْرَضَ عَنْهُ, فَسَأَلَ قَوْمَهُ: (أَمَجْنُونٌ هُوَ؟). قَالُوا: لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ. قَالَ: (أَفَعَلْتَ بِهَا). قَالَ نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ, فَانْطُلِقَ بِهِ فَرُجِمَ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە ماعیزی کوڕی مالیك زینای کردبوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: زینام کردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم روی لێ وەرگێڕاو پشتی تێ کرد، دیسانەوە چەند جارێ هاتەوە وتی: زینام کردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەر پشتی تێ دەکرد، قەومەکەی پرسیاریان کرد: (ئەوە شێتە؟) وتیان: هیچ گوێ ناداتێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (زینات لەگەڵ کرد؟) وتی: بەڵێ، فەرمانی دا بەردباران بکرێت، بردیان بەردبارانیان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی مردوی لەسەر نەکرد.

٤٤٢٢ - (صحيح) عن جابر بن سمورة قال: رَأَيْتُ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ جِيءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً قَصِيرًا أَعْضَلَ, لَيْسَ عَلَيْهِ رِدَاءٌ فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ أَنَّهُ قَدْ زَنَى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (فَلَعَلَّكَ قَبَّلْتَهَا؟). قَالَ: لاَ وَاللَّهِ إِنَّهُ قَدْ زَنَى الآخِرُ. قَالَ فَرَجَمَهُ ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ (أَلاَ كُلَّمَا نَفَرْنَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَلَفَ أَحَدُهُمْ لَهُ نَبِيبٌ كَنَبِيبِ التَّيْسِ يَمْنَحُ إِحْدَاهُنَّ الْكُثْبَةَ أَمَا إِنَّ اللَّهَ إِنْ يُمَكِّنِّي مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ إِلاَّ نَكَلْتُهُ عَنْهُنَّ).

واته: له جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، که وتویەتی: کاتێ ماعیزی کوڕی مالیکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینیم پیاوێکی کورته بالای گۆشتنی خاوەن عەزەلاتی بەهێز بوو، شانی رووت بوو، چوار جار شایەتی لەسەر خۆی دا که زینای کردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەوانەیە ماچت کردبێ؟). سەرزەنشتی خۆی کرد وتی: نا سوێند به (الله) زینام لەگەڵ کردوە. راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بەردبارانیان کرد، لەپاشدا وتاری بۆ خوێندنەوە فەرمووی: (کاتێ که ئێمه دەردەچین بۆ غەزا له پێناوی خوای گەورەدا یەکێ لەئێوە کەسێ دەکات به جێنشین و سەرپەرشتیار بەسەر خانەوادەکەیەوە که یارمەتیان بدات و ئاگای لێیان بێت کەچی خیانەت له ئافرەتەکانیان دەکات، به تۆزێ شیر یان هەر خواردنێکی تر، سوێند به (الله) ئەگەر کەسێ کاری لەو جۆره بکات و بیهێنن بۆلام سزای دەدەم به شەلاق لێدان یان به بەردباران کردن).

٤٤٢٣ - (صحيح) عن جابر بن سمورة: بِهَذَا الْحَدِيثِ. وَالأَوَّلُ أَتَمُّ. قَالَ: فَرَدَّهُ مَرَّتَيْنِ. قَالَ سِمَاكٌ فَحَدَّثْتُ بِهِ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ, فَقَالَ: إِنَّهُ رَدَّهُ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ.

واته: له جابری کوڕی سەمورەوە فەرموودەی پێشو هاتوه، بەلام یەکەم تەواو تره. وتی: دووجار رەتی کردەوەو دەری کرد. سیماك وتی: ئەمەم باسکرد بۆ سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: چوار جار رەتی کردەوە.

٤٤٢٤ - (صحيح مقطوع) عن شعبة قال: سَأَلْتُ سِمَاكًا عَنِ الْكُثْبَةِ؟ فَقَالَ: اللَّبَنُ الْقَلِيلُ.

واته: له شوعبەوە دەگێڕنەوە، که وتویەتی: دەربارەی مانای (الْكُثْبَةِ) پرسیارم کرد له سیماك؟ وتی: واته: کەمێك شیر.

٤٤٢٥ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم لماعز بن مالك: (أَحَقٌّ مَا بَلَغَنِى عَنْكَ؟). قَالَ: وَمَا بَلَغَكَ عَنِّى؟ قَالَ (بَلَغَنِى عَنْكَ أَنَّكَ وَقَعْتَ عَلَى جَارِيَةِ بَنِى فُلاَنٍ). قَالَ نَعَمْ. فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە ماعیزی کوڕی مالیکی فەرموو: (ئەوەی کە پێیان راگەیاندوم لەبارەی تۆوە راستە؟). وتی: چیان لەبارەی منەوە پێ راگەیاندوی؟)، فەرمووی: (پێم راگەیەنراوە کە لەگەڵ کەنیزەکێکی هۆزی فلان زینات کردوە)، وتی: بەڵێ، چوار جار شایەتی دا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بەردبارانیان کرد.

٤٤٢٦ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَاءَ مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا مَرَّتَيْنِ, فَطَرَدَهُ, ثُمَّ جَاءَ فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا مَرَّتَيْنِ. فَقَالَ: (شَهِدْتَ عَلَى نَفْسِكَ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە ماعیزی کوڕی مالیك دووجار هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئیعتیرافی کرد کە زینای کردوە، دەری کرد، لەپاشدا هاتەوەو دووجار ئیعتیرافی کرد کە زینای کردوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چوار جار شایەتیت لەسەر خۆت دا، بیبەن بەرد بارانی بکەن).

٤٤٢٧ - (صحيح) عن ابن عباس, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال لماعز بن مالك: (لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ غَمَزْتَ أَوْ نَظَرْتَ). قَالَ لاَ. قَالَ (أَفَنِكْتَهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ أَمَرَ بِرَجْمِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ماعیزی کوڕی مالیکی فەرموو: (لەوانەیە ماچت کردبێ، یان ئیشارەتت بۆ کردبێ یا سەیرت کردبێ؟). وتی: نا، فەرمووی: (لەتەکی جووت بوویت و زینات لەگەڵ کرد؟). وتی: بەڵێ. راوی وتی: ئیتر فەرمانی دا بە بەردباران کردنی.

٤٤٢٨ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: جَاءَ الأَسْلَمِيُّ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَنَّهُ أَصَابَ امْرَأَةً حَرَامًا أَرْبَعَ مَرَّاتٍ, كُلُّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَقْبَلَ فِي الْخَامِسَةِ فَقَالَ: (أَنِكْتَهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ: (حَتَّى غَابَ ذَلِكَ مِنْكَ فِي ذَلِكَ مِنْهَا). قَالَ نَعَمْ. قَالَ: (كَمَا يَغِيبُ الْمِرْوَدُ فِي الْمُكْحُلَةِ, وَالرِّشَاءُ فِي الْبِئْرِ). قَالَ نَعَمْ. قَالَ (فَهَلْ تَدْرِي مَا الزِّنَا). قَالَ نَعَمْ, أَتَيْتُ مِنْهَا حَرَامًا مَا يَأْتِي الرَّجُلُ مِنِ امْرَأَتِهِ حَلاَلاً. قَالَ (فَمَا تُرِيدُ بِهَذَا الْقَوْلِ). قَالَ أُرِيدُ أَنْ تُطَهِّرَنِي. فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ فَسَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِهِ يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ انْظُرْ إِلَى هَذَا الَّذِي سَتَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَلَمْ تَدَعْهُ نَفْسُهُ حَتَّى رُجِمَ رَجْمَ الْكَلْبِ. فَسَكَتَ عَنْهُمَا ثُمَّ سَارَ سَاعَةً حَتَّى مَرَّ بِجِيفَةِ حِمَارٍ شَائِلٍ بِرِجْلِهِ فَقَالَ (أَيْنَ فُلاَنٌ وَفُلاَنٌ). فَقَالاَ نَحْنُ ذَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ (انْزِلاَ فَكُلاَ مِنْ جِيفَةِ هَذَا الْحِمَارِ). فَقَالاَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَنْ يَأْكُلُ مِنْ هَذَا قَالَ (فَمَا نِلْتُمَا مِنْ عِرْضِ أَخِيكُمَا آنِفًا أَشَدُّ مِنْ أَكْلٍ مِنْهُ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُ الآنَ لَفِي أَنْهَارِ الْجَنَّةِ يَنْقَمِسُ فِيهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی ئەسلەمی- واتە: ماعیز- هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوار جار شایەتی لەسەر خۆی دا کە توشی حەرام بوە لەگەڵ ئافرەتێکدا، هەموو جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم روی کرد بەولاوەو پشتی تێ دەکرد، لە پێنجەم جاردا پێی فەرموو: (لەتەکی جووت بوویت و زینات لەگەڵ کرد؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (تەنانەت هینەکەی تۆ ون بوو لەناو هینەکەی ئەودا

مەبەستی لەجووت بون بوو). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (وەك چۆن میل لەناو كلداندا ون دەبێت، یان وەك پەتی دۆڵچەیە كە ئاوی پێ هەڵدەگۆزن لەناو بیردا ون بوو). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەزانی زینا چییە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (بە حەرامی لەتەكی جووت بووم وەك چۆن پیاو لەگەڵ ژنی خۆیدا بە حەلاڵی جووت دەبێت، فەرمووی: (مەبەستت چییە لەم قسەیەو چیت دەوێ؟)، وتی: دەمەوێت پاكم بكەیتەوە لەو تاوانە، فەرمانی دا بەردبارانیان كرد، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم گوێی لەدوو لە هاوەڵانی بوو یەكێكیان بەوی تریانی وت: سەیری ئا ئەمە ناكەیت خوای گەورە تاوانەكەی بۆ پۆشی كەچی خۆی وازی نەهێناو ئاشكرای كرد تا وەك سەگ بەردباران كرا، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم قسەی نەكرد و هیچی پێ نەفەرموون، لەدوای سەعاتێك رێیان دەكرد دای بەلای گوێدرێژێكی تۆپیودا قاچی ئەوەندە ئاوسا بوو بەرزبوبوەوە، فەرمووی: (فلان و فلان لەكوێن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئێمە لێرەین و ئامادەین، فەرمووی: (دابەزن لە گۆشتی ئەم گوێدرێژە تۆپیوە بخۆن). - لەوانەیە سوار بووبن یان لاشەی گوێدرێژە تۆپیوەكە لە چاڵێكدا بووبێت -، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، كێ لەم گۆشتە دەخوات؟ فەرمووی: (ئەو دەستدرێژیەی كردتانە سەر ناموسی قورس ترە لە خواردنی گۆشتی ئەم گوێدرێژە تۆپیوە، سوێند بە (الله) ئێستا لەناو دەریاكانی بەهەشتدایەو سودیان لێ وەردەگرێت).

٤٤٢٩ - (ضعيف) عن أبو هريرة, بِنَحْوِهِ, زَادَ: وَاخْتَلَفُوا عليَّ, فَقَالَ بَعْضُهُمْ: رُبِطَ إِلَى شَجَرَةٍ, وَقَالَ بَعْضُهُمْ: وَقَفَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەلام راوی ئەمەی بۆ زیاد كرد: حاڵیان نەكردم لە چۆنیەتی بەردباران كردنەكەی، هەندێكیان وتیان: بە ستیانەوە بە درەختێكەوەو بەردبارانیان كرد، هەندێكیان وتیان: راوەستا.

٤٤٣٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا, فَأَعْرَضَ عَنْهُ, ثُمَّ اعْتَرَفَ, فَأَعْرَضَ عَنْهُ, حَتَّى شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ, فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَبِكَ جُنُونٌ). قَالَ: لاَ. قَالَ: (أَحْصَنْتَ؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَ فِي الْمُصَلَّى, فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ فَرَّ, فَأُدْرِكَ فَرُجِمَ حَتَّى مَاتَ, فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرًا, وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی هۆزی ئەسلەم هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئیعتیرافی کرد کە زینای کردوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پشتی تێ کرد، لەپاشدا ئیعتیرافی کرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پشتی تێ کرد، هەتا چوار جار شایەتی لەسەر خۆی دا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (ئایا تۆ شێتیت). وتی: نەخێر، فەرمووی: (ژنت هێناوە؟)، وتی: بەڵێ، فەرمانی دا بەردبارانیان کرد لە نوێژگاکەدا، کاتێ کە بەردەکان ئازاریان پێ گەیاند رای کرد، گرتیانەوەو بەردبارانیان کرد هەتا مرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی مردوی لەسەر نەکرد.

٤٤٣١ - (صحيح) عن أبو سعيد قال: لَمَّا أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَجْمِ مَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ, خَرَجْنَا بِهِ إِلَى الْبَقِيعِ, فَوَاللَّهِ مَا أَوْثَقْنَاهُ وَلاَ حَفَرْنَا لَهُ وَلَكِنَّهُ قَامَ لَنَا. قَالَ أَبُو كَامِلٍ: قَالَ: فَرَمَيْنَاهُ بِالْعِظَامِ, وَالْمَدَرِ, وَالْخَزَفِ, فَاشْتَدَّ وَاشْتَدَدْنَا خَلْفَهُ حَتَّى أَتَى عُرْضَ الْحَرَّةِ فَانْتَصَبَ لَنَا فَرَمَيْنَاهُ بِجَلاَمِيدِ الْحَرَّةِ حَتَّى سَكَتَ, قَالَ: فَمَا اسْتَغْفَرَ لَهُ, وَلاَ سَبَّهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بە بەردبارانکردنی ماعیزی کوڕی مالیك، بردمانەدەرەوە بۆ بەقیع، سوێند بە (الله) نە بەستمانەوە، نە چاڵمان بۆ هەڵکەند،

بەڵكو راوەستا بۆمان ئەبو كامیل وتی: ئێمەش رەجممان كرد بە ئێسك و گڵی وشك و پارچەی ئەو شتانەی كە لە قوڕ دروست دەكران وەك پارچە خشت، ماعیز بە پەلە رۆشت، ئێمەش لەدوایەوە بە پەلە رۆشتین هەتا گەیشتە حەڕە لەوێ راوەستا بۆمان، ئێمەش بە بەردە گەورەكانی حەڕە بەردبارانمان كرد هەتا مرد، راوی وتی: نە داوای لێ خۆش بوونی بۆ كردو، نە قسەشی پێ وت.

٤٤٣٢ - (ضعيف مرسل) عن أبو نضرة قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, نَحْوَهُ, وَلَيْسَ بِتَمَامِهِ. قَالَ: ذَهَبُوا يَسُبُّونَهُ فَنَهَاهُمْ, قَالَ: ذَهَبُوا يَسْتَغْفِرُونَ لَهُ فَنَهَاهُمْ, قَالَ: (هُوَ رَجُلٌ أَصَابَ ذَنْبًا حَسِيبُهُ اللَّهُ).

واتە: لە ئەبو (نضرة)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەكەی گێڕایەوە بەڵام بە تەواوی نا، راوی وتی: قسەیان پێ وت رێگری لێ كردن، داوای لێ خۆش بوونیان بۆ كرد رێگری لێ كردن، فەرمووی: (ئەمە پیاوێكە توشی تاوانێ بووە، خوای گەورە موحاسەبەی دەكات و لێپێچینەوەی لەگەڵ دەكات).

٤٤٣٣ - (صحيح) عن ابن بريدة عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَنْكَهَ مَاعِزًا.

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆنی فووی دەمی ماعیزی كرد بۆ ئەوەی بزانێ مەی نەخواردۆتەوەو سەرخۆش نیە قسەی وەها دەكات.

٤٤٣٤ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه قال: كُنَّا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ نَتَحَدَّثُ أَنَّ الْغَامِدِيَّةَ وَمَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ لَوْ رَجَعَا بَعْدَ اعْتِرَافِهِمَا أَوْ قَالَ: لَوْ لَمْ يَرْجِعَا بَعْدَ اعْتِرَافِهِمَا, لَمْ يَطْلُبْهُمَا, وَإِنَّمَا رَجَمَهُمَا عِنْدَ الرَّابِعَةِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی ژنە غامیدیەکە و ماعیزی کوڕی مالیك دەدواین کە ئەگەر لەدوای دان پێدانانیان بگەڕانایەتەوە بۆ مەنزڵگای خۆیان ئەوا لێیان قبوڵ دەکراو بەردباران نەدەکران، یان وتی: ئەگەر نەگەڕانایەتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەدوای دان پێدانانیان، کاتێ کە پشتی تێ کردن ئەوا لێیان قبوڵ دەکراو بەردباران نەدەکران، بەڵکو هاتنەوە بۆ خزمەتی و لەدوای چوار جار دان پێدانان ئینجا بەردباران کران.

٤٤٣٥ - (حسن الإسناد) عن خالد بن اللجلاج حدثه, أن الجلاج أباه أخبره, أَنَّهُ كَانَ قَاعِدًا يَعْتَمِلُ فِي السُّوقِ, فَمَرَّتِ امْرَأَةٌ تَحْمِلُ صَبِيًّا فَثَارَ النَّاسُ مَعَهَا وَثُرْتُ فِيمَنْ ثَارَ, فَانْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَهُوَ يَقُولُ: (مَنْ أَبُو هَذَا مَعَكِ؟). فَسَكَتَتْ, فَقَالَ شَابٌّ حَذْوَهَا: أَنَا أَبُوهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَقْبَلَ عَلَيْهَا, فَقَالَ: (مَنْ أَبُو هَذَا مَعَكِ؟). قَالَ الْفَتَى: أَنَا أَبُوهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَعْضِ مَنْ حَوْلَهُ يَسْأَلُهُمْ عَنْهُ, فَقَالُوا: مَا عَلِمْنَا إِلاَّ خَيْرًا. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَحْصَنْتَ). قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ. قَالَ: فَخَرَجْنَا بِهِ فَحَفَرْنَا لَهُ حَتَّى أَمْكَنَّا, ثُمَّ رَمَيْنَاهُ بِالْحِجَارَةِ حَتَّى هَدَأَ, فَجَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ عَنِ الْمَرْجُومِ فَانْطَلَقْنَا بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْنَا: هَذَا جَاءَ يَسْأَلُ عَنِ الْخَبِيثِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَهُوَ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ). فَإِذَا هُوَ أَبُوهُ فَأَعَنَّاهُ عَلَى غُسْلِهِ وَتَكْفِينِهِ وَدَفْنِهِ وَمَا أَدْرِي, قَالَ: وَالصَّلاَةِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ؟.

واتە: لە خالیدی کوڕی لەجلاجەوە دەگێڕنەوە، کە لەجلاجی باوکی پێی ڕاگەیاندوە: جارێ لەبازار دانیشتوە ئیشی خۆی دەکرد ئافرەتێ تێپەڕی منداڵێکی هەڵگرتبوو خەڵك بە توڕەیی و هەڵچونەوە شوێنی کەتبون منیش شوێنی ئەوان کەوتم هەتا گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،

فەرمووی: (کێ باوکی ئەم منداڵەیە کە لەگەڵتایە). ئافرەتەکە قسەی نەکردو بێدەنگ بوو، گەنجێ کە بەرامبەری ئافرەکە وەستابوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من باوکی ئەو منداڵەم، رووی تێ کرد، فەرمووی: (کێ باوکی ئەم منداڵەیە کە لەگەڵتایە). گەنجەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من باوکی ئەو منداڵەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەیری ئەوانەی کرد کە لەدەوری ئامادەبوون پرسیاری لێ کردن دەربارەی، وتیان: جگە لە خێر و چاکە هیچی لەبارەوە نازانین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (زنت هێناوە؟)، وتی: بەڵێ، فەرمانی دا بەردبارانیان کرد، راوی وتی: چاڵێکمان بۆ هەڵکەند لەپاشدا بەردبارانمان کرد هەتا مرد، پیاوێ هات لەو گەنجەی دەپرسی کە بەرباران کرا، لەگەڵ خۆمان بردمان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتمان: ئەم پیاوە هاتوە لە گەنجە پیسەکە دەپرسێ، فەرمووی: (بۆنی ئەو گەنجە لەلای خوای گەورە لە بۆنی میسك خۆشترە)، پیاوەکە باوکی گەنجەکە بوو، بۆ شۆردن و کفن و دفن کردنی یارمەتیمان دا، جا نازانم وتی: نوێژی لەسەر کرد یان نا؟ .

٤٤٣٦ – (حسن الإسناد) عن خالد بن اللجلاج, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه و سلم ببعض هذا الحديث.

واتە: لە خالیدی کوڕی لەجلاجەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ لە فەرمودەی پێشو هاتوە.

٤٤٣٧ - (صحيح) عن سهل بن سعد: عن النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَأَقَرَّ عِنْدَهُ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ سَمَّاهَا لَهُ, فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَرْأَةِ فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ, فَأَنْكَرَتْ أَنْ تَكُونَ زَنَتْ, فَجَلَدَهُ الْحَدَّ وَتَرَكَهَا.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتوە: کە پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

ئیعتیرافی کرد کە لەگەڵ ئافرەتێ زینای کردوەو ناوی ئەو ئافرەتەی هێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بۆ لای ئافرەتەکە لەوبارەوە لێی پرسی، ئەویش نکولی کردو نەچوە ژێری کە زینای کردبێت، جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەلاقی لە پیاوەکە داو، وازی لە ژنەکە هێنا.

٤٤٣٨ - (ضعيف الإسناد) عن جابر: أَنَّ رَجُلاً زَنَى بِامْرَأَةٍ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجُلِدَ الْحَدَّ, ثُمَّ أُخْبِرَ أَنَّهُ مُحْصَنٌ فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ, عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ بِنَحْوِ ابْنِ وَهْبٍ, لَمْ يَذْكُرِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: إِنَّ رَجُلاً زَنَى فَلَمْ يَعْلَمْ بِإِحْصَانِهِ فَجُلِدَ, ثُمَّ عَلِمَ بِإِحْصَانِهِ فَرُجِمَ.

واتە: لە جابرەوە، هاتوە: کە پیاوێ لەگەڵ ئافرەتێك زینای کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا شەلاقی لێدرا، لەپاشدا پێیان راگەیاند کە شوی کردوە، فەرمانی دا بەردباران کرا. لە ئیبنو جورەیجەوە بە شێوەی فەرموودەکەی ئیبنو وەهەب هاتوە، بەڵام باسی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم نەکرد، وتی: پیاوێ زینای کرد نەیزانی ژنی هێناوە فەرمانی دا شەلاقی لێ درا، لەپاشدا زانی کە ژنی هێناوە فەرمانی دا بەردباران کرا.

٤٤٣٩ - (ضعيف موقوف) عن جابر: أَنَّ رَجُلاً زَنَى بِامْرَأَةٍ فَلَمْ يَعْلَمْ بِإِحْصَانِهِ فَجُلِدَ, ثُمَّ عَلِمَ بِإِحْصَانِهِ فَرُجِمَ.

واتە: لە جابرەوە، هاتوە: کە پیاوێ لەگەڵ ئافرەتێك زینای کرد، نەیزانی ژنی هێناوە شەلاقی لێ درا، لەپاشدا کە زانی ژنی هێناوە فەرمانی دا بەردباران کرا.

## باسی ئەو ئافرەتە جوهەینیەی کە زینای کردبو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بەردباران بکرێت.

## ٢٥ - باب الْمَرْأَةِ الَّتِي أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَجْمِهَا مِنْ جُهَيْنَةَ.

٤٤٤٠ - (صحيح) عن عمران بن حصين أن امرأة - قال في حديث أبان: من جهينة - أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: إِنَّهَا زَنَتْ وَهِيَ حُبْلَى. فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلِيًّا لَهَا, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَجِئْ بِهَا). فَلَمَّا أَنْ وَضَعَتْ جَاءَ بِهَا, فَأَمَرَ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا, ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ, ثُمَّ أَمَرَهُمْ فَصَلَّوْا عَلَيْهَا, فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُصَلِّي عَلَيْهَا وَقَدْ زَنَتْ, قَالَ (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ وَهَلْ وَجَدْتَ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە ئافرەتێ — لە فەرمودەکەی ئەباندا لە هۆزی جوهەینە بوو — هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دانی پیا نا کە زینای کردوەو سکیشی پڕ بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (ولی)هەقداری ژنەکەی بانگ کرد، پێی فەرموو: (چاك بە لەگەڵی کاتێ کە سکەکەی دانا ژنەکە بهێنە بۆلام). کاتێ کە منداڵەکەی بوو هێنای بۆ لای، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا ژنەکەیان بە پۆشاکەکەی خۆی شەتەکدا بۆ ئەوەی لەکاتی بەردباران کردندا شەرمگەی دەرنەکەوێت، لەپاشدا فەرمانی دا بەردباران کرا، ئینجا فەرمانی دا نوێژیان مردویان بە کۆمەڵ لەسەر کرد، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی لەسەر دەکەیت لەکاتێکدا کە زینای کردوە، فەرمووی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بەدەستە

تەوبەیەکی کردوە ئەگەر بێتو دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینەدا بەشی هەر هەموویان دەکات، تەوبە لەوە باشتر دەبێ چی بێ کە رۆحی خۆی بەخشی لەبەر رەزامەندی خوای گەورە).

٤٤٤١ – (صحيح) عن أوزاعى قال: فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا. يَعْنِى فَشُدَّتْ.

واتە: لە ئەوزاعیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا ژنەکەیان بە پۆشاکەکەی خۆی شەتەکدا بۆ ئەوەی لەکاتی بەردباران کردندا شەرمگەی دەرنەکەوێت.

٤٤٤٢ - (صحيح) عن بريدة, قال: أَنَّ امْرَأَةً - يَعْنِى مِنْ غَامِدَ - أَتَتِ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: إِنِّى قَدْ فَجَرْتُ. فَقَالَ: (ارْجِعِى). فَرَجَعَتْ فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ أَتَتْهُ فَقَالَتْ: لَعَلَّكَ أَنْ تَرُدَّنِى, كَمَا رَدَدْتَ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ, فَوَاللَّهِ إِنِّى لَحُبْلَى. فَقَالَ لَهَا: (ارْجِعِى). فَرَجَعَتْ, فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ أَتَتْهُ, فَقَالَ لَهَا: (ارْجِعِى حَتَّى تَلِدِى). فَرَجَعَتْ, فَلَمَّا وَلَدَتْ أَتَتْهُ بِالصَّبِىِّ, فَقَالَتْ: هَذَا قَدْ وَلَدْتُهُ. فَقَالَ لَهَا: (ارْجِعِى فَأَرْضِعِيهِ حَتَّى تَفْطِمِيهِ). فَجَاءَتْ بِهِ وَقَدْ فَطَمَتْهُ وَفِى يَدِهِ شَىْءٌ يَأْكُلُهُ, فَأَمَرَ بِالصَّبِىِّ فَدُفِعَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ, وَأَمَرَ بِهَا فَحُفِرَ لَهَا, وَأَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ, وَكَانَ خَالِدٌ فِيمَنْ يَرْجُمُهَا فَرَجَمَهَا بِحَجَرٍ فَوَقَعَتْ قَطْرَةٌ مِنْ دَمِهَا عَلَى وَجْنَتِهِ فَسَبَّهَا, فَقَالَ لَهُ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَهْلاً يَا خَالِدُ, فَوَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا صَاحِبُ مَكْسٍ لَغُفِرَ لَهُ). وَأَمَرَ بِهَا فَصُلِّىَ عَلَيْهَا فَدُفِنَتْ.

واتە: لە بورەیدەوە دەگێرنەوە، کە ئافرەتێکی غامیدی هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: زینام کردوە، فەرمووی: (بگەرێرەوە). گەڕایەوە بۆ سبەینێ هاتەوە بۆ خزمەتی وتی: بۆچی دەمگەڕێنیتەوە؟ رەنگ بێ وەك چۆن ماعیزت گەڕاندەوە، منیش بگەڕێنیتەوە، سوێند بە (الله) سکم پڕە

لەئەنجامی ئەو داوێن پیسیەی کە کردومە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بگەڕێرەوە). گەڕایەوە، بۆ سبەینێ هاتەوە بۆ خزمەتی، پێی فەرموو: (بگەڕێرەوە هەتا منداڵەکەت دەبێ ئەو کاتە وەرەوە). گەڕایەوە، کاتێ کە منداڵەکەی بوو بە منداڵەکەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: منداڵم بووەو ئەوەش منداڵەکەیە، پێی فەرموو: (بگەڕێرەوە شیری بدەرێ هەتا لەشیر دەبڕێتەوەو بۆ خۆی خواردن دەخوات). جا ژنەکە منداڵەکەی گەورە کرد هەتا لەشیر بڕییەوە، هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم منداڵەکەی پێ بوو لەتێ نانی بەدەستەوە بوو یان خواردنێکی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەمە منداڵەکەمە گەورەم کردووە بۆ خۆی خواردن دەخوات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا منداڵەکەیان دایە دەست پیاوێ لە موسوڵمانان کە سەرپەرشتی بکات، جا فەرمانی دا چاڵێکیان بۆ ژنەکە هەڵکەند، لەپاشدا فەرمانی دا بەردبارانیان کرد، خالید کە یەکێك بوو لەوانەی بەردبارانی کرد بەردێکی کێشا بە ژنەکەدا خوێن فیچقەی کرد بەسەر دەم و چاوی خالید دا لەسەر ئەوە خالید جنێوی دا بە ژنەکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەی خالید هێواش و لەسەرخۆبە سوێند بە (الله) کە گیانی منی بەدەستە، ئەم ژنە تەوبەیەکی وەهای کرد ئەگەر باجگر و گومرگ خۆریش تەوبەی وەها بکات خوای گەورە لێ قبوڵ دەکات و لێی خۆش دەبێت). جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا نوێژی مردویان لەسەر کردو ناشتیان.

٤٤٤٣ - (صحيح) عن ابن أبو بكرة, عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, رَجَمَ امْرَأَةً فَحُفِرَ لَهَا إِلَى الثَّنْدُوَةِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ الْغَسَّانِيُّ: جُهَيْنَةُ وَغَامِدٌ وَبَارِقٌ وَاحِدٌ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو بەکرەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئافرەتێکی بەردباران کرد، چاڵێکیان بۆ هەڵکەند هەتا سەر سینگی بوو. ئەبو داود دەڵێت: غەسانی دەڵێت: جوهەینەو غامید و باریق هەر یەکێکن.

٤٤٤٤ - (ضعيف الإسناد) عن زكريا بن سليم, بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ, زَادَ: ثُمَّ رَمَاهَا بِحَصَاةٍ مِثْلَ الْحُمُّصَةِ, ثُمَّ قَالَ (ارْمُوا وَاتَّقُوا الْوَجْهَ). فَلَمَّا طَفِئَتْ, أَخْرَجَهَا, فَصَلَّى عَلَيْهَا, وَقَالَ فِي التَّوْبَةِ نَحْوَ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ.

واتە: لە زەکەریای کوڕی سولەیمەوە بە ئیسنادی خۆی و بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشو هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، لەپاشدا بە بەردی بچوکی وەك دەنکە نۆك بەردبارانیان کرد، لەپاشدا فەرمووی: (بەردبارانی بکەن بەڵام دەست بپارێزن لەدەم و چاوی واتە لە روخساری مەدەن، کاتێ کە گیانی دەرچوو، هێنایانەدەرەوە، نوێژی مردوی لەسەر کرد، دەربارەی تەوبەکەی وەك فەرمودەکەی بورەیدەی فەرموو واتە وەك فەرموودەکەی پێشو.

٤٤٤٥ - (صحيح) عن أبو هريرة و زيد بن خالد الجهني قالا: أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ أَحَدُهُمَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ. وَقَالَ الآخَرُ: وَكَانَ أَفْقَهَهُمَا أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ وَائْذَنْ لِي أَنْ أَتَكَلَّمَ. قَالَ: (تَكَلَّمْ). قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا - وَالْعَسِيفُ الأَجِيرُ - فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ, فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ, فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَبِجَارِيَةٍ لِي, ثُمَّ إِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ, فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ, وَإِنَّمَا الرَّجْمُ عَلَى امْرَأَتِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ, أَمَّا غَنَمُكَ وَجَارِيَتُكَ فَرَدٌّ إِلَيْكَ). وَجَلَدَ ابْنَهُ مِائَةً, وَغَرَّبَهُ عَامًا, وَأَمَرَ أُنَيْسًا الأَسْلَمِيَّ أَنْ يَأْتِيَ امْرَأَةَ الآخَرِ فَإِنِ اعْتَرَفَتْ رَجَمَهَا, فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: دوو پیاو سکاڵایان بردە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە قورئانەکەی خوا حوکم بکە لە نێوانماندا، ئەوی تریان کە تێگەیشتو تر بوو وتی: بەڵێ بە قورئانەکەی

خوا حوکم بکە لە نێوانمانداو ماوەم پێ بدە با قسەی خۆم بکەم، فەرمووی: (دەی قسە بکە). وتی: کوڕی من لەلای ئەمە ڕەنجبەر بووەو زینای لەگەڵ ژنەکەی کردوە، پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێ کوڕەکەی من بەردباران بکرێت، منیش سەد سەر مەڕ و کەنیزەکێکم دایە، بۆ ئەوەی کوڕەکەم بەردباران نەکرێت، لەپاشدا لە زاناکانم پرسی، وتیان: کوڕەکەی تۆ سەد شەلاقی لێ دەدرێت و ساڵێ دوردەخرێتەوە، ژنەکەی ئەویش بەردباران دەکرێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوێند بە (الله) بە قورئانەکەی خوا بڕیار دەدەم لەنێوانتاندا، سەد سەر مەڕ و کەنیزەکەکە ئەگەڕێنینەوە بۆ تۆ - کوڕەکەت سەد شەلاقی لێ دەدرێ و ساڵێ دوردەخرێتەوە - ). کوڕەکەی سەد شەلاقی لێ دراو، ساڵێ دورخرایەوە. فەرمانی دا بە ئونەیسی ئەسلەمی بڕوات بۆ لای ئافرەتەکە ئەگەر دانی پێدا نا زینای کردوە ئەوە بەردبارانی بکە، ئونەیس چو بۆ لای ئافرەتەکە دانی پێدا نا، ئەویش بەردبارانی کرد.

## سەبارەت بە بەردباران کردنی ژن و پیاوە جولەکەکە.

## ٢٦ - باب فِي رَجْمِ الْيَهُودِيَّيْنِ.

٤٤٤٦ - (صحيح) عن ابن عمر قال: إِنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا, فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الزِّنَا). فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ كَذَبْتُمْ إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ. فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا فَجَعَلَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ, ثُمَّ جَعَلَ يَقْرَأُ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا, فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ: ارْفَعْ يَدَكَ. فَرَفَعَهَا فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ, فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ. فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَا. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَحْنِى عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جولەکەکان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بۆیان باسکرد کە ژن و پیاوێکیان پێکەوە زینیان کردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموون: (لە تەواتدا باسی چی کراوە لەبارەی حوکمی زیناوە ئەگەر کەسەکە هاوسەرگیری کردبوو؟ یان ئەگەر کەسێ لەئێوە هاوسەرگیری بکات و زینا بکات بەپێی تەورات چی لێ دەکەن؟) وتیان: ئابڕوی دەبەین - بە خەڵوز دەم و چاوی ڕەش دەکەین و بەسواری گوێدرێژ دەیگێڕین - و شەلاقی لێ دەدەین، (عبد الله)ی کوڕی سەلام وتی: ئێوە درۆ دەکەن، تەوراتیان هێنا کردیانەوە یەکێ لەجولەکەکان دەستی خستە سەر ئایەتی بەردباران کردن، لەپاشدا پێش و پاشی ئایەتەکەی خوێندەوە، (عبد الله)ی کوڕی سەلام پێی وت: دەستت لابە دەستی لابرد ئایەتی بەردباران کردن دەرکەوت، جولەکەکان وتیان: ئەی موحەممەد (عبد الله)ی کوڕی سەلام ڕاست دەکات ئایەتی بەردباران کردنی تێدایە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بەردبارانیان کردن. (عبد الله)ی کوڕی عومەر وتی: بەچاوی خۆم بینیم پیاوەکە خۆی دەدایە بەر بەردەکان بۆ ئەوەی ژنەکە بپارێزێ و بەردەکانی بەر نەکەوێت.

٤٤٤٧ - (صحيح) عن براء بن عازب قال: مَرُّوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَهُودِيٍّ قَدْ حُمِّمَ وَجْهُهُ وَهُوَ يُطَافُ بِهِ, فَنَاشَدَهُمْ مَا حَدُّ الزَّانِي فِي كِتَابِهِمْ؟ قَالَ: فَأَحَالُوهُ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ, فَنَشَدَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا حَدُّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ؟). فَقَالَ: الرَّجْمُ وَلَكِنْ ظَهَرَ الزِّنَا فِي أَشْرَافِنَا فَكَرِهْنَا أَنْ يُتْرَكَ الشَّرِيفُ وَيُقَامَ عَلَى مَنْ دُونَهُ فَوَضَعْنَا هَذَا عَنَّا. فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَ, ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا مَا أَمَاتُوا مِنْ كِتَابِكَ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جولەکەکان بە خەڵوز دەم و چاوی جولەکەیەکیان ڕەش کردبوو بەسواری گوێدرێژ دەیانگێڕا، دایان بەلای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، پرسیاری لێ کردن و سوێندی دان کە حەدی زینا چیە لە تەوراتەکەتاندا؟ ڕاوی وتی: پرسیارەکەیان حەواڵە

کرد بۆ پیاوێ لە خۆیان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پرسیاری لێ کردو سوێندی دا: (کە حوکمی زینا چییە لە کتێبەکەتاندا کە تەوراتە؟) وتی: بەردباران کردنە، بەڵام زیناکردن لەناو وەجاخ زادەو گەورەکانمان و بنەماڵە بەرێزەکانماندا پەرەی سەندبوو ئێمەش پێمان خۆش نەبوو بەسەر ئەواندا جێبەجێی نەکەین و بەسەر هەژار و بێ دەسەڵاتەکاندا جێبەجێی بکەین بۆیە وازمان هێنا لەو حوکم و بڕیارەو کارمان پێ نەدەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بەردبارانیان کرد، لەپاشدا فەرمووی: (خودایە ئەوەی کە لە کتێبەکەی تۆدا وازیان لێ هێنابوو کاریان پێ نەدەکرد کە حوکم و بڕیاری بەردباران کردنە ئەوا من یەکەم کەسم زیندوم کردەوەو کارم پێ کرد).

## سەبارەت بە بەردباران کردنی ژن و پیاوە جولەکەکە.

٤٤٤٨ - (صحيح) عن براء بن عازب قال: مُرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَهُودِيٍّ مُحَمَّمٍ مَجْلُودٍ, فَدَعَاهُمْ فَقَالَ: (هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي؟). فَقَالُوا: نَعَمْ. فَدَعَا رَجُلاً مِنْ عُلَمَائِهِمْ قَالَ لَهُ: (نَشَدْتُكَ بِاللَّهِ الَّذِى أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ؟). فَقَالَ: اللَّهُمَّ لاَ وَلَوْلاَ أَنَّكَ نَشَدْتَنِي بِهَذَا لَمْ أُخْبِرْكَ, نَجِدُ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِنَا الرَّجْمَ وَلَكِنَّهُ كَثُرَ فِي أَشْرَافِنَا فَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الرَّجُلَ الشَّرِيفَ تَرَكْنَاهُ, وَإِذَا أَخَذْنَا الرَّجُلَ الضَّعِيفَ أَقَمْنَا عَلَيْهِ الْحَدَّ, فَقُلْنَا: تَعَالَوْا فَنَجْتَمِعَ عَلَى شَيْءٍ نُقِيمُهُ عَلَى الشَّرِيفِ وَالْوَضِيعِ فَاجْتَمَعْنَا عَلَى التَّحْمِيمِ وَالْجَلْدِ وَتَرَكْنَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ إِذْ أَمَاتُوهُ).فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ) إِلَى قَوْلِهِ ( يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ وَإِنْ لَمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا) إِلَى قَوْلِهِ (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) فِي الْيَهُودِ إِلَى قَوْلِهِ ( وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ

هُمُ الظَّالِمُونَ) فِي الْيَهُودِ إِلَى قَوْلِهِ (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) قَالَ: هِيَ فِي الْكُفَّارِ كُلُّهَا يَعْنِى هَذِهِ الآيَةَ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جولەکەکان بە خەڵوز دەم و چاوی جولەکەیەکیان رەش کردبوو بەسواری گوێدرێژ دەیانگێڕا، داری حەدیان لێ دابوو، دایان بەلای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، جولەکەکانی بانگی کردو فەرمووی: (حەدی زینا بەو شێوەیە لە تەوراتەکەتاندا). وتیان: بەڵێ، جا یەکێ لە زاناکانی جولەکەی بانگی کردو پێی فەرموو: (سوێندت دەدەم بەو (الله)یەی کە تەوراتی دابەزاندوە بۆ موسا حەدی زیناکردن بەو شێوەیە لە تەوراتەکەتاندا؟)، وتی: (اللَّهُمَّ) نەخێر، وە ئەگەر سوێندت نەدامایە بە خوا ئەوا پێم رانەدەگەیاندی، حەدی زیناکردن لە تەوراتەکەماندا بریتیە لە بەردبارانکردن، بەڵام زیناکردن لەناو وەجاخ زادەو گەورەکانمان و بنەماڵە بەرێزەکانماندا پەرەی سەندبوو، ئەگەر یەکێ لەوانە زینای بکردایە وازمان لێ دەهێناو حوکمەکەمان بەسەردا جێبەجێی نەدەکرد، بەڵام ئەگەر کەسێکی هەژار و بێ دەسەڵات زینای بکردایە ئەوا تۆڵەمان لێ دەسەندو حوکمەکەمان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، ئێمەش وتمان: وەرن با پێکەوە لەسەر شتێ کۆببینەوەو بەسەر هەردوو لادا جێبەجێی بکەین خاوەن دەسەڵات و بێ دەسەڵات، ئەویش بە خەڵوز دەم و چاو رەش کردن و شەلاق لێدان بوو، وازمان هێنا لە بەردباران کردن. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خودایە ئەوەی کە لە کتێبەکەی تۆدا وازیان لێ هێنابوو کاریان پێ نەدەکرد کە حوکم و بڕیاری بەردباران کردنە ئەوا من یەکەم کەسم زیندوم کردەوەو کارم پێ کرد). فەرمانی دا بەردبارانیان کرد، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتانەی دابەزاند:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ ﴾ سورة مائده: ٤١.

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم غەم بارت نەکات ئەوانەی کە پێشبڕکێ دەکەن لەبێ بڕوایی دا. هەتا دەگاتە:

﴿ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْ ﴾ سورة مائده: ٤١.

واتە: ئەڵێن ئەگەر ئەمە(ی ئێمە)تان پێ گوترا (لەلایەن موحەممەدەوە صلی

الله عليه وسلم ئەوە وەری گرن، ئەگەر لەئەمە(ی ئێمە)تان پێ نەگوترا ئەوا خۆتان بپارێزن. هەتا دەگاتە:

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ سورة مائدە: ٤٤.

واتە: وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێ باوەڕن و موسڵمان نین. دەربارەی جولەکە، هەتا دەگاتە:

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾ سورة مائدە: ٤٥.

واتە: وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە ئەوا هەر ئەو کەسانە ستەم کاری تەواون. دەربارەی جولەکە، هەتا دەگاتە:

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾ سورة مائدە: ٤٧.

واتە: وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بەتەواوی یاخین و لەفەرمانی خوا دەرچوون. جا راوی وتی: ئەم ئایەتە بۆ سەرجەم کافرانە.

٤٤٤٩ ـ (حسن) عن ابن عمر قال: أَتَى نَفَرٌ مِنْ يَهُودَ فَدَعَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْقُفِّ فَأَتَاهُمْ فِي بَيْتِ الْمِدْرَاسِ, فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّ رَجُلاً مِنَّا زَنَى بِامْرَأَةٍ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ, فَوَضَعُوا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وِسَادَةً فَجَلَسَ عَلَيْهَا, ثُمَّ قَالَ: (ائْتُونِي بِالتَّوْرَاةِ). فَأُتِيَ بِهَا, فَنَزَعَ الْوِسَادَةَ مِنْ تَحْتِهِ فَوَضَعَ التَّوْرَاةَ عَلَيْهَا, ثُمَّ قَالَ (آمَنْتُ بِكِ وَبِمَنْ أَنْزَلَكِ). ثُمَّ قَالَ (ائْتُونِي بِأَعْلَمِكُمْ). فَأُتِيَ بِفَتًى شَابٍّ, ثُمَّ ذَكَرَ قِصَّةَ الرَّجْمِ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكٍ عَنْ نَافِعٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: یەکێ لە جولەکەکان هات پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بانگ کرد بۆ قوف کە شیوێکە لە مەدینە، لە ماڵێکدا کۆبونەوە کە تیایدا دەیانخوێند، وتیان: ئەی باوکی قاسیم پیاوێ لە ئێمە زینای کردوە لەگەڵ ئافرەتێکدا، حوکم بکە لە نێوانیاندا، پشتیەکیان دانا بۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم، ئەویش لەسەری دانیشت، لەپاشدا فەرمووی: (تەوراتێکم بۆ بێنن).

بۆیان هێنا، پشتیەكەی لەژێر خۆی دەرهێناو تەوراتەكەی دانا لەسەری، لەپاشدا فەرمووی: (باوەڕم هەیە بە تۆ و بەوەش كە دایبەزاندوی). ئینجا فەرمووی: (زاناترین كەستانم بۆ بانگ بكەن). گەنجێكیان هێنا، جا راوی بەسەرهاتی بەردبارانكردنەكەی گێڕایەوە وەك فەرموودەكەی مالیك لە نافیعەوە واتە فەرموودەی پێشوتر.

٤٤٥٠ – (ضعيف) عن أبو هريرة - وَهَذَا حَدِيثُ مَعْمَرٍ وَهُوَ أَتَمُّ - قَالَ زَنَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ وَامْرَأَةٌ, فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: اذْهَبُوا بِنَا إِلَى هَذَا النَّبِيِّ, فَإِنَّهُ نَبِيٌّ بُعِثَ بِالتَّخْفِيفِ, فَإِنْ أَفْتَانَا بِفُتْيَا دُونَ الرَّجْمِ قَبِلْنَاهَا وَاحْتَجَجْنَا بِهَا عِنْدَ اللَّهِ, قُلْنَا فُتْيَا نَبِيٍّ مِنْ أَنْبِيَائِكَ. قَالَ: فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ فِي أَصْحَابِهِ, فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ مَا تَرَى فِي رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ زَنَيَا, فَلَمْ يُكَلِّمْهُمْ كَلِمَةً حَتَّى أَتَى بَيْتَ مِدْرَاسِهِمْ, فَقَامَ عَلَى الْبَابِ فَقَالَ: (أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ). قَالُوا يُحَمَّمُ وَيُجَبَّهُ وَيُجْلَدُ – وَالتَّجْبِيَةُ: أَنْ يُحْمَلَ الزَّانِيَانِ عَلَى حِمَارٍ وَتُقَابَلَ أَقْفِيَتُهُمَا وَيُطَافَ بِهِمَا – قَالَ: وَسَكَتَ شَابٌّ مِنْهُمْ فَلَمَّا رَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَكَتَ أَلَظَّ بِهِ النِّشْدَةَ, فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِذْ نَشَدْتَنَا فَإِنَّا نَجِدُ فِي التَّوْرَاةِ الرَّجْمَ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَمَا أَوَّلُ مَا ارْتَخَصْتُمْ أَمْرَ اللَّهِ). قَالَ: زَنَى ذُو قَرَابَةٍ مَعَ مَلِكٍ مِنْ مُلُوكِنَا فَأَخَّرَ عَنْهُ الرَّجْمَ, ثُمَّ زَنَى رَجُلٌ فِي أُسْرَةٍ مِنَ النَّاسِ, فَأَرَادَ رَجْمَهُ فَحَالَ قَوْمُهُ دُونَهُ, وَقَالُوا: لاَ يُرْجَمُ صَاحِبُنَا حَتَّى تَجِيءَ بِصَاحِبِكَ فَتَرْجُمَهُ فَاصْطَلَحُوا عَلَى هَذِهِ الْعُقُوبَةِ بَيْنَهُمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَإِنِّي أَحْكُمُ بِمَا فِي التَّوْرَاةِ). فَأَمَرَ بِهِمَا فَرُجِمَا. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَبَلَغَنَا أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِمْ (إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا). كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ژن و پیاوێكی جولەكە پێكەوە

زینایان كردبوو، هەندێكیان بە هەندێكی تریان وت: با بڕۆین بۆ لای ئەم پێغەمبەرە، چونكە نێردراوە بەوەی ئەحكامەكانی شەریعەتەكەی ئاسانكاری تێدایە - دەیانویست بەڵكو حوكمەكەی سوكتر بێت لە حوكمی ئەوان كە بەردبارانكردن بوو -، ئەگەر فەتوای بۆداین و بەردبارانكردن نەبوو ئەوە وەری دەگرین و دەیكەینە بەڵگە لەلای خوای گەورە، دەڵێین: ئەمە فەتوای یەكێكە لە پێغەمبەرەكانت ئێمە كارمان پێ كرد، راوی وتی: هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوكاتەدا لەمزگەوت لەناو هاوەڵەكانیدا دانیشتبو، دەربارەی ژن و پیاوێ كە زینا بكەن پرسیاریان لێ كرد، وتیان: ئەی باوكی قاسیم بڕیاری تۆ چۆنە لەبارەیانەوە، ئەویش تەنانەت بە یەك وشە وەڵامی نەدانەوە هەتا گەیشتە ئەو ماڵەی كە تیایدا دەیانخوێند، لەبەردەم دەرگا راوەستا فەرمووی: (سوێندتان دەدەم بەو (الله)یەی كە تەوراتی دابەزاندوە بۆ موسا حوكمی زیناكردن بۆ كەسێ كە هاوسەرگیری كردبێ چییە؟) وتیان: بە خەڵوز دەم و چاوی رەش دەكرێ و سواری گوێدرێژ دەكرێ رووی بۆ دواوەی گوێدرێژەكە وەردەگێڕرێ - ئەگەر دوان بوون پێكەوە سواری گوێدرێژ دەكرێن پشتیان بە پشتی یەكەوە دەبێ و وەردەگێڕرێن - جا شەلاقی لێ دەدرێ، گەنجەكە كە لە جولەكەكان بوو بێدەنگ بوو. كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینی گەنجەكە بێدەنگ بوو ئیلحاحی لێ كرد سوێندی دا كە بەڕاستی وەڵامی بداتەوە، وتی: (اللَّهُمَّ) مادەم سوێندت داین حوكمی تەوارت بریتیە لە بەردبارانكردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هۆكاری یەكەم چی بوو وازتان لە فەرمانی خوای گەورە هێناو ئەمەی ئێستاتان هەڵبژارد كە بریتیە لە بە خەڵوز دەم و چاو رەش كردن و بە سواری گوێدرێژ گێڕان و شەلاق لێ دان؟)، وتی: كەسێكی نزیك لە فەرمانڕەوا زینای دەكرد بەردبارانیان نەدەكرد، بەردبارانەكەیان دواخست لەبەرئەوەی نزیك بوو لە فەرمانڕەواوە، لەپاشدا پیاوێ زینای دەكرد لە هۆزێكی خاوەن دەسەڵات، فەرمانڕەوا دەویست بەردبارانی بكات، هۆزەكەی رێگریان لێ دەكرد كە بەردبارانی بكات دەیانوت: نابێ بەردبارانی بكەی هەتا تۆش كەسەكەی نزیكی خۆت نەهێنی بەردبارانی بكەی، جا هەردوو لایەن رێككەوتن لەسەر ئەم سزایەی ئێستا.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی من بەوە حوکم دەکەم کە لە تەوراتدا هەیە کە بەردبارانکردنە)، جا فەرمانی دا بەردبارانیان کردن - حوکمی بەسەردا دان بەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوە، کە ڕێك وەك حوکمی تەوراتە - زوهری وتی: پێمان گەیشتوە کە ئەم ئایەتە لەوبارەوە دابەزیوە:

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ ﴾ سورة المائدە: ٤٤.

واتە: بێگومان ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە کەڕێنموونی و ڕووناکی تێدا بوو، ئەو پێغەمبەرانە حوکمیان پێ دەکرد کە موسوڵمان و ملکەچ بوون، بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون.

بێگومان پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم یەکێ بوو لەو پێغەمبەرانە.

٤٤٥١ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: زَنَى رَجُلٌ وَامْرَأَةٌ مِنَ الْيَهُودِ وَقَدْ أُحْصِنَا, حِينَ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ, وَقَدْ كَانَ الرَّجْمُ مَكْتُوبًا عَلَيْهِمْ فِي التَّوْرَاةِ, فَتَرَكُوهُ وَأَخَذُوا بِالتَّجْبِيَةِ: يُضْرَبُ مِائَةً بِحَبْلٍ مَطْلِيٍّ بِقَارٍ, وَيُحْمَلُ عَلَى حِمَارٍ وَجْهُهُ مِمَّا يَلِي دُبُرَ الْحِمَارِ, فَاجْتَمَعَ أَحْبَارٌ مِنْ أَحْبَارِهِمْ فَبَعَثُوا قَوْمًا آخَرِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: سَلُوهُ عَنْ حَدِّ الزَّانِي. وَسَاقَ الْحَدِيثَ قَالَ فِيهِ: قَالَ: وَلَمْ يَكُونُوا مِنْ أَهْلِ دِينِهِ فَيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ فَخُيِّرَ فِي ذَلِكَ, قَالَ: (فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە شاری مەدینە، ژن و پیاوێکی جولەکە پێکەوە زینایان کردبوو هاوسەرگیریان کردبوو، حوکمی بەردبارانکردن نوسرابوو لەسەریان لە تەوراتدا، بەڵام ئەوان وازیان لێ هێنابوو، بۆ خۆیان دەستیان بەمەوە گرتبوو: کەسێ زینای بکردایە سەد شەلاقیان لێ دەدا بە حەبلێ کە ڕوپۆشەکەی لە قیر و زەفت بوو، جا سواری گوێدرێژێکیان دەکرد ڕوی لەدواوەی کەرەکەوە دەبوو، کۆمەڵێ لە زاناکانیان کۆبونەوە خەڵکانێکی تریان نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری

خوا صلى الله عليه وسلم، وتیان: دەربارەی حەدی زیناکار پرسیاری لێ بکەن. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، لە فەرموودەکەیدا وتی: جولەکەکان لەسەر دینی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەبوون، هەتا پێویست بێ لەسەری حوکم و بڕیار بدات لە نێوانیاندا، بەڵام خوای گەورە ئەوی سەرپشك کرد کە حوکم و بڕیار بدات لەنێوانیاندا یان وازیان لێ بهێنێ، فەرمووی:

﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ سورة المائدة: ٤٢.

واتە: جا ئەگەر ئەوانە هاتن بۆلات ئەوە (بەویستی خۆت) بڕیار بدە لە نێوانیاندا، یان وازیان لێ بهێنە.

٤٤٥٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: جَاءَتِ الْيَهُودُ بِرَجُلٍ وَامْرَأَةٍ مِنْهُمْ زَنَيَا, فَقَالَ: ائْتُونِي بِأَعْلَمِ رَجُلَيْنِ مِنْكُمْ, فَأَتَوْهُ بِابْنَيْ صُورِيَا فَنَشَدَهُمَا: (كَيْفَ تَجِدَانِ أَمْرَ هَذَيْنِ فِي التَّوْرَاةِ). قَالاَ: نَجِدُ فِي التَّوْرَاةِ إِذَا شَهِدَ أَرْبَعَةٌ أَنَّهُمْ رَأَوْا ذَكَرَهُ فِي فَرْجِهَا مِثْلَ الْمِيلِ فِي الْمُكْحُلَةِ رُجِمَا. قَالَ: (فَمَا يَمْنَعُكُمَا أَنْ تَرْجُمُوهُمَا؟). قَالاَ: ذَهَبَ سُلْطَانُنَا فَكَرِهْنَا الْقَتْلَ, فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالشُّهُودِ, فَجَاءُوا بِأَرْبَعَةٍ فَشَهِدُوا أَنَّهُمْ رَأَوْا ذَكَرَهُ فِي فَرْجِهَا مِثْلَ الْمِيلِ فِي الْمُكْحُلَةِ, فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَجْمِهِمَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جولەکە هاتن ژن و پیاوێکیان لەتەك خۆیان هێنابوو زینایان کردبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (دوو کەس لە زاناترین کەستانم بۆ بهێنن). ئەوانیش دوو کوڕی صوریيایان هێنا بۆ لای سوێندی دان بەخوای گەورەو لێی پرسین: (کە حوکم و بڕیاری تەورات چی یە لەبارەی ئەم دوانەوە؟)، وتیان: لە تەوراتدا هاتوە ئەگەر چوار کەس شایەتیان دا کە هێنەکەیان لە هێنەکەیدا بینیوە وەك میلی کل لەناو کلداندا ئەوە دەبێ بەردباران بکرێن، فەرمووی: (ئەی چی ڕێگری لێ کردن بەردبارانیان نەکەن؟)، وتیان: دەترساین دەسەڵات و دەوڵەتەکەمان لەناو بچێ لە نەوەی فەرمانڕەواکانمان کەم بێتەوە بۆیە کوشتنمان پێ ناخۆش بوو،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای شایەتی کرد، چوار شایەتیان هێنا شایەتیان دا کە هینەکەیان بینیوە لە هینەکەیدا وەك میلی کل لەناو کلداندا، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە بەردباران کردنیان.

٤٤٥٣ - (صحيح بما قبله) عن ابرهيم والشعبي, عن النبي صلى الله عليه وسلم نحوه. لَمْ يَذْكُرْ: فَدَعَا بِالشُّهُودِ فَشَهِدُوا.

واتە: لە ئیبراهیم و شەعبیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە. بەڵام باسی ئەمەی نەکرد: داوای چوار شایەتی کرد، شایەتەکان هاتن و شایەتیان دا.

٤٤٥٤ - عن ابن شبرمة, عن الشعبي بنحو منه.

واتە: لە ئیبنو شوبرومەوە، لە شەعبیشەوە، فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە.

٤٤٥٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: رَجَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ وَامْرَأَةً زَنَيَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ژن و پیاوێکی جولەکەی بەردباران کرد کە پێکەوە زینایان کردبوو.

# سەبارەت بە پیاوێ زینا بکات لەتەك یەکێ لەو ئافرەتانەی کە هەتا هەتایە حەرامە لەسەری مارەی بکات.

## ٢٧ - باب فِي الرَّجُلِ يَزْنِي بِحَرِيمِهِ.

٤٤٥٦ - (صحيح) عن براء بن عازب قال: بَيْنَا أَنَا أَطُوفُ عَلَى إِبِلٍ لِي ضَلَّتْ, إِذْ أَقْبَلَ رَكْبٌ أَوْ فَوَارِسُ مَعَهُمْ لِوَاءٌ, فَجَعَلَ الأَعْرَابُ يُطِيفُونَ بِي لِمَنْزِلَتِي مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, إِذْ أَتَوْا قُبَّةً فَاسْتَخْرَجُوا مِنْهَا رَجُلاً فَضَرَبُوا عُنُقَهُ, فَسَأَلْتُ عَنْهُ, فَذَكَرُوا أَنَّهُ أَعْرَسَ بِامْرَأَةِ أَبِيهِ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ وشترێکم ون بوو بۆی دەگەڕام، گەیشتم بە کۆمەڵێ سوارە ئاڵایەکیان پێ بوو، عەرەبە دەشتەکیەکان پەیوەندیان پێوە کردم و لەدەورم کۆبوونەوە لەبەر نزیکی پلەو پایەم لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، سوارەکان هاتن هەتا گەیشتنە لای قوبەیە بینایەکی بازنەیی پیاوێکیان تیا هێنایەدەرەوەو دایان لەملی، پرسیارم لێ کردن دەربارەی کوشتنی ئەو پیاوە، باسیان کرد کە ئەو پیاوە ژنی باوکی مارەکردووەو هێناویەتی کە دەکاتە زڕ دایکی خۆی.

٤٤٥٧ - (صحيح) عن يزيد بن البراء, عن أبيه قال: لَقِيتُ عَمِّي وَمَعَهُ رَايَةٌ, فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةَ أَبِيهِ, فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ, وَآخُذَ مَالَهُ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی بەرائەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گەیشتم بە مامم ئاڵایەکی پێ بوو، پێم وت: بۆ کوێ؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله

علیه وسلم منی ناردووه له ملی پیاوێ بدەم و ماڵەکەی وەرگرم، که لەدوای باوکی ژنەکەی باوکی ماره کردوەو هێناویەتی که دەکاته زڕ دایکی خۆی.

## سەبارەت بە پیاوێ زینا بکات لەگەڵ کەنیزەکی ژنەکەی خۆی

## ٢٨ - باب فِي الرَّجُلِ يَزْنِي بِجَارِيَةِ امْرَأَتِهِ.

٤٤٥٨ - (ضعيف) عن حبيب بن سالم: أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حُنَيْنٍ وَقَعَ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ, فَرُفِعَ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْكُوفَةِ, فَقَالَ: لأَقْضِيَنَّ فِيكَ بِقَضِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَكَ جَلَدْتُكَ مِائَةً, وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَكَ رَجَمْتُكَ بِالْحِجَارَةِ. فَوَجَدُوهُ قَدْ أَحَلَّتْهَا لَهُ, فَجَلَدَهُ مِائَةً . قَالَ قَتَادَةُ: كَتَبْتُ إِلَى حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ, فَكَتَبَ إِلَيَّ بِهَذَا.

واته: لە حەبیبی کوڕی سالمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ کە ناوی (عبد الرحمن)ی کوڕی حونەین بوو زینای لەتەك کەنیزەکی ژنەکەی خۆی کردبوو- کەنیزەکەکە شوی کردبوو -، ئەو کاتە نوعمانی کوڕی بەشیر کاربەدەستی کوفە بوو کێشەکەیان بردە لای، نوعمان وتی: بەحوکم و بڕیاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیارت بۆ دەدەم، ئەگەر ژنەکەت بۆتی حەڵاڵ کردبێ و مۆڵەتی پێ دابی ئەوا سەد دارت لێ دەدەم، بەڵام ئەگەر ژنەکەت بۆتی حەڵاڵ نەکردبێ و مۆڵەتی پێ نەدابی ئەوا بەردبارانت دەکەم. جا کە بۆیان دەرکەوت کە ژنەکەی بۆی حەڵاڵ کردوەو مۆڵەتی پێ داوە، سەد داری لێ دا. قەتادە وتی: کاتێ کە راوی فەرموودەکە خالید ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە نامەم نوسی بۆ حەبیبی کوڕی سالم ئەویش وەڵامی نامەکەی دامەوە ئەم فەرموودەی بۆ نوسیمەوە.

٤٤٥٩ - (ضعيف) عن النعمان بن بشير, عن النبي صلى الله عليه وسلم, فِي الرَّجُلِ يَأْتِي جَارِيَةَ امْرَأَتِهِ, قَالَ: (إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ جُلِدَ مِائَةً, وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَهُ رَجَمْتُهُ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، دەربارەی پیاوێ زینا بکات لەگەڵ کەنیزەکی ژنەکەی خۆیدا هاتوە، کە فەرموویەتی: (ئەگەر ژنەکەت بۆتی حەڵاڵ کردبێ و مۆڵەتی پێ دابی ئەوا سەد دارت لێ دەدەم، بەڵام ئەگەر ژنەکەت بۆتی حەڵاڵ نەکردبێ و مۆڵەتی پێ نەدابی ئەوا بەردبارانت دەکەم).

٤٤٦٠ - (ضعيف) عن سلمة بن المحبق: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي رَجُلٍ وَقَعَ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ: إِنْ كَانَ اسْتَكْرَهَهَا فَهِيَ حُرَّةٌ, وَعَلَيْهِ لِسَيِّدَتِهَا مِثْلُهَا, فَإِنْ كَانَتْ طَاوَعَتْهُ فَهِيَ لَهُ, وَعَلَيْهِ لِسَيِّدَتِهَا مِثْلُهَا.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی موحەببەقەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی پیاوێ زینا بکات لەگەڵ کەنیزەکی ژنەکەی خۆیدا بەم شێوەیە حوکم و بڕیاری دا: ئەگەر بەزۆر سواری بوبێ ئەوە کەنیزەکەکە ئازادەو، دەبێ کەنیزەکێکی لەو جۆرە بۆ گەورەی کەنیزەکەکە بکڕێ واتە بۆ ژنەکەی خۆی، بەڵام ئەگەر بە خۆشی خۆی بوبێت ئەوە دەبێتە موڵکی خۆی و، دەبێت کەنیزەکێکی لەو جۆرە بکڕێ بۆ ژنەکەی خۆی.

٤٤٦١ - (ضعيف) عن سلمة بن المحبق, عن النبي صلى الله عليه وسلم, نَحْوَهُ. إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: وَإِنْ كَانَتْ طَاوَعَتْهُ فَهِيَ حُرَّةٌ, وَمِثْلُهَا مِنْ مَالِهِ لِسَيِّدَتِهَا.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی موحەببەقەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، تەنها ئەوەندە نەبێ وتی: ئەگەر بەزۆر سواری بوبێ ئەوە کەنیزەکەکە ئازادەو، دەبێ کەنیزەکێکی لەو جۆرە بە پارەی خۆی بکڕێ بۆ ژنەکەی خۆی.

## باسی ئەوانەی کاری گەلی (لوط) دەکەن.

## ٢٩ - باب فِيمَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ.

٤٤٦٢ - (حسن صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دیتان کەسێك کاری گەلی (لوط) دەکات واتە بە پاش سواری یەکێ بووە بکەر و بدەر هەردوکیان بکوژن).

٤٤٦٣ - (صحيح الإسنادِ موقوف) عن ابن عباس, فِي الْبِكْرِ يُوجَدُ عَلَى اللُّوطِيَّةِ, قَالَ: يُرْجَمُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، پرسیار کرا ئیبنو عەباس سەبارەت بە کەسێ ژنی نەهێنابێ و کاری گەلی (لوط) بکات واتە هەتیوبازی حوکمی چیە؟ وتی: حوکمەکەی بەردبارانکردنە.

## باسی کەسێك بچێتە لای ئاژەڵێ.

## ٣٠ - باب فِيمَنْ أَتَى بَهِيمَةً.

٤٤٦٤ - عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَتَى بَهِيمَةً فَاقْتُلُوهُ وَاقْتُلُوهَا مَعَهُ). قَالَ: قُلْتُ لَهُ: مَا شَأْنُ الْبَهِيمَةِ؟ قَالَ: مَا أُرَاهُ إِلاَّ قَالَ ذَلِكَ أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يُؤْكَلَ لَحْمُهَا وَقَدْ عُمِلَ بِهَا ذَلِكَ الْعَمَلُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَيْسَ هَذَا بِالْقَوِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك بچێتە لای ئاژەڵێك، خۆی بکوژن و ئاژەڵەکەیش لەگەڵیا بکوژن). راوی وتی: بە ئیبنو عەباسم وت: کوشتنی ئاژەڵەکە لەبەرچی، وتی: وا ئەزانم بۆیە وای فەرموو چونکە حەز ناکات گۆشتی بخورێ لەبەر ئەنجامدانی ئەو کارە ناشیرینە لەگەڵیا، ئەبو دواد دەڵێت: ئەمە بەهێز نیە.

٤٤٦٥ - عن ابن عباس قال: لَيْسَ عَلَى الَّذِى يَأْتِى الْبَهِيمَةَ حَدٌّ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا قَالَ عَطَاءٌ, وَقَالَ الْحَكَمُ: أَرَى أَنْ يُجْلَدَ وَلاَ يَبْلُغَ بِهِ الْحَدَّ. وَقَالَ الْحَسَنُ: هُوَ بِمَنْزِلَةِ الزَّانِى. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حَدِيثُ عَاصِمٍ يُضَعِّفُ حَدِيثَ عَمْرِو بْنِ أَبِى عَمْرٍو.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: حەد لەسەر کەسێ نیە بڕواتە لای ئاژەڵێ واتە لەتەکی جوت بێت. وا ئەزانم داری حەدی لێ دەدرێ، حەسەن وتی: ئەمە وەك پلەی زینا وایە.

# ئەگەر پیاو دانی نا بەوەدا کە زینای کردوە بەڵام ئافرەتەکە دانی پیا نەنا.

## ٣١ - باب إِذَا أَقَرَّ الرَّجُلُ بِالزِّنَا وَلَمْ تُقِرَّ الْمَرْأَةُ.

٤٤٦٦ - (صحيح) عن سهل بن سعد, عن النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَأَقَرَّ عِنْدَهُ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ سَمَّاهَا لَهُ, فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَرْأَةِ فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ, فَأَنْكَرَتْ أَنْ تَكُونَ زَنَتْ, فَجَلَدَهُ الْحَدَّ وَتَرَكَهَا.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتوە، کە پیاوێ هاتوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دانی پێدا نا کە لەگەڵ ئافرەتێ زینای کردوە، ناوی ئافرەتەکەی هێنا بۆی، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەسێکی نارد بۆ لای ئافرەتەکە پرسیاری لێ بکات لەوبارەوە، ئافرەتەکە نکولی کردو نەچوە ژێری کە زینای کردبێت، داری حەدی دا لە پیاوەکەو، وازی لە ژنەکە هێنا چونکە نکولی کردو دانی پێدا نەنا.

٤٤٦٧ - (منكر) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَكْرِ بْنِ لَيْثٍ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَقَرَّ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ فَجَلَدَهُ مِائَةً وَكَانَ بِكْرًا, ثُمَّ سَأَلَهُ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمَرْأَةِ, فَقَالَتْ: كَذَبَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ, فَجَلَدَهُ حَدَّ الْفِرْيَةِ ثَمَانِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ لە هۆزی بەکری کوڕی (لیث) هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چوار جار دانی پێدا نا کە لەگەڵ ئافرەتێ زینای کردوە، سەد داری لێ دا ژنی نەهێنا بوو، لەپاشدا داوای بەڵگەی لێ کرد لەسەر ژنەکە کە زینای کردبێت بەڵگەی پێ نەبوو. ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوێند

بە (الله) درۆدەکات، جا هەشتا شەلاقی تری لێ دا لەباتی ئەوەی بوختانی بۆ کرد.

## دەربارەی پیاوێ لەتەك ئافرەتێك یاری و دەستبازی بکا بەڵام زینای لەتەك نەکات، پێش ئەوەی بیهێنن بۆ لای پێشەوا تەوبە بکات.

## ٣٢ - باب فِي الرَّجُلِ يُصِيبُ مِنَ الْمَرْأَةِ دُونَ الْجِمَاعِ، فَيَتُوبُ قَبْلَ أَنْ يَأْخُذَهُ الإِمَامُ.

٤٤٦٨ - (حسن صحيح) عن عبد الله قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ، فَأَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا، فَأَنَا هَذَا فَأَقِمْ عَلَيَّ مَا شِئْتَ. فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ سَتَرَ اللَّهُ عَلَيْكَ لَوْ سَتَرْتَ عَلَى نَفْسِكَ. فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ، فَأَتْبَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً، فَدَعَاهُ، فَتَلاَ عَلَيْهِ: (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَهُ خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ كَافَّةً؟ فَقَالَ: (بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً).

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: لەوبەری مەدینەوە یاری و دەستبازیم لەتەك ئافرەتێکدا کردووە بەڵام لەگەڵی جوت نەبووم، فەرموو ئەوە من ئامادەم و ملکەچم بۆ حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەر بەویستی خۆت حەدم بەسەردا جێبەجێ بکە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: خوای گەورە بۆی دەپۆشیت ئەگەر خۆت ئەو نهێنیەت بپۆشیایە ئەوەش چاکتر بوو بۆت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەڵامی نەدایەوە، پیاوەکە ڕۆشت، پێغەمبەر صلی الله

علیه وسلم پیاوێکی نارد بەدوایا، بانگی کردو، ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە:
﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ سورة الهود: ١١٤.

واتە: هەستە بە ئەرکی راگرتنی نوێژ لەهەر دوو سەری رۆژەوەو لە بەشێك لە شەویشدا، بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە ناپەسەندەکانتان لادەبەن و دەبنە کەفارەت و شۆردنەوەی گوناهەکانتان، ئەوە ئامۆژگاری و بیر خەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیکرو یادی خوا دەکەن.
پیاوێ لە ئامادەبون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم ئایەتە تایبەتە بەمەوە یان بۆ سەرجەم خەڵکە؟ فەرمووی: (بۆ هەموو خەڵکە بە گشتی).

## دەربارەی کەنیزەکێ
## زینا بکات و شوی نەکردبێ.
## ٣٣ - بَاب فِي الأَمَةِ تَزْنِي وَلَمْ تُحْصَنْ.

٤٤٦٩ - (صحيح) عن أبو هريرة وزيد بن خالد الجهني: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ وَلَمْ تُحْصَنْ؟ قَالَ: (إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا, ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا, ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا, ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَبِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: لاَ أَدْرِي فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ, وَالضَّفِيرُ: الْحَبْلُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە دەگێرنەوە، کە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەربارەی کەنیزەکێ شوی نەکردبێ و زینا بکات؟ فەرمووی: (ئەگەر زینای کرد داری حەدی لێ بدەن، لەپاشدا ئەگەر زینای کرد داری حەدی لێ بدەن، لەپاشدا ئەگەر زینای کرد

داری حەدی لێ بدەن، لەپاشدا زینای کرد ئەگەر فرۆشتویەتی بە پەتێ با بیفرۆشێ). ئیبنو شیهاب وتی: جا نازانم لەدوای سێیەم جار یان چوارەم جار فەرمووی: داری لێ بدەن و بیفرۆشن با بە پەتێکیش بێ، (الضَّفِيرِ) واتە: (حەبل)پەت.

٤٤٧٠ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا زَنَتْ أَمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيَحُدَّهَا وَلاَ يُعَيِّرْهَا, ثَلاَثَ مِرَارٍ, فَإِنْ عَادَتْ فِي الرَّابِعَةِ فَلْيَجْلِدْهَا وَلْيَبِعْهَا بِضَفِيرٍ, أَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعْرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتوە، كە فەرموویەتی: (ئەگەر كەنیزەكی یەكێكتان زینای كرد حەدی شەرعی خۆی بەسەردا جێبەجێ بكات و لۆمەو سەرزەنشتی نەكات، سێ جار ئەمەی فەرموو، ئەگەر بۆ چوارەم جار دووبارەی كردەوە داری حەدی لێ بدەن و، ئەگەر فرۆشتویەتی بە پەتێ یان بە پەتێكی موو با بیفرۆشێ).

٤٤٧١ - (صحيح بما قبله) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا الْحَدِيثِ قَالَ فِي كُلِّ مَرَّةٍ: (فَلْيَضْرِبْهَا كِتَابُ اللَّهِ وَلاَ يُثَرِّبْ عَلَيْهَا). وَقَالَ فِي الرَّابِعَةِ: (فَإِنْ عَادَتْ فَلْيَضْرِبْهَا كِتَابُ اللَّهِ, ثُمَّ لْيَبِعْهَا وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعْرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، فەرموودەی پێشو هاتوە، هەموو جارێ دەیفەرموو: (حوكم و بڕیاری قورئانەكەی خوای گەورەی بەسەردا جێبەجێ بكات و لۆمەو سەرزەنشتی نەكات). چوارەم جار فەرمووی: (ئەگەر دووبارەی كردەوە حوكم و بڕیاری قورئانەكەی خوای گەورەی بەسەردا جێبەجێ بكات، لەپاشدا ئەگەر فرۆشتویەتی بە پەتێكی موو با بیفرۆشێ).

## دەربارەی جێبەجێ كردنی حەد بەسەر نەخۆشدا.

## ٣٤ - باب فِي إِقَامَةِ الْحَدِّ عَلَى الْمَرِيضِ.

٤٤٧٢ - (صحيح) عن أبو أمامة بن سهل بن حنيف, عن بعض أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم من الأنصار: أَنَّهُ اشْتَكَى رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتَّى أُضْنِيَ فَعَادَ جِلْدَةً عَلَى عَظْمٍ, فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ جَارِيَةٌ لِبَعْضِهِمْ, فَهَشَّ لَهَا فَوَقَعَ عَلَيْهَا, فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ رِجَالُ قَوْمِهِ يَعُودُونَهُ أَخْبَرَهُمْ بِذَلِكَ, وَقَالَ: اسْتَفْتُوا لِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَإِنِّي قَدْ وَقَعْتُ عَلَى جَارِيَةٍ دَخَلَتْ عَلَيَّ. فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَقَالُوا: مَا رَأَيْنَا بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ مِنَ الضُّرِّ مِثْلَ الَّذِي هُوَ بِهِ, لَوْ حَمَلْنَاهُ إِلَيْكَ لَتَفَسَّخَتْ عِظَامُهُ مَا هُوَ إِلاَّ جِلْدٌ عَلَى عَظْمٍ, فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْخُذُوا لَهُ مِائَةَ شِمْرَاخٍ فَيَضْرِبُوهُ بِهَا ضَرْبَةً وَاحِدَةً.

واتە: لە ئەبو ئومامەی كوڕی سەهلی كوڕی حونەیفەوە، لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لە ئەنصار دەگێڕنەوە، كە پیاوێكیان نەخۆشكەوت نەخۆشیەكەی تینی بۆ هێنا حاڵی زۆر خراپ بوو گۆشتی پێوە نەمابوو پێستی لكابو بە ئێسكەكانیەوە، كەنیزەكێ چوەژوورەوە بۆ لای، دڵی پێی خۆش بوو گەشایەوە زینای لەگەڵ كرد، كۆمەڵێ لە خزمەكانی سەردانیان كرد بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕانەوە، وتی: لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بپرسن بۆم كە كەنیزەكێ هاتۆتەژورەوە بۆلام و زینام لەتەك كردوە، ئەوانیش بەسەرهاتەكەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتیان: پێ نازانین هیچ كەسێ تووشی نەخۆشی ئەوەندە خراپ بوویێت، ئەگەر بیهێنین بۆ خزمەتت ئێسكەكانی دەشكێت، لە پێستێ بەسەر ئێسكەوە زیاتر هیچی تر نیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا سەد لاسكی بەیەك جار لێ بدەن.

٤٤٧٣ - (صحيح) عن علي رضى الله عنه قال: فَجَرَتْ جَارِيَةٌ لآلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (يَا عَلِيُّ, انْطَلِقْ فَأَقِمْ عَلَيْهَا الْحَدَّ). فَانْطَلَقْتُ فَإِذَا بِهَا دَمٌ يَسِيلُ لَمْ يَنْقَطِعْ, فَأَتَيْتُهُ, فَقَالَ: (يَا عَلِيُّ أَفَرَغْتَ؟). قُلْتُ: أَتَيْتُهَا وَدَمُهَا يَسِيلُ.

فَقَالَ: (دَعْهَا حَتَّى يَنْقَطِعَ دَمُهَا, ثُمَّ أَقِمْ عَلَيْهَا الْحَدَّ وَأَقِيمُوا الْحُدُودَ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ أَبُو الأَحْوَصِ عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى, وَرَوَاهُ شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى, فَقَالَ فِيهِ: (لاَ تَضْرِبْهَا حَتَّى تَضَعَ). وَالأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە کەنیزەکی یەکێ لە کەسوکاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زینای کرد، فەرمووی: (ئەی عەلی برۆ حەدی بەسەردا جێبەجێ بکە). رۆشتم، دەبینم خوێنی لەبەر دەڕوات و ناگرسێتەوە، هێنام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەلی لێ بویتەوە لە حەد جێبەجێ کردنەکە؟). وتم: هێناومە بەڵام خوێنی زەیسانی لەبەر دەڕوات، فەرمووی: (وازی لێ بێنە هەتا خوێنەکەی دەگیرسێتەوەو نامێنێ، لەپاشدا حەدی بەسەردا جێبەجێ بکە، حەد جێبەجێ بکەن بەسەر ئەو کەنیزەکانەی کە بونەتە موڵکتان). ئەبو داود دەڵێت: هەروەها ئەبو ئەحوەص لە (عَبْدِ الأَعْلى)وە ریوایەتی کردوە، وە شوعبە لە (عَبْدِ الأَعْلى)وە ریوایەتی کردوە، لەفەرمودەکەیدا وتی: (لێی مەدە هەتا کۆتایی دێت). یەکەم صەحیح ترە.

## سەبارە بە حەدی بوختان.

## ٣٥ - باب فِي حَدِّ الْقَذْفِ.

٤٤٧٤ – (حسن) عن عائشة رضي الله عنها قالت: لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ ذَاكَ وَتَلاَ - تَعْنِي الْقُرْآنَ - فَلَمَّا نَزَلَ مِنَ الْمِنْبَرِ أَمَرَ بِالرَّجُلَيْنِ وَالْمَرْأَةِ فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە بەهانەکەم هاتەخوارەوە ئەو ئایەتانەی باسی داوێن پاکی منیان تێدایە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەستا چوە سەر دوانگە(مینبەر) باسی کردو ئایەتەکانی قورئانی خوێندەوە، کاتێ کە لەسەر دوانگە(مینبەر) دابەزی فەرمانی دا دوو پیاو و ژنەکەیان دارکاری کرد کە بوختانیان بۆ کردبوو.

٤٤٧٥ – (حسن بما قبله) عن محمد بن إسحاق, بِهَذَا الْحَدِيثِ, لَمْ يَذْكُرْ عَائِشَةَ قَالَ: فَأَمَرَ بِرَجُلَيْنِ وَامْرَأَةٍ مِمَّنْ تَكَلَّمَ بِالْفَاحِشَةِ حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ وَمِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ. قَالَ النُّفَيْلِيُّ: وَيَقُولُونَ الْمَرْأَةُ حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام باسی عائیشەی نەکرد، وتی: فەرمانی دا دوو پیاو و ژنەکەیان دارکاری کرد کە بوختانیان بۆ کردبوو ئەوانیش: حەسانی کوڕی (ثَابِت) و (مِسْطَح)ی کوڕی (أُثَاثَة)و حەمنە بوون. نوفەیلی دەڵێ: دەڵێن ژنەکە حەمنەی کچی جەحش بوو.

## دەربارەی حەدی ئارەق خواردنەوە.

## ٣٦ - باب الْحَدِّ فِي الْخَمْرِ.

٤٤٧٦ - (ضعيف) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَقِتْ فِي الْخَمْرِ حَدًّا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: شَرِبَ رَجُلٌ فَسَكِرَ فَلُقِيَ يَمِيلُ فِي الْفَجِّ, فَانْطُلِقَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا حَاذَى بِدَارِ الْعَبَّاسِ انْفَلَتَ فَدَخَلَ عَلَى الْعَبَّاسِ فَالْتَزَمَهُ, فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَضَحِكَ وَقَالَ: (أَفَعَلَهَا). وَلَمْ يَأْمُرْ فِيهِ بِشَيْءٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەدی خواردنەوەی ئارەقی دیاری نەکردبو. ئیبنو عەباس وتی: پیاوێ ئارەقی خواردبووەو سەرخۆش بوو لەڕێگا کە دەگەیشت بە خەڵك بەم لاو بەلادا دەهات، بردیان بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە گەیشتە بەرامبەر ماڵی عەباس خۆی دەرباز کرد لەدەستیان و چوە ماڵی عەباسەوە، عەباسی گوشی بەخۆیەوەو لەوێ خۆی پەنادا بۆ ئەوەی تکای بۆ بکات حەدی لێ نەدرێت، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم باسکرد پێکەنی و فەرمووی: (ئەو کارەی کرد؟) فەرمانی بە هیچ پێ نەکرد.

٤٤٧٧ - (صحيح) عن أبو هريرة, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ, فَقَالَ: (اضْرِبُوهُ). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ, وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ, وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ, فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللَّهُ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَقُولُوا هَكَذَا, لاَ تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، دەگێڕنەوە، کە پیاوێ ئارەقی خواردبۆوە هێنایان بۆ لای

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لێی بدەن). ئەبو هورەیرە وتی: هەمان بوو بە دەستی لێی دەدا، هەمان بوو بە پێڵاو و نەعلەکەی لێی دەدا، هەمان بوو بە جلەکەی لێی دەدا، کاتێ کە ڕۆشت هەندێ کەس وتیان: خوای گەورە ڕیسواو شەرمەزارت بکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وا مەڵێن). مەبنە پشتیوانی شەیتان لەسەری - ئەگەر خوای گەورە ڕیسواو شەرمەزاری بکات شەیتان بەسەریا زاڵ دەبێت - .

٤٤٧٨ - (صحيح) عن ابن الهاد, بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ, قَالَ فِيهِ بَعْدَ الضَّرْبِ: ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَصْحَابِهِ: (بَكِّتُوهُ). فَأَقْبَلُوا عَلَيْهِ يَقُولُونَ: مَا اتَّقَيْتَ اللَّهَ, مَا خَشِيتَ اللَّهَ, وَمَا اسْتَحَيْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ أَرْسَلُوهُ, وَقَالَ فِي آخِرِهِ: (وَلَكِنْ قُولُوا: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ, اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ). وَبَعْضُهُمْ يَزِيدُ الْكَلِمَةَ وَنَحْوَهَا.

واتە: لە ئیبنو ئەلهادەوە بە هەمان ئیسنادو مانا فەرمودەی پێشو هاتوە، لە فەرمودەکەیدا وتی لەدوای لێدانی ئارەق خۆرەکە: لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە هاوەڵانی فەرموو: (سەرکۆنەی بکەن). ئەوانیش ڕویان تێکردو وتیان: ئەوە بۆ پەرێزکار نیت سنورەکانی خوای گەورە دەبەزێنیت و سەرپێچی دەکەیت، ئەوە لەسزاو تۆڵەی خوای گەورە ناترسی، شەرم ناکەی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەپاشدا بەرەڵایان کرد، لە کۆتایی دا فەرمووی: (بەڵکو بڵێن: خودایە لێی خۆش ببە، خودایە بەزەیت پێیدا بێتەوە). هەندێ لە راویەکان وتەیەکی وەك: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ)یان بۆ زیاد کرد.

٤٤٧٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَدَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ, وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَرْبَعِينَ, فَلَمَّا وَلِيَ عُمَرُ دَعَا النَّاسَ, فَقَالَ لَهُمْ: إِنَّ النَّاسَ قَدْ دَنَوْا مِنَ الرِّيفِ - وَقَالَ مُسَدَّدٌ مِنَ الْقُرَى وَالرِّيفِ - فَمَا تَرَوْنَ فِي حَدِّ الْخَمْرِ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَرَى أَنْ

تَجْعَلَهُ كَأَخَفِّ الْحُدُودِ. فَجَلَدَ فِيهِ ثَمَانِينَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ ابْنُ أَبِي عَرُوبَةَ, عَنْ قَتَادَةَ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَنَّهُ جَلَدَ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ أَرْبَعِينَ. وَرَوَاهُ شُعْبَةُ, عَنْ قَتَادَةَ, عَنْ أَنَسٍ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: ضَرَبَ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ الأَرْبَعِينَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی دەدا ئارەق خۆریان بە پەلکە خورماو پێڵاو و نەعل دارکاری دەکرد. پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، کاتێ کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفە هاوەڵانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کۆکردەوەو راوێژی پێ کردن و پێی وتن: خەڵك پەیوەندیەکی زۆریان پەیدا کردبو لەگەڵ لادێ دێهاتەکانداو نزیك بونەتەوە لێیان ئەوانەی کە خاوەنی زەوی کشتوکاڵی و دارخورمان، ئارەق خواردن پەرەی سەندوەو زۆر بوە، جا ئێوە لەبارەی حەدی ئارەق خۆر راتان چۆنە؟ (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف پێی وت: من رام وایە بەقەد کەمترین سزای لێ بکەیت - کە سزای بوختانە - کە هەشتا دارە، بۆیە رایان هاتە سەر ئەوە، جا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هەشتا داری بۆ ئارەق خۆر بڕیەوە، ئیبنو ئەبو عەروبە ریوایەتی کردوە، لە قەتادەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، بە پەلکە خورماو پێڵاو و نەعل چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، وە شوعبە ریوایەتی کردوە، لە قەتادەوە، لە پێغەمبەرەوە ی خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: بە دوو پەلکە خورما نزیکەی چل داری لێ دەدا.

٤٤٨٠ – (صحيح) عن حضين بن المنذر الرقاشي - هُوَ أَبُو سَاسَانَ – قال: شَهِدْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ وَأُتِيَ بِالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ فَشَهِدَ عَلَيْهِ حُمْرَانُ وَرَجُلٌ آخَرُ, فَشَهِدَ أَحَدُهُمَا أَنَّهُ رَآهُ شَرِبَهَا - يَعْنِي الْخَمْرَ -, وَشَهِدَ الآخَرُ أَنَّهُ رَآهُ يَتَقَيَّأُهَا, فَقَالَ عُثْمَانُ: إِنَّهُ لَمْ يَتَقَيَّأْهَا حَتَّى شَرِبَهَا. فَقَالَ لِعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَقِمْ عَلَيْهِ الْحَدَّ. فَقَالَ عَلِيٌّ لِلْحَسَنِ: أَقِمْ عَلَيْهِ الْحَدَّ. فَقَالَ الْحَسَنُ: وَلِّ حَارَّهَا مَنْ تَوَلَّى قَارَّهَا. فَقَالَ عَلِيٌّ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ: أَقِمْ عَلَيْهِ الْحَدَّ. قَالَ: فَأَخَذَ السَّوْطَ فَجَلَدَهُ وَعَلِيٌّ

يَعُدُّ فَلَمَّا بَلَغَ أَرْبَعِينَ قَالَ حَسْبُكَ, جَلَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعِينَ - أَحْسِبُهُ قَالَ - وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ, وَعُمَرُ ثَمَانِينَ, وَكُلٌّ سُنَّةٌ وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ.

واتە: لە (حُضَين)ی کوڕی (مُنْذِر)ی ڕەقاشیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئامادەی کۆڕ و انیشتنی پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەفان بووم ڕەزای خوای لێ بێ، کاتێ کە وەلیدی کوڕی عوقبەیان هێنا بۆ دادگایی، حومران و کەسێکی تر شایەتیان دا کە ئارەقی خواردۆتەوە، یەکێکیان وتی: من دیم ئارەقی خواردەوە، ئەوی تریشیان وتی: منیش دیم کە دەڕشایەوە، پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: هەتا نەیخواردایەتەوە نە دەڕشایەوە، وتی بە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ: هەستە دارکاری بکە، پێشەوا عەلی بە حەسەنی کوڕی وت: هەستە تۆ دارکاری بکە، حەسەن وتی: کێ خۆشیەکەی دەنۆشێ، با هەر ئەویش تاڵیەکەی بچێژێ، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەری وت: هەستە تۆ دارکاری بکە، وتی: (عبد الله)ی کوڕی جەعفەر قەمچیەکی هەڵگرت و دارکاری کرد، پێشەوا عەلیش قەمچیەکانی دەژمارد، کاتێ کە گەیشتە چل وتی: ئیتر بەسە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ خۆی چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، پێم وایە وتی: پێشەوا ئەبو بەکریش بەهەمان شێوە هەر چل داری لێ دەدا، پێشەوا عومەر هەشتا داری لێ دەدا، ئەمانە هەر هەموویان سوننەتن، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم چل دارەکەم پێ باشترە.

٤٤٨١ - (صحيح) عن علي قال: جَلَدَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْخَمْرِ وَأَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ, وَكَمَّلَهَا عُمَرُ ثَمَانِينَ, وَكُلٌّ سُنَّةٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ الأَصْمَعِيُّ: وَلِّ حَارَّهَا مَنْ تَوَلَّى قَارَّهَا, وَلِّ شَدِيدَهَا مَنْ تَوَلَّى هَيِّنَهَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا كَانَ سَيِّدَ قَوْمِهِ: حُضَيْنُ بْنُ الْمُنْذِرِ أَبُو سَاسَانَ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و پێشەوا ئەبو بەکر چل داریان دەدا لە

ئارەق خۆر، پێشەوا عومەر کاملی کردو هەشتا داری لێ دەدا، هەر هەموویان سوننەتن. ئەبو داود دەڵێت: ئەصمەعی وتی: کێ خۆشیەکەی دەنۆشێ، با هەر ئەویش تاڵیەکەی بچێژێ، توندو تیژیەکەی بۆ کێ یە، با ئاسانکاری و نەرم و نیانیەکەیش بۆ ئەو بێ. ئەبو داود دەڵێت: (حُضَين)ی کوڕی (مُنْذِر) ئەبو ساسان گەورەی هۆزەکەی خۆی بوو.

## ئەگەر جار لەدوای جار ئارەقی خواردەوە.

## ٣٧ - باب إِذَا تَتَابَعَ فِي شُرْبِ الْخَمْرِ.

٤٤٨٢ - (حسن صحيح) عن معاوية بن أبي سفيان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا شَرِبُوا الْخَمْرَ فَاجْلِدُوهُمْ, ثُمَّ إِنْ شَرِبُوا فَاجْلِدُوهُمْ, ثُمَّ إِنْ شَرِبُوا فَاجْلِدُوهُمْ, ثُمَّ إِنْ شَرِبُوا فَاقْتُلُوهُمْ).

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئارەقی خواردەوە دارکاری بکەن، لەپاشدا ئەگەر ئارەقی خواردەوە دارکاری بکەن، لەپاشدا ئەگەر ئارەقی خواردەوە دارکاری بکەن، لەپاشدا ئەگەر ئارەقی خواردەوە بیکوژن).

٤٤٨٣ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: بِهَذَا الْمَعْنَى, قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ فِي الْخَامِسَةِ: (إِنْ شَرِبَهَا فَاقْتُلُوهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا فِي حَدِيثِ أَبِي غُطَيْفٍ فِي الْخَامِسَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە هەمان مانا فەرموویەتی. راوی وتی: وا ئەزانم لە پێنجەم جاردا فەرمووی: (ئەگەر ئارەقی خواردەوە بیکوژن). ئەبو داود دەڵێت: لە

فەرموودەكەی (أَبِي غُطَيْف)دا هاتوە لە پێنجەم جاردا فەرمووی: (ئەگەر ئارەقی خواردەوە بیكوژن).

٤٤٨٤ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ, ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ, ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ, فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا حَدِيثُ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ, عَنْ أَبِيهِ, عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا شَرِبَ الْخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ, فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا حَدِيثُ سُهَيْلٍ, عَنْ أَبِي صَالِحٍ, عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ شَرِبُوا الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُمْ). وَكَذَا حَدِيثُ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ, عَنِ ابْنِ عُمَرَ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَكَذَا حَدِيثُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَالشَّرِيدِ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَفِي حَدِيثِ الْجَدَلِيِّ, عَنْ مُعَاوِيَةَ, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (فَإِنْ عَادَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ, فَاقْتُلُوهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئارەقی خواردەوەو سەرخۆشی كرد داركاری بكەن، لەپاشدا ئەگەر ئارەقی خواردەوەو سەرخۆشی كرد داركاری بكەن، لەپاشدا ئەگەر ئارەقی خواردەوەو سەرخۆشی كرد داركاری بكەن، بۆ چوارەم جار ئەگەر گەڕایەوە سەری بیكوژن). ئەبو داود دەڵێت: بە هەمان شێوە فەرموودەكەی عومەری كوڕی ئەبو سەلەمە، لە باوكیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم: (ئەگەر ئارەقی خواردەوە داركاری بكەن، ئەگەر بۆ چوارەم جار گەڕایەوە سەری بیكوژن). ئەبو داود دەڵێت: بە هەمان شێوە فەرموودەكەی سوهەیل، لە ئەبو صاڵحەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم: (ئەگەر بۆ چوارەم جار ئارەقی خواردەوە بیكوژن). بە هەمان شێوە فەرموودەكەی ئەبو نوعم، لە ئیبنو عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، هەروەها فەرموودەكەی (عبد الله)ی كوڕی عومەر، لە

پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، وە شەرید، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، وە لە فەرمودەکەی جەدەلی، لە موعاویەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، کە فەرموویەتی: (ئەگەر بۆ سێیەم جار یان چوارەم جار ئارەقی خواردەوە بیکوژن).

٤٤٨٥ - (ضعيف مرسل) عن قبيصة بن ذؤيب: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ, فَإِنْ عَادَ فَاجْلِدُوهُ, فَإِنْ عَادَ فَاجْلِدُوهُ, فَإِنْ عَادَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ, فَاقْتُلُوهُ). فَأُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ فَجَلَدَهُ, ثُمَّ أُتِيَ بِهِ فَجَلَدَهُ, ثُمَّ أُتِيَ بِهِ فَجَلَدَهُ, ثُمَّ أُتِيَ بِهِ فَجَلَدَهُ, وَرَفَعَ الْقَتْلَ, فَكَانَتْ رُخْصَةً. قَالَ سُفْيَانُ: حَدَّثَ الزُّهْرِيُّ بِهَذَا الْحَدِيثِ وَعِنْدَهُ مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ وَمُخَوَّلُ بْنُ رَاشِدٍ فَقَالَ لَهُمَا: كُونَا وَافِدَيْ أَهْلِ الْعِرَاقِ بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە قەبیصەی کوڕی (ذؤیب)ەوە، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ ئارەقی خواردەوە دارکاری بکەن، ئەگەر گەڕایەوە سەری دارکاری بکەن، ئەگەر گەڕایەوە سەری دارکاری بکەن، ئەگەر بۆ سێیەم جار یان چوارەم جار گەڕایەوە سەری بیکوژن). پیاوێکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئارەقی خواردبۆوە دارکاری کرد، لەپاشدا هێنایانەوە بۆ لای ئارەقی خواردبۆوە دارکاری کرد، لەپاشدا هێنایانەوە بۆ لای ئارەقی خواردبۆوە دارکاری کرد، لەپاشدا هێنایانەوە بۆ لای ئارەقی خواردبۆوە دارکاری کردو نەیکوشت، حوکمی کوشتنی هەڵوەشاندەوەو جێبەجێ نەکرد، کە ئەمەش روخسەت بوو. سوفیان وتی: زوهری مەنصوری کوڕی موعتەمیر و موخەوەلی کوڕی راشیدی لەلا بوو باسی ئەم فەرمودەی دەکرد، پێی وتن: بەم فەرموودەوە ببنە نوێنەری خەڵکی عێراق. چونکە ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەپاش چوار جار خواردنەوە ئارەق خۆری نەکوشتوە.

٤٤٨٦ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: لاَ أَدِي أَوْ مَا كُنْتُ لأَدِيَ مَنْ أَقَمْتُ عَلَيْهِ حَدًّا إِلاَّ شَارِبَ الْخَمْرِ, فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَسُنَّ فِيهِ شَيْئًا, إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ قُلْنَاهُ نَحْنُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جگە لە ئارەق خۆر بۆ هیچ کەسێ لەوانەی کە حەدیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت و دەمرن خوێن باییمان دانەناوە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هیچ حەدێکی دیاری کراوی دانەناوە بۆی، بەڵکو ئەم دارکاریە ئێمە خۆمان بۆمان دیاریکردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیفەرمووە.

٤٤٨٧ - (حسن صحيح) عن عبد الرحمن بن أزهر قال: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الآنَ وَهُوَ فِي الرِّحَالِ يَلْتَمِسُ رَحْلَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ, فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الْخَمْرَ, فَقَالَ لِلنَّاسِ: (اضْرِبُوهُ). فَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِالنِّعَالِ, وَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِالْعَصَا, وَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِالْمِيتَخَةِ - قَالَ ابْنُ وَهْبٍ الْجَرِيدَةُ الرَّطْبَةُ - ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُرَابًا مِنَ الأَرْضِ فَرَمَى بِهِ فِي وَجْهِهِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەزهەرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وەك ئەوەی ئێستا بۆ خۆم چاوم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێ بۆ ڵنیایی باسی ئەو شوێنەی کرد کە لێی بوو، پیاوێکیان هێنا بۆ خزمەتی ئارەقی خواردبووەوە، بە خەڵکەکەی فەرموو: (ئادەی لێی دەن و دارکاری بکەن). هەیان بوو بە پێڵاو و نەعلەکەی لێی دەدا، هەیان بوو بە داردەستەکەی لێی دەدا، هەیان بوو بە پەلکە خورمای تەڕ لێی دەدا، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ خۆڵی هەڵگرت و کێشای بە دەم و چاویدا.

٤٤٨٨ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أزهر قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَارِبٍ وَهُوَ بِحُنَيْنٍ فَحَثَى فِي وَجْهِهِ التُّرَابَ, ثُمَّ أَمَرَ أَصْحَابَهُ فَضَرَبُوهُ بِنِعَالِهِمْ, وَمَا كَانَ فِي أَيْدِيهِمْ حَتَّى قَالَ لَهُمْ: (ارْفَعُوا). فَرَفَعُوا, فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ جَلَدَ أَبُو بَكْرٍ فِي الْخَمْرِ أَرْبَعِينَ, ثُمَّ جَلَدَ عُمَرُ أَرْبَعِينَ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ, ثُمَّ جَلَدَ ثَمَانِينَ فِي آخِرِ خِلَافَتِهِ, ثُمَّ جَلَدَ عُثْمَانُ الْحَدَّيْنِ كِلَيْهِمَا ثَمَانِينَ وَأَرْبَعِينَ, ثُمَّ أَثْبَتَ مُعَاوِيَةُ الْحَدَّ ثَمَانِينَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی ئەزهەرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێك ئارەقی خواردبوەوە هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە حونەین ئەویش هەندێ خۆڵی كێشا بە دەم و چاویدا. لەپاشدا فەرمانی دا بە هاوەڵەكانی لێی بدەن بە پێڵاو و نەعلەكانیان و ئەوەی بە دەستیانەوە بوو لە داردەست و قەمچی و هەر شتێكی تری لەو جۆرە، ئەوەندەیان لێ دا هەتا فەرمووی: (ئیتر بەسە دەست هەڵگرن)، ئەوانیش دەستیان لێ هەڵگرت، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەفاتی فەرموو، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، لەپاشدا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەرەتای سەردەمی جێنشینی خۆیدا چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، بەڵام لەكۆتایی جێنشینیەكەیدا هەشتا داری لێ دەدا، لەپاشدا پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا جارێ چل دار و جارێ هەشتا داری لێ دەدا، موعاویەوش لەسەردەمی خۆیدا هەشتا داری بۆ بڕییەوەو بە یەكجاری جێگیری كرد.

٤٤٨٩ - (حسن) عن عبد الرحمن بن أزهر قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَدَاةَ الْفَتْحِ وَأَنَا غُلَامٌ شَابٌّ يَتَخَلَّلُ النَّاسَ يَسْأَلُ عَنْ مَنْزِلِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ, فَأُتِيَ بِشَارِبٍ, فَأَمَرَهُمْ فَضَرَبُوهُ بِمَا فِي أَيْدِيهِمْ, فَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِالسَّوْطِ, وَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِعَصًا, وَمِنْهُمْ مَنْ ضَرَبَهُ بِنَعْلِهِ, وَحَثَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ التُّرَابَ, فَلَمَّا كَانَ أَبُو بَكْرٍ أُتِيَ بِشَارِبٍ فَسَأَلَهُمْ عَنْ ضَرْبِ النَّبِيِّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِى ضَرَبَ, فَحَزَرُوهُ أَرْبَعِينَ, فَضَرَبَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ, فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ كَتَبَ إِلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ إِنَّ النَّاسَ قَدِ انْهَمَكُوا فِى الشُّرْبِ وَتَحَاقَرُوا الْحَدَّ وَالْعُقُوبَةَ, قَالَ: هُمْ عِنْدَكَ فَسَلْهُمْ, وَعِنْدَهُ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ, فَسَأَلَهُمْ, فَأَجْمَعُوا عَلَى أَنْ يَضْرِبَ ثَمَانِينَ. قَالَ: وَقَالَ عَلِيٌّ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا شَرِبَ افْتَرَى فَأَرَى أَنْ يَجْعَلَهُ كَحَدِّ الْفِرْيَةِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەزهەرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لاوێکی تازە پێگەیشتو بووم ئەو بەیانیەی کە مەککە رزگار کرا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناو خەڵکەکەدا هەواڵی ماڵی خالیدی کوڕی وەلیدی دەپرسی، پیاوێك ئارەقی خواردبووەوە هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا لێی بدەن بەوەی کە بە دەستیانەوەیە، جا هەیان بوو بە قامچی لێی دەدا، هەیان بوو بە عەصاو داردەستەکەی و عەصاکەی لێی دەدا، هەیان بوو بە پێڵاو و نەعلەکەی لێی دەدا، خۆشی هەندێ خۆڵی کێشا بە دەم و چاویدا. کاتێ کە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە جێنشین پیاوێك ئارەقی خواردبووەوە هێنایان بۆ خزمەتی، ئەویش پرسیاری کرد دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەند داری دەدا لە ئارەق خۆر، ئەوەی لەبەریانکردبوو چل دار بوو، ئیتر پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بوو چل داری دەدا لە کەسێ ئارەقی بخواردایەتەوە، کاتێ کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە جێنشین نامەی نوسی بۆ خالیدی کوڕی وەلید بەم شێوەیە: لەبەر ئەوەی حەدی ئارەق خۆر سوکە خەڵك رویان کردۆتە ئارەق خواردنەوەو بەلایانەوە ئاساییەو گوێی نادەنێ، خالیدیش وەڵامی دایەوەو وتی: زانایان لە هاوەڵان لەلای خۆتن پرس و رایان پێ بکە، کۆچەرانی یەکەمینی لەلا بوو، پرسیاری لێ کردن، ئەوانیش بە یەکدەنگی هەشتا داریان پەسەند کرد کە بدرێت لە ئارەق خۆر، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وتی: کەسێ کە خواردیەوە بوختان دەکات بۆیە من رام وایە بەقەد حەدی بۆختانی لێ بدرێت - کە هەشتا قامچی یە - .

## دەربارەی جێبەجێ کردنی حەد لە مزگەوتدا.

## ٣٨ - باب فِي إِقَامَةِ الْحَدِّ فِي الْمَسْجِدِ.

٤٤٩٠ - (حسن) عن حكيم بن حزام قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُسْتَقَادَ فِي الْمَسْجِدِ, وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ الأَشْعَارُ, وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ.

واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەدەدا لە مزگەوتدا: بکوژ بکوژرێتەوەو، شیعر و هۆنراوەی تێدا بخوێنرێتەوەو، حەدی تێدا جێبەجێ بکرێت.

## دەربارەی لە روخساردان لەکاتی جێبەجێ کردنی حەددا.

## ٣٩- باب في ضرب الوجه في الحد.

٤٤٩١ - (صحيح) عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ الْوَجْهَ).

واتە: واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لە کەسێکتان دا لەڕوخساری مەدەن).

# سەبارەت بە تەمێ کردن.

## ٣٩ - باب فِي التَّعْزِيرِ.

٤٤٩٢ - (صحيح) عن أبو بردة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئەبو بوردەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەگەر بۆ حەدی شەرعی ئەگینا لەسەر هیچ شتێکی تر لە دە دار زیاتر لە کەس نادرێ).

٤٤٩٣ - عن أبو بردة الأنصاري قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو بوردەی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو. جا راوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە.

٤٤٩٣ – م (صحيح) عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ الْوَجْهَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لە کەسێکتان دا لەڕوخساری مەدەن).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی خوێنبایی.

## ٤٠ - أول كتاب الديات

### باسی گیان بە گیان

### ١ - باب النَّفْسِ بِالنَّفْسِ.

٤٤٩٤ - (صحيح) عن ابن عباس قال: كَانَ قُرَيْظَةُ وَالنَّضِيرُ - وَكَانَ النَّضِيرُ أَشْرَفَ مِنْ قُرَيْظَةَ - فَكَانَ إِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْظَةَ رَجُلاً مِنَ النَّضِيرِ قُتِلَ بِهِ, وَإِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ فُودِىَ بِمِائَةِ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ, فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ, فَقَالُوا: ادْفَعُوهُ إِلَيْنَا نَقْتُلْهُ. فَقَالُوا: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَوْهُ, فَنَزَلَتْ: (وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ). وَالْقِسْطُ النَّفْسُ بِالنَّفْسِ, ثُمَّ نَزَلَتْ: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قُرَيْظَةُ وَالنَّضِيرُ جَمِيعًا مِنْ وَلَدِ هَارُونَ النَّبِيِّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بەنی (قُرَيْظَةُ) و بەنی (النَّضِير) دوو هۆزی جولەکە بوون لە مەدینە - لەنەوەی هارون پێغەمبەر بوون سەلامی خوای لەسەر بێ -، بەنی (النَّضِير) بەهێزتربوون لە بەنی (قُرَيْظَةُ)، ئەگەر پیاوێکی بەنی (قُرَيْظَةُ) پیاوێکی بەنی (النَّضِير)ی بکوشتایە دەیانکوشتەوە، بەلأم ئەگەر پیاوێکی بەنی (قُرَيْظَةُ) پیاوێکی بەنی (النَّضِير)ی

بکوشتایە سەد ویسق خورمایان دەدا لە خوێنیایی دا، کاتێ کە خوای گەورە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم رەوانە کرد، پیاوێکی بەنی (النَّضِیر) پیاوێکی بەنی (قُرَیْظَةُ)ی کوشت، بەنی (قُرَیْظَةُ) وتیان: بکوژەکە بدەن بەدەستمانەوە با بیکوژین، بەنی (النَّضِیر) ملیان نەدا وتیان: با پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنێوانی ئێمەو ئێوەدا بڕیار بدات، هەردوو لایان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ﴾. سورة المائدة: ٤٢. واتە: وە ئەگەر بڕیارت دا لەنێوانیاندا ئەوا بە دادوەری بڕیار بدە. (وَالْقِسْطُ) واتە گیان بە گیان، بەنی (النَّضِیر) ملیان نەدا، لەپاشدا ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾. سورة المائدة: ٥٠. واتە: ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن؟

## پیاو ناکوژرێت لەسەر تاوانی براکەی و باوکی.

## ٢ - باب لاَ يُؤْخَذُ الرَّجُلُ بِجَرِيرَةِ أَخِيهِ أَوْ أَبِيهِ.

٤٤٩٥ - (صحيح) عن أبي رمثة قال: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَبِي: (ابْنُكَ هَذَا؟). قَالَ: إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ, قَالَ: (حَقًّا؟). قَالَ: أَشْهَدُ بِهِ. قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَاحِكًا مِنْ ثَبْتِ شَبَهِى فِى أَبِي وَمِنْ حَلْفِ أَبِي عَلَىَّ. ثُمَّ قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ لاَ يَجْنِى عَلَيْكَ وَلاَ تَجْنِى عَلَيْهِ). وَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى).

واتە: لە ئەبو (رِمْثَة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەتەك باوکم رۆشتین بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە باوکمی فەرموو: (ئەمە کوڕی تۆیە؟). وتی: بەڵێ بە پەروەردگاری

کەعبە، فەرمووی: (ئەوە بەڕاستە؟). وتی: شایەتی دەدەم کە کوڕمە، ئەبو (رِمْثَة) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێکەنی بەوەی کە من زۆر لەباوکم دەچوم و باوکیشم سوێندی دەخواردو پێداگری دەکرد کە کوڕی ئەوم، لەپاشدا فەرمووی: (بەڵام باوك زامنی تاوانی کوڕی ناکات و، کوڕیش زامنی تاوانی باوکی ناکات هەرکەس تاوانی خۆی لەئەستۆی خۆی و هیچیان ناکوژرێن لەسەر تاوانی یەکتر). جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾. سورة الزمر: ٧. واتە: وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

## فەرمانڕەوا فەرمان دەدا بە لێبوردن لەبکوژ.

## ٣ - باب الإِمَامِ يَأْمُرُ بِالْعَفْوِ فِي الدَّمِ.

٤٤٩٦ - (ضعيف) عن أبي شريح الخزاعي: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أُصِيبَ بِقَتْلٍ أَوْ خَبْلٍ فَإِنَّهُ يَخْتَارُ إِحْدَى ثَلَاثٍ: إِمَّا أَنْ يَقْتَصَّ, وَإِمَّا أَنْ يَعْفُوَ, وَإِمَّا أَنْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ, فَإِنْ أَرَادَ الرَّابِعَةَ فَخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ, وَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ).

واتە: لە ئەبو شورەیحی خوزاعیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرموویەتی: (کەسێ کەسێکی کوژرا یان ئەندامێکی لەکار خرا ئەوە خۆی سەرپشکە یەکێ لەم سیانە هەڵبژێرێت: یان تۆڵەبسێنێ، یان تاوانبارەکە ببەخشێ، یان خوێنبایی وەربگرێت، بەڵام ئەگەر جگە لەم سیانە داوای چوارەمی کرد ئەوە دەستی بگرن، هەرکەسێ لەدوای ئەمە ناهەقی و دەستدرێژی بکات ئەوە سزایەکی سەخت و بەسۆی بۆ هەیە.

٤٤٩٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُفِعَ إِلَيْهِ شَيْءٌ فِيهِ قِصَاصٌ إِلاَّ أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم نەدیوە کێشەیەکیان بۆ بردبێ کێشەکە تۆڵەسەندنەوەی تێدابێ و، فەرمانی بە لێبوردن نەکردبێ.

٤٤٩٨ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قُتِلَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَدَفَعَهُ إِلَى وَلِيِّ الْمَقْتُولِ, فَقَالَ الْقَاتِلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ قَتْلَهُ. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْوَلِيِّ: (أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا, ثُمَّ قَتَلْتَهُ دَخَلْتَ النَّارَ). قَالَ: فَخَلَّى سَبِيلَهُ. قَالَ: وَكَانَ مَكْتُوفًا بِنِسْعَةٍ فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ فَسُمِّيَ ذَا النِّسْعَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پیاوێ کوژرا، کێشەکەیان گەیاندە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش بکوژەکەی دایە دەستی خاوەن کوژراوەکە کە بیکوژێتەوە، بکوژەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەمویستوە بیکوژم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خاوەن کوژراوەکەی فەرموو: (ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست بکات و تۆ بیکوژیتەوە ئەوە ئەچیتە ئاگری دۆزەخەوە). ئەنەس وتی: ئیتر ئەویش بەرەڵای کرد. ئەنەس وتی: پیاوکوژەکە بە قایشێ دەستی بەسترابوو کاتێ کە هاتەدەرەوە قایشەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا ئیتر پێیان دەوت: کابرای خاوەن قایش.

٤٤٩٩- (صحيح) عن وائل بن حجر قال: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, إِذْ جِيءَ بِرَجُلٍ قَاتِلٍ فِي عُنُقِهِ النِّسْعَةُ, قَالَ: فَدَعَا وَلِيَّ الْمَقْتُولِ, فَقَالَ: (أَتَعْفُو). قَالَ لاَ. قَالَ (أَفَتَأْخُذُ الدِّيَةَ). قَالَ لاَ. قَالَ (أَفَتَقْتُلُ). قَالَ نَعَمْ. قَالَ (اذْهَبْ بِهِ).

فَلَمَّا وَلَّى قَالَ (أَتَعفُو). قَالَ لاَ. قَالَ (أَفَتَأْخُذُ الدِّيَةَ). قَالَ: لاَ. قَالَ: (أَفَتَقْتُلُ). قَالَ نَعَمْ. قَالَ (اذْهَبْ بِهِ). فَلَمَّا كَانَ فِي الرَّابِعَةِ قَالَ: (أَمَا إِنَّكَ إِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِ صَاحِبِهِ). قَالَ فَعَفَا عَنْهُ. قَالَ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ يَجُرُّ النِّسْعَةَ.

واتە: لە وائیلی کوڕی حوجرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم، پیاوکوژێکیان هێنا قایشێ لە ملیابوو، راوی وتی: خاوەن کوژراوەکەی بانگ کردو فەرمووی: (لێی خۆش دەبیت؟). وتی: نەخێر. فەرمووی: (خوێنبایی لێ وەرد گریت؟) وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەیکوژیت؟). وتی: بەڵێ. فەرمووی: (دەی بۆی بەرن با بیکوژێت)، لە چوارەم جاردا فەرمووی: (ئەگەر تۆ لێی خۆش بویتایە ئەوە گوناهی خۆی و ئەو کەسەش کە ئەو کوشتویەتی دەکەوێتە ئەستۆی، وائل وتی: ئەویش لێی خۆش بوو، منیش دیم قایشەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا.

٤٥٠٠ - عن علقمة بن وائل بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ.

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٤٥٠١ - (صحيح بما قبله) عن علقمة بن وائل, عن أبيه قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحَبَشِيٍّ, فَقَالَ: إِنَّ هَذَا قَتَلَ ابْنَ أَخِي. قَالَ: (كَيْفَ قَتَلْتَهُ؟). قَالَ: ضَرَبْتُ رَأْسَهُ بِالْفَأْسِ وَلَمْ أُرِدْ قَتْلَهُ. قَالَ: (هَلْ لَكَ مَالٌ تُؤَدِّي دِيَتَهُ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (أَفَرَأَيْتَ إِنْ أَرْسَلْتُكَ تَسْأَلُ النَّاسَ تَجْمَعُ دِيَتَهُ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَمَوَالِيكَ يُعْطُونَكَ دِيَتَهُ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ لِلرَّجُلِ: (خُذْهُ). فَخَرَجَ بِهِ لِيَقْتُلَهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا إِنَّهُ إِنْ قَتَلَهُ كَانَ مِثْلَهُ). فَبَلَغَ بِهِ الرَّجُلُ حَيْثُ يَسْمَعُ قَوْلَهُ, فَقَالَ: هُوَ ذَا فَمُرْ فِيهِ مَا شِئْتَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَرْسِلْهُ - وَقَالَ مَرَّةً: دَعْهُ - يَبُوءُ بِإِثْمِ صَاحِبِهِ وَإِثْمِهِ فَيَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ). قَالَ: فَأَرْسَلَهُ.

واتە: لە عەلقەمەی كوڕی وائیلەوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لە پیاوێ بەندەیەكی حەبەشی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەمە برازایەكی كوشتوم، فەرمووی: (چۆن كوشتت؟)، وتی: بە تەورێ دام لەسەری مەبەستم ئەوە نەبوو بیكوژم بەئەنقەست نەمكوشت، فەرمووی: (ماڵ و سامانت هەیە خوێنبایی بدەیت؟) وتی: نەخێر، فەرمووی: (ئەگەر بەرت بدەم دەڕۆی داوا لەخەڵك بكەیت و خۆینباییەكە كۆكەیتەوە؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (گەورەكەت خۆینباییەكەت بۆ دەدات؟). وتی: نەخێر، بە پیاوەكەی فەرموو: (دەی بیبە بیكوژە)، بردیەدەرەوە لەگەڵ خۆی بیكوژێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر بیكوژێت ئەوە ئەویش وەك ئەو بكوژە وایە). جا كە فەرمایشتەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گەیشت بە خاوەن كوژراوەكە هەركە بیستی گەڕایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە بكوژەكە تۆ چی لێ دەكەی ئارەزووی خۆتە، فەرمووی: (بەرەڵای بكە، یان فەرمووی: وازی لێ بێنە، گوناهی خۆی و ئەو كەسەش كە ئەو كوشتویەتی دەكەوێتە ئەستۆی و دەبێتە هاوەڵی ئاگری دۆزەخ)، وائل وتی: ئەویش بەرەڵای كردو لێی خۆش بوو.

٤٥٠٢ - عن أبو أمامة بن سهل قال: كُنَّا مَعَ عُثْمَانَ وَهُوَ مَحْصُورٌ فِي الدَّارِ, وَكَانَ فِي الدَّارِ مَدْخَلٌ مَنْ دَخَلَهُ سَمِعَ كَلاَمَ مَنْ عَلَى الْبَلاَطِ, فَدَخَلَهُ عُثْمَانُ فَخَرَجَ إِلَيْنَا وَهُوَ مُتَغَيِّرٌ لَوْنُهُ, فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَتَوَاعَدُونَنِي بِالْقَتْلِ آنِفًا. قُلْنَا: يَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ. قَالَ: وَلِمَ يَقْتُلُونَنِي, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: كُفْرٌ بَعْدَ إِسْلاَمٍ, أَوْ زِنًا بَعْدَ إِحْصَانٍ, أَوْ قَتْلُ نَفْسٍ بِغَيْرِ نَفْسٍ). فَوَاللَّهِ مَا زَنَيْتُ فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلاَ إِسْلاَمٍ قَطُّ, وَلاَ أَحْبَبْتُ أَنَّ لِي بِدِينِي بَدَلاً مُنْذُ هَدَانِي اللَّهُ, وَلاَ قَتَلْتُ نَفْسًا, فَبِمَ يَقْتُلُونَنِي؟ قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عُثْمَانُ وَأَبُو بَكْرٍ رضى الله عنهما تَرَكَا الْخَمْرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی كوڕی سەهلەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ئێمە لە

خزمەت پێشەوا (عثمان)دا بووین ڕەزای خوای لێ بێ لە ماڵێکدا دەست بەسەر بوو زیندانی کرا بوو، ماڵەکە مەدخەلێکی هەبوو ئەوەی لەوێوە بچوایەتەژوورەوە گوێی لە وتەی ئەو کەسانە دەبوو کە لە (بلاط) قسەیان دەکرد - شوێنێکی بە ناوبانگە لە مەدینە -، پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ چوە ناو مەخەلەکەو لەوێوە هاتەدەرەوە بۆ لامان ڕەنگی گۆڕا بوو، وتی: هەر ئێستا بەڵێنیان پێ دواوم بە کوشتن، وتمان: خوای گەورەت بەسە ئەی فەرمانڕەوا و خەلیفەی باوەڕداران، پێشەوا (عثمان) وتی: بۆچی دەمکوژن، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەفەرموو: (خوێن ڕشتنی مرۆڤی موسوڵمان حەڵاڵ نیە تەنها لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت: کافر ببێ پاش ئەوەی کە موسوڵمان بووە، زینا بکات پاش ئەوەی ژنی هێنا بێت، موسوڵمانێك بکوژێت بەبێ ئەوەی ئەو موسوڵمانە کەسێکی بە ناهەق کوشتبێت و شایستەی کوشتن بێ). سوێند بە (الله) لەسەردەمی نەفامی و لەسەردەمی ئیسلامدا هەرگیز زینام نەکردووە، لەوەتی خوای گەورە هیدایەتی داوم بۆ سەر دینی ئیسلام هەرگیز حەزم نەکردووە دینەکەم بگۆڕم، کەسیشم نەکوشتوە بە ناهەق، ئیتر لەبەرچی دەیانەوێت بمکوژن؟ ئەبو داود دەڵێت: هەردوو پێشەوایان ئەبو بەکر و (عثمان) ڕەزای خوایان لێ بێ لەسەردەمی نەفامی دا وازیان لە ئارەق خواردنەوە هێنابوو.

٤٥٠٣ - (ضعيف) عن وهب, أَنَّ مُحَلِّمَ بْنَ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيَّ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ أَشْجَعَ فِي الإِسْلاَمِ, وَذَلِكَ أَوَّلُ غِيَرٍ قَضَى بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَتَكَلَّمَ عُيَيْنَةُ فِي قَتْلِ الأَشْجَعِيِّ لأَنَّهُ مِنْ غَطَفَانَ, وَتَكَلَّمَ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ دُونَ مُحَلِّمٍ لأَنَّهُ مِنْ خِنْدِفَ, فَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ وَكَثُرَتِ الْخُصُومَةُ وَاللَّغَطُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عُيَيْنَةُ أَلاَ تَقْبَلُ الْغِيَرَ). فَقَالَ عُيَيْنَةُ: لاَ وَاللَّهِ حَتَّى أُدْخِلَ عَلَى نِسَائِهِ مِنَ الْحَرْبِ وَالْحَزَنِ مَا أَدْخَلَ عَلَى نِسَائِي. قَالَ: ثُمَّ ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ, وَكَثُرَتِ الْخُصُومَةُ وَاللَّغَطُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عُيَيْنَةُ أَلاَ تَقْبَلُ الْغِيَرَ). فَقَالَ عُيَيْنَةُ: مِثْلَ ذَلِكَ أَيْضًا إِلَى أَنْ قَامَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي

لَيْثٍ يُقَالُ لَهُ مُكَيْتِلٌ عَلَيْهِ شِكَّةٌ وَفِي يَدِهِ دَرَقَةٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَمْ أَجِدْ لِمَا فَعَلَ هَذَا فِي غُرَّةِ الإِسْلاَمِ مَثَلاً إِلاَّ غَنَمًا وَرَدَتْ فَرُمِيَ أَوَّلُهَا فَنَفَرَ آخِرُهَا, اسْنُنِ الْيَوْمَ وَغَيِّرْ غَدًا! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَمْسُونَ فِي فَوْرِنَا هَذَا, وَخَمْسُونَ إِذَا رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ). وَذَلِكَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ. وَمُحَلِّمٌ رَجُلٌ طَوِيلٌ آدَمُ, وَهُوَ فِي طَرَفِ النَّاسِ فَلَمْ يَزَالُوا حَتَّى تَخَلَّصَ فَجَلَسَ بَيْنَ يَدَىْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَيْنَاهُ تَدْمَعَانِ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي بَلَغَكَ, وَإِنِّي أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى, فَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَقَتَلْتَهُ بِسِلاَحِكَ فِي غُرَّةِ الإِسْلاَمِ, اللَّهُمَّ لاَ تَغْفِرْ لِمُحَلِّمٍ). بِصَوْتٍ عَالٍ, زَادَ أَبُو سَلَمَةَ: فَقَامَ وَإِنَّهُ لَيَتَلَقَّى دُمُوعَهُ بِطَرَفِ رِدَائِهِ. قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَزَعَمَ قَوْمُهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَغْفَرَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ الْغِيَرُ: الدِّيَةُ.

واتە: لە وەهەبەوە دەگێڕنەوە، کە موحەلیمی کوڕی (جثامة الليثي)ی لەسەردەمی ئیسلامدا پیاوێکی ئەشجەعی کوشت، ئەمەش یەکەمین دادوەری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەربارەی خوێنبایی، عویەینە قسەی کرد دەربارەی کوژراوە ئەشجەعیەکە و داوای خوێنەکەی کرد، چونکە لە هۆزی (غطفان) بوو، ئەقرەعی کوڕی حابس بەرگری لە موحەلیم کرد، چونکە لە هۆزی (خیندیف) بوو، ئیتر دەنگەکان بەرزبوونەوەو بوو بەهەراو قاو و قیژ و ژاوەژاو کەس لەکەس حاڵی نەدەبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی عویەینە ئایا خوێنبایی قبوڵ ناکەی؟). عویەینە وتی: نا، سوێند بە (الله) بەڵکو لە تۆڵەدا دەیکوژینەوە، بۆ ئەوەی ژنەکانی وەك ژنەکانی ئێمە توشی داخ و مەراق و دڵگرانی و ماتەمینی ببن، راوی وتی: لەپاشدا دەنگەکان بەرزبوونەوەو هەراو قاو و قیژ و ژاوەژاو زۆرتر بوو، بۆ جاری دووەم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی عویەینە ئایا خوێنبایی قبوڵ ناکەی؟). عویەینە بە هەمان شێوەی یەکەمجار وەڵامی دایەوە، هەتا پیاوێ لە هۆزی (لیث) هەستایەوە پێیان دەوت: موکەیتیل،

چەکێکی پێ بوو قەڵغانێکی لە چەرم دروستکراوی بەدەستەوە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم کارەی کە موحەلیم یەکەم کەس کردویەتی لە سەردەمی ئیسلامدا هیچ نمونەیە لەوبارەوە نازانم تەنها ئەوە نەبێت کە کۆمەڵێ مەڕ دەچنە سەر ئاوێ بۆ ئاوخواردنەوە ئەگەر بەردێ یان تیرێکیان گرتە یەکەمیان ئەوانی تر لەترسان هەڵدێن، بەو شێوەیە ئەمەش یەکەم کەسە خوێنی رشتوە بۆیە پێم باشە تۆڵەی لێ بکرێتەوەو بکوژرێت بۆ ئەوەی خەڵك لە ئیسلام دورنەکەونەوەو لە کوشتنەکەی پەند وەربگرن و کەس نەوێرێ کاری لەو جۆرە بکات، ئەگەر ئەمڕۆ تۆڵە لە موحەلیم نەکەیتەوەو نەیکوژی سبەینێ سوننەتەکەت جێگیر نابێ و لەدوای خۆت بڕیارەکانت جێبەجێ ناکرێن و، سوننەت و بڕیارەکانت دەگۆڕدرێن. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەر ئێستا پەنجا وشترتان دەدەینێ، کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە پەنجای ترتان دەدەینێ). ئەم بەسەرهاتە لەیەکێ لە سەفەرەکانی دا رویدا.
موحەلیم پیاوێکی درێژی کەڵەگەتی ئەسمەر بوو، لەلایەکی خەڵکەکەوە بوو، یارمەتیان دا بۆ ئەوەی رزگاری بکەن و نەیکوژن هەتا بردیانە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەردەمیدا دانیشت فرمێسك بە هەدوو چاویدا دەهاتەخوارەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەڕاستی ئەوەی کە پێیان راگەیاندوی من کردومە، من دەگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورەو پەشیمانم، داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە دەنگی بەرز فەرمووی: (لەسەرەتای ئیسلامەوە بە چەکەکەی خۆت پیاوێکت کوشت، خودایە لە موحەلیم خۆش نەبی). ئەبو سەلەمە ئەمەی بۆ زیاد کرد: مەحەلیم لە کۆڕی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا بە چمکێکی پۆشاکەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی. ئیبنو ئیسحاق وتی: خزمەکانی موحەلیم پێیان وابوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوایی دا داوای لێ خۆشبونی بۆ کردوە. ئەبو داود دەڵێت: (نظر)ی کوڕی شومەیل وتی: (غیر) واتە: خوێنبایی.

## خاوەن کوژراو خوێنبایی وەردەگرێت.

## ٤ - باب وَلِيِّ الْعَمْدِ يَأْخُذُ الدِّيَةَ.

٤٥٠٤ - (صحيح) عن أبو شريح الكعبي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَلاَ إِنَّكُمْ يَا مَعْشَرَ خُزَاعَةَ قَتَلْتُمْ هَذَا الْقَتِيلَ مِنْ هُذَيْلٍ, وَإِنِّى عَاقِلُهُ, فَمَنْ قُتِلَ لَهُ بَعْدَ مَقَالَتِى هَذِهِ قَتِيلٌ فَأَهْلُهُ بَيْنَ خِيرَتَيْنِ: أَنْ يَأْخُذُوا الْعَقْلَ, أَوْ يَقْتُلُوا).

واتە: لە ئەبو شورەیحی کەعبیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی کۆمەڵی خوزاعە ئەم پیاوەتان کوشتوە لە هۆزی (هُذَیْل)، من خوێنەکەی دەدەم، بەڵام لەدوای ئەم فەرمایشتەم لەوبارەوە هەرکەسێ کەسێکی لێ کوژرا ئەوە بۆ کەسوکارەکەی دوو رێگا هەیە: یان دەبێ خوێنبایی وەربگرێت، یا دەبێ لەباتی کوژراوەکەیاندا بیکوژن).

٤٥٠٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: لَمَّا فُتِحَتْ مَكَّةُ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ (مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُودَى, أَوْ يُقَادَ). فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شَاهٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اكْتُبْ لِي - قَالَ الْعَبَّاسُ اكْتُبُوا لِي - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اكْتُبُوا لأَبِي شَاهٍ). وَهَذَا لَفْظُ حَدِيثِ أَحْمَدَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ اكْتُبُوا لِي يَعْنِى خُطْبَةَ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ مەککە رزگار کرا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا فەرمووی: (هەرکەسێ کەسێکی

لێ کوژرا ئەوە بۆ ئەو دوو ڕێگا هەیە: یان دەبێ خوێنبایی وەربگرێت، یا لەباتی کوژراوی خۆیدا بیکوژێت). پیاوێکی یەمەنی کە پێیان دەوت: ئەبو (شاة) هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم وتارەم بۆ بنوسە، عەباس لە جیاتی (اكتب لي) وتی: (اكتبوا لي) ئەمەش گۆی فەرموودەکەی پێشەوا ئەحمەدە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بینوسن بۆ ئەبو (شاة)). ئەبو داود دەڵێت: (اكتبوا لي) واتە وتارەکەی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بۆ بنوسن.

٤٥٠٦ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ, وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ: فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوهُ, وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باوەڕدار لەباتی کافر ناکوژرێتەوە، هەرکەسێ بە ئارەزوو باوەڕدارێ بکوژێ ئەوە دەدرێتە دەست کەسوکار و خاوەنی کوژراوەکە ئیتر ئارەزووی خۆیانە: ئەگەر ویستیان دەیکوژنەوە، ئەگەر ویستیان خوێنبایی وەردەگرن).

## ئەو کەسەی لەدوای خوێنبایی بکوژ بکوژێتەوە.

## ٥ - باب مَنْ قَتَلَ بَعْدَ أَخْذِ الدِّيَةِ.

٤٥٠٧ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ أُعْفِى مَنْ قَتَلَ بَعْدَ أَخْذِهِ الدِّيَةَ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لەدوای خوێنبایی بکوژ یان کەسێکی بکوژ لەباتی کوژراوەکەی بکوژێتەوە ئەوە لێ خۆش بوونی بۆ نیە).

# ئەو کەسەی زەهر دەرخواردی کەسێ بدات و بمرێت ئایا تۆڵەی لێ دەسێنرێت یان نا؟

## ٦ - باب فِيمَنْ سَقَى رَجُلاً سَمًّا أَوْ أَطْعَمَهُ فَمَاتَ أَيُقَادُ مِنْهُ ؟

٤٥٠٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ, فَأَكَلَ مِنْهَا, فَجِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: أَرَدْتُ لأَقْتُلَكَ. فَقَالَ: (مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَلِكَ). أَوْ قَالَ: (عَلَيَّ). قَالَ: فَقَالُوا: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: (لاَ). فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، دەگێرنەوە، کە ژنێکی جولەکە مەڕێکی برژاوی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش هەندێکی لێ خوارد، جا ژنەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوبارەوە لێی پرسی، کە بۆ ئەم کارەت کردوە؟ وتی: ویستم بتکوژم، فەرمووی: (خوای گەورە کاری وا ناکا کە ئەوە بە تۆ بکرێ) یان فەرمووی: (خوای گەورە کاری وا ناکا کە تۆ بەسەر مندا زاڵ بکات). ئەنەس وتی: وتیان: نەیکوژین؟ فەرمووی: (نەخێر). ئەنەس وتی: هەتا کاتی مەرگی شوێنەواری ئەو زەهرە مابوو بە زمانە بچکۆلەو مەڵاشوی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

٤٥٠٩ - (ضعيف الإسناد) عن أبو هريرة قال: أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الْيَهُودِ أَهْدَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَاةً مَسْمُومَةً - قَالَ - فَمَا عَرَضَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذِهِ أُخْتُ مَرْحَبٍ الْيَهُودِيَّةُ الَّتِي سَمَّتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژنێکی جولەکە مەڕێکی برژاوی ژەهراوی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەیدایەوە لەرووی و هیچی پێ نەوت - بەڵام کاتێ کە یەکێك لە هاوەڵان وەفاتی کرد بە هۆی زەهرەکەوە لەباتی ئەو کوشتیانەوە -. ئەبو داود دەڵێت: ئەم ژنە جولەکەیە خوشکی مەرحەبی جولەکە بوو کە زەهری دەرخواردی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دا.

٤٥١٠ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: أَنَّ يَهُودِيَّةً مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ سَمَّتْ شَاةً مَصْلِيَّةً, ثُمَّ أَهْدَتْهَا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الذِّرَاعَ فَأَكَلَ مِنْهَا, وَأَكَلَ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِهِ مَعَهُ, ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ). وَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ فَدَعَاهَا فَقَالَ لَهَا: (أَسَمَمْتِ هَذِهِ الشَّاةَ). قَالَتِ الْيَهُودِيَّةُ مَنْ أَخْبَرَكَ؟ قَالَ: (أَخْبَرَتْنِي هَذِهِ فِي يَدِي). لِلذِّرَاعِ. قَالَتْ نَعَمْ. قَالَ (فَمَا أَرَدْتِ إِلَى ذَلِكَ). قَالَتْ: قُلْتُ: إِنْ كَانَ نَبِيًّا فَلَنْ يَضُرَّهُ, وَإِنْ لَمْ يَكُنِ اسْتَرَحْنَا مِنْهُ. فَعَفَا عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يُعَاقِبْهَا, وَتُوُفِّيَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ الَّذِينَ أَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ, وَاحْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى كَاهِلِهِ مِنْ أَجْلِ الَّذِى أَكَلَ مِنَ الشَّاةِ, حَجَمَهُ أَبُو هِنْدٍ بِالْقَرْنِ وَالشَّفْرَةِ وَهُوَ مَوْلًى لِبَنِي بَيَاضَةَ مِنَ الأَنْصَارِ.

واتە: لە جابیریە کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژنێکی جولەکەی خەڵکی خەیبەر مەڕێکی برژاوی ژەهراوی کرد، لەپاشدا بە دیاری هێنای بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستێکی مەڕەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بە خواردنی، هەندێ لە هاوەڵانی لەتەکی دەستیان کرد بە خواردنی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموون: (دەستان هەڵگرن لە خواردنی). جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای ژنە جولەکەکەدا لێی پرسی فەرمووی: (ئەم مەڕەت

ژەهراوی کردوە؟). ژنە جولەکەکە وتی: کێ پێی وتی؟ فەرمووی: (ئەمەی کە بە دەستمەوەیە مەبەستی گۆشتە برژاوەکە بوو). ژنە جولەکەکە وتی: بەڵێ ژەهراویم کردوە، فەرمووی: (مەبەستت چی بوو لەم کارەو بۆ وات کرد؟). وتی: وتم: ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش نەبێ ئەوە دەیکوژێ و رزگارمان دەبێت لەدەستی، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی خۆش بوو تۆڵەی لێ نەکردەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو شانی کەڵەشاخی گرت لەبەر ئەو گۆشتە ژەهراویەی کە خواردبووی، ئەبو هیندی بەندەی ئازادکراوی هۆزی بەنی(بیاضة) لە ئەنصار کەڵەشاخەکەی بۆ کرد بە چەقۆ و (قرن) کە ئالەتێکی کەڵەشاخ گرتن بوو.

٤٥١١ - (حسن صحيح) عن أبو سلمة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْدَتْ لَهُ يَهُودِيَّةٌ بِخَيْبَرَ شَاةً مَصْلِيَّةً. نَحْوَ حَدِيثِ جَابِرٍ. قَالَ: فَمَاتَ بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُورٍ الأَنْصَارِيُّ, فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ: (مَا حَمَلَكِ عَلَى الَّذِى صَنَعْتِ). فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ جَابِرٍ. فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُتِلَتْ, وَلَمْ يَذْكُرْ أَمْرَ الْحِجَامَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ژنێکی جولەکەی خەڵکی خەیبەر مەڕێکی برژاوی ژەهراوی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی جابیر ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: کاتێ کە بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروری ئەنصاری مرد بە هۆی ژەهرەکەوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای ژنە جولەکەکەدا لێی پرسی: (ئەم کارەت بۆ کرد؟). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی جابیر بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا کوشتیان. بەڵام باسی کەڵەشاخ گرتنی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم نەکرد.

٤٥١٢ - (حسن صحيح) عن أبو سلمة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَلاَ يَأْكُلُ الصَّدَقَةَ. فَأَهْدَتْ لَهُ يَهُودِيَّةٌ بِخَيْبَرَ شَاةً مَصْلِيَّةً سَمَّتْهَا, فَأَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا, وَأَكَلَ الْقَوْمُ فَقَالَ: (ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ فَإِنَّهَا أَخْبَرَتْنِى أَنَّهَا مَسْمُومَةٌ). فَمَاتَ بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُورٍ الأَنْصَارِىُّ, فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ: (مَا حَمَلَكِ عَلَى الَّذِى صَنَعْتِ). قَالَتْ: إِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ الَّذِى صَنَعْتُ, وَإِنْ كُنْتَ مَلِكًا أَرَحْتُ النَّاسَ مِنْكَ. فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُتِلَتْ, ثُمَّ قَالَ فِى وَجَعِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ (مَا زِلْتُ أَجِدُ مِنَ الأَكْلَةِ الَّتِى أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ, فَهَذَا أَوَانُ قَطَعَتْ أَبْهَرِى).

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دیاری وەردەگرت و خێر و زەكاتی نەدەخوارد، ژنێكی جولەكەی خەڵكی خەیبەر مەڕێكی برژاوی ژەهراوی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەندێكی لێ خوارد، هاوەڵانیشی هەندێكیان لێ خوارد، فەرمووی: (دەستان هەڵگرن چونكە ئەم مەڕە پێی راگەیاندم كە ژەهراوی كراوە). بیشری كوڕی بەرائی كوڕی مەعروری ئەنصاری مرد بە هۆی ژەهرەكەوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای ژنە جولەكەكەدا لێی پرسی فەرمووی: (ئەم مەڕەت ژەهراوی كردوە؟). ژنە جولەكەكە وتی: كێ پێی وتی؟ فەرمووی: (ئەم كارەت بۆ كرد؟). وتی: ئەگەر پێغەمبەر بیت ئەوە زیانت پێ ناگەیەنێ، خۆ ئەگەر پاشاش بیت ئەوە ئەم خەڵككە رزگار دەكەم لەدەستت، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا كوشتیان. لەپاشدا بەو ئازار و نەخۆشیەوە وەفاتی كرد فەرمووی: (هێشتا هەست بە ئێش و ئازار دەكەم بە هۆی خواردنی گۆشتە ژەهراویەكەی خەیبەرەوە، هاكا شاخوێنبەری بچڕاندم).

٤٥١٣ - (صحيح الإسناد) عن ابن كعب بن مالك, عن أبيه: أَنَّ أُمَّ مُبَشِّرٍ قَالَتْ لِلنَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى مَرَضِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ: مَا يُتَّهَمُ بِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَإِنِّى لاَ أَتَّهِمُ بِابْنِى شَيْئًا, إِلاَّ الشَّاةَ الْمَسْمُومَةَ الَّتِى أَكَلَ مَعَكَ بِخَيْبَرَ. وَقَالَ النَّبِىُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَأَنَا لاَ أَتَّهِمُ بِنَفْسِي إِلاَّ ذَلِكَ, فَهَذَا أَوَانُ قَطَعَتْ أَبْهَرِي).

واته: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە ئوممو موبەشیر بە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم وت لەکاتی ئەو نەخۆشیەیدا کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی نەخۆشیە شك دەبەی لە خۆتدا، پێ نازانم کوڕەکەم هیچ نەخۆشیەکی تری هەبووبێت جگە لە شوێنەوای گۆشتی ئەو مەڕە ژەهراویەی لەتەك تۆدا خواردی لە خەیبەر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (منیش جگە لە شوێنەوای ئەوە هیچ نەخۆشیەکی تر شك نابەم، ئەویش هاکا شاخوێنبەری بچڕاندم).

٤٥١٤ - (صحيح الإسناد) عن أم مبشر قالت: دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ مَخْلَدِ بْنِ خَالِدٍ نَحْوَ حَدِيثِ جَابِرٍ, قَالَ: فَمَاتَ بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُورٍ, فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ, فَقَالَ: (مَا حَمَلَكِ عَلَى الَّذِى صَنَعْتِ). فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ جَابِرٍ, فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُتِلَتْ, وَلَمْ يَذْكُرِ الْحِجَامَةَ.

واته: لە ئوممو موبەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چومەژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە بە هەمان مانای فەرموودەکەی موخەلەدی کوڕی خالید، وەك فەرموودەکەی جابیر، وتی: بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروری ئەنصاری بە هۆی ژەهرەکەوە مرد، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای ژنە جولەکەکەدا لێی پرسی: (ئەم کارەت بۆ کرد؟). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی جابیر بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا کوشتیان. بەڵام باسی کەڵەشاخ گرتنی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم نەکرد.

## ئەگەر کەسێ بەندەکەی بکوژێ یان پەلەکانی ببڕێ وەك: لوت یان گوێی، ئایا تۆڵەی لێ دەکرێتەوە یان نا؟

## ٧ - باب مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ أَوْ مَثَّلَ بِهِ أَيُقَادُ مِنْهُ

| ٤٥١٥ - (ضعيف) عن سمرة: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ, وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ). |
|---|

واتە: لە سەمورەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەندەی خۆی بکوژێ دەیکوژین، هەرکەسێ لوتی بەندەی خۆی هەڵدڕێ لوتی هەڵدەدڕین).

| ٤٥١٦ - (ضعيف) عن قتادة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ خَصَى عَبْدَهُ خَصَيْنَاهُ). |
|---|

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەندەی خۆی بخەسێنێ دەیخەسێنین).

| ٤٥١٧ - (صحيح مقطوع) عن قتادة بِإِسْنَادِ شُعْبَةَ, مِثْلَهُ, زَادَ: ثُمَّ إِنَّ الْحَسَنَ نَسِيَ هَذَا الْحَدِيثَ فَكَانَ يَقُولُ: (لاَ يُقْتَلُ حُرٌّ بِعَبْدٍ). |
|---|

واتە: لە قەتادەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان ئیسنادی شوعبە هاتوە. بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەپاشدا حەسەنئەم فەرموودەی لەیاد چو، دەیفەرموو: (کەسی ئازاد لەباتی بەندە ناکوژرێتەوە).

٤٥١٨ - ((صحيح مقطوع) عن الحسن قال: لاَ يُقَادُ الْحُرُّ بِالْعَبْدِ.

واتە: لە حەسەنەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کەسی ئازاد لەباتی بەندە تۆڵەی لێ ناکرێتەوە.

٤٥١٩ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: جَاءَ رَجُلٌ مُسْتَصْرِخٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: جَارِيَةٌ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: (وَيْحَكَ مَا لَكَ). قَالَ: شَرًّا أَبْصَرَ لِسَيِّدِهِ جَارِيَةً لَهُ فَغَارَ فَجَبَّ مَذَاكِيرَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَيَّ بِالرَّجُلِ). فَطُلِبَ فَلَمْ يُقْدَرْ عَلَيْهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اذْهَبْ فَأَنْتَ حُرٌّ). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, عَلَى مَنْ نُصْرَتِي؟ قَالَ: (عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ). أَوْ قَالَ: (كُلِّ مُسْلِمٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الَّذِي عُتِقَ كَانَ اسْمُهُ رَوْحُ بْنُ دِينَارٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الَّذِي جَبَّهُ زِنْبَاعٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا زِنْبَاعٌ أَبُو رَوْحٍ كَانَ مَوْلَى الْعَبْدِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاتوە، وتی: پیاوێ بە هات و هاوار هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم،کەنیزەکی فلان کەس، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: ((ويحك) ئەوە چیتە؟). پیاوەکە وتی: توشی شەڕ و خراپە بووم سەیری کەنیزەکی فلانە کەسم کرد پەلاماری دام و هینەکانی بڕیم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەو پیاوەم بۆ رابگرن). چون بۆی دەستیان نەکەوت لەترسان هەڵهاتبو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەو پیاوەی کە هینەکانی بڕا بوو فەرمووی: (برۆ تۆ ئازادی). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (پشتگیری کردنم و داڵدەدانم لەسەر کێ یە؟). پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەسەر سەرجەم باوەڕدارانە) یان فەرمووی: (لەسەر هەموو موسوڵمانانە). ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی کە ئازاد کرا ناوی رەوحی کوڕی دینار بوو. ئەوەی کە هینەکانی بڕی ناوی زینباع بوو. زینباع ئەبو رەوع گەورەی بەندە ئازاد کراوەکە بوو.

## باسی (قەسامە) پاکانە

### ٨ - باب الْقَسَامَةِ.

٤٥٢٠ - (صحيح) عن سهل بن أبي حثمة و رافع بن خديج: أَنَّ مُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ انْطَلَقَا قِبَلَ خَيْبَرَ فَتَفَرَّقَا فِي النَّخْلِ فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ, فَاتَّهَمُوا الْيَهُودَ, فَجَاءَ أَخُوهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَابْنَا عَمِّهِ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَتَكَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي أَمْرِ أَخِيهِ وَهُوَ أَصْغَرُهُمْ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْكُبْرَ الْكُبْرَ). أَوْ قَالَ: (لِيَبْدَإِ الأَكْبَرُ). فَتَكَلَّمَا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمَا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَيُدْفَعُ بِرُمَّتِهِ). قَالُوا: أَمْرٌ لَمْ نَشْهَدْهُ كَيْفَ نَحْلِفُ؟ قَالَ: (فَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْمٌ كُفَّارٌ. قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ قِبَلِهِ. قَالَ: قَالَ سَهْلٌ: دَخَلْتُ مِرْبَدًا لَهُمْ يَوْمًا فَرَكَضَتْنِي نَاقَةٌ مِنْ تِلْكَ الإِبِلِ رَكْضَةً بِرِجْلِهَا. قَالَ حَمَّادٌ: هَذَا أَوْ نَحْوَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ وَمَالِكٌ, عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ فِيهِ: (أَتَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِينًا وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ أَوْ قَاتِلِكُمْ) وَلَمْ يَذْكُرْ بِشْرٌ دَمًا. وَقَالَ عَبْدَةُ, عَنْ يَحْيَى, كَمَا قَالَ حَمَّادٌ, وَرَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ عَنْ يَحْيَى فَبَدَأَ بِقَوْلِهِ: (تُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِينًا يَحْلِفُونَ). وَلَمْ يَذْكُرِ الاِسْتِحْقَاقَ, قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا وَهَمٌ مِنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (حثمة) و رافیعی عەمری کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە موحەیصەی کوڕی مەسعود و (عبد الله)ی کوڕی سەهل دەچن بۆ خەیبەر، لەوێ بەناو باخە خورماکاندا بڵاودەبنەوە، (عبد الله)ی کوڕی سەهل دەکوژرێت، جا جولەکەکان تاوانبار دەکەن بە کوشتنی، (عبد الرحمن)ی کوڕی

سەهلی برای و دوو ئامۆزای بە ناوەکانی حوەیصەو موحەیصە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (عبد الرحمن)ی برای کە لەوان بچوکتر بوو ویستی دەربارەی کوشتنی براکەی قسە بکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (با گەورەکەتان قسە بکات، با گەورەکەتان قسە بکات)، یان فەرمووی: (با گەورە دەست پێ بکات)، جا حوەیصەو موحەیصە باسی بەسەرهاتی ئامۆزاکەیان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پەنجا کەس لەئێوە سوێند بخوات لەسەر پیاوێ لەوان، ئەو پیاوە پەت دەکرێ و دەدرێتە دەستان لەجیاتی کوژراوەکەتان بیکوژنەوە). وتیان: شتێ کە نەمان دیبێ چۆن سوێندی لەسەر بخۆین؟ فەرمووی: (کەواتە پەنجا کەس لەجولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوانە هۆزێکی کافرن سوێندیان لێ وەرناگیرێت، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی خوێنەکەی دا لە وشتری زەکات. راوی وتی: سەهل وتی: رۆژێ چومە ناو پەچەی وشترەکانەوە یەکێ لەو وشترانە لەقەیەکی لێ دام، حەماد ئەم فەرموودەی گێڕاویەوە یان وك ئەمەی گێڕاویەوە. بیشری کوڕی (مفضل) و مالیك لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردوە لە فەرموودەکەیدا وتی: (ئایا پەنجا سوێند دەخۆن کە ئەوان کوشتویانە هەتا ئەوان خوێن کوژراوەکەتان پێ بدەن). بیشر باسی وشەی (الدم)خوێنی نەکرد، عەبدە لە یەحیاوە، هەروەك حەماد گێڕایەوە، وە عویەینە لە یەحیاوە ریوایەتی کردوەو، بەمە دەستی پێ کرد: (کەواتە پەنجا کەس لەجولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن). بەڵام باسی (ئستیحقاق)ی نەکرد، ئەبو داود دەڵێت: ئەمە (وهم) لە ئیبنو عویەینەوە.

٤٥٢١ - (صحيح) عن سهل بن أبي حثمة, عن رجال من كبراء قومه: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ, فَأُتِيَ مُحَيِّصَةُ فَأُخْبِرَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ أَوْ عَيْنٍ, فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ. قَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ. فَأَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلِكَ, ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ - وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ - وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ فَذَهَبَ

مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ - وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ - , فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَبِّرْ كَبِّرْ). يُرِيدُ السِّنَّ فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ, ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ وَإِمَّا أَنْ يُؤْذَنُوا بِحَرْبٍ). فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ, فَكَتَبُوا إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: (أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟). قَالُوا: لاَ. قَالَ: (فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ). قَالُوا لَيْسُوا مُسْلِمِينَ, فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عِنْدِهِ, فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ. قَالَ سَهْلٌ: لَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ.

واتە: سەهلی کوڕی (حثمة) دەڵێت: کۆمەڵێ لە گەورە پیاوانی هۆزەکەی خۆم گێڕایانەوە بۆم: کە (عبد الله)ی کوڕی سەهل و موحەیصە دەچن بۆ خەیبەر لەبەر هەژاری و بارگرانی ژیان، موحەیصە هات و هەواڵی هێنا کە (عبد الله)ی کوڕی سەهل کوژراوەو فڕێدراوەتە ناو (فقیر)ێکەوە - (فقیر) بریتیە لە بیرێك زۆر قوڵ نیەو دەمەکەی فراوانە - یان کارێزێکەوە، چو بۆ لای جولەکەکان وتی: سوێند بە (الله) ئێوە کوشتوتانە، ئەوانیش وتیان: سوێند بە (الله) ئێمە نەمان کوشتوە، جا موحەیصە هاتەوە بەرەو مەدینە هەتا گەیشتە ناو هۆزەکەی خۆی و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندن، لەپاشدا خۆی و حوەیصەی برای کە لەخۆی گەورەتر بوو لەتەك (عبد الرحمن)ی کوڕی سەهل چوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، موحەیصە کە ئەو لە خەیبەر بوو ویستی لەبارەی بەسەرهاتەکەوە قسە بکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (با گەورەکەتان قسە بکات، با گەورەکەتان قسە بکات)، جا حوەیصە قسەی کرد، لەپاشدا موحەیصەش قسەی خۆی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر جولەکەکان ئەو کارەیان کردبێ یان دەبێ خوێنبایی بدەن، یان دەبێ جەنگ ڕابگەیەنن لەنێوان ئێمەو ئەواندا). جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە نامەی نوسی بۆ جولەکەکان، ئەوانیش وەڵامی نامەکەیان دایەوەو نوسیبویان: سوێند بە (الله) ئێمە نەمان کوشتوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە موحەیصەو حوەیصە و (عبد

الرحمن)ی کوڕی سەهلی فەرمووی: (ئایا ئێوە سوێند دەخۆن کە ئەوان کوشتویانە هەتا ئەوان خوێنتان پێ بدەن؟) وتیان: نەخێر، سوێند ناخۆین، فەرمووی: (کەواتە جولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن و پاکانەتان بۆ دەکەن کە ئەوان نەیان کوشتوە). وتیان: ئەوانە موسوڵمان نین سوێندیان لێ وەرناگیرێت، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی خوێنی کوژراوەکەی دا، سەد وشتری مێینەی بۆ ناردن تا کرانە ژوورەوە بۆیان. سەهل وتی: ڕۆژێ چومە ناو پەچەی وشترێکی سوریان لەقەیەکی لێ دام.

٤٥٢٢ - (ضعيف معضل) عن عمرو بن شعيب: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم, أَنَّهُ قَتَلَ بِالْقَسَامَةِ رَجُلاً مِنْ بَنِى نَصْرِ بْنِ مَالِكٍ بِبَحْرَةِ الرُّغَاءِ عَلَى شَطِّ لِيَّةِ الْبَحْرَةِ, قَالَ: الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ مِنْهُمْ. وَهَذَا لَفْظُ مَحْمُودٍ. بِبَحْرَةٍ: أَقَامَهُ مَحْمُودٌ وَحْدَهُ. عَلَى شَطٍّ لِيَّةِ الْبَحْرَةِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتوە، کە لە (بحرة الرغاء) لە ڕێگەی (قەسامة)پاکانەوە پیاوێکیان کوشتبوو لە بەنی نەصری کوڕی مالیك لە لایە لەلاکانی (بحرة)، ڕاوی وتی: بکوژ و کوژراو لە خۆیان بوون واتە لە بەنی نەصر.

## دەربارەی وازهێنان لە تۆڵە بە پاکانە

## ٩ - باب فِي تَرْكِ الْقَوَدِ بِالْقَسَامَةِ.

٤٥٢٣ - (صحيح) عن بشير بن يسار زَعَمَ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ, أَخْبَرَهُ, أَنَّ نَفَرًا مِنْ قَوْمِهِ انْطَلَقُوا إِلَى خَيْبَرَ, فَتَفَرَّقُوا فِيهَا, فَوَجَدُوا أَحَدَهُمْ قَتِيلاً, فَقَالُوا لِلَّذِينَ وَجَدُوهُ عِنْدَهُمْ: قَتَلْتُمْ صَاحِبَنَا! فَقَالُوا: مَا قَتَلْنَاهُ, وَلاَ عَلِمْنَا قَاتِلاً. فَانْطَلَقْنَا إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: فَقَالَ لَهُمْ: (تَأْتُونِي بِالْبَيِّنَةِ عَلَى مَنْ قَتَلَ هَذَا). قَالُوا: مَا لَنَا بَيِّنَةٌ. قَالَ: (فَيَحْلِفُونَ لَكُمْ). قَالُوا: لاَ نَرْضَى بِأَيْمَانِ الْيَهُودِ. فَكَرِهَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُبْطِلَ دَمَهُ فَوَدَاهُ مِائَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ.

واتە: لە بەشیری کوڕی یەسارەوە هاتوە، پێی وابوو کە پیاوێ لە ئەنصار بەناوی سەهلی کوڕی (حثمة)ەوە بۆی گێڕاوەتەوە، کە چەند کەسێ لە هۆزەکەی دەچن بۆ خەیبەر، لەوێ بڵاودەبنەوە، یەکێکیان دەکوژرێت، بە جولەکەکانیان وت: ئێوە کوشتوتانە، وتیان: ئێمە نەمان کوشتوەو ناشزانین کێ کوشتویەتی ئاگامان لێی نیە. رۆشتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەهل وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموون: (بەڵگەم بۆ دێنن لەسەر ئەوەی کە کێ کوشتویەتی؟) وتیان: نەخێر، بەڵگەمان پێ نیە چونکە لەوێ نەبووین، فەرمووی: (کەواتە جولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن و پاکانەتان بۆ دەکەن کە ئەوان نەیان کوشتوە). وتیان: ئێمە رازی نابین بە سوێندی جولەکەکان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی ناخۆش بوو خوێنەکەی بە هەدەر بڕوات بۆیە خۆی سەد وشتری زەکاتی دا لەجیاتی خوێنەکەی.

٤٥٢٤ - (صحيح بما قبله) عن رافع بن خديج قال: أَصْبَحَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ مَقْتُولاً بِخَيْبَرَ, فَانْطَلَقَ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ, فَقَالَ: (لَكُمْ شَاهِدَانِ يَشْهَدَانِ عَلَى قَتْلِ صَاحِبِكُمْ؟). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ يَكُنْ ثَمَّ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ, وَإِنَّمَا هُمْ يَهُودُ وَقَدْ يَجْتَرِئُونَ عَلَى أَعْظَمَ مِنْ هَذَا. قَالَ: (فَاخْتَارُوا مِنْهُمْ خَمْسِينَ فَاسْتَحْلِفُوهُمْ). فَأَبَوْا, فَوَدَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عِنْدِهِ.

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پیاوێکی ئەنصاری لە خەیبەر کوژرا، کەسوکارەکەی چون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (دوو شایەتتان هەیە کە شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە فلان کەس خزمەکەی ئێوەی کوشتوە؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەو شوێنە یەکێ لە موسوڵمانانی لێ نەبووە، بەڵکو ئەوانە جولەکەن جورئەتی لەوە گەورەتریشیان هەیە، چونکە ئەوانە دوژمنی ئێمەن، فەرمووی: (دەی پەنجا کەس لەخۆتان هەڵبژێرن سوێند بخۆن کە ئەوان کوشتویانە)، ئەوانیش ئەو کارەیان نەکرد، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی خوێنەکەی دا.

٤٥٢٥ - (منكر) عن عبد الرحمن بن بجيد قال: إِنَّ سَهْلاً وَاللَّهِ أَوْهَمَ الْحَدِيثَ, إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ إِلَى يَهُودَ: (أَنَّهُ قَدْ وُجِدَ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ قَتِيلٌ فَدُوهُ). فَكَتَبُوا يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ خَمْسِينَ يَمِينًا مَا قَتَلْنَاهُ وَلاَ عَلِمْنَا قَاتِلاً. قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عِنْدِهِ مِائَةَ نَاقَةٍ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی بوجەیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سوێند بە (الله) سەهل (وهم)ی کردوە لە فەرموودەکەدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نامەی نوسی بۆ جولەکەکان: (بەڕاستی ئەو پیاوە لەلای ئێوە کوژراوە خوێنەکەی بدەن). ئەوانیش وەڵامی نامەکەیان دایەوەو پاکانەیان کردبوو پەنجا

کەسیان سوێنیان خواردبوو بە (اللە) کە ئێمە نەمان کوشتوەو ئاگاشمان لێ نیە کە کێ کوشتویەتی. راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم خۆی خوێنی کوژراوەکەی دا کە سەد وشتر بوو.

٤٥٢٦ - (شاذ) عن أبو سلمة بن عبد الرحمن وسليمان بن يسار, عن رجال من الأنصار: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِلْيَهُودِ وَبَدَأَ بِهِمْ: (يَحْلِفُ مِنْكُمْ خَمْسُونَ رَجُلاً). فَأَبَوْا. فَقَالَ لِلأَنْصَارِ: (اسْتَحِقُّوا). فَقَالُوا: نَحْلِفُ عَلَى الْغَيْبِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟! فَجَعَلَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِيَةً عَلَى يَهُودَ, لأَنَّهُ وُجِدَ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی (عبد الرحمن) و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە، لە پیاوانێ لە ئەنصارەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لە جولەکەکانەوە دەستی پێ کردو پێی فەرموون: (با پەنجا کەس لەئێوە سوێند بخۆن). ئەوانیش رازی نەبوون، جا پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بە ئەنصارەکانی فەرموو: (دەی ئێوە سوێند بخۆن؟!) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەسەر شتی نادیار سوێند بخۆین؟! پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم خوێنەکەی خستە ئەستۆی جولەکەکانەوە چونکە لەلای ئەوان دۆزرایەوە کە کوژرابوو.

# دەربارەی بکوژ تۆڵەی لێ دەکرێتەوە

## ١٠ - باب يُقَادُ مِنَ الْقَاتِلِ.

٤٥٢٧ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَتْ قَدْ رُضَّ رَأْسُهَا بَيْنَ حَجَرَيْنِ, فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ؟ أَفُلَانٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ, فَأَوْمَتْ بِرَأْسِهَا, فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ, فَاعْتَرَفَ, فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێکی جولەکە سەری کچۆڵەیەکی شکاندبوو لەنێوان دوو بەرددا، بە نیوە گیانی پێی وترا: کێ وای لێ کردی: ئایا فڵان کەس بوو، ئایا فڵان کەس بوو، ناوی چەند کەسێکیان هێنا هەتا گەیشتنە سەر ناوی جولەکەکە سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد کە بەڵێ ئەو وای لێ کردوم، کابرای جولەکەیان گرت و هێنایان بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، جولەکەکە دانی نا بە تاوانەکەیدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا لەنێوان دوو بەرددا سەری ئەویشیان شکاند.

٤٥٢٨- (صحيح) عن أنس: أَنَّ يَهُودِيًّا قَتَلَ جَارِيَةً مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى حُلِيٍّ لَهَا, ثُمَّ أَلْقَاهَا فِي قَلِيبٍ, وَرَضَخَ رَأْسَهَا بِالْحِجَارَةِ, فَأُخِذَ, فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ حَتَّى يَمُوتَ, فَرُجِمَ حَتَّى مَاتَ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێکی جولەکە لەسەر هەندێ خشل سەری کچۆڵەیەکی ئەنصاری بە بەرد شکاندبوو، بە نیوە گیانی فڕێی دابوە ناو بیرێکەوە، گرتیان و هێنایان بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمانی دا بەردبارانی بکەن هەتا دەمرێت، ئەوانیش بردیان بەردبارانیان کرد هەتا مرد.

٤٥٢٩ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ جَارِيَةً كَانَ عَلَيْهَا أَوْضَاحٌ لَهَا فَرَضَخَ رَأْسَهَا يَهُودِيٌّ بِحَجَرٍ, فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِهَا رَمَقٌ, فَقَالَ لَهَا: (مَنْ قَتَلَكِ فُلاَنٌ قَتَلَكِ؟). فَقَالَتْ: لاَ. بِرَأْسِهَا, قَالَ: (مَنْ قَتَلَكِ فُلاَنٌ قَتَلَكِ؟). قَالَتْ لاَ. بِرَأْسِهَا, قَالَ: (فُلاَنٌ قَتَلَكِ؟). قَالَتْ: نَعَمْ. بِرَأْسِهَا, فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُتِلَ بَيْنَ حَجَرَيْنِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە کچۆڵەیەك هەندێ خشڵی پێوە بوو، پیاوێکی جولەکە بە بەرد سەری شکاندبوو، بە نیوە گیانی هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (کێ وای لێ کردی فڵان کەس سەری شکاندی؟) بەسەری ئاماژەی کرد وتی: نەخێر، فەرمووی: (کێ وای لێ کردی فڵان کەس بوو؟) بەسەری ئاماژەی کرد وتی: نەخێر، فەرمووی: (فڵان کەس وای لێ کردی؟) بەسەری ئاماژەی کرد وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا لەنێوان دوو بەردا سەری ئەویشیان شکاند.

## دەربارەی ئایا موسوڵمان لەسەر کافر تۆڵەی لێ دەکرێتەوە.

## ١١ - باب أَيُقَادُ الْمُسْلِمُ بِالْكَافِرِ

٤٥٣٠ - (صحيح) عن قيس بن عباد قال: انْطَلَقْتُ أَنَا وَالأَشْتَرُ إِلَى عَلِيٍّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ, فَقُلْنَا: هَلْ عَهِدَ إِلَيْكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا, لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً؟ قَالَ: لاَ, إِلاَّ مَا فِي كِتَابِي هَذَا - قَالَ مُسَدَّدٌ: قَالَ: فَأَخْرَجَ كِتَابًا, وَقَالَ أَحْمَدُ: كِتَابًا مِنْ قِرَابِ سَيْفِهِ - فَإِذَا فِيهِ: (الْمُؤْمِنُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ, وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ, وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ, أَلاَ لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ, وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ, مَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا فَعَلَى نَفْسِهِ, وَمَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ).

واتە: لە قەیسی كوڕی عەبادەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: من ئەشتەر چوین بۆ لای پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ، وتمان: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ وەسیەتێكی بۆ كردووی كە بۆ خەڵكی بە گشتی نەكردبێ؟ وتی: نەخێر، جگە لەم نامەیە - موسەددەد وتی: وتی: نامەیەكی دەرهێنا، ئەحمەد وتی: لە چەرمێكدا كە شمشێرو قامچی تێ دەخرا نامەیەكی دەرهێنا - ئەمەی تێدا نوسرابوو: (باوەڕداران خوێنەكانیان یەكسانە - واتە: لە تۆڵە لێ سەندن و خوێن كەوتنەسەردا وەك یەكن گەورەو بچوك و خاوەن پلەو پایەو بێ پلەو پایە -، *ئەكەوێتە گەردنی هەموویانەوە ئەوەی كە لەگەردنی كەمترین و خوارترینیاندا* بێت - واتە ئەگەر لەخوارترینی موسوڵمانان لە پلەو پایەدا پەنای كافرێكی دا ئەوا پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان بیپارێزن -، یەكدەستن بەرامبەر بە جگە لە خۆیان و یارمەتی دەری یەكترن، كەسی باوەڕدار بە كافر ناكوژرێت، كافرێ كە لەناو بەڵێن و پەیمانی موسوڵماناندا بێت بە كافرێكی دەرەوە بەڵێن و پەیمانی موسوڵمانان ناكوژرێتەوە، هەركەسێ كارێكی (بیدعە) دابهێنێ ئەوە تاوانەكەی لەئەستۆیەتی، وە هەر كەسێ كارێكی (بیدعە) دابهێنێ یان ئەهلی بیدعە پەنا بدات و سەری بخات ئەوە نەفرینی خوداو مەلائیكەكان و ئەو خەڵكە هەر هەمووی لەسەربێ).

٤٥٣١ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم, ذكر نحو حديث علي, زاد فيه: (وَيُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ, وَيَرُدُّ مُشِدُّهُمْ عَلَى مُضْعِفِهِمْ, وَمُتَسَرِّيهِمْ عَلَى قَاعِدِهِمْ).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی، جا ڕاوی وەك فەرموودەكەی عەلی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد: واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دورترینی موسوڵمانان پەنای كافرێكی دا ئەوا پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان بیپارێزن، - خاوەن پلەوپایەو لەخوارترینیان





وەك يەكن بۆ بەڵێن و پەيماندان بە كافر -، بەهێز و بێ هێزيان وەك يەك بەشدارن لە دەستكەوتی جەنگيدا، ئەوەی لە لەشكرەكە جيابێتەوە و ئەوەی كە دەمێنێتەوە وەك يەكيان بەردەكەوێت).

## ئەگەر کەسێ یەکێ بگرێت بەسەر ژنەکەیەوە ئایا بیکوژێت یان نا؟

## ١٢ - باب فِي مَنْ وَجَدَ مَعَ أَهْلِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ

٤٥٣٢ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ يَجِدُ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ). قَالَ سَعْدٌ: بَلَى وَالَّذِى أَكْرَمَكَ بِالْحَقِّ. قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اسْمَعُوا إِلَى مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ). قَالَ عَبْدُ الْوَهَّابِ: (إِلَى مَا يَقُولُ سَعْدٌ).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێڕنەوە، كە سەعدی كوڕی عوبادە وتويەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم ئەگەر پياوێك بەسەر ژنەكەيەوە پياوێ بگرێت ئايا بيكوژێت؟ فەرمووی: (نەخێر). سەعد وتی: بەڵێ، بيكوژێت بەو (الله)يەی كە رێزی لەتۆ ناوە بە هەق، پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم فەرمووی: (گوێ بگرن لەوەی كە گەورەكەتان دەيڵێت). عبد الوهاب وتی: پێغەمبەر صلی الله عليه وسلم فەرمووی: (گوێ بگرن لەوەی كە سەعد دەيڵێت).

٤٥٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرَأَيْتَ لَوْ وَجَدْتُ مَعَ امْرَأَتِى رَجُلاً أُمْهِلُهُ حَتَّى آتِىَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟ قَالَ: (نَعَمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە سەعدی کوڕی عوبادە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وت: پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە پیاوێ بگرێت ماوەی پێ بدات هەتا چوار شایەت دەهێنێ؟ فەرمووی: (بەڵێ).

## سەبارەت بە ئەگەر سەرکار بە هەڵە شتێکی لەدەست بقەومێ تۆڵەی لێ دەکرێتەوە یان نا؟

## ١٣ - باب الْعَامِلِ يُصَابُ عَلَى يَدَيْهِ خَطَأً.

٤٥٣٤ - (صحيح) عن عائشة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ أَبَا جَهْمِ بْنَ حُذَيْفَةَ مُصَدِّقًا, فَلاَجَّهُ رَجُلٌ فِي صَدَقَتِهِ, فَضَرَبَهُ أَبُو جَهْمٍ, فَشَجَّهُ, فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: الْقَوَدَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَكُمْ كَذَا وَكَذَا). فَلَمْ يَرْضَوْا, فَقَالَ: (لَكُمْ كَذَا وَكَذَا). فَلَمْ يَرْضَوْا, فَقَالَ: (لَكُمْ كَذَا وَكَذَا). فَرَضُوا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي خَاطِبٌ الْعَشِيَّةَ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ). فَقَالُوا: نَعَمْ. فَخَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (إِنَّ هَؤُلاَءِ اللَّيْثِيِّينَ أَتَوْنِي يُرِيدُونَ الْقَوَدَ, فَعَرَضْتُ عَلَيْهِمْ كَذَا وَكَذَا فَرَضُوا أَرَضِيتُمْ). قَالُوا: لاَ. فَهَمَّ الْمُهَاجِرُونَ بِهِمْ, فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَكُفُّوا عَنْهُمْ, فَكَفُّوا, ثُمَّ دَعَاهُمْ فَزَادَهُمْ, فَقَالَ: (أَرَضِيتُمْ). فَقَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: (إِنِّي خَاطِبٌ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ). قَالُوا: نَعَمْ. فَخَطَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَرَضِيتُمْ). قَالُوا: نَعَمْ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەبا جەهمی کوڕی (حذیفة)ی نارد بۆ زەکات کۆکردنەوە، کەسێ لەسەر زەکاتەکەی دەمەقاڵەی لەتەك کرد، ئەویش سەری شکاند، کابرا هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای

تۆڵەسەندنەوەی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (واز لە تۆڵەسەندنەوە بێنە ئەوەندەو ئەوەندە ماڵت دەدەینێ). رازی نەبوو، بۆی زیاد کردو فەرمووی: (ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەینێ). هەر رازی نەبوو، بۆی زیاد کردو فەرمووی: (ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەینێ). رازی بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من ئەم ئێوارە وتار دەدەم بۆ خەڵك و هەواڵیان دەدەمێ کە ئێوە رازی بوون) وتیان: بەڵێ باشە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆدان، فەرمووی: (ئەوانە (لیث)یەکان هاتون و داوای تۆڵەسەندنەوە دەکەن، منیش ئەوەندەو ئەوەندە ماڵم بۆ پێشنیاز کردون ئایا ئێوە رازین؟). وتیان: نەخێر رازی نین، کۆچەران نیازیان بوو ئازاریان بدەن و لێیان بدەن، چونکە لەتەك پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم درۆیان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا وازیان لێ بێنن، لەپاشدا بانگی کردنەوەو بۆی زیاد کردن فەرمووی: (ئایا ئێوە بە ئەوەندە ماڵ رازین؟) وتیان: بەڵێ. فەرمووی: (وتار دەدەم بۆ خەڵك و هەواڵیان دەدەمێ کە ئێوە رازی بوون) وتیان: بەڵێ باشە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆدان و فەرمووی: (ئایا ئێوە رازین؟) وتیان: بەڵێ رازین.

## باسی تۆڵەکردنەوە بەبێ بەکارهێنای ئاسن.

## ١٤ - باب الْقَوَدِ بِغَيْرِ حَدِيدٍ.

٤٥٣٥ – (صحيح) عن أنس: أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَتْ قَدْ رُضَّ رَأْسُهَا بَيْنَ حَجَرَيْنِ, فَقِيلَ لَهَا مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ, أَفُلَانٌ, حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ, فَأَوْمَتْ بِرَأْسِهَا, فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ, فَاعْتَرَفَ, فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی جولەکە سەری کچۆڵەیەکی شکاندبوو لەنێوان دوو بەرددا، بە نیوە گیانی پێی وترا: کێ وای لێ کردی: ئایا فلان کەس بوو، ئایا فلان کەس بوو، ناوی چەند کەسێکیان هێنا هەتا گەیشتنە سەر

ناوی جولەکەکە سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد کە بەڵێ ئەو وای لێ کردوم، کابرای جولەکەیان گرت و هێنایان بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، جولەکەکە دانی نا بە تاوانەکەیدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە بەرد سەری ئەویش بشکێنن.

## باسی تۆڵەکردنەوە لە لێدان، تەنانەت لە کاربەدەست خۆشی.

## ١٥ - باب الْقَوَدِ مِنَ الضَّرْبَةِ وَقَصِّ الأَمِيرِ مِنْ نَفْسِهِ.

٤٥٣٦ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري قال: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ قَسْمًا أَقْبَلَ رَجُلٌ فَأَكَبَّ عَلَيْهِ, فَطَعَنَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُرْجُونٍ كَانَ مَعَهُ فَجُرِحَ بِوَجْهِهِ, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَعَالَ فَاسْتَقِدْ). فَقَالَ: بَلْ عَفَوْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماڵێکی دابەش دەکرد پیاوێ پەلاماری دا، لقە دارخورمایەکی وشکی بەدەستەوە بوو روخساری کابرای بریندار کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (وەرە تۆڵەی خۆتم لێ بکەرەوە). وتی: نا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵکو لێت خۆش بووم.

٤٥٣٧ - (ضعيف) عن أبو فراس قال: خَطَبَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ عُمَّالِي لِيَضْرِبُوا أَبْشَارَكُمْ وَلاَ لِيَأْخُذُوا أَمْوَالَكُمْ, فَمَنْ فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ فَلْيَرْفَعْهُ إِلَيَّ أَقُصُّهُ مِنْهُ, قَالَ: عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ لَوْ أَنَّ رَجُلاً أَدَّبَ بَعْضَ رَعِيَّتِهِ أَتَقُصُّهُ مِنْهُ, قَالَ: إِي وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ أَقُصُّهُ, وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَصَّ مِنْ نَفْسِهِ.

واتە: لە ئەبو فیراسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ وتاری بۆ دەخوێندینەوە فەرمووی: کاربەدەستان بۆ ئەو نانێرم لێتان بدەن و ماڵ و سامانتان بەرن، هەرکەس کاری لەو جۆرەی لەگەڵ کردن با بێت شکات بکات و پێم بڵێن ئەوە خۆم تۆڵەی لێ دەکەمەوە بۆی، عەمری کوڕی عاص وتی: ئەی ئەگەر یەکێ تەمێی کەسێ لەژێردەستەکانی خۆی بکات تۆڵەی لێ دەکەیتەوە، فەرمووی: بەڵێ سوێند بە (الله) تۆڵەی لێ دەکەمەوە، چونکە بەڕاستی بۆ خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە تۆڵەی لەخۆی ئەسەند.

## لێخۆشبون لە خوێن لەلایەن ئافرەتانەوە.

## ١٦ - باب عَفْوِ النِّسَاءِ عَنِ الدَّمِ.

٤٥٣٨ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (عَلَى الْمُقْتَتِلِينَ أَنْ يَنْحَجِزُوا الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ وَإِنْ كَانَتِ امْرَأَةً). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: بَلَغَنِى أَنَّ عَفْوَ النِّسَاءِ فِي الْقَتْلِ جَائِزٌ إِذَا كَانَتْ إِحْدَى الأَوْلِيَاءِ, وَبَلَغَنِى عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ فِي قَوْلِهِ: (يَنْحَجِزُوا). يَكُفُّوا عَنِ الْقَوَدِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خزم و کەسوکاری کوژراو کامەیان خزمایەتی نزیکتر بێ لە کوژراوەکەوە ئەوە لەپێشترە بۆ لێخۆشبون، با ئافرەتیش بێت). ئەبو داود دەڵێت: پێم گەیشتوە کە لێخۆشبون لەلایەن ئافرەتانەوە دروستە ئەگەر یەکێ بێ لە خزمانی کوژراوەکە. هەروەها لە ئەبو عوبەیدەوە پێم گەیشتوە کە: (يَنْحَجِزُوا) وازهێنانە لە تۆڵەکردنەوە.

## ئەوەی كوێرانە بكوژرێت لە نێوان خەڵك دا

### ١٧ - باب مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيَّاءَ بَيْنَ قَوْمٍ.

٤٥٣٩ - (صحيح بما بعده) عن ابن عبيد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيًا فِي رَمْيٍ يَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحِجَارَةٍ أَوْ ضَرْبٍ بِالسِّيَاطِ أَوْ ضَرْبٍ بِعَصًا: فَهُوَ خَطَأٌ, وَعَقْلُهُ عَقْلُ الْخَطَإِ, وَمَنْ قُتِلَ عَمْدًا فَهُوَ قَوَدٌ). وَقَالَ ابْنُ عُبَيْدٍ: (قَوَدُ يَدٍ). ثُمَّ اتَّفَقَا: (وَمَنْ حَالَ دُونَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَغَضَبُهُ لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ). وَحَدِيثُ سُفْيَانَ أَتَمُّ.

واتە: لە ئیبنو عوبەیدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس لە شەڕە بەرد و شەڕە قەمچی و شەڕە تێڵادا كوێرانە كوژرا لە نێواندا كەس نەیدەزانی كێ كوشتویەتی ئەوە دادەنرێ بە كوشتنی هەڵە، خوێنبایی وەك خوێنبایی كوشتنی هەڵەیە، وە هەركەس بە قەستی بكوژرێ ئەوە تۆڵە لە بكوژ دەكرێتەوەو لەجیاتی كوژراوەكە دەكوژرێتەوە - مەگەر خاوەنەكەی لێی خۆش ببێ - ). ئیبنو عوبەید دەڵێت: (قَوَدُ يَدٍ). واتە: وشەی (يَدٍ)ی بۆ زیاد كرد، لەپاشدا هەردوو راوی هاوڕان كە فەرمووی: (ئەوەی سەرپێچی لەمە بكات و رێگە نەدات ئەوە نەفرەتی خوای لەسەر بێ و غەزەبی خوای لێ بێ و فەرز و سوننەتی هەرگیز لێ وەرنەگیرێ). بەڵام فەرموودەكەی سوفیان تەواوترە.

٤٥٤٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ سُفْيَانَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی. جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە بە هەمان مانای فەرمودەکەی سوفیان.

## باسی نرخی خوێنبایی چەندە.

## ١٨ - باب الدِّيَةِ كَمْ هِيَ

٤٥٤١ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى أَنَّ مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ: ثَلاَثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ: وَثَلاَثُونَ بِنْتَ لَبُونٍ, وَثَلاَثُونَ حِقَّةً, وَعَشْرَةٌ بَنِي لَبُونٍ ذَكَرٍ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا نرخی خوێنی کوشتنی هەڵە سەد وشترە: سی وشتری مێی تەمەن یەك ساڵە، سی وشتری مێی دوو ساڵە، سی وشتری مێی سێ ساڵە، دە وشتری نێری دوو ساڵە).

٤٥٤٢ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: كَانَتْ قِيمَةُ الدِّيَةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَانَمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ ثَمَانِيَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ, وَدِيَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ يَوْمَئِذٍ النِّصْفُ مِنْ دِيَةِ الْمُسْلِمِينَ. قَالَ: فَكَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ حَتَّى اسْتُخْلِفَ عُمَرُ رَحِمَهُ اللَّهُ فَقَامَ خَطِيبًا, فَقَالَ: أَلاَ إِنَّ الإِبِلَ قَدْ غَلَتْ. قَالَ: فَفَرَضَهَا عُمَرُ عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفَ دِينَارٍ, وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ اثْنَىْ عَشَرَ أَلْفًا, وَعَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَىْ بَقَرَةٍ, وَعَلَى أَهْلِ الشَّاءِ أَلْفَىْ شَاةٍ, وَعَلَى أَهْلِ الْحُلَلِ مِائَتَىْ حُلَّةٍ. قَالَ: وَتَرَكَ دِيَةَ أَهْلِ الذِّمَّةِ لَمْ يَرْفَعْهَا فِيمَا رَفَعَ مِنَ الدِّيَةِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نرخی خوێن

هەشت سەد دینار بوو، یان هەشت هەزار درهەم بوو. خوێنی خاوەن نامەکان نیوەی خوێنی موسوڵمانان بوو، راوی وتی: ئیتر هەر بەو شێوەیە مایەوە هەتا پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ کرا بە جێنشین، هەستا وتارێکی خوێندەوەو فەرمووی: ئاگاداربن کە وشتر گران بووە. راوی وتی: پێشەوا عومەر بڕیاری دا ئەوەی کە زێڕ دەدات لەباتی خوێن دەبێ هەزار دینار بدات، ئەوەی کە زیو دەدات دەبێ دوانزە هەزار درهەم بدات، ئەوەی کە رەشەوڵاخ دەدات دەبێ دوو سەد سەر مانگا بدات، ئەوەی کە مەڕ و بزن دەدات دەبێ دوو هەزار سەر بدات. ئەوەی کە جل و بەرگ دەدات دەبێ دوو سەد قات جل بدات. راوی وتی: بەڵام خوێنایی خاوەن نامەکانی زیاد نەکردو وەك خۆی هێشتیەوە.

٤٥٤٣ - (ضعيف) عن عطاء بن أبي رباح: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي الدِّيَةِ عَلَى أَهْلِ الإِبِلِ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ, وَعَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ, وَعَلَى أَهْلِ الشَّاءِ أَلْفَيْ شَاةٍ, وَعَلَى أَهْلِ الْحُلَلِ مِائَتَيْ حُلَّةٍ, وَعَلَى أَهْلِ الْقَمْحِ شَيْئًا لَمْ يَحْفَظْهُ مُحَمَّدٌ.

واتە: لە (عطاء) عەمری کوڕی ئەبو رەباحەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا ئەوەی کە وشتر دەدات لەباتی خوێن دەبێ سەد وشتر بدات، ئەوەی کە رەشەوڵاخ دەدات دەبێ دوو سەد سەر مانگا بدات، ئەوەی کە مەڕ و بزن دەدات دەبێ دوو هەزار سەر بدات. ئەوەی کە جل و بەرگ زێڕ دەدات دەبێ دوو سەد قات جل بدات. بۆ ئەوانەی کە گەنم دەدەن شتێکی فەرموو راوی فەرمودەکە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەبەری نەکرد.

٤٥٤٤ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ مِثْلَ حَدِيثِ مُوسَى. وَقَالَ: وَعَلَى أَهْلِ الطَّعَامِ شَيْئًا لاَ أَحْفَظُهُ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرزی کرد، جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە وەك

فەرمودەکەی موسا واتە فەرمودەی پێشو. وتی: بۆ ئەوانەی کە خواردن دەدەن شتێکی فەرموو بەڵام من لەبەرم نەکرد.

٤٥٤٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (فِي دِيَةِ الْخَطَإِ: عِشْرُونَ حِقَّةً, وَعِشْرُونَ جَذَعَةً, وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ, وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ, وَعِشْرُونَ بَنِي مَخَاضٍ ذُكُرٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: خوێنی کوشتنی هەڵە دەکاتە: بیست سەر وشتری مێی سێ ساڵە، بیست سەر وشتری مێی سێ ساڵە، بیست سەر وشتری مێی چوار ساڵە، بیست سەر وشتری مێی یەك ساڵە، بیست سەر وشتری مێی دوو ساڵە، بیست سەر وشتری نێری یەك ساڵە).

٤٥٤٦ - (ضعيف) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي عَدِيٍّ قُتِلَ فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِيَتَهُ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە بەنی عەدی کوژرا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوانزە هەزار درهەمی دانا بە خوێنبایی بۆی.

## خوێن بایی کوشتنی نیمچە بە قەستی.

## ١٩ - باب دِيَةِ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ.

٤٥٤٧ - عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ يَوْمَ الْفَتْحِ بِمَكَّةَ فَكَبَّرَ ثَلاَثًا, ثُمَّ قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ, صَدَقَ وَعْدَهُ, وَنَصَرَ عَبْدَهُ, وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ). إِلَى هَا هُنَا حَفِظْتُهُ عَنْ مُسَدَّدٍ, ثُمَّ اتَّفَقَا: (أَلاَ إِنَّ كُلَّ مَأْثُرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تُذْكَرُ وَتُدْعَى مِنْ دَمٍ أَوْ مَالٍ تَحْتَ قَدَمَيَّ إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ سِقَايَةِ الْحَاجِّ, وَسِدَانَةِ الْبَيْتِ). ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا). وَحَدِيثُ مُسَدَّدٍ أَتَمُّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەرۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا وتاری دا سێ (الله أکبر)ی کرد، لەپاشدا فەرمووی: (هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، بەڵێن و پەیمانەکەی بردە سەر، بەندەکەی سەرخست، حزبەکانی شکاند). هەتا ئێرەم لەبەر کردوە لە موسەددەدەوە، ئینجا هەردوو راوی هاوڕان کە فەرمووی: (ئاگاداربن هەموو داب و نەریت و دەستورێکی خەڵکانی نەفامی کە شانازی پێوە بکەن دەیخەمە ژێر پێمەوە بێجگە لە ئاودانی حاجیان و سەرەوکاری و خزمەتکردنی ماڵی خوا). ئینجا فەرمووی: (ئاگاداربن خوینی کوشتنی نیمچە قەستی بە قەمچی بێ یان بە تێڵا سەد وشترە دەبێ چلیان بەچکە لە سکیاندا بێ).

٤٥٤٨ – عن خالد, بِهَذَا الإِسْنَادِ, نَحْوَ مَعْنَاهُ.

٤٥٤٩ - عن ابن عمر, عن النبي صلى الله عليه و سلم, بمعناه, قال: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْفَتْحِ أَوْ فَتْحِ مَكَّةَ عَلَى دَرَجَةِ الْبَيْتِ أَوِ الْكَعْبَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە. وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا لەسەر پیلکانەی ماڵی خوا یان سەردەرگای کەعبە وتاری دا.

٤٥٥٠ - عن مجاهد قال: قَضَى عُمَرُ فِي شِبْهِ الْعَمْدِ: ثَلاَثِينَ حِقَّةً, وَثَلاَثِينَ جَذَعَةً, وَأَرْبَعِينَ خَلِفَةً مَا بَيْنَ ثَنِيَّةٍ إِلَى بَازِلِ عَامِهَا.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەر بڕیاری دا نرخی خوێنی کوشتنی نیمچە قەستی سەد وشترە: سی وشتری مێی سێ ساڵە، سی وشتری مێی چوار ساڵە، لەگەڵ چل وشتری ئاوس کە پێیان نابێتە شەش ساڵیەوە تا نۆ ساڵی.

٤٥٥١ - (ضعيف الإسناد) عن علي رضي الله عنه قال: فِي شِبْهِ الْعَمْدِ أَثْلاَثٌ ثَلاَثٌ: وَثَلاَثُونَ حِقَّةً, وَثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً, وَأَرْبَعٌ وَثَلاَثُونَ ثَنِيَّةً إِلَى بَازِلِ عَامِهَا كُلُّهَا خَلِفَةٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی کوشتنی نیمچە قەستی وتویەتی: دەکرێت بە سێ بەشەوە: سی و سێ وشتری مێی سێ ساڵە، سی و سێ وشتری مێی چوار ساڵە، سی و چوار وشتر کە پێیان نابێتە شەش ساڵیەوە هەتا نۆ ساڵی دەبێ هەموویان ئاوس بن.

٤٥٥٢ - (ضعيف الإسناد) عن عبدالله في شبه عمد: خَمْسٌ وَعِشْرُونَ حِقَّةً, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ جَذَعَةً, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ مَخَاضٍ.

واته: له (عبد الله)وه دەگێڕنەوه، کە دەربارەی نرخی کوشتنی نیمچە قەستی وتویەتی: دەکاته: بیست و پێنج وشتری مێی سێ ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی چوار ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی دوو ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی یەك ساڵه.

٤٥٥٣ - (ضعيف الإسناد) عن علي رضي الله عنه فِي الْخَطَإِ أَرْبَاعًا: خَمْسٌ وَعِشْرُونَ حِقَّةً, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ جَذَعَةً, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ, وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ مَخَاضٍ.

واته: له پێشەوا عەلیەوه ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوه، کە دەربارەی کوشتنی هەڵە وتویەتی: دەکرێت بە چوار بەشەوه: بیست و پێنج وشتری مێی سێ ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی چوار ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی دوو ساڵه، بیست و پێنج وشتری مێی یەك ساڵه.

٤٥٥٤ - (صحيح) عن عثمان بن عفان وزيد بن ثابت فِي الْمُغَلَّظَةِ: أَرْبَعُونَ جَذَعَةً خَلِفَةً, وَثَلاَثُونَ حِقَّةً, وَثَلاَثُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ, وَفِي الْخَطَإِ: ثَلاَثُونَ حِقَّةً, وَثَلاَثُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ, وَعِشْرُونَ بَنُو لَبُونٍ ذُكُورٍ, وَعِشْرُونَ بَنَاتِ مَخَاضٍ.

واته: له پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەفان و زەیدی کوڕی (ثابت)ەوه ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوه، کە دەربارەی کوشتنی نیمچە قەستی وتویانه: دەکاته چل وشتری ئاوس، سی وشتری مێی سێ ساڵه، سی وشتری مێی دوو ساڵه. هەروەها دەربارەی کوشتنی هەڵە وتویانه: دەکاته سی وشتری مێی سێ ساڵه، سی وشتری مێی دوو ساڵه، بیست وشتری نێری دوو ساڵه، بیست وشتری مێی یەك ساڵه.

٤٥٥٥ - صحيح الإسناد) عن زيد بن ثابت فِي الدِّيَةِ الْمُغَلَّظَةِ. فَذَكَرَ مِثْلَهُ سَوَاءً.

واتە: لە زەیدی كوڕی (ثابت)ەوە دەربارەی كوشتنی نیمچە قەستی هاتوە. جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕاوە.

## ٩١- باب الأسنان الإبل

(صحيح الإسناد) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: وَعَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ إِذَا دَخَلَتِ النَّاقَةُ فِي السَّنَةِ الرَّابِعَةِ فَهُوَ حِقٌّ, وَالأُنْثَى حِقَّةٌ, لأَنَّهُ يَسْتَحِقُّ أَنْ يُحْمَلَ عَلَيْهِ وَيُرْكَبَ, فَإِذَا دَخَلَ فِي الْخَامِسَةِ فَهُوَ جَذَعٌ وَجَذَعَةٌ, فَإِذَا دَخَلَ فِي السَّادِسَةِ وَأَلْقَى ثَنِيَّتَهُ فَهُوَ ثَنِيٌّ وَثَنِيَّةٌ, فَإِذَا دَخَلَ فِي السَّابِعَةِ فَهُوَ رَبَاعٌ وَرَبَاعِيَةٌ, فَإِذَا دَخَلَ فِي الثَّامِنَةِ وَأَلْقَى السِّنَّ الَّذِى بَعْدَ الرَّبَاعِيَةِ فَهُوَ سَدِيسٌ وَسَدَسٌ, فَإِذَا دَخَلَ فِي التَّاسِعَةِ وَفَطَرَ نَابُهُ وَطَلَعَ فَهُوَ بَازِلٌ, فَإِذَا دَخَلَ فِي الْعَاشِرَةِ فَهُوَ مُخْلِفٌ, ثُمَّ لَيْسَ لَهُ اسْمٌ وَلَكِنْ يُقَالُ: بَازِلُ عَامٍ, وَبَازِلُ عَامَيْنِ, وَمُخْلِفُ عَامٍ, وَمُخْلِفُ عَامَيْنِ إِلَى مَا زَادَ. وَقَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: بِنْتُ مَخَاضٍ لِسَنَةٍ, وَبِنْتُ لَبُونٍ لِسَنَتَيْنِ, وَحِقَّةٌ لِثَلاَثٍ, وَجَذَعَةٌ لأَرْبَعٍ, وَالثَّنِيُّ لِخَمْسٍ, وَرَبَاعٌ لِستٍّ, وَسَدِيسٌ لِسَبْعٍ وَبَازِلٌ لِثَمَانٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ أَبُو حَاتِمٍ وَالأَصْمَعِيُّ وَالْجَذُوعَةُ وَقْتٌ وَلَيْسَ بِسِنٍّ. قَالَ أَبُو حَاتِمٍ: قَالَ بَعْضُهُمْ: فَإِذَا أَلْقَى رَبَاعِيَتَهُ فَهُوَ رَبَاعٌ, وَإِذَا أَلْقَى ثَنِيَّتَهُ فَهُوَ ثَنِيٌّ, وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: إِذَا أُلْقِحَتْ فَهِيَ خَلِفَةٌ فَلاَ تَزَالُ خَلِفَةً إِلَى عَشْرَةِ أَشْهُرٍ, فَإِذَا بَلَغَتْ عَشْرَةَ أَشْهُرٍ فَهِيَ عُشَرَاءُ. قَالَ أَبُو حَاتِمٍ: إِذَا أَلْقَى ثَنِيَّتَهُ فَهُوَ ثَنِيٌّ, وَإِذَا أَلْقَى رَبَاعِيَتَهُ فَهُوَ رَبَاعٌ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەبو عوبەید لە جگە لە كەسێكەوە ریوایەتی كردوەو وتویەتی: كاتێ كە وشتر پێی نایە ساڵی چوارەمەوەو سێ ساڵی تەواو كرد ئەگەر نێر بوو





پێی دەوترێت: (حِق)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (حِقَّة)، هەتا چوار ساڵ، چونکە شایستەی ئەوەن کە بۆ سواری بەکاربێن، مێیەکەش شایستەی ئەوەیە کە کەڵ بگرێت و ئاوس ببێت، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی پێنج ساڵیەوە ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت: (جَذَع)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (جَذَعَةٌ) هەتا پێنج ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی شەش ساڵیەوەو ددانەکانی پێشەوەی لەسەر و لەخوارەوە کە پێیان دەوترێت: (ثَنِيّة) کەوتن، ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت: (ثَنِيّ)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (ثَنِيَّتَه)، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی حەوت ساڵیەوە ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت: (رَبَاعِی)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (رَبَاعِيَّة) هەتا حەوت ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی هەشت ساڵیەوەو ددانە شەشیەکانی کە لەدوای چواریەکانەوە دێن کەوتن ئەوە پێیان دەوترێت: (سَدِيسٌ) و (سَدَسٌ)، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی نۆ ساڵیەوەو کەڵبەکانی کەوتن پێی دەوترێت: (بَازِل)، واتە کەڵبەکانی کەوتون، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی دە ساڵیەوە ئەوە (مُخْلِف)ە، لەپاشدا ناوی نیە: بەڵام پێی دەوترێت: (بَازِل)ی یەك ساڵ، (بَازِل)ی دوو ساڵ، (مُخْلِف)ی یەك ساڵ، (مُخْلِف)ی دوو ساڵ، (مُخْلِف)ی سێ ساڵ، هەتا زیاتر بکات. (نضر)ی کوڕی شومەیل دەڵێت: (بِنْتُ مَخَاض) وشتری تەمەن یەك ساڵە، (بِنتُ لَبُونٍ) وشتری تەمەن دوو ساڵە، (حِقّه)، سێ ساڵە، (جَذعَة) چوار ساڵە، (ثنِية) پێنج ساڵە، (ربَاع) شەش ساڵە، (سدِيس) حەوت ساڵە، (بازل) هەشت ساڵە، ئەبو داود دەڵێت: (جَذَعَةٌ) ساڵ نیە بەڵکو کاتە. ئەبو حاتیم دەڵێت: هەندێکیان دەڵێن: ئەگەر ددانە چواریەکانی کەوتن ئەوە پێی دەوترێت: (رَبَاعِيَّة)، ئەگەر ددانە دوانیەکانی کەوتن ئەوە پێی دەوترێت: (ثنِي)، ئەبو عوبەید دەڵێت: ئەگەر ئاوس بوو ئەوە پێی دەوترێت: (خلفة) بەردەوام پێی دەوترێت: (خلفة) هەتا دە مانگ، کاتێ کە گەیشتە دە مانگ ئەوە پێی دەوترێت: (عُشراء). وە ئەبو حاتیم دەڵێت: ئەگەر ددانە (ثَنِيّة)کانی کەوتن ئەوە پێی دەوترێت: (ثَنِيّ)، بەڵام ئەگەر ددانە چواریەکانی کەوتن ئەوە پێی دەوترێت: (رباع).

# باسی خوێنبایی ئەندامەکانی جەستە

## ٢٠ - باب دِيَاتِ الأَعْضَاءِ.

٤٥٥٦ - (صحيح) عن أبو موسى: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الأَصَابِعُ سَوَاءٌ, عَشْرٌ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم: دەربارەی کوشتنی نیمچە قەستی فەرموویەتی: (خوێنبایی پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێ وەك یەکن، دە وشتر بۆ هەر یەکێ لە دە پەنجەکە).

٤٥٥٧ - (صحيح) عن الأشعري: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الأَصَابِعُ سَوَاءٌ). قُلْتُ: عَشْرٌ عَشْرٌ؟ قَالَ: (نَعَمْ).

واتە: لە ئەشعەریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێ وەك یەکن). وتم: دە وشتر بۆ هەر یەکێ لە دە پەنجەکە؟ فەرمووی: (بەڵێ).

٤٥٥٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ). قَالَ يَعْنِى الإِبْهَامَ وَالْخِنْصَرَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەمەو ئەمە یەکسانن خوێنیان وەك یەکە). راوی وتی: واتە: پەنجە توتەو پەنجە کەڵە وەك یەکن.

٤٥٥٩ - (صحيح) عن ابن عباس: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الأَصَابِعُ سَوَاءٌ, وَالأَسْنَانُ سَوَاءٌ, الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ, هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێ وەك یەکن،هەروەها خوێنبایی ددانەکانیش وەك یەکن، دوانیەکان و خرێ وەك یەکن، ئەمەو ئەمە وەك یەکن). واتە: پەنجە توتەو پەنجە کەڵە وەك یەکن.

٤٥٦٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الأَسْنَانُ سَوَاءٌ, وَالأَصَابِعُ سَوَاءٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی ددانەکان وەك یەکن، هەروەها خوێنبایی پەنجەکانیش.وەك یەکن).

٤٥٦١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَابِعَ - الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ - سَوَاءً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خوێنبایی پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێ وەك یەك دانا.

٤٥٦٢ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ وَهُوَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ: (فِي الأَصَابِعِ عَشْرٌ عَشْرٌ).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە وتارەكەیدا كە پاڵی دابۆوە بە كەعبەوە فەرمووی: (خوێنبایی پەنجەكان وەك یەكن دە وشتر دە وشتر بۆ هەر پەنجەیەك).

٤٥٦٣ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (فِي الأَسْنَانِ خَمْسٌ خَمْسٌ).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەددان پێنج هەیە واتە پێنج وشتر بۆ هەر ددانێ).

٤٥٦٤ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَوِّمُ دِيَةَ الْخَطَإِ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ, يُقَوِّمُهَا عَلَى أَثْمَانِ الإِبِلِ, فَإِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي قِيمَتِهَا, وَإِذَا هَاجَتْ رُخْصًا نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا وَبَلَغَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا بَيْنَ أَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ, أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ ثَمَانِيَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ. وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ, وَمَنْ كَانَ دِيَةُ عَقْلِهِ فِي الشَّاءِ فَأَلْفَيْ شَاةٍ. قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى قَرَابَتِهِمْ, فَمَا فَضَلَ فَلِلْعَصَبَةِ). قَالَ: وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الأَنْفِ إِذَا جُدِعَ الدِّيَةَ كَامِلَةً, وَإِنْ جُدِعَتْ ثَنْدُوَتُهُ فَنِصْفُ الْعَقْلِ: خَمْسُونَ مِنَ الإِبِلِ أَوْ عَدْلُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ, أَوْ مِائَةُ بَقَرَةٍ أَوْ أَلْفُ شَاةٍ, وَفِي الْيَدِ إِذَا قُطِعَتْ نِصْفُ الْعَقْلِ, وَفِي الرِّجْلِ نِصْفُ الْعَقْلِ, وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الْعَقْلِ: ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ مِنَ الإِبِلِ وَثُلْثٌ, أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ أَوِ الْبَقَرِ أَوِ الشَّاءِ, وَالْجَائِفَةُ مِثْلُ ذَلِكَ وَفِي الأَصَابِعِ فِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ, وَفِي الأَسْنَانِ فِي كُلِّ سِنٍّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ. وَقَضَى رَسُولُ

اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ عَقْلَ الْمَرْأَةِ بَيْنَ عَصَبَتِهَا مَنْ كَانُوا لاَ يَرِثُونَ مِنْهَا شَيْئًا إِلاَّ مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا, فَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا, وَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهُمْ, وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ لِلْقَاتِلِ شَيْءٌ, وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَارِثٌ فَوَارِثُهُ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَيْهِ, وَلاَ يَرِثُ الْقَاتِلُ شَيْئًا).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم نرخی خوێنی هەڵەی دانا بە چوار سەد دیناری زێڕ، یان بە قەد نرخی ئەوە زیو، بە پێی گرانی و هەرزانی وشتر نرخی خوێنی دادەنا، ئەگەر گران بوایە نرخی خوێنی بە پارە زیاد دەكرد، خۆ ئەگەر هەرزان بوایە نرخی خوێنی بە پارە كەم دەكردەوە، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله علیه وسلم خوێنبایی لە نێوان چوار سەد دینار بۆ هەشت سەد دینار بوو، یان بە قەد نرخی ئەوە زیو كە دەیكردە هەشت هەزار درهەم، وە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بڕیاری دا ئەوەی كە رەشەوڵاخ دەدات دەبێ دوو سەد سەر مانگا بدات، ئەوەی كە مەڕ و بزن دەدات دەبێ دوو هەزار سەر بدات. راوی وتی: وە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (خوێنبایی دادەنرێ بە میرات و دابەش دەكرێت بەسەر میراتبەرانی كوژراوەكەدا بە پێی دور و نزیكی خزمایەتیەكەیان، دەدرێت بە خزمی باوكی. راوی وتی: وە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بڕیاری دا ئەگەر لوت لەبنا بڕا ئەوە خوێنەكەی دەكاتە خوێنێكی تەواوی خاوەنەكەی، بەڵام ئەگەر گۆكەی برابوو دەكاتە نیو خوێنی خاوەنەكەی، كە دەكاتە پەنجا وشتر یان بایی ئەوە لە ئاڵتون و زیو، یان سەد مانگا یا هەزار مەڕ، دەستیش ئەگەر قرتا دەكاتە نیو خوێن، هەروەها ئەگەر قاچیش قرتا دەكاتە نیو خوێن، ئەو زامەش ئەگەر بگاتە پەردەی مێشك خوێنەكەی دەكاتە سێ یەكی خوێنبایی، سی و سێ وشتر و سێ یەكی نرخی وشتر، یان بایی نرخەكەی لە زێڕ و زیو و مانگاو مەڕ و بزن، هەروەها هەر زامێ كە بگاتە ناو بۆشایی سەر یان سینگ یا سك بە هەمان شێوە. وە بڕیای دا خوێنی هەموو پەنجەیە دەكاتە دە وشتر، وە خوێنی هەموو ددانێ دەكاتە پێنج وشتر. وە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بڕیاری دا خوێنی

ئافرەت دابەش دەکرێت بەسەر خزمانی باوکی دا ئەوانەی کە لە میراتی ئەو ئافرەتەیان بەرناکەوێت مەگەر لە میراتبەرە دانراوەکان بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر کوژراو میراتبەرە دانراوەکانی هەبوو ئەوە خوێنەکەی دابەش دەکرێت بەسەریاندا. وە هەر ئەوانیش بکوژەکەی دەکوژنەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بکوژ لە خوێن و میراتی کوژراو هیچی بۆ نابێت، ئەگەر کوژراو میراتبەری نەبێت جگە لە بکوژ، میراتبەری نزیکترین کەسە لێیەوە، بکوژ بە هیچ شێوەیە میراتی کوژراوی بۆ نابێت).

٤٥٦٥ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ وَلاَ يُقْتَلُ صَاحِبُهُ). قَالَ: وَزَادَنَا خَلِيلٌ, عَنِ ابْنِ رَاشِدٍ: (وَذَلِكَ أَنْ يَنْزُوَ الشَّيْطَانُ بَيْنَ النَّاسِ فَتَكُونَ دِمَاءٌ فِي عِمِّيَّا فِي غَيْرِ ضَغِينَةٍ وَلاَ حَمْلِ سِلاَحٍ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی نیمچە قەستی قورسە وەکو خوێنبایی کوشتنی قەستی وایە بەڵام ئەوەندە هەیە کە بکوژ ناکوژرێتەوە). راوی وتی: خەلیل لە ئیبنو راشیدەوە ئەمەی بۆ زیاد کردین: (ئەویش لەبەر ئەوەیە کە شەیتان ئاژاوە دەخاتە نێوان خەڵکەوە و بە نەزانی و بەبێ رق و کینەو دوژمنایەتی و چەك بۆ یەك هەڵگرتن کوشتن لەنێوانیاندا روودەدات).

٤٥٦٦ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو زامانەی کە ئێسکیان دەردەکەوێت خوێنی هەر زامێ دەکاتە پێنج وشتر).

٤٥٦٧ - (حسن احتمالا) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْعَيْنِ الْقَائِمَةِ السَّادَّةِ لِمَكَانِهَا بِثُلُثِ الدِّيَةِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا ئەگەر چاوێك کە لەجێی خۆیدا بێ بەڵام نەبینێ هەرکاتێ لابرا بە تەواوی سێ یەکی خوێنی هەیە — بێگومان ئەگەر چاوەکە لەجێی خۆیدا بێ جوانترە بۆ روخساری خاوەنەکەی وەك لەوەی بشێوێنرێت - .

## باسی خوێنبایی کۆرپەلە.

## ٢١ - باباب دِيَةِ الْجَنِينِ.

٤٥٦٨ - (صحيح) عن المغيرة بن شعبة: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ هُذَيْلٍ فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِعَمُودٍ فَقَتَلَتْهَا وَجَنِينَهَا, فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ أَحَدُ الرَّجُلَيْنِ: كَيْفَ نَدِي مَنْ لاَ صَاحَ وَلاَ أَكَلَ, وَلاَ شَرِبَ وَلاَ اسْتَهَلَّ؟ فَقَالَ: (أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الأَعْرَابِ). وَقَضَى فِيهِ بِغُرَّةٍ, وَجَعَلَهُ عَلَى عَاقِلَةِ الْمَرْأَةِ.

واتە: لە موغیری کوڕی شوعبەوە، دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی هۆزی هوزەیل دوو ژنی هەبوو یەکێکیان بە دارێ دای لەوی تریان کە سکی پڕ بوو خۆی و سکەکەی کوشت، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، یەکێ لە پیاوەکان وتی: ئەمە خوێنی هەیە لەکاتێکدا کە نە دەنگی لێوە هاتوە و نە قسەی کردوە، وە نە نانی خواردوە و نە ئاو؟ فەرمووی: (ئەمە بەم قسە قوتانەی دا دژایەتی حوکمی شەرع دەکات). جا بڕیاری دا کە خوێنی کۆرپەلەکەی دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ، وە بڕیاری دا خوێنی

ژنەکەو کۆرپەلەکەی لەسەر خزمانی ژنە تاوانبارەکە بێت نەك لەسەر ژنەکە خۆی.

٤٥٦٩ - (صحيح) عن منصور بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ. وَزَادَ: فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ وَغُرَّةً لِمَا فِي بَطْنِهَا.

واتە: لە مەنصورەوە فەرموودەی پێشەو بە هەمان شێوە هاتوە. بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خوێنی ژنە کوژراوەکەی لەسەر کەسوکاری بکوژەکە دانا، وە بڕیاری دا کە خوێنی کۆرپەلەکەی دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ.

٤٥٧٠ - (صحيح دون زيادة) عن المسور بن مخرمة: أَنَّ عُمَرَ اسْتَشَارَ النَّاسَ فِي إِمْلَاصِ الْمَرْأَةِ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِيهَا بِغُرَّةٍ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ. فَقَالَ: ائْتِنِي بِمَنْ يَشْهَدُ مَعَكَ، فَأَتَاهُ بِمُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ. زَادَ هَارُونُ: فَشَهِدَ لَهُ. يَعْنِي ضَرَبَ الرَّجُلُ بَطْنَ امْرَأَتِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: بَلَغَنِي عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ إِنَّمَا سُمِّيَ إِمْلَاصًا لِأَنَّ الْمَرْأَةَ تَزْلِقُهُ قَبْلَ وَقْتِ الْوِلَادَةِ، وَكَذَلِكَ كُلُّ مَا زَلَقَ مِنَ الْيَدِ وَغَيْرِهِ فَقَدْ مَلِصَ.

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ پرس و رای کرد بە خەڵك دەربارەی بەر خستنی ئافرەت، موغیری کوڕی شوعەبە وتی: من خۆم ئامادە بووم کە بڕیاری دا کە خوێنەکەی دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ، پێشەوا عومەر وتی: ئەوەی لەگەڵ تۆ ئامادە بوو لەوێ بۆم بێنە با شایەتی بدات، ئەویش موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی هێنا. راوی فەرموودەکە هارون ئەمەی بۆ زیاد کرد: موحەممەدی کوڕی مەسلەمە شایەتی دا، واتە پیاوێ دای لە سکی ژنەکەی خۆی. ئەبو داود دەڵێت: لە ئەبو عوبەیدەوە پێم گەیشتوە کە بۆیە پێی دەوترێت بەری خست چونکە پێش کاتی لەدایك بوون دەیخات، هەروەها

هەرشتێ لەدەست بکەوێ یان لە غەیری دەست بکەوێ ئەوە کەوتنە - خستن و کەوتن هەر یەکە - .

٤٥٧١ - عن عمر, بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٤٥٧٢ - (صحيح) عن عمر: أَنَّهُ سَأَلَ عَنْ قَضِيَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ, فَقَامَ إِلَيْهِ حَمَلُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّابِغَةِ فَقَالَ: كُنْتُ بَيْنَ امْرَأَتَيْنِ فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِمِسْطَحٍ فَقَتَلَتْهَا وَجَنِينَهَا, فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنِينِهَا بِغُرَّةٍ, وَأَنْ تُقْتَلَ .

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە خەڵك دەربارەی ئەو بڕیارەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دای لەوبارەوە پرسیاریان کرد لە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ، حەملی کوڕی مالیکی کوڕی نابیغە وتی: من لەنێوان دوو ژندا بووم یەکێکیان بە دارێ دای لەوی تریان خۆی و کۆرپەلەکەی کوشت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیاری دا کە خوێنی سکە لەبارچوەکەی دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ، وە بڕیاری دا ژنە تاوانبارەکە بکوژرێت.

٤٥٧٣ - (ضعيف الإسناد) عن طاوس قال: قَامَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَى الْمِنْبَرِ, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ, لَمْ يَذْكُرْ (وَأَنْ تُقْتَلَ). زَادَ: بِغُرَّةٍ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ. قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: اللَّهُ أَكْبَرُ لَوْ لَمْ أَسْمَعْ بِهَذَا لَقَضَيْنَا بِغَيْرِ هَذَا.

واتە: لە (طاوس) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ لەسەر مینبەر هەستایەوە، جا راوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی گێڕایەوە،

بەڵام باسی (وَأَنْ تُقْتَلَ)ی نەکرد. ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بِغُرَّةٍ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ)، راوی وتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: (الله أكبر) ئەگەر ئەمەمان نەبیستایە واتە: بڕیارەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەوا بە غەیری ئەمە بڕیارمان دەدا.

٤٥٧٤ - (ضعيف) عن ابن عباس في قصة حمل بن مالك قال: فَأَسْقَطَتْ غُلاَمًا قَدْ نَبَتَ شَعْرُهُ مَيِّتًا وَمَاتَتِ الْمَرْأَةُ فَقَضَى عَلَى الْعَاقِلَةِ الدِّيَةَ. فَقَالَ عَمُّهَا: إِنَّهَا قَدْ أَسْقَطَتْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ غُلاَمًا قَدْ نَبَتَ شَعْرُهُ. فَقَالَ أَبُو الْقَاتِلَةِ: إِنَّهُ كَاذِبٌ إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا اسْتَهَلَّ وَلاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ فَمِثْلُهُ يُطَلُّ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَسَجْعَ الْجَاهِلِيَّةِ وَكَهَانَتَهَا؟! أَدِّ فِي الصَّبِيِّ غُرَّةً). قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَانَ اسْمُ إِحْدَاهُمَا مُلَيْكَةَ وَالأُخْرَى أُمَّ غُطَيْفٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە دەربارەی بەسەرهاتەکەی حەمەلی کوڕی مالیك وتویەتی: ژنێ دای لە ژنێکی سك پڕ خۆی و سکەکەی کوشت کۆرپەلەکەی ئەوەندە گەورە بوو سەری مووی لێ هاتبو. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیاری دا خزمانی باوکی ژنە بکوژەکە خوێنەکەی بدەن، مامی کوژراوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمە سکێکی لەبارچوە سەری مووی لێ هاتوە، باوکی بکوژەکە وتی: بەڕاستی درۆزنە سوێند بە (الله) نە دەنگی لێوە هاتوە و نە قسەی کردوە، نە نانی خواردوە و نە ئاو وێنەی ئەمە خوێنی نیە. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەمە لە کەسانی سەردەمی نەفامی و کوڵەنانی و کاهینانە دژایەتی حوکمی شەرع دەکات، لەبەرئەوەی لە سەروا(سجع)دا قسەکەی وەك قسەی ئەوان وابوو. خوێنی کۆرپەلەکەی بدەن کە دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ). ئیبنو عەباس وتی: یەکێکیان ناوی مولەیکە بوو، ئەوی تریان ناوی (أُمَّ غُطَيْف) بوو.

٤٥٧٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ قَتَلَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى, وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا زَوْجٌ وَوَلَدٌ, فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَاقِلَةِ الْقَاتِلَةِ, وَبَرَّأَ زَوْجَهَا وَوَلَدَهَا. قَالَ: فَقَالَ عَاقِلَةُ الْمَقْتُولَةِ: مِيرَاثُهَا لَنَا, قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ, مِيرَاثُهَا لِزَوْجِهَا وَوَلَدِهَا).

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: واتە: دوو ژنی هۆزی هوزەیل بوو بە شەڕیان یەكێكیان دای لە ئەوی تریان و كوشتی، هەردووكیان مێردیان هەبوو یەكی كوڕێكیشیان هەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوێنی كوژراوەكەی خستە ئەستۆی خزمان و كەسوكاری بكوژەكە، مێردەكەی و كوڕەكەی بێ تاوان دەرچون و خوێنەكەی نەخستە سەریان، راوی وتی: خزم و كەسوكاری بكوژەكە وتیان: میراتەكەی بۆ ئێمەیە، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر، میراتەكەی بۆ مێردەكەی و كوڕەكەیەتی ئێوە میراتتان ناكەوێ).

٤٥٧٦ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ, فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ فَقَتَلَتْهَا, فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ, وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا, وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ, فَقَالَ حَمَلُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَغْرَمُ دِيَةَ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ). مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ.

ماناكەی وەك دوو فەرموودەكەی پێشتر وایە.

٤٥٧٧ - (صحيح) عن أبي هريرة في هذه القصة قال: ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا بِالْغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ, فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا, وَأَنَّ الْعَقْلَ عَلَى عَصَبَتِهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هەمان بەسەرهات هاتوە، کە وتویەتی: لەپاشدا ئەو ئافرەتە مرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا کە خوێنی کۆرپەلەکەی دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ، وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا میراتەکەی بۆ کوڕەکانی، خوێنی ژنە کوژراوەکەش لەسەر خزمانی باوکی ژنە تاوانبارەکە بێت.

٤٥٧٨ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه: أَنَّ امْرَأَةً حَذَفَتِ امْرَأَةً فَأَسْقَطَتْ, فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَعَلَ فِي وَلَدِهَا خَمْسَمِائَةِ شَاةٍ, وَنَهَى يَوْمَئِذٍ عَنِ الْحَذْفِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا الْحَدِيثُ خَمْسَمِائَةِ شَاةٍ. وَالصَّوَابُ مِائَةُ شَاةٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَكَذَا قَالَ عَبَّاسٌ وَهُوَ وَهَمٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە ژنێ بەردێکی گرتە ژنێکی سك پڕ سکەکەی لەبار برد، کێشەکەیان بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش خوێنی سکەکەی دانا بە پێنج سەد سەر مەڕ. هەر ئەو کاتەش نەهی کرد لەبەرد گرتنە خەڵك. ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکە بەم شێوەیە راستیەکەی سەد سەر مەڕە نەك پێنج سەد سەر مەڕ، هەروەها ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو عەباس بەم شێوەیەی وت پێنج سەد سەر مەڕ (وهم)ە.

٤٥٧٩ - (شاذ) عن أبي هريرة قال: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْجَنِينِ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ, أَوْ فَرَسٍ أَوْ بَغْلٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَخَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ, عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو لَمْ يَذْكُرَا: أَوْ فَرَسٍ أَوْ بَغْلٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا خوێنی کۆرپەلەیە دەکاتە سەرێ ئیتر بەندە بێت یان کەنیزەك یان ئەسپێ یا ئێسترێ. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە حەممادی کوری سەلەمەو

خالیدی کوڕی (عبد الله) لە موحەممەدی کوڕی عەمرەوە ریوایەتیان کردوە بەڵام باسی یەك ئەسپ یان یەك ئێستریان نەکرد.

٤٥٨٠ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن الشعبي قال: الْغُرَّةُ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ رَبِيعَةُ: الْغُرَّةُ خَمْسُونَ دِينَارًا.

واتە: لە شەعبییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خوێنی کۆرپەلەیە پێنج سەد درهەمە. ئەبو داود دەڵێت: رەبیعە دەڵێت: خوێنی کۆرپەلەیە پەنجا دینارە.

## سەبارەت بە خوێنی بەندەیە نامە پێدراو [1].

## ٢٢ - باب فِي دِيَةِ الْمُكَاتَبِ.

٤٥٨١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دِيَةِ الْمُكَاتَبِ يُقْتَلُ: يُودَى مَا أَدَّى مِنْ مُكَاتَبَتِهِ دِيَةَ الْحُرِّ, وَمَا بَقِيَ: دِيَةَ الْمَمْلُوكِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی خوێنی بەندەی نامە پێدراو ئەگەر کوژرا بڕیاری دا خوێنەکەی بەم شێوەیە دەدرێت: چەندەی لە پارەی نامە نوسیەکەی دابوو ئەوەندەی وەك ئازاد خوێنی دەدرێت، وە ئەوەشی لەوە مایەوە وەك بەندە خوێنی دەدرێت.

(١) (المكاتب) واتە: ئەو بەندەیەی کە رێك دەکەوێ لەگەڵ گەورەکەی لەسەر بڕێ پارە هەوڵدەدات بۆی پەیدا بکات و ئەویش ئازادی بکات.

٤٥٨٢ - (صحيح) عن ابن عباس: ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَصَابَ الْمُكَاتَبُ حَدًّا أَوْ وَرِثَ مِيرَاثًا: يَرِثُ عَلَى قَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: ئەگەر بەندەی نامە پێدراو خاوەن خوێنی کەسێ بوو، یان میراتگری کەسێ بوو ئەوە خۆی چەندە ئازاد بوو بێ بە ئەندازەی ئەوە خوێن وەردەگرێ یان میرات دەگرێ.

## سەبارەت بە خوێنی خاوەن پەیمان.

## ٢٣ - باب فِي دِيَةِ الذِّمِّيِّ.

٤٥٨٣ -(حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (دِيَةُ الْمُعَاهِدِ نِصْفُ دِيَةِ الْحُرِّ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێنی خاوەن پەیمان نیوەی خوێنی کەسێکی موسوڵمانی ئازادە).

## دەربارەی پیاوێ لەگەڵ
## كەسێ بەشەڕبێ و بەرگری لەخۆی بكات.

## ٢٤ - باب فِي الرَّجُلِ يُقَاتِلُ الرَّجُلَ فَيَدْفَعُهُ عَنْ نَفْسِهِ.

٤٥٨٤ - (صحيح الإسناد) عن صفوان بن يعلى عن أبيه قال: قَاتَلَ أَجِيرٌ لِي رَجُلاً فَعَضَّ يَدَهُ, فَانْتَزَعَهَا, فَنَدَرَتْ ثَنِيَّتُهُ, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَهْدَرَهَا, وَقَالَ (أَتُرِيدُ أَنْ يَضَعَ يَدَهُ فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا كَالْفَحْلِ؟). قَالَ: وَأَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ, عَنْ جَدِّهِ, أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَهْدَرَهَا, وَقَالَ: بَعُدَتْ سِنُّهُ.

واتە: لە صەفوانی كوڕی یەعلاوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: خزمەتكارێكم هەبوو بە كرێ كاری بۆ دەكردم جارێ لەگەڵ پیاوێ بوو بە شەڕیان دەستی دەگەزێ ئەویش لە تاو ئازار دەستی خۆی رادەپسكێنێ لەدەمی دوو ددانی پێشەوەی دەكەون، جا خزمەتكارەكە بۆ سكاڵا هاتە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەویش خوێنی بۆ دانەنا. فەرمووی: (دەتەوێ دەست بخاتە دەمتەوەو وەك نێرە وشتر گازی لێ بگری؟). راوی وتی: ئیبنو ئەبو مولەیكە، لە باپیریەوە پێی راگەیاندم كە ئەبو بەكریش رەزای خوای لێ بێ خوێنی بۆ دانەنا. وتی: ددانەكانی نەمێنێ واتە دوعای لێ كرد.

٤٥٨٥ - (صحيح الإسناد) عن يعلى بن أميه بِهَذَا, زَادَ: ثُمَّ قَالَ يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْعَاضِّ: (إِنْ شِئْتَ أَنْ تُمَكِّنَهُ مِنْ يَدِكَ فَيَعَضَّهَا, ثُمَّ تَنْزِعَهَا مِنْ فِيهِ). وَأَبْطَلَ دِيَةَ أَسْنَانِهِ.

واتە: لە یەعلای كوڕی ئومەیەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد

کرد: لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە گەزراوەکەی فەرموو: (ئەگەر دەست بخەیتە دەمیەوەو گازی لێ بگرێ دان بەخۆتا دەگریت، لەپاشدا تۆش دەستت راپسکێنی لەدەمی). جا خوێنی ددانەکانی پوچەڵ کردەوە.

## کەسێ چارەسەری نەخۆش بکات بە نەشارەزایی زیان بە نەخۆش بگەیەنێ.

## ٢٥ - باب فِيمَنْ تَطَبَّبَ وَلاَ يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ فَأَعْنَتَ.

٤٥٨٦ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: ان النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ تَطَبَّبَ وَلاَ يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ فَهُوَ ضَامِنٌ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خۆی بکات بە پزیشك و پێشتر بە پزیشك نەناسرابێت ئەوە زامن و دەستەبەرە بۆ هەر زیانێ کە بیدات). واتە ئەگەر چارەسەری نەخۆشێکی کردو بوو بە هۆی مردنی ئەوە خوێنی دەکەوێتە سەر دەبێ خزمانی خوێنەکە بدەن.

٤٥٨٧ - (حسن) عن عمر بن عبد العزيز قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا طَبِيبٍ تَطَبَّبَ عَلَى قَوْمٍ لاَ يُعْرَفُ لَهُ تَطَبُّبٌ قَبْلَ ذَلِكَ فَأَعْنَتَ فَهُوَ ضَامِنٌ).

واتە: لە عومەری کوڕی (عبد العزيز)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خۆی کردە پزیشکی خەڵك و پێشتر بە پزیشك نەناسرابو زیانی گەیاند بە نەخۆشێك ئەوە زامن و دەستەبەرە).

## دەربارەی خوێنبایی کوشتنی هەڵەی نیمچە قەستی

## ٢٦ - باب فِي دِيَةِ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ.

٤٥٨٨ - (حسن) عن عبد الله بن عمرو: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلَا إِنَّ كُلَّ مَأْثُرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ دَمٍ أَوْ مَالٍ تُذْكَرُ وَتُدْعَى تَحْتَ قَدَمَيَّ, إِلَّا مَا كَانَ مِنْ سِقَايَةِ الْحَاجِّ وَسِدَانَةِ الْبَيْتِ). ثُمَّ قَالَ: (أَلَا إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن هەموو داب و نەریت و دەستورێکی خەڵکانی نەفامی کە شانازی پێوە بکەن دەیخەمە ژێر پێمەوە بێجگە لە ئاودانی حاجیان و سەرەوکاری و خزمەتکردنی ماڵی خوا). لەپاشدا فەرمووی: (ئاگاداربن خوینی کوشتنی نیمچە قەستی بە قەمچی بێ یان بە تێلا سەد وشترە دەبێ چلیان بەچکە لە سکیاندا بێ).

٤٥٨٩ - عن خالد, بِهَذَا الإِسْنَادِ, نَحْوَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە خالیدەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

## دەربارەی تۆڵەسەندنەوەی ددان.

## ٢٧ - باب الْقِصَاصِ مِنَ السِّنِّ.

٤٥٩٠ – (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ أُخْتُ أَنَسِ بْنِ النَّضْرِ ثَنِيَّةَ امْرَأَةٍ, فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَضَى بِكِتَابِ اللَّهِ الْقِصَاصَ, فَقَالَ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ تُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا الْيَوْمَ. قَالَ: (يَا أَنَسُ! كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ). فَرَضُوا بِأَرْشٍ أَخَذُوهُ, فَعَجِبَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ قِيلَ لَهُ: كَيْفَ يُقْتَصُّ مِنَ السِّنِّ؟ قَالَ: تُبْرَدُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: روبەعی خوشکی ئەنەسی کوڕی (نضر) ددانە دوانیەکەی ژنێکی شکاند، بۆ سکاڵا هاتنە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم داوای تۆڵەیان دەکرد، بە قورئانەکەی خوای گەورە بڕیاری بۆ دان کە تۆڵەی لێ بسەنرێت، ئەنەسی کوڕی (نضر) وتی: سوێند بە (الله) کە تۆی بە هەق ڕەوانەکردوە ئەمڕۆ ددانە دوانیەکەی روبەیع ناشکێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەنەس حوکمی تۆڵەسەندنەوە لە قورئانەکەی خوای گەورەدایە). واتە دەبێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە، جا ڕازی بوون بە خوێنبایی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەری سوڕما لە سوێندەکەی ئەنەسی کوڕی (نضر) کە ڕاست دەرچوو، فەرمووی: (بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوای گەورەدا کەسانێك هەن ئەگەر سوێند بخۆن لەسەر خوا ئەوە خوای گەورە سوێندەکەیان ناخات). ئەبو داود دەڵێت: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا ئەحمەد بوو پێی وترا: چۆن تۆڵەی ددان دەکرێتەوە؟ وتی: بە بڕینەوە.

## دەربارەی وڵاخێ لەقە بدات لە کەسێ.

## ٢٨ - باب فِي الدَّابَّةِ تَنْفَحُ بِرِجْلِهَا.

٤٥٩١ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الرِّجْلُ جُبَارٌ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الدَّابَّةُ تَضْرِبُ بِرِجْلِهَا وَهُوَ رَاكِبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر وڵاخێ لەقە بدات لە کەسێك زیانی پێ بگەیەنێت خاوەنەکەی خوێنی لەسەر نیە). ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر خاوەنەکەی سواری بوو لەقەی دا لە کەسێ چونکە لەدواوەیە دەسەڵاتی بەسەریا نیە ئەوە خوێنی نیە، بەڵام ئەگەر لەپێشەوە زیان بگەیەنێت ئەوە خاوەنەکەی بەرپرسە.

## باسی زیانی ئاژەڵی بەرەڵاو کان و بیر.

## ٢٩- باب الْعَجْمَاءُ وَالْمَعْدِنُ وَالْبِئْرُ جُبَارٌ.

٤٥٩٢ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْعَجْمَاءُ الْمُنْفَلِتَةُ الَّتِي لاَ يَكُونُ مَعَهَا أَحَدٌ وَتَكُونُ بِالنَّهَارِ وَلاَ تَكُونُ بِاللَّيْلِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئاژەڵێ بەرەڵا بێ و کەسێ بریندار بکات یان کارێکی خراپ بکات ئەو کەسە یان ئەو شتە بە فیڕۆ دەڕوات و خوێنی نیەو

خاوەنەكەی نابێتە زامن و دەستەبەر، كەسێ كرێكارێ بەكرێ بگرێت بۆ ئەوەی كان(معدن)ێكی بۆ هەڵكەنێ ئەگەر كانەكە روخا بەسەریا، یان روخا بەسەر كەسێكی تردا لەوێوە تێپەڕی ئەوە خاوەن كانەكە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنی بەفیرۆ دەڕوات، ئەگەر كەسێ بیرێ هەڵكەنێ كەسێ بكەوێتە ناویەوەو بخنكێ یان زیانی پێ بگات ئەوە خاوەن بیرەكە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنەكەی بە فیرۆ دەڕوات،ریكاز پێنج یەك زەكاتی لێ دەكەوێت. ئەبو داود دەڵێت: ئاژەڵی بەرەڵا ئەوەی كە كەسی بەلاوە نیەو لەرۆژدا، نەك لەشەودا، چونكە ئەگەر بەشەوا بەرەڵا بكرێت خاوەنەكەی بەرپرسە لێی ئەگەر زیان بگەیەنێ بە خەڵك.

## سەبارەت بە زیانی ئاگر لەدەست دەرچون.

## ٣٠ - باب فِي النَّارِ تَعَدَّى.

٤٥٩٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (النَّارُ جُبَارٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئاگر لەدەست دەرچون لە موڵكی خۆیەوە بۆ موڵكی خەڵك بژاردنی نیەو بە فیرۆ دەڕوات).

## سەبارەت بە تاوانی بەندەی خێزانە هەژارەکان.

## ٣١ - باب فِي جِنَايَةِ الْعَبْدِ يَكُونُ لِلْفُقَرَاءِ.

٤٥٩٤ - (صحيح) عن عمران بن حصين: أَنَّ غُلَامًا لأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ أُذُنَ غُلَامٍ لأُنَاسٍ أَغْنِيَاءَ, فَأَتَى أَهْلُهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّا أُنَاسٌ فُقَرَاءُ. فَلَمْ يَجْعَلْ عَلَيْهِ شَيْئًا.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە کوڕێکی خێزانێکی هەژار گوێچکەی کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەندی بڕیبو، هاتنە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئێمە خێزانێکی هەژارین و کوڕەکەشمان منداڵەو باڵغ نەبوە، ئیتر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هیچی دانەنا لەسەریان.

## دەربارەی ئەوەی کوێرانە لە نێوان خەڵکدا بکوژرێت.

## ٣٢ - باب فِيمَنْ قَتَلَ فِي عِمِّيَّا بَيْنَ قَوْمٍ.

٤٥٩٥ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيًّا أَوْ رِمِّيًّا يَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحَجَرٍ أَوْ بِسَوْطٍ فَعَقْلُهُ عَقْلُ خَطَإٍ, وَمَنْ قُتِلَ عَمْدًا فَقَوْدُ يَدَيْهِ, فَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس کوژرانە لە قەرەباڵغیدا کوژرا یان لە نێواندا لەشەڕە قەمچی و شەڕە بەردا کوژرا کەس نەیدەزانی کێ کوشتویەتی، ئەوە دادەنرێت بە کوشتنی بە هەڵەو خوێنباییەکەی وەك خوێنبایی کوشتنی بە هەڵە وایە، هەرکەس بە قەستی بکوژرێت ئەوە تۆڵەی دەسەندرێ بکوژ لەباتی ئەو دەکوژرێتەوە، ئەوەی سەرپێچی لەمە بکات نەهێڵێ بکوژ بکوژرێتەوە ئەوە نەعلەتی خواو پێغەمبەرەکەی و سەرجەم خەڵکی لێ بێت).

کۆتایی پەرتوکی خوێنبایی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی سوننە.
## ٤١ - أول كتاب السنة.

### باسی راڤەی سوننە.

### ١ - باب شَرْحِ السُّنَّةِ.

| ٤٥٩٦ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً, وَتَفَرَّقَتِ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً, وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِى عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جولەکە بوون بە حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو دەستەو تاقم و پارچەوە، گاورەکان بوون بە حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو دەستەو تاقم و پارچەوە، ئوممەتەکەی منیش دەبن بە حەفتاو سێ دەستەو تاقم و پارچەوە).

| ٤٥٩٧ - (حسن) عن معاوية بن أبي سفيان قال: إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: أَلاَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ فِينَا فَقَالَ: (أَلاَ إِنَّ مَنْ قَبْلَكُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً, وَإِنَّ هَذِهِ الْمِلَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ, ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِى النَّارِ, وَوَاحِدَةٌ فِى الْجَنَّةِ وَهِىَ الْجَمَاعَةُ). زَادَ ابْنُ يَحْيَى وَعَمْرٌو فِى حَدِيثَيْهِمَا (وَإِنَّهُ سَيَخْرُجُ مِنْ أُمَّتِى أَقْوَامٌ |
|---|

تَجَارَى بِهِمْ تِلْكَ الأَهْوَاءُ كَمَا يَتَجَارَى الْكَلْبُ لِصَاحِبِهِ). وَقَالَ عَمْرٌو: (الْكَلْبُ بِصَاحِبِهِ, لاَ يَبْقَى مِنْهُ عِرْقٌ وَلاَ مَفْصِلٌ إِلاَّ دَخَلَهُ).

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا وتاری بۆداین فەرمووی: (ئاگادارین ئەوانەی پێش ئێوە لە خاوەن نامەکان پەرتەوازە بوون و بوون بە حەفتاو دوو دەستەو تاقمەوە، ئەم ئوممەتەش دەبێت بە حەفتاو سێ دەستەو تاقمەوە، حەفتاو دوویان دەچەنە ئاگری دۆزەخەوە، یەکێکیان دەچێتە بەهەشتەوە، ئەویش بریتیە لە (جەماعە) واتە کۆمەڵی موسوڵمانان ئەهلی سوننەو جەماعە). ئیبنو یەحیاو عەمر لە فەرموودەکەیاندا ئەمەیان بۆ زیاد کرد: (لەم ئوممەتەی مندا خەڵکانێ لەو دەستەو تاقمانە پەیدا دەبن هەواو ئارەزوو بیدعەکان لایدەدەن و کارێکی پێ دەکەن وەك چۆن کە سەگێ توشی (داء الکلب) بوەو کەسێ دەگەزێ و زیانی پێ دەگەیەنێت و ئازارەکەی دەگاتە هەموو جەستەی و ئارامی نامێنێ بەو شێوەیە) - ڕێگری ئاو خواردنەوەی لێ دەکات هەتا دەمرێت - عەمر وتی: (هیچ ڕەگ و جومگەیە نامێنێ ئیللا دەچێتە ناویەوە).

## باسی ڕێگرتن لە موجادەلەو شوێنکەوتنی هاوشێوەکانی قورئان.

## ٢ - باب النَّهْيِ عَنِ الْجِدَالِ وَاتِّبَاعِ مُتَشَابِهِ الْقُرْآنِ.

٤٥٩٨ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الآيَةَ (هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ) إِلَى (أُولُو الأَلْبَابِ) قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَإِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ فَاحْذَرُوهُمْ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾. سورة آل عمران : ٧.

واتە: ئەو خوایە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هەندێکی ئایاتی (کە مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن، وە ئەوانی تر (ئایەتانێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین، ئینجا ئەوانەی کە لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابهن (هاوشێوەن) بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان، وە بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان، لە حاڵەتێکدا کەس ڕاڤەکردنی نازانێ تەنیا خوا نەبێ، وە دامەزراوان لەزانیین دا ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوە بە (موتەشابە) هەمووی لەپەروەردگارمانەوەن، بیر لەقورئان ناکەنەوە تەنها خاوەنانی ژیری و بیر نەبێ.

عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کەواتە هەرکاتێ ئەوانەتان بینی دوای ئەو ئایەتانە کەوتن کە لە قورئاندا هاوشێوەن ئەوە خوای گەورە ناوی ناون ئەهلی (زیغ) واتە لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە، ئێوە خۆتانیان لێ بپارێزن و مەترسیتان لێیان هەبێ).

# باسی دورکەوتنەوە لە ئەهلی هەواو هەوەس و رق لێ بونیان.

## ٣ - باب مُجَانَبَةِ أَهْلِ الأَهْوَاءِ وَبُغْضِهِمْ.

٤٥٩٩ - (ضعيف) عن أبو ذر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَفْضَلُ الأَعْمَالِ: الْحُبُّ فِي اللَّهِ, وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ).

واتە: لە ئەبو (ذر)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترین کردەوەی چاك بریتیە لە: خۆشەویستی لەبەر خواو، رق لێ بوون لەبەر خوا).

٤٦٠٠ - (صحيح) عن كعب بن مالك قال: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلَامِنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ, حَتَّى إِذَا طَالَ عَلَيَّ تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ, وَهُوَ ابْنُ عَمِّي, فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ, فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلَامَ. ثُمَّ سَاقَ خَبَرَ تَنْزِيلِ تَوْبَتِهِ.

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەو سێ کەسەی کە لە غەزای تەبوك دواکەوتبوین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری کرد لە موسوڵمانان کە قسەمان لەگەڵ بکەن، هەتا رۆژێ رۆشتم بە شورای باخەکەی ئەبو قەتادەی ئامۆزامدا سڵاوم لێ کرد، سوێند بە (الله) وەڵامی سڵاوەکەی نەدامەوە. لەپاشدا راوی فەرمودەی دابەزینی ئایەتی تەوبەکەی گێڕایەوە.

## باسی سەلام نەکردن لە خەڵکانی شوێنکەوتەی هەواو ئارەزوو.

## ٤ - باب تَرْكِ السَّلاَمِ عَلَى أَهْلِ الأَهْوَاءِ.

٤٦٠١ - (حسن) عن عمار بن ياسر قال: قَدِمْتُ عَلَى أَهْلِي وَقَدْ تَشَقَّقَتْ يَدَاىَ, فَخَلَّقُونِي بِزَعْفَرَانٍ, فَغَدَوْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ, فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ وَقَالَ: (اذْهَبْ فَاغْسِلْ هَذَا عَنْكَ).

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەو گەیشتمەوە ماڵ دەستەکانم قڵیشیان بردبوو زەعفەرانیان دا لە قڵیشەکان بەیانی چوم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سڵاوم لێ کرد، وەڵامی نەدامەوە فەرمووی: (بڕۆ دەستەکانت بشۆ و ئەوەی لێ بکەرەوە).

٤٦٠٢ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّهُ اعْتَلَّ بَعِيرٌ لِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ وَعِنْدَ زَيْنَبَ فَضْلُ ظَهْرٍ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِزَيْنَبَ: (أَعْطِيهَا بَعِيرًا). فَقَالَتْ: أَنَا أُعْطِي تِلْكَ الْيَهُودِيَّةَ؟! فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهَجَرَهَا ذَا الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمَ وَبَعْضَ صَفَرٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەسەفەرێکدا وشترەکەی صەفیەی کچی حویەی نەخۆش بوو، زەینەبیش وشتری زیادەی پێ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە زەینەبی هاوسەری فەرموو: (وشترێکی بدەرێ با سواری ببێ). زەینەب وتی: وشتری خۆم بدەم بەو جولەکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی توڕە بوو، مانگی (ذي الحجة) و موحەڕەم و هەندێك لە مانگی سەفەریش قسەی لەگەڵ نەکرد. واتە دوو مانگ و ئەوەندە ڕۆژ دەنگی لێ وەرگرت.

## باسی قەدەغەکردنی موجادەلە لەسەر قورئان.

## ٥ - باب النَّهْيِ عَنِ الْجِدَالِ فِي الْقُرْآنِ.

٤٦٠٣ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: ان النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الْمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەڕە قسەو مشت و مڕ کردن لەسەر قورئان کوفرە).

## دەربارەی پابەندبوون بە سوننەتەوە.

## ٦ - باب فِي لُزُومِ السُّنَّةِ.

٤٦٠٤ - (صحيح) عن المقدام بن معد يكرب: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ, أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ, فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ, وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ, أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ لَحْمُ الْحِمَارِ الأَهْلِيِّ, وَلاَ كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ, وَلاَ لُقَطَةُ مُعَاهِدٍ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِيَ عَنْهَا صَاحِبُهَا, وَمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَعَلَيْهِمْ أَنْ يَقْرُوهُ, فَإِنْ لَمْ يَقْرُوهُ فَلَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ).

واتە: لە میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن من ئەم قورئانەو وێنەی ئەم قورئانەم بۆ هاتوە، لەوانەیە کاتێك بێت کەسێکی تێر و پڕ لەسەر سەرینەکەی

پاڵ بداتەوەو بڵێ: لەسەرتانە تەنها شوێن قورئان بکەون، هەرچیتان بینی لە قورئاندا حەلاڵ کرابوو ئێوەش بە حەلاڵی بزانن، هەرچیتان بینی لە قورئاندا حەرام کرابوو ئێوەش بە حەرامی بزانن، ئاگاداربن گۆشتی گوێدرێژی ماڵی و، هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار و، هەموو دۆزراوەیەك کە خاوەنەکەی هاوپەیمان (معاهد) بێت جگە لەوانەی کە خاوەنی وازی لێ هێناون حەرامن بۆتان، هەرکەس لای قەومێك دابەزی بۆ میوانی ئەوە لەسەریانە رێزی بگرن و میوانداری بکەن، ئەگەر ئەوەیان نەکرد بۆی هەیە بەزۆر بەشی پێویستی خۆی بسێنێ).

٤٦٠٥ - (صحيح) عن عبيد الله بن أبي رافع, عن أبيه: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الأَمْرُ مِنْ أَمْرِى مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ, فَيَقُولُ: لاَ نَدْرِى مَا وَجَدْنَا فِى كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ).

واتە: لە (عبيد الله)ی کوڕی ئەبو رافیعەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نامەوێ بگەم بە یەکێکتان لەسەر سەرینەکەی پاڵ بداتەوەو کاروبارێکی گرنگی دین بێنن بۆ لای کە من فەرمانم پێ کردوە یان قەدەغەم کردوە بڵێ: هەرشتێ لە قورئاندا بێ شوێنی دەکەوین و کاری پێ دەکەین). - هەر شتێ لە قورئاندا نەبوو دەستی پێوە ناگرین، ئەمە پێچەوانەی شەرعی خوایە- .

٤٦٠٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَحْدَثَ فِى أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ). قَالَ ابْنُ عِيسَى: قَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ صَنَعَ أَمْرًا عَلَى غَيْرِ أَمْرِنَا فَهُوَ رَدٌّ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس شتێکی لەم دینەی ئێمەدا هێناو لەدینی ئێمەدا نەبوو ئەوە ئەدرێتەوە بەڕوی خاوەنەکەیداو لێی وەرناگیرێت). ئیبنو

عیسا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس کارێ بکات لە دینی ئێمەدا نەبوو ئەوە ئەدرێتەوە بەڕوی خاوەنەکەیداو لێی وەرناگیرێت).

٤٦٠٧ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عمرو السلمي وحجر بن حجر قالا: أَتَيْنَا الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ وَهُوَ مِمَّنْ نَزَلَ فِيهِ: (وَلاَ عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ). فَسَلَّمْنَا, وَقُلْنَا: أَتَيْنَاكَ زَائِرِينَ وَعَائِدِينَ وَمُقْتَبِسِينَ. فَقَالَ الْعِرْبَاضُ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ, ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً, ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ, وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ, فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟ فَقَالَ: (أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا, فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلاَفًا كَثِيرًا, فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي, وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ تَمَسَّكُوا بِهَا, وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ, وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ, فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ, وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەمری سولەمی و حوجری کوڕی حوجرەوە دەگێرنەوە، کە وتویانە: چوینە خزمەت (عرباض)ی کوڕی ساریە کە یەکێ بوو لەوانەی ئەم ئایەتە لەبارەیانەوە دابەزی:

﴿ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴾. سورة التوبة:٩٢.

واتە: وە تاوان لەسەر ئەو کەسانەش نی یە کە هاتنە لات (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی (وولآخیان بۆ دابین کەیت و) سواریان کەیت، ووتت: وولآخم دەست ناکەوێ سوارتان بکەم (بۆ جیهاد)، ئەوانیش گەڕانەوە لەکاتێکدا چاویان فرمێسکی دەڕشت لەداخ و خەفەتدا کەهیچیان نەبوو خەرجی بکەن (بۆ پێداویستی جیهاد).

جا سڵاومان كرد له (عرباض)، وتمان: هاتوین سەردانت بكەین و هەندێ زانستی بەسودت لێ وەرگرین، (عرباض) وتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی بۆ كردین، لەپاشدا رووی تێ كردین و ئامۆژگاریەكی كاریگەر و گرنگی كردین، چاوەكانی خستە گریان و دڵەكانی خستە ترس و لەرزین، قسەكەرێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمایشتەكانت لەقسەی یەكێ دەچێ كە ماڵ ئاوایی بكات، فەرمانت بە چی یە بۆمان؟ فەرمووی: (ئامۆژگاریتان دەكەم لە خوای گەورە بترسن و تەقوای خوا بكەن گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بن لە فەرمانی فەرمانڕەوای خۆتان دەرمەچن، ئەگەرچی قولەڕەشێكی حەبەشی بێت، چونكە ئەوەی لەئێوە بمێنێ ناكۆكیەكی زۆر دەبینێ، ئاگاداری سوننەتەكانی من و، سوننەتەكانی خەلیفە راشیدینە رێنمایی كراوەكان بن، پێویستە بە توندی دەستیان پێوە بگرن، هەروەها وریای شتە تازەكان بن كە دەخرێنە سەر دین، بێگومان ئەو شتە تازانەش داهێنراو(بیدعە)ن، وە هەموو داهێنراو(بیدعە)ێك لەدیندا گومڕاییە).

٤٦٠٨ - (صحيح) عن عبدِ الله بن مسعود: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (ئاگاداربن ئەوانەی كە زێدەڕۆیی دەكەن و شت زۆر قوڵ دەكەنەوە ئەوە بە هیلاكا دەچن).

# باسی ئەوانەی کە خەڵك بانگ دەکەن بۆ سوننە.

## ٧ - بباب من دعا إلى السُّنَّةِ.

٤٦٠٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا, وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خەڵك بانگ بکات بۆ سەر رێگەی راست و هیدایەت خۆشی بەقەد ئەوکەسانە بەگوێی دەکەن خێری دەگات، بەبێ ئەوەی لە خێری ئەوان کەم بکاتەوە، وە هەرکەس خەڵك بانگ بکات بۆ سەر رێگەی خراپەو گومڕایی خۆشی بەقەد ئەوکەسانە بەگوێی دەکەن گوناهی دەگات، بەبێ ئەوەی لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە).

٤٦١٠ - (صحيح) عن عامر بن سعد, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا: مَنْ سَأَلَ عَنْ أَمْرٍ لَمْ يُحَرَّمْ فَحُرِّمَ عَلَى النَّاسِ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ).

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترین تاوان کە موسوڵمان لە هەقی موسوڵماناندا ئەنجامی بدات بریتیە لەوەی: دەربارەی شتێ کە زۆر پێویست نەبێ پرسیار بکات کە هێشتا ئەو شتە حەرام نەکرابێ، بەڵام بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام ببێ لەسەر خەڵك و موسوڵمانان).

٤٦١١ - (صحيح الإسناد موقوف) عن ابن شهاب: أن أبا إدريس الخولاني عائذ الله أخبره أن يزيد بن عميرة -وكان من أصحاب معاذ بن جبل - أخبره قال: كَانَ لاَ يَجْلِسُ مَجْلِسًا لِلذِّكْرِ حِينَ يَجْلِسُ إِلاَّ قَالَ: اللَّهُ حَكَمٌ قِسْطٌ, هَلَكَ الْمُرْتَابُونَ, فَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ يَوْمًا إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ فِتَنًا يَكْثُرُ فِيهَا الْمَالُ, وَيُفْتَحُ فِيهَا الْقُرْآنُ حَتَّى يَأْخُذَهُ الْمُؤْمِنُ وَالْمُنَافِقُ, وَالرَّجُلُ وَالْمَرْأَةُ, وَالصَّغِيرُ وَالْكَبِيرُ, وَالْعَبْدُ وَالْحُرُّ, فَيُوشِكُ قَائِلٌ أَنْ يَقُولَ: مَا لِلنَّاسِ لاَ يَتَّبِعُونِي وَقَدْ قَرَأْتُ الْقُرْآنَ؟! مَا هُمْ بِمُتَّبِعِيَّ حَتَّى أَبْتَدِعَ لَهُمْ غَيْرَهُ! فَإِيَّاكُمْ وَمَا ابْتُدِعَ, فَإِنَّ مَا ابْتُدِعَ ضَلاَلَةٌ, وَأُحَذِّرُكُمْ زَيْغَةَ الْحَكِيمِ, فَإِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ يَقُولُ كَلِمَةَ الضَّلاَلَةِ عَلَى لِسَانِ الْحَكِيمِ, وَقَدْ يَقُولُ الْمُنَافِقُ كَلِمَةَ الْحَقِّ. قَالَ: قُلْتُ لِمُعَاذٍ: مَا يُدْرِينِي رَحِمَكَ اللَّهُ أَنَّ الْحَكِيمَ قَدْ يَقُولُ كَلِمَةَ الضَّلاَلَةِ, وَأَنَّ الْمُنَافِقَ قَدْ يَقُولُ كَلِمَةَ الْحَقِّ؟! قَالَ: بَلَى, اجْتَنِبْ مِنْ كَلاَمِ الْحَكِيمِ الْمُشْتَهِرَاتِ الَّتِي يُقَالُ لَهَا: مَا هَذِهِ؟ وَلاَ يُثْنِيَنَّكَ ذَلِكَ عَنْهُ, فَإِنَّهُ لَعَلَّهُ أَنْ يُرَاجِعَ, وَتَلَقَّ الْحَقَّ إِذَا سَمِعْتَهُ فَإِنَّ عَلَى الْحَقِّ نُورًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مَعْمَرٌ: عَنِ الزُّهْرِيِّ فِي هَذَا الحديث: وَلاَ يُنْئِيَنَّكَ ذَلِكَ عَنْهُ, مَكَانَ: يُثْنِيَنَّكَ. وَقَالَ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ, عَنِ الزُّهْرِيِّ فِي هَذَا الحديث: الْمُشَبَّهَاتِ, مَكَانَ: الْمُشْتَهِرَاتِ, وَقَالَ: لاَ يُثْنِيَنَّكَ كَمَا قَالَ عُقَيْلٌ. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ, عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: بَلَى مَا تَشَابَهَ عَلَيْكَ مِنْ قَوْلِ الْحَكِيمِ حَتَّى تَقُولَ: مَا أَرَادَ بِهَذِهِ الْكَلِمَةِ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو ئیدریسی خەولانی (عائذ الله) پێی ڕاگەیاندوە، یەزیدی کوڕی عومەیرە - کە یەکێ بووە لە هاوڕێکانی (معاذ)ی کوڕی جەبەل - پێی ڕاگەیاندوە، کە یەزید وتویەتی: (معاذ)ی کوڕی جەبەل لەهەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا دابنیشتایە بۆ زیکر و یادی خواو ئامۆژگاری کردنی خەڵك ئیللا لەوکاتەدا دەیوت: خوای گەورە حاکمێکی دادپەروەرە، ئەوانەی کە شك و گومانیان هەیە تیادەچن ئەمەی دوبارە دەکردەوە، ڕۆژێ (معاذ) وتی: لەدوای ئێوە فیتنەو ئاژاوەیە پەیدا دەبێ تیایدا ماڵ و سامان زۆر زۆر دەبێ،

قورئان خوێندن بە دەنگەوە زۆر دەبێ و لەماناكەی ناگەن، بە شێوەیە باوەڕدار و دووڕوو، پیاو و ژن، گەورە و بچوك، كەسی بەندەو كەسی ئازاد ئەمانە هەر هەموویان قورئان دەخوێنن، نزیكە قسەكەرێك لەدڵی خۆیدا بڵێ: ئەو خەڵكە چیانە كە شوێنی من ناكەون لەكاتێكدا كە من قورئانیان بۆ دەخوێنم و بۆیان بەیان دەكەم؟! ئەمانە شوێنی من ناكەون هەتا شتێكی تازەیان بۆ دانەهێنم لەدیندا، بانگیان دەكات بۆ ئەوەی شوێنی قورئان بكەون كە شوێنی ناكەون كارێكی خراپ دەكات هەڵەسێ بە ئەنجامدانی بیدعە بۆئەوەی شوێنی بكەون و بانگیان دەكات بۆی، دەی هۆشیاربن لە بیدعەكەی، ئەو كەسەی شتێكی تازە دابهێنێ لە دیندا ئەوە گومڕاییە، ئاگادارتان دەكەمەوە لە لادانی زانای خاوەن حیكمەت و دانایی لە ڕێی ڕاست، چونكە شەیتان مرۆڤ گومڕا دەكات هەتا قسەی گومڕایی و پڕوپوچ و ناهەق دەكات لەكاتێكدا كە پێشتر ناسراو بوە بە گوفتار شیرین و قسەی چاكی دەكرد، هەروەها كەسی دووڕوو قسەی هەق دەكات، یەزید وتی: بە (معاذ)م وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێ چۆن كەسی زانای خاوەن حیكمەت قسەی گومڕایی و ناهەق دەكات و كەسی دووڕوویش قسەی هەق دەكات؟! (معاذ) وتی: بەڵێ، دوربكەونەوە لە وتەی زانا كە بەناوبانگن بە قسە پڕو پوچەكان و خەڵك سەریان لێی سوڕ دەمێنێ و بەلایانەوە نامۆیە پێی دەڵێن: ئەم قسە پڕو پوچانە چیە دەیكات بۆ خەڵك؟ قسە پڕوپوچ و هەڵەكانی لێ وەرمەگرن و لەبەر ئەو قسانەی لێی دوور مەكەونەوەو قسەی خێری بۆ بكەن بەڵكو بگەڕێتەوە بۆ سەر هەق و ڕاستی، قسەی هەق و ڕاستی وەربگرە ئەگەر بیستت چونكە وتەی حەق نور و ڕوناكیە با دووڕوویش بیكات.

ئەبو داود دەڵێ: موعەممەر ئەم فەرموودەی لە زوهریەوە ریوایەت كردوە بەڵام لەجیاتی: (يُثْنِيَنَّكَ) بە (يُنْئِيَنَّكَ)، صاڵحی كوڕی كەیسان ئەم فەرموودەی لە زوهریەوە ریوایەت كردوە بەڵام لەجیاتی: (الْمُشْتَهِرَاتِ) بە (الْمُشَبَّهَاتِ) واتە: لێكچوەكان هەر هەموویان ڕاست و دروستن، هەروەها وتی: (لاَ يُثْنِيَنَّكَ) وەك چۆن عەقیل وتی، بەڵام وەك مەعمەر نەیوت: (يُنْئِيَنَّكَ). هەروەها ئیبنو ئیسحاق وتی: لە زوهریەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: بەڵێ ئەوەندە قسەی زانات لێ تێكەڵ و پێكەڵ دەبێ هاتا دەڵێی: مەبەستی چیە لە قسانەدا.

٤٦١٢ - (صحيح مقطوع) عن أبي الصلت، وهذا لفظ حديث ابن كثير ومعناهم، قال: كَتَبَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَسْأَلُهُ عَنِ الْقَدَرِ, فَكَتَبَ: أَمَّا بَعْدُ, أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللَّهِ, وَالاِقْتِصَادِ فِي أَمْرِهِ, وَاتِّبَاعِ سُنَّةِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَتَرْكِ مَا أَحْدَثَ الْمُحْدِثُونَ بَعْدَ مَا جَرَتْ بِهِ سُنَّتُهُ, وَكُفُوا مُؤْنَتَهُ, فَعَلَيْكَ بِلُزُومِ السُّنَّةِ فَإِنَّهَا لَكَ - بِإِذْنِ اللَّهِ - عِصْمَةٌ, ثُمَّ اعْلَمْ أَنَّهُ لَمْ يَبْتَدِعِ النَّاسُ بِدْعَةً إِلاَّ قَدْ مَضَى قَبْلَهَا مَا هُوَ دَلِيلٌ عَلَيْهَا أَوْ عِبْرَةٌ فِيهَا؛ فَإِنَّ السُّنَّةَ إِنَّمَا سَنَّهَا مَنْ قَدْ عَلِمَ مَا فِي خِلاَفِهَا - وَلَمْ يَقُلِ ابْنُ كَثِيرٍ (مَنْ قَدْ عَلِمَ) - . مِنَ الْخَطَإِ وَالزَّلَلِ وَالْحُمْقِ وَالتَّعَمُّقِ, فَارْضَ لِنَفْسِكَ مَا رَضِيَ بِهِ الْقَوْمُ لأَنْفُسِهِمْ؛ فَإِنَّهُمْ عَلَى عِلْمٍ وَقَفُوا, وَبِبَصَرٍ نَافِذٍ كَفَوْا, وَلَهُمْ عَلَى كَشْفِ الأُمُورِ كَانُوا أَقْوَى, وَبِفَضْلِ مَا كَانُوا فِيهِ أَوْلَى, فَإِنْ كَانَ الْهُدَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ لَقَدْ سَبَقْتُمُوهُمْ إِلَيْهِ وَلَئِنْ قُلْتُمْ: (إِنَّمَا حَدَثَ بَعْدَهُمْ). مَا أَحْدَثَهُ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِهِمْ وَرَغِبَ بِنَفْسِهِ عَنْهُمْ؛ فَإِنَّهُمْ هُمُ السَّابِقُونَ, فَقَدْ تَكَلَّمُوا فِيهِ بِمَا يَكْفِي, وَوَصَفُوا مِنْهُ مَا يَشْفِي, فَمَا دُونَهُمْ مِنْ مَقْصَرٍ, وَمَا فَوْقَهُمْ مِنْ مَحْسَرٍ, وَقَدْ قَصَّرَ قَوْمٌ دُونَهُمْ فَجَفَوْا, وَطَمَحَ عَنْهُمْ أَقْوَامٌ فَغَلَوْا, وَإِنَّهُمْ بَيْنَ ذَلِكَ لَعَلَى هُدًى مُسْتَقِيمٍ, كَتَبْتَ تَسْأَلُ عَنِ الإِقْرَارِ بِالْقَدَرِ فَعَلَى الْخَبِيرِ - بِإِذْنِ اللَّهِ - وَقَعْتَ, مَا أَعْلَمُ مَا أَحْدَثَ النَّاسُ مِنْ مُحْدَثَةٍ, وَلاَ ابْتَدَعُوا مِنْ بِدْعَةٍ هِيَ أَبْيَنُ أَثَرًا وَلاَ أَثْبَتُ أَمْرًا مِنَ الإِقْرَارِ بِالْقَدَرِ, لَقَدْ كَانَ ذَكَرَهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ الْجُهَلاَءُ يَتَكَلَّمُونَ بِهِ فِي كَلاَمِهِمْ وَفِي شِعْرِهِمْ, يُعَزُّونَ بِهِ أَنْفُسَهُمْ عَلَى مَا فَاتَهُمْ, ثُمَّ لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ بَعْدُ إِلاَّ شِدَّةً, وَلَقَدْ ذَكَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَيْرِ حَدِيثٍ وَلاَ حَدِيثَيْنِ, وَقَدْ سَمِعَهُ مِنْهُ الْمُسْلِمُونَ فَتَكَلَّمُوا بِهِ فِي حَيَاتِهِ وَبَعْدَ وَفَاتِهِ, يَقِينًا وَتَسْلِيمًا لِرَبِّهِمْ, وَتَضْعِيفًا لأَنْفُسِهِمْ, أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ لَمْ يُحِطْ بِهِ عِلْمُهُ, وَلَمْ يُحْصِهِ كِتَابُهُ, وَلَمْ يَمْضِ فِيهِ قَدَرُهُ, وَإِنَّهُ مَعَ ذَلِكَ لَفِي مُحْكَمِ كِتَابِهِ مِنْهُ اقْتَبَسُوهُ, وَمِنْهُ تَعَلَّمُوهُ, وَلَئِنْ قُلْتُمْ: (لِمَ أَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ كَذَا وَلِمَ قَالَ كَذَا). لَقَدْ قَرَءُوا مِنْهُ مَا قَرَأْتُمْ, وَعَلِمُوا مِنْ تَأْوِيلِهِ مَا جَهِلْتُمْ, وَقَالُوا بَعْدَ ذَلِكَ كُلِّهِ بِكِتَابٍ وَقَدَرٍ, وَكُتِبَتِ الشَّقَاوَةُ, وَمَا يُقَدَّرْ يَكُنْ, وَمَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ, وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ, وَلاَ نَمْلِكُ لأَنْفُسِنَا ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا, ثُمَّ رَغِبُوا بَعْدَ ذَلِكَ وَرَهِبُوا.

واتە: لە ئیبنو صەلتەوە دەگێرنەوە، ئەمە گۆی فەرموودەکەی ئیبنو (کثیر) و ماناکەیەتی، کە وتویەتی: پیاوێ نامەی نوسی بۆ عومەری کوڕی (عبد العزیز) دەربارەی قەزاو قەدەر پرسیاری لێ کرد، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی نامەکەی دایەوە: لەدواییدا، وەسیەتت بۆ دەکەم لەخوا بترسەو پابەندبە بە تەقوای خواوە، بەرامبەر بە فەرمانەکانی خوای گەورە و سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم مام ناوەند بە نەزێدەڕۆیی بکە نە کەمتەرخەم بە، ئەوەی سوننەتە دەستی پێوە بگرەو وازبێنە لە بیدعەی بیدعەکاران و دوربە لێی، لەدوای ئەوەی کە شەرع بە سوننەتی داناوەو چەسپاوە، باری سەرشانی خۆتان قورس مەکەن بە بیدعەی بیدعەکاران ئەوەندە بەسە بۆتان کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم بەیانیان کردوە بۆتان پابەندبن پێوەی. ئاگاداربە شوێنی بیدعە نەکەوی، پێویستە لەسەرت پابەندبی بە سوننەتەوە، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی پاراستنت لە گومڕایی و تاوان و تیاچون و سزاو تۆڵەی خوای گەورە.

لەپاشدا بزانە کە بیدعەکاران هەر بیدعەیە دابهێنن پێشتر بەڵگەی قورئان و سوننەت هەبوبێ لەسەری کە گومڕایی و پوچ و بەتاڵە، ئەوە پوچ و بەتاڵە و گومڕایی یە، سوننەت ئەوەیە کە خوای گەورە بە سونەتی داناوەو وەحی ناردوە بۆ پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم، بەڕاستی هەر خۆشی ئەزانێ کە پێچەوانەی سوننەتیش بیدعەو هەڵەو تاوان و گوج و گێلی و بارگرانی و قوڵبونەوەیە - ئیبنو (کثیر) (مَنْ قَدْ عَلِمَ)ی نەهێنا لە فەرموودەکەیدا - .

نەفسی خۆت رازی بکە بەو رێبازەی کە سەلەفی سالح لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان پێی رازی بوون و لەسەری بوون، چونکە ئەوان لەسەر ئەو بەرنامەو پرۆگرامە بوون و بە زانستەوە لەسەری وەستان، بە بەرچاو ڕونی و بە بەڵگەوە وازیان لە بیدعە هێناو لێی دورکەوتنەوە و شوێنی نەکەوتن، ئەوانە واتە سەلەفی صالح بەهێزتربوون لە خەڵکانی تر بۆ رونکردنەوەی ئەو کارەی کە پێویستی بە رونکردنەوەیە، ئەوانە دورترین کەس بوون لەو شتانەی کە زیانیان هەبوو بۆ خۆیان و دینەکەیان، لە خەڵکانی تر لەپێشتر بوون بە فەزڵی زانست و بەرچاوڕونی و ناسینی هەق و رۆشتن لەسەری - بەڵام ئەوانەی کە لە رێباز و بەرنامەی ئەوان دەرچوون کەوتنە ناو زەلکاوێکەوە خوای گەورە هاوەڵانی

لێ پاراست، شتانێکیان داهێنا هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر دانەبەزی بوو، بۆیە تاوانەکەی لە ئەستۆی ئەوانە هەروەها تاوانی ئەوانەش کە توش بوون -، ئەی خەڵکانی بیدعەچی و شوێنکەوتەی هەواو ئارەزوو ئەگەر ئەوەی ئێوە لەسەرینی هیدایەت و رێگای راست بێ کەواتە لەدەستی هاوەڵان دەرچوو، پەیان پێ نەبرد، بەڵکو ئێوە پەیتان پێ برد، ئەمەش ناگونجێ و مەحاڵە چونکە هەق و راستی ئەوە بوو کە هاوەڵان لەسەری بوون.

ئەگەر بڵێن: ئەوەی داهێنراوە لەدوای سەلەفی صالح گومڕایی نیە بەڵکو رێگای راست و هیدایەتە، با پێچەوانەی رێبازی ئەوانیش بێت، ئەمەش راست نیەو یوچ و بەتاڵە، چونکە سەلەفی صالح لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان پێشکەوتوبوون بۆ سەر رێگای راست و هیدایەت و هەموو خێرێك و سوربوون لەسەری، ناگونجێ و مەحاڵە کەسی تر پێش ئەوان بکەوێت، کەسیش نایانگاتێ، ئەوەندەی ئەوان لێی دواون و وەسفیان کردوە بەسە ئیتر پێویست بەوە ناکات خەڵك شتی تازە دابهێنێت لەدیندا، لەشتانێ نەفسی خۆیان گرتوە و لێی نەدواون و بێ دەنگ بوون، هیچ کەس نیە بێ دەنگ بێ لێیان وەك ئەوان، هیچ کەس ناتوانێ شتێ کەشف بکات کە ئەوان کەشفیان نەکردبێ، چونکە ئەوان هەموو هەقێکیان بۆ خەڵك رونکردۆتەوە، پارێزراوبوون لەوەی کە بکەونەوە ناو کاروباری پوچ و بەتاڵ و بیدعەوە، خەڵکانێ لەوەی کە سەلەف لەسەری بوون کەمتەرخەمیان کرد نەگەیشتنە سنوری مام ناوەندی، خەڵکانێکیش زێدەڕۆییان کرد لە سنوری شەرعی دا نەوەستان، بێگومان هەردوولایان هەڵەن، بەڵکو سەلەفی صالح لەسەر رێگای راست بوون.

نوسیوتە دەربارەی داننان بە قەدەردا پرسیارت کردوە کە بیدعەیە یان سوننەت؟ بە ئیزنی خوای گەورە لە یەکێ پرسیارت کردوە شارەزایە لەو بارەوەو زانیاریم هەیە دەربارەی، بێگومان ئەم بیدعە رون و ئاشکرانەی کە خەڵك دایهێناون داننان بە قەدەردا هەقتر و رونتر و ئاشکراترە لەوانە، گومڕاو نەزانەکانی سەردەمی نەفامی لە هۆنراوەو وتەکانیاندا باسیان کردوەو قسەیان لەسەر کردوە، کردویانتە هۆکاری دڵدانەوە و سەرەخۆشی و ئارامگرتن لەکاتی لەدەستدانی خۆشەویستان و ئەوەی لەدەستیان چووە، ئیسلام زیاتر سەلماندی و دانی پێدا ناو رونی کردەوە - بەڕاستی هەموو شتێ بە قەزاو قەدەری خوایە، لە موڵکی خوای گەورەدا

هیچ شتێ روونادات بەبێ ویستی ئەو، هەرشتێ روبدات پێشتر لە ئەزەلدا زانیاری هەبوە دەربارەی، لە (لوح المحفوظ)دا نوسیویەتی، پێنج سەد ساڵ پێش ئەوەی زەوی و ئاسمانەكان دروست بكات وەك لە فەرمودەی راست و دروستدا هاتوە -.

لەیەك و دوو لە فەرمودەكانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم هاتوە بەڵكو زیاتریش، موسوڵمانان باسی قەدەریان لێ بیستوە، لە ژیانی خۆیداو لەدوای مردنیشی قسەیان لەسەر كردوە، باوەیان پێی هێناوە بە دڵنیایی و بە خۆبەدەستەوەدان و تەسلیم بوون بە پەروەردگاری خۆیان، خۆیان بە كەم داناوەو، خوای گەورەیان بە پاك راگرتوە لەوەی كە شتێ زانین و زانیاری ئەو پەی پێ نەبردبێ و، لە قورئانەكەیدا هەژمار نەكرا بێت بەڵكو خوای گەورە زانین و زانیاری هەیە بەسەر هەموو شتێكدا، هەر قەدەرێ كە روودەدات زانین و زانیاری خوا پێشی كەوتوەو، لە (لوح المحفوظ)دا تۆماری كردوە، روودانی شتێ كە ویست و ئیرادەی لێ بێ روبدات یان روونەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا باسی قەدەر وەك چۆن لە سوننەتدا هاتوە لە قورئانەكەی خوای گەورەشدا هاتوە - وەك:

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾ سورة القمر: ٤٩ -، لەوەوە هەڵیان گۆستوەو، لەوەوە فێربوون، ئەگەر بڵێن: خوای گەورە بۆ ئەم ئایەتەی دابەزاندوە؟ - كە بە رواڵەت پێچەوانەی قەدەرە - بۆچی وای فەرمووە؟ ئەوەی ئێوە دەیخوێننەوە ئەوانیش خوێندیانەوە، لە تەئویلەكەی چاك تێگەیشتن بەلام ئێوە لێی تێناگەن، لەدوای هەموو ئەمانە سەلەف وتیان: هەموو شتێك بە قەزاو قەدەری خوایە لە (لوح المحفوظ)دا تۆماری كردوە، نەگبەت بۆی نوسراوە كە نەگبەتە، خۆشبەختیش بۆی نوسراوە كە خۆشبەختە، خوای گەورە تەقدیری هەر شتێكی كرد ئیللا هەردەبێ ببێت، ئەوەی بیەوێ ببێ دەبێ، ئەوەی نەیەوێ ببێ هەرگیز نابێ، هەموو شتێ بە دەستی خوای گەورەیە و بە قەزاو قەدەری ئەوە، سودو زیان نادەینە پاڵ خۆمان، لەپاشدا لەدوای دانان بە قەدەردا كردەوەی چاك دەكەن بە هیوای پاداشتی دوارۆژ، لە كردەوەی خراپە دوردەكەونەوە لە ترسی سزاو تۆڵەی خوای گەورە.

٤٦١٣ - (حسن) عن نافع قال: كَانَ لاِبْنِ عُمَرَ صَدِيقٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ يُكَاتِبُهُ, فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَكَلَّمْتَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقَدَرِ فَإِيَّاكَ أَنْ تَكْتُبَ إِلَيَّ؛ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي أَقْوَامٌ يُكَذِّبُونَ بِالْقَدَرِ).

واتە: لە نافیعەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ هاوڕێیەکی خۆشەویستی هەبوو خەڵکی شام بوو نامەی بۆ دەنوسی، (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ نامەیەکی بۆ نوسی بەم شێوەیە: پێم گەیشتوە کە دەربارەی قەدەر دەدوێی ئاگاداربە ئیتر لەمەولا نامەم بۆ نەنوسی، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەم ئوممەتەی مندا خەڵکانێ پەیدا دەبن بەناوی قەدەرەوە درۆدەکەن).

٤٦١٤ - (حسن الإسناد مقطوع) عن خالد الحذاء قال: قلت للحسن: يَا أَبَا سَعِيدٍ أَخْبِرْنِي عَنْ آدَمَ, أَلِلسَّمَاءِ خُلِقَ أَمْ لِلأَرْضِ؟ قَالَ: لاَ بَلْ لِلأَرْضِ. قُلْتُ: أَرَأَيْتَ لَوِ اعْتَصَمَ فَلَمْ يَأْكُلْ مِنَ الشَّجَرَةِ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنْ لَهُ مِنْهُ بُدٌّ, قُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: (مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ إِلاَّ مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ). قَالَ: إِنَّ الشَّيَاطِينَ لاَ يَفْتِنُونَ بِضَلاَلَتِهِمْ إِلاَّ مَنْ أَوْجَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَحِيمَ.

واتە: لە خالیدی کوڕی (حذاء)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم بە حەسەنی بەصری: ئەی ئەبا سەعید هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئادەم، کە ئایا بۆ ئەوە دروستکرا لە ئاسمان واتە لە بەهەشت بژی یان لەسەر زەوی دا؟ وتی: نەخێر بەڵکو بۆ ئەوەی لەسەر زەوی دا بژی، وتم: ئەگەر تاوانی نەکردایە لەبەری درەختەکەی نەخواردایە چی؟ وتی: هەر دەبوایە بیخواردایە، وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئەم ئایەتە:

﴿مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾﴾ سورة الصافات :١٦٢-١٦٣. واتە: ئێوە ناتوانن لەبەرانبەری خوادا گومڕاکەری (کەس) بن. بێجگە ئەو کەسەی (خوا دەزانێ) دەچێتە دۆزەخەوە.

حەسەن وتی: شەیاتینەکان ناتوانن بە گومڕایی خۆیان کەس گومڕا بکەن مەگەر کەسێ کە خوای گەورە خۆی تەقدیری کردبێ دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

٤٦١٥ - (حسن الإسناد مقطوع) عن الحسن في قوله تعالى: (وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ) قَالَ: خَلَقَ هَؤُلاَءِ لِهَذِهِ, وَهَؤُلاَءِ لِهَذِهِ.

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿لِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ سورة هود: ١١٩. واتە: هەر بۆ ئەوە دروستی کردوون.
وتویەتی: خوای گەورە ئەوانەی دروستکردوە بۆ بەهەشت و، ئەوانەشی دروستکردوە بۆ دۆزەخ.

٤٦١٦ - (حسن الإسناد مقطوع) عن خالد الحذاء قال: قلت للحسن: (مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ إلاَّ مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ). قَالَ: إلاَّ مَنْ أَوْجَبَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ أَنَّهُ يَصْلَى الْجَحِيمَ.

واتە: لە خالیدی کوڕی (حژاء)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە حەسەنی بەصری: ﴿مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾﴾. سورة الصافات: ١٦٢-١٦٣.
واتە: ئێوە ناتوانن لەبەرانبەری خوادا گومڕاکەری (کەس) بن. بێجگە ئەو کەسەی (خوا دەزانێ) دەچێتە دۆزەخەوە.
حەسەن وتی: مەگەر کەسێ کە خوای گەورە خۆی تەقدیری کردبێ دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

٤٦١٧ -(حسن الإسناد مقطوع) عن الحسن قال: لأَنْ يُسْقَطَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَقُولَ الأَمْرُ بِيَدِي.

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە ئاسمانەوە بکەوێتە سەر زەوی پێم خۆشترە لەوەی بڵێ: کاروکردەوە بەدەست خۆمە - واتە خوای گەورە تەقدیری نەکردوە ئەو کارە بکەم یان نەیکەم، قەدەر رەت بکاتەوە - .

٤٦١٨ - (صحيح مثله) عن حميد قال: قَدِمَ عَلَيْنَا الْحَسَنُ مَكَّةَ, فَكَلَّمَنِى فُقَهَاءُ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ أُكَلِّمَهُ فِى أَنْ يَجْلِسَ لَهُمْ يَوْمًا يَعِظُهُمْ فِيهِ. فَقَالَ: نَعَمْ. فَاجْتَمَعُوا فَخَطَبَهُمْ فَمَا رَأَيْتُ أَخْطَبَ مِنْهُ, فَقَالَ رَجُلٌ: يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ خَلَقَ الشَّيْطَانَ؟ فَقَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ!! هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ؟ خَلَقَ اللَّهُ الشَّيْطَانَ, وَخَلَقَ الْخَيْرَ, وَخَلَقَ الشَّرَّ. قَالَ الرَّجُلُ: قَاتَلَهُمُ اللَّهُ كَيْفَ يَكْذِبُونَ عَلَى هَذَا الشَّيْخِ.

واتە: لە حومەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەمەککە حەسەنی بەصری هات بۆ لامان، شەرعزانانی خەڵکی مەککە وتیان دەمانەوێ پێی بڵێی رۆژێ دانیشین وتارمان بۆ بدات و ئامۆژگاریمان بکات، وتی: بەڵێ باشە، کۆبونەوە وتاری بۆ دان هیچ کەسێکم نەدیوە ئەوەندەی ئەو بە جوانی وتار بدات و ئامۆژگاری خەڵك بکات، پیاوێ وتی: ئەی ئەبا سەعید کێ شەیتانی دروستکرد؟ وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە جگە لەو کردگاری تر هەیە؟ شەیتانی دروستکردوە، خێر و چاکەو شەڕ و خراپەشی دروستکردوە، پیاوەکە وتی: خوا بتان کوژێ چۆن درۆ دەکەن بەدەم حەسەنی بەصریەوە.

٤٦١٩ - (صحيح مثله) عن الحسن: (كَذَلِكَ نَسْلُكُهُ فِى قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ). قَالَ: الشِّرْكُ.

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەگێرنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە:

﴿ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ سورة الحجر: ١٢.

واتە: ئا بەو جۆرە ئێمە ئەو (قورئانە) دەخەینە ناو دڵی تاوانبارانەوە.

حەسەن وتویەتی: هاوبەش بۆ خوا دانان.

٤٦٢٠ - (حسن الإسناد مقطوع) عن الحسن في قوله عز وجل: (وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ). قَالَ: بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الإِيمَانِ.

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەگێرنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾. سورة سبأ: ٥٣. واتە: بەربەست دەخرێتە نێوان ئەوان و ئەوەی ئارەزووی دەکەن (کە بڕواهێنان و تەوبەکردنە).
حەسەن وتویەتی: نێوان ئەوان(کافران) و بڕواهێنان.

٤٦٢١ - (صحيح مثله) عن ابن عون قال كُنْتُ أَسِيرُ بِالشَّامِ, فَنَادَانِي رَجُلٌ مِنْ خَلْفِي, فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَجَاءُ بْنُ حَيْوَةَ, فَقَالَ: يَا أَبَا عَوْنٍ, مَا هَذَا الَّذِى يَذْكُرُونَ عَنِ الْحَسَنِ؟ قَالَ: قُلْتُ: إِنَّهُمْ يَكْذِبُونَ عَلَى الْحَسَنِ كَثِيرًا.

واتە: لە ئیبنو عەونەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ لە شام ئەسیر بووم پیاوێ لەدوامەوە بانگی کردم، لام کردەوە دەبینم رەجائی کوڕی حەیوەیەوتی: ئەی ئەبا عەون ئەوە چی یە دەربارەی حەسەنی بەصری دەیلێن؟ وتی: وتم: ئەوانە درۆی زۆریان کردوە بەدەم حەسەنەوە.

٤٦٢٢ - ((صحيح مثله) عن أيوب قال: كَذَبَ عَلَى الْحَسَنِ ضَرْبَانِ مِنَ النَّاسِ: قَوْمٌ الْقَدَرُ رَأْيُهُمْ وَهُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يُنَفِّقُوا بِذَلِكَ رَأْيَهُمْ, وَقَوْمٌ لَهُ فِي قُلُوبِهِمْ شَنَآنٌ وَبُغْضٌ, يَقُولُونَ: أَلَيْسَ مِنْ قَوْلِهِ كَذَا؟ أَلَيْسَ مِنْ قَوْلِهِ كَذَا؟

واتە: لە ئەیوبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دوو جۆر لە خەڵك درۆیان کردوە بەدەم حەسەنەوە: خەڵکانی یەکەم ئەوانەن کە راوبۆچون بیروباوەڕیان نەفی قەدەرە واتە قەدەر رەت دەکەنەوە کە قەدەریەکانن رەواجی پێ دەدەن، جۆرەکەی تریان: بوغز و کینە لە دڵیاندایە بەرامبەری، دەڵێن: ئەوە نیە لەو وتەیەدا ئاوا دەڵێ؟ ئەوە نیە لەو وتەیەدا ئاوا دەڵێ؟

٤٦٢٣ - (صحيح مثله) عن يحيى بن كثير العنبري قال: كَانَ قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ يَقُولُ لَنَا: يَا فِتْيَانُ, لاَ تُغْلَبُوا عَلَى الْحَسَنِ؛ فَإِنَّهُ كَانَ رَأْيُهُ السُّنَّةَ وَالصَّوَابَ.

واتە: لە یەحیای کوڕی (کثیر)ی عەنبەریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قورەی کوڕی خالید پێی وتین: ئەی لاوەکان، قەدەریەکان رای خۆیان نەسەپێنن بە سەرتاندا بڵێن حەسەن لە خۆمانە قەدەریە، بێگومان راوبۆچونی حەسەن سوننەیەو راست و دروستە.

٤٦٢٤ - (صحيح مثله) عن ابن عون قال: لَوْ عَلِمْنَا أَنَّ كَلِمَةَ الْحَسَنِ تَبْلُغُ مَا بَلَغَتْ لَكَتَبْنَا بِرُجُوعِهِ كِتَابًا وَأَشْهَدْنَا عَلَيْهِ شُهُودًا, وَلَكِنَّا قُلْنَا: كَلِمَةٌ خَرَجَتْ لاَ تُحْمَلُ.

واتە: لە ئیبنو عەونەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر بمانزانیایە ئەو وتەیەی کە حەسەنی بەصری دەربارەی قەدەر دەیڵێ پێچەوانەی قورئان و سوننەتە ئەوا نامەمان بۆ دەنوسی کە بگەڕێتەوە لەو وتانەی و شایەتیمان بۆ دەدا کە گەڕاوەتەوە، بەڵکو وتەکانی دەقی قورئان و سوننەن، بەڵام دەڵێین: وتەیەکە لە زمانی حەسەنەوە دەردەچێت خەڵکەکە بەهەڵە لێی حاڵی دەبن - بەو شێوەیە لێی حاڵی نابن کە حەسەن دەیڵێ و مەبەستێتی - .

٤٦٢٥ - (صحيح مثله) عن ايوب قال: قال لي الحسن: مَا أَنَا بِعَائِدٍ إِلَى شَيْءٍ مِنْهُ أَبَدًا.

واتە: لە ئەیوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: حەسەنی بەصری پێی وتم: من هەرگیز پەشیمان نیم لەو وتانەم و ناگەڕێمەوە کە خەڵك پێیان وایە نەفی قەدەر دەکەم، چونکە دەقی قورئان و سوننەن و نەفی قەدەر ناکەن.

٤٦٢٦ - (صحيح مثله) عن عثمان البتي قال: مَا فَسَّرَ الْحَسَنُ آيَةً قَطُّ إِلاَّ عَلَى الإِثْبَاتِ.

واته: له (عثمان البتى)وه دەگێرنەوە، کە وتویەتی: حەسەنی بەصری هەرگیز تەفسیری ئایەتێکی نەکردوە ئیللا بە سەلماندنەوە نەبێت.

## سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی کەسێ بەسەر کەسێکی تردا.

## ٨ - باب فِي التَّفْضِيلِ.

٤٦٢٧ - (صحيح) عن ابن عمر قال: كُنَّا نَقُولُ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَدًا, ثُمَّ عُمَرَ, ثُمَّ عُثْمَانَ, ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ تَفَاضُلَ بَيْنَهُمْ.

واته: له ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لەدوای ئەو کەسمان بە هاوتای پێشەوا ئەبو بەکر دانەدەنا، لەپاشدا پێشەوا عومەر، لەپاشدا پێشەوا (عثمان) رەزای خوایان لێ بێ، ئینجا وازمان دەهێنا لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و فەزڵی کەسیانمان نەدەدا بەسەر کەسی تریاندا.

٤٦٢٨ - (صحيح) عن ابن عمر قال: كُنَّا نَقُولُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَيٌّ: أَفْضَلُ أُمَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بَعْدَهُ أَبُو بَكْرٍ, ثُمَّ عُمَرُ, ثُمَّ عُثْمَانُ رضى الله عنهم أَجْمَعِينَ.

واته: له ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر

صلی الله علیه وسلم خۆی لەژیاندا بوو دەمانوت: چاکترینی ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەدوای خۆی پێشەوا ئەبو بەکرە، لەپاشدا پێشەوا عومەرە، لەپاشدا پێشەوا (عثمان)ە خوای گەورە لە هەر هەموویان رازی بێ.

٤٦٢٩ - (صحيح) عن محمد بن الحنفية قال: قلت لأبي: أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَبُو بَكْرٍ, قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ عُمَرُ. قَالَ: ثُمَّ خَشِيتُ أَنْ أَقُولَ ثُمَّ مَنْ؟ فَيَقُولَ: عُثْمَانُ, فَقُلْتُ: ثُمَّ أَنْتَ يَا أَبَةِ؟ قَالَ: مَا أَنَا إِلاَّ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی حەنەفیەوە - واتە کوڕی پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) رەزای خوای لێ بێ - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە باوکمم وت: لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ کەسێ باشترە؟ وتی: پێشەوا ئەبو بەکر، وتم: ئەی لەدوای ئەو کێ باشترین کەسە؟ وتی: پێشەوا عومەر، ترسام ئەگەر لەدوای ئەو پرسیاری لێ بکەمەوە بڵێ: (عثمان) رەزای خوایان لێ بێ، وتم: لەپاشدا تۆ باوکە گیان، وتی: من پیاوێکم لە موسوڵمانان.

٤٦٣٠ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن سفيان قال: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ كَانَ أَحَقَّ بِالْوِلاَيَةِ مِنْهُمَا فَقَدْ خَطَّأَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارَ, وَمَا أُرَاهُ يَرْتَفِعُ لَهُ مَعَ هَذَا عَمَلٌ إِلَى السَّمَاءِ.

واتە: لە سوفیانی (ثوری)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەوەی پێی وابێ پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ شایەنترە بە خەلیفەی موسوسڵمانان ئەوە پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ و کۆچەران و یاریدەدەران هەر هەموویان بە هەڵە دەزانێ چونکە ئەوان یەدەنگ بوون لەسەری، کردەوەکانی لێ وەرناگیرێت چونکە بیروباوەڕی پێچەوانەی بیروباوەڕی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

٤٦٣١ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن سفيان لثوري قال: الْخُلَفَاءُ خَمْسَةٌ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ رضى الله عنهم.

واتە: لە سوفیانی (ثوری)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خەلیفەکان پێنجن ئەوانیش بریتین لە: ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان) و عەلی و عومەری کوڕی (عبد العزیز) ڕەزای خوایان لێ بێ.

## سەبارەت بە خەلیفەکان.

## ٩ - باب فِى الْخُلَفَاءِ.

٤٦٣٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أَنَّ رَجُلاً أَتَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّى أَرَى اللَّيْلَةَ ظُلَّةً يَنْطِفُ مِنْهَا السَّمْنُ وَالْعَسَلُ, فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ بِأَيْدِيهِمْ فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ, وَأَرَى سَبَبًا وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ, فَأَرَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ بِهِ, ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ بِهِ, ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ بِهِ, ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ, ثُمَّ وُصِلَ فَعَلاَ بِهِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بِأَبِى وَأُمِّى لَتَدَعَنِّى فَلأَعْبُرَنَّهَا. فَقَالَ: (اعْبُرْهَا). قَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ: فَظُلَّةُ الإِسْلاَمِ, وَأَمَّا مَا يَنْطِفُ مِنَ السَّمْنِ وَالْعَسَلِ فَهُوَ الْقُرْآنُ لِينُهُ وَحَلاَوَتُهُ, وَأَمَّا الْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ فَهُوَ الْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ مِنْهُ, وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَهُوَ الْحَقُّ الَّذِى أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ, ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ بَعْدَكَ رَجُلٌ فَيَعْلُو بِهِ, ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ, ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ, ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ, أَىْ رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّى أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ فَقَالَ: (أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا). فَقَالَ: أَقْسَمْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّى مَا الَّذِى أَخْطَأْتُ, فَقَالَ: النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ تُقْسِمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەمشەو لە خەوما هەورێکم دی هەنگوین و رۆنی لێ دەباری، خەڵکم دەبینی مشتیان بۆ گرتبو هەیان بوو زۆری بەردەکەوت، هەشیان بوو کەمی بەردەکەوت، پەتێکیشم بینی لە ئاسمانەوە شۆڕکرابووەوە بۆ زەوی، ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دیم تۆ دەستت پێوە گرت و سەرکەوتی، لەدوای تۆش کەسێکی تر دەستی پێوە گرت و سەرکەوت، لەپاشدا کەسێکی تریش دەستی پێوە گرت و سەرکەوت، ئینجا کەسێکی تریش دەستی پێوە گرت ویستی سەرکەوێ پەتەکە پچڕا، پاشان دەستی پێوە گرتەوەو سەرکەوت، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: باوکم دایکم بە فیدات بن وازم لێ بێنە با تەعبیری ئەو خەوە بکەم واتە لێکی بدەمەوە، فەرمووی: (تەعبیری بکە)، وتی: هەورەکە: ئیسلامە، هەنگوین و رۆنەکە هێمنی و نەرمی و شیرینی قورئانە، هەندێکی زۆری بەردەکەوێت و هەندێکی کەم، پەتەکەش: ئەو رێگا راست و هەقەیە کە تۆ لەسەریتی، دەستت پێوە گرتووە خوای گەورە سەرت دەخات، لەدوای تۆش کەسێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، لەپاشدا کەسێکی تریش دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، ئینجا کەسێکی تریش دەستی پێوە دەگرێت و دەپچڕێت، پاشان دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێم بفەرموو پێکام یان نا؟ فەرمووی: (هەندێکت پێکاو هەندێکت نەپێکا)، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوێندت دەدەم چیم هەڵەبوو، فەرمووی: (سوێند مەخۆ پێت ناڵێم).

٤٦٣٣ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بهذه القصة قال: فَأَبَى أَنْ يُخْبِرَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم، هەمان بەسەرهات هاتوە، راوی وتی: نەیویست وەڵامی بداتەوە کە چی هەڵەبوو.

٤٦٣٤ - (صحيح) عن أبو بكرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال ذات يوم: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ رُؤْيَا؟). فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا رَأَيْتُ كَأَنَّ مِيزَانًا نَزَلَ مِنَ السَّمَاءِ فَوُزِنْتَ أَنْتَ وَأَبُو بَكْرٍ فَرُجِحْتَ أَنْتَ بِأَبِي بَكْرٍ, وَوُزِنَ عُمَرُ وَأَبُو بَكْرٍ فَرُجِحَ أَبُو بَكْرٍ, وَوُزِنَ عُمَرُ وَعُثْمَانُ فَرُجِحَ عُمَرُ, ثُمَّ رُفِعَ الْمِيزَانُ فَرَأَيْنَا الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو بەکرەوە دەگێرنەوە، کە رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ لەئێوە خەوی دیوە؟) پیاوێ وتی: من خەوێکم دیوە، ترازویە لە ئاسمانەوە دابەزی تۆ و پێشەوا ئەبوبەکری کێشانە کرد تۆ لەو چاکتربووی، جا پێشەوایان ئەبوبەکر و عومەری کێشانە کرد ئەبو بەکر چاکتر بوو لە عومەر، هەروەها پێشەوایان عومەر و (عثمان)ی کێشانە کرد عومەر چاکتر بوو لە (عثمان)، لەپاشدا ترازووەکە هەڵکێشرایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی ناخۆش بوو بە روخساریدا بۆمان دەرکەوت — لەبەرئەوەی کە پێشەوایان (عثمان) و عەلی کێشانە نەکرد - .

٤٦٣٥ - (صحيح) عن أبو بكرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ (أَيُّكُمْ رَأَى رُؤْيَا). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ, وَلَمْ يَذْكُرِ الْكَرَاهِيَةَ. قَالَ: فَاسْتَاءَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, يَعْنِي فَسَاءَهُ ذَلِكَ, فَقَالَ: (خِلاَفَةُ نُبُوَّةٍ, ثُمَّ يُؤْتِي اللَّهُ الْمُلْكَ مَنْ يَشَاءُ).

واتە: لە ئەبو بەکرەوە دەگێرنەوە، کە رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ لەئێوە خەوی دیوە؟) جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە بە هەمان مانا بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی ناخۆش بوو. راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دڵگران بوو بە خەوی کابرا، فەرمووی: (خیلافەتی پێغەمبەرایەتی، لەپاشدا خوای گەورە پاشایەتی دەدات بە هەرکەسێ کە بیەوێت).

٤٦٣٦ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله أنه كان يحدث: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أُرِيَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ صَالِحٌ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ نِيطَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَنِيطَ عُمَرُ بِأَبِي بَكْرٍ، وَنِيطَ عُثْمَانُ بِعُمَرَ). قَالَ جَابِرٌ: فَلَمَّا قُمْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْنَا: أَمَّا الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَمَّا تَنَوُّطُ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ فَهُمْ وُلاَةُ هَذَا الأَمْرِ الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ بِهِ نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: جابری کوڕی (عبد الله) گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەمشەو پیاوێکی صاڵح خەوێکی دیوە: ئەبو بەکر خۆی هەڵواسیبوو بە پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، عومەر خۆی هەڵواسیبووە بە ئەبو بەکردا، (عثمان) خۆی هەڵواسیبوو بە عومەردا). جابر وتی: کاتێ کە لەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستاین، وتمان: پیاوە صاڵحەکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی بووە، بەڵام هەندێکیان خۆیان هەڵواسیوە بە هەندێکی تریاندا ئەوە کاربەدەستانی کاروباری ئەم دینەن کە بەدوای یەکتردا دێن.

٤٦٣٧ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَأَيْتُ كَأَنَّ دَلْوًا دُلِّيَ مِنَ السَّمَاءِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ بِعَرَاقِيهَا فَشَرِبَ شُرْبًا ضَعِيفًا، ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ فَأَخَذَ بِعَرَاقِيهَا فَشَرِبَ حَتَّى تَضَلَّعَ، ثُمَّ جَاءَ عُثْمَانُ فَأَخَذَ بِعَرَاقِيهَا فَشَرِبَ حَتَّى تَضَلَّعَ، ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ فَأَخَذَ بِعَرَاقِيهَا فَانْتَشَطَتْ وَانْتَضَحَ عَلَيْهِ مِنْهَا شَيْءٌ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمشەو لەخەوما لە ئاسمانەوە دۆڵچەیەکیان شۆڕکردەوە پێشەوا ئەبو بەکر هات دەستی گرت بەو تەختەوە کە دۆڵچەکەی پێ توندوتۆڵ دەکرێت کەمێکی لێ خواردەوە، لەپاشدا پێشەوا عومەر هات دەستی گرت بەو

تەختەوە کە دۆڵچەکەی پێ توندوتۆڵ دەکرێت ئەوەندەی لێ خواردەوە هەتا سکی پڕ بوو تێر بوو، لەپاشدا پێشەوا (عثمان) هات دەستی گرت بەو تەختەوە کە دۆڵچەکەی پێ توندوتۆڵ دەکرێت ئەوەندەی لێ خواردەوە هەتا سکی پڕ بوو تێر بوو، لەپاشدا پێشەوا عەلی هات دەستی گرت بەو تەختەوە کە دۆڵچەکەی پێ توندوتۆڵ دەکرێت تێك چوو ئاوەکەی پێدا رژا.

٤٦٣٨ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن مكحول قال: لَتَمْخُرَنَّ الرُّومُ الشَّامَ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا لاَ يَمْتَنِعُ مِنْهَا إِلاَّ دِمَشْقُ وَعَمَّانُ.

واتە: لە مەکحولەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: رۆمەکان چل رۆژ دەچنە شامەوەو داگیری دەکەن جگە لە دیمەشق و عەممان نەبێت.

٤٦٣٩ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن عبد الرحمن بن سلمان قال: سَيَأْتِي مَلِكٌ مِنْ مُلُوكِ الْعَجَمِ يَظْهَرُ عَلَى الْمَدَائِنِ كُلِّهَا إِلاَّ دِمَشْقَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی سولەیمانەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: رۆژێ دێ پاشایە لە پاشاکانی عەجەم دەست دەگرێت بەسەر هەموو وڵاتی مەدائین داو داگیری دەکات جگە لە دیمەشق نەبێت.

٤٦٤٠ - (صحيح) عن مكحول قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَوْضِعُ فُسْطَاطِ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمَلاَحِمِ أَرْضٌ يُقَالُ لَهَا الْغُوطَةُ).

واتە: لە مەکحولەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی جەنگە گەورەکەدا شوێنی خێمەی موسوڵمانان و سەربازەکانی خاکێکە لە شام پێی دەوترێت: (الْغُوطَةُ)).

٤٦٤١ - ((ضعيف مقطوع) عن عوف قال: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَخْطُبُ وَهُوَ يَقُولُ: إِنَّ مَثَلَ عُثْمَانَ عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ, ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ يَقْرَؤُهَا وَيَفُسِّرُهَا: (إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا). يُشِيرُ إِلَيْنَا بِيَدِهِ وَإِلَى أَهْلِ الشَّامِ.

واتە: لە عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە حەجاج بوو وتاری دەدا دەیوت: وێنەی پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ لەلای خوای گەورە وەك عیسای کوڕی مەریەم وایە، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە خوێندیەوەو تەفسیریشی کرد:

﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ سورة آل عمران:٥٥.

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەی عیسا من تۆ دەمرێنم و (روحت) بەرزدەکەمەوە بۆ لای خۆم، وە پاککەرەوەی تۆم لە (هاودەمی) ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون، پەیڕەوانی (ڕاستەقینەی) تۆ بەرزدەکەمەوە بەسەر بێ بڕوایاندا تا ڕۆژی دوایی. جا حەجاج بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئێمەو بۆ خەڵکی شامیش - کە لە پەیڕوانی پێشەوا (عثمان)ین ڕەزای خوای لێ بێ - .

٤٦٤٢ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن الربيع بن خالد الضبي قال: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَخْطُبُ فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: رَسُولُ أَحَدِكُمْ فِي حَاجَتِهِ أَكْرَمُ عَلَيْهِ أَمْ خَلِيفَتُهُ فِي أَهْلِهِ؟ فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: لِلَّهِ عَلَيَّ أَلاَّ أُصَلِّيَ خَلْفَكَ صَلاَةً أَبَدًا, وَإِنْ وَجَدْتُ قَوْمًا يُجَاهِدُونَكَ لأُجَاهِدَنَّكَ مَعَهُمْ. زَادَ إِسْحَاقُ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ: فَقَاتَلَ فِي الْجَمَاجِمِ حَتَّى قُتِلَ.

واتە: لە ڕەبیعی کوڕی خالیدی (ضبي)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە حەجاج بوو وتاری دەدا لە وتارەکەیدا دەیوت: کەسێك لەئێوە فروستادەیە ڕەوانە بکات بۆ پێویستیەکی خۆی چاکتر و بەڕێزترە یان جێنشینێ کە دایدەنێ بەسەر

خانەوادەکەیەوە؟ - بێگومان جێنشینێ کە دایدەنێ بەسەر خانەوادەکەیەوە چاکتر و بەرێزترە لەلای -، لەدڵی خۆمدا وتم: سوێند بە (الله) هەرگیز نوێژ لەدواتەوە ناکەم، ئەگەر دیم قەومێك جەنگان بەرامبەرت منیش لەگەڵیان بەرامبەرت دەجەنگم - رەبیع وا حاڵی بوو کە حەجاج مەبەستی ئەوەبوە خەلیفەکانی بەنی ئومەییە لە پێغەمبەران چاکترن - . ئیسحاق لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتی: رەبیع لە جەنگی جەماجم دا جەنگی کرد هەتا کوژرا.

٤٦٤٣ - (صحيح الإسناد إلى الحجاج, وهو الظالم المبير) عن عاصم قال: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: اتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ لَيْسَ فِيهَا مَثْنَوِيَّةٌ, وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا لَيْسَ فِيهَا مَثْنَوِيَّةٌ, لأَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَبْدِ الْمَلِكِ, وَاللَّهِ لَوْ أَمَرْتُ النَّاسَ أَنْ يَخْرُجُوا مِنْ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ فَخَرَجُوا مِنْ بَابٍ آخَرَ لَحَلَّتْ لِي دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ, وَاللَّهِ لَوْ أَخَذْتُ رَبِيعَةَ بِمُضَرَ لَكَانَ ذَلِكَ لِي مِنَ اللَّهِ حَلاَلاً, وَيَا عَذِيرِي مِنْ عَبْدِ هُذَيْلٍ يَزْعُمُ أَنَّ قِرَاءَتَهُ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ, وَاللَّهِ مَا هِيَ إِلاَّ رَجَزٌ مِنْ رَجَزِ الأَعْرَابِ مَا أَنْزَلَهَا اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ عَلَيْهِ السَّلاَمُ, وَعَذِيرِي مِنْ هَذِهِ الْحَمْرَاءِ, يَزْعُمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَرْمِي بِالْحَجَرِ فَيَقُولُ: إِلَى أَنْ يَقَعَ الْحَجَرُ قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ, فَوَاللَّهِ لأَدَعَنَّهُمْ كَالأَمْسِ الدَّابِرِ. قَالَ: فَذَكَرْتُهُ لِلأَعْمَشِ, فَقَالَ: أَنَا وَاللَّهِ سَمِعْتُهُ مِنْهُ.

واتە: لە عاصیمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە حەجاج بوو - کاتێ کە والی بوو لەلایەن خەلیفە (عبد الملك)ی کوڕی مەروانەوە - لەسەر مینبەر دەیوت: ئەوەندەی لە تواناتاندایە لەخوای گەورە بترسن، گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری هەموو فەرمانەکانی فەرمانڕەوای باوەڕداران (عبد الملك) بن بە رەهایی - ئەمەش ناشەرعیە چونکە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری تەنها لە چاکەدایە -، سوێند بە (الله) ئەگەر فەرمان بکەم بە خەڵك لە دەرگایەکی مزگەوتەوە دەرچن لەدەرگایەکی ترەوە دەرچن ئەوە خوێن و سەر و ماڵیان حەڵاڵە بۆم، سوێند بە (الله) ئەگەر هۆزی رەبیعە کەسێك بکوژن لە هۆزی (مضر)

تۆڵە بکەمەوە بۆم حەڵاڵە، کێ پاساوم بۆ دێنێتەوە ئەگەر بەندەی (هُذیل) بکوژم یان سزای بدەم - مەبەستی لە هاوەڵی بەڕێز (عبد الله)ی کوڕی مەسعود بووە - کە پێی وایە ئەو قورئانەی لەلایەتی و دەیخوێنێ لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیوە، سوێند بە (الله) هیچ نیە جگە لە هۆنراوە وەك هۆنراوەی عەرەبە دەشتەکیەکان، خوای گەورەوە داینەبەزاندوە بۆ پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم، مەبەستی لە عەجەمەکانە کە لەناو خۆیاندا دەیانوت: لەسەردەمی (عبد الملك) و حەجاجدا ئەوەندە فیتنەو ئاژاوە زۆربوە ئەگەر بەردێ بکەوێتە خوارەوە ناکەوێتە سەر زەوی ئاژاوەیە روودەدات، جا حەجاج هەڕەشەی لێ کردن وتی: سوێند بە (الله) ئەگەر لەلایەن عەجەمەکانەوە شتێ روبدات لەناویان دەبەم وەك چۆن دوێنێ رابورد و رۆشت ئاوا نایانهێڵم و لەناویان دەبەم، ئەمەم باسکرد بۆ ئەعمەش وتی: سوێند بە (الله) منیش بۆ خۆم ئەم قسەم لێ بیستوە.

٤٦٤٤ - (صحيح أيضا) عن الأعمش قال: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ هَذِهِ الْحَمْرَاءُ هَبْرٌ هَبْرٌ, أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ قَرَعْتُ عَصًا بِعَصًا لأَذَرَنَّهُمْ كَالأَمْسِ الذَّاهِبِ, يَعْنِى الْمَوَالِي.

واتە: لە ئەعمەشەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە حەجاج بوو لەسەر مینبەر دەیوت: ئەم عەجەمانە شایستەی لێدان و پارچە چارچەکردنن، سوێند بە (الله) ئەگەر داردەستێ بەر داردەستێ بکەوێت، مانای وایە ئەگەر بمەوێ لەناویان بەرم و بیانکوژم وەك چۆن دوێنێ رابردو رۆشت ئاوا نایانهێڵم و لەناویان دەبەم، واتە عەجەمەکان. — حەجاج هەڕەشەی لێ کردن وتی: ئەگەر لەلایەن عەجەمەکانەوە شتێ روبدات با کەمیش بێت بەداری بدرێت لە دارێکی تر و ببێتە هۆکاری هەڵگیرسانی فیتنەو ئاژاوە ئەوا سزای سەختیان دەدەم و لەناویان دەبەم -.

٤٦٤٥ - (صحيح إلى الحجاج الظالم) عن سليمان بن الأشعث قال: جَمَّعْتُ مَعَ الْحَجَّاجِ فَخَطَبَ فَذَكَرَ حَدِيثَ أَبِى بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ قَالَ فِيهَا: فَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا

لِخَلِيفَةِ اللَّهِ وَصَفِيِّهِ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ, قَالَ: وَلَوْ أَخَذْتُ رَبِيعَةَ بِمُضَرَ وَلَمْ يَذْكُرْ قِصَّةَ الْحَمْرَاءِ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی (أشعث)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نوێژی هەینیم لەدوای حەجاجەوە کرد وتای دا، جا فەرمودەکەی ئەبو بەکری کوڕی عەییاشی گێڕایەوە تێیدا وتی: لە قسەکانیدا وتی: گوێڕیەڵ و فەرمانبەرداری خەلیفەی خواو هەڵبژێردراوەکەی (عبد الملك)ی کوڕی مەروان بن. جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە وتی: (وَلَوْ أَخَذْتُ رَبِيعَةَ بِمُضَرَ) بەڵام باسی بەسەرهاتی (الْحَمْرَاءِ)ی نەکرد.

٤٦٤٦ -(حسن صحيح) عن سفينة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (خِلَافَةُ النُّبُوَّةِ ثَلَاثُونَ سَنَةً, ثُمَّ يُؤْتِي اللَّهُ الْمُلْكَ - أَوْ مُلْكَهُ - مَنْ يَشَاءُ).

واتە: لە سەفینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: خیلافەت لەسەر رێگەو رێبازی پێغەمبەرایەتی سی ساڵ بەردەوام دەبێ، لەپاشدا خوای گەورە فەرمانڕەوایەتی و پاشایەتی - یان موڵکەکەی - دەدات بە هەرکەسێ کە خۆی بیەوێت).

(حسن) قَالَ سَعِيدٌ: قَالَ لِي سَفِينَةُ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ أَبَا بَكْرٍ سَنَتَيْنِ, وَعُمَرَ عَشْرًا, وَعُثْمَانَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ, وَعَلِيٌّ كَذَا. قَالَ سَعِيدٌ: قُلْتُ لِسَفِينَةَ: إِنَّ هَؤُلَاءِ يَزْعُمُونَ أَنَّ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلَامُ لَمْ يَكُنْ بِخَلِيفَةٍ. قَالَ: كَذَبَتْ أَسْتَاهُ بَنِي الزَّرْقَاءِ يَعْنِي بَنِي مَرْوَانَ.

واتە: سەعید وتی: سەفینە پێی وتم: ماوەی خەلیفایەتی پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ دوو ساڵ بوو، پێشەوا عومەر دە ساڵ بوو، پێشەوا (عثمان) رەزای خوای لێ بێ دوانزە ساڵ بوو، پێشەوا عەلیش رەزای خوای لێ بێ هەروەها - شەش ساڵ - . سەعید وتی: بە سەفینەم وت: ئەوانە دەڵێن پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ خەلیفە نەبوە، وتی: بەنی (زرقاء) درۆدەکەن قسەیەکە لەپاشیانەوە دەردەچێت بەنی (زرقاء) واتە بەنی مەروان.

٤٦٤٧ - (حسن صحيح) عن سفينة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (خِلاَفَةُ النُّبُوَّةِ ثَلاَثُونَ سَنَةً ثُمَّ يُؤْتِي اللَّهُ الْمُلْكَ مَنْ يَشَاءُ, أَوْ مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ).

واتە: لە سەفینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: خیلافەت لەسەر ڕێگەو ڕێبازی پێغەمبەرایەتی سی ساڵ بەردەوام دەبێ، لەپاشدا خوای گەورە فەرمانڕەوایەتی و پاشایەتی دەدات بە هەرکەسێ کە خۆی بیەوێت، یان موڵکەکەی دەدات بە هەرکەسێ کە خۆی بیەوێت).

٤٦٤٨ - (صحيح) عن سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل قال: لَمَّا قَدِمَ فُلاَنٌ الْكُوفَةَ, أَقَامَ فُلاَنٌ خَطِيبًا, فَأَخَذَ بِيَدِي سَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ فَقَالَ: أَلاَ تَرَى إِلَى هَذَا الظَّالِمِ, فَأَشْهَدُ عَلَى التِّسْعَةِ إِنَّهُمْ فِي الْجَنَّةِ, وَلَوْ شَهِدْتُ عَلَى الْعَاشِرِ لَمْ إِيثَمْ - قَالَ ابْنُ إِدْرِيسَ: وَالْعَرَبُ تَقُولُ آثَمْ - قُلْتُ: وَمَنِ التِّسْعَةُ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى حِرَاءٍ: (اثْبُتْ حِرَاءُ إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ). قُلْتُ: وَمَنِ التِّسْعَةُ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَأَبُو بَكْرٍ, وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ. قُلْتُ: وَمَنِ الْعَاشِرُ؟ فَتَلَكَّأَ هُنَيَّةً, ثُمَّ قَالَ: أَنَا.

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە فڵان کەس گەیشتە کوفە - واتە موعاویە -، فڵان کەس بویە وتاربێژ و هەستا وتاری خوێندەوە- واتە موغیرەی کوڕی شوعبە -، سەعیدی کوڕی زەید دەستی گرتم وتی: ئایا نابینی ئەم ستەمکارە شایەتی دەدات کە نۆ کەس بەهەشتین - ئاماژەی کرد بۆ وتاربێژ -، ئەگەر بۆ دەیەمیش شایەتی بدەم گوناهم ناگات - ئیبنو ئیدریس وتی: عەرەب دەڵێن: (آثم) -، وتم: ئەو نۆ کەسە کێن؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر کێوی (حِرَاء) بوو کێوەکە لەرزی فەرمووی: (ئەی (حِرَاء) دامەزرێ پێغەمبەرێك و

(صديق)راستگۆیەك و شەهیدێ بەسەرتەوەن). وتم: ئەی نۆ كەسەكە كێن؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و، ئەبو بەكر و، عومەر و، (عثمان) و، عەلی و، (طلحة) و، زوبێری كوڕی عەوام و، سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص و، (عبد الرحمن)ی كوڕی عەوف بوون. وتم: ئەی دەیەم كێ بوو، سەعید كەمێك وەستا لەپاشدا وتی: خۆم بووم.

٤٦٤٩ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن الأخنس: أَنَّهُ كَانَ فِي الْمَسْجِدِ فَذَكَرَ رَجُلٌ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلَامُ, فَقَامَ سَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ فَقَالَ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَنِّي سَمِعْتُهُ وَهُوَ يَقُولُ: (عَشْرَةٌ فِي الْجَنَّةِ, النَّبِيُّ فِي الْجَنَّةِ, وَأَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ, وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ, وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ, وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ, وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ, وَالزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ فِي الْجَنَّةِ, وَسَعْدُ بْنُ مَالِكٍ فِي الْجَنَّةِ, وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ). وَلَوْ شِئْتَ لَسَمَّيْتُ الْعَاشِرَ. قَالَ: فَقَالُوا: مَنْ هُوَ؟ فَسَكَتَ, قَالَ: فَقَالُوا: مَنْ هُوَ؟ فَقَالَ: هُوَ سَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی ئەخنەسەوە دەگێڕنەوە، كە لە مزگەوت بووە پیاوێ بە خراپە باسی پێشەوا عەلی كرد ڕەزای خوای لێ بێ، سەعیدی كوڕی زەید هەستا وتی: شایەتی دەدەم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من بۆ خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (ئەم دەكەسە بەهەشتین: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و، ئەبو بەكر و، عومەر و، (عثمان) و، عەلی و، (طلحة) و، زوبێری كوڕی عەوام و، سەعدی كوڕی مالیك و، (عبد الرحمن)ی كوڕی عەوف). ئەگەر بمەوێ ناوی دەیەمیش دەهێنم، (عبد الرحمن) وتی: وتیان: ئەو كەسە كێیە؟ بێدەنگ بوو، وتی: وتیان: ئەو كەسە كێیە؟ سەعید وتی: خۆمم سەعیدی كوڕی زەید.

٤٦٥٠ - (صحيح) عن رياح بن الحارث قال: كُنْتُ قَاعِدًا عِنْدَ فُلَانٍ فِي مَسْجِدِ الْكُوفَةِ, وَعِنْدَهُ أَهْلُ الْكُوفَةِ, فَجَاءَ سَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ, فَرَحَّبَ

بِهِ وَحَيَّاهُ وَأَقْعَدَهُ عِنْدَ رِجْلِهِ عَلَى السَّرِيرِ, فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ يُقَالُ لَهُ قَيْسُ بْنُ عَلْقَمَةَ فَاسْتَقْبَلَهُ, فَسَبَّ وَسَبَّ, فَقَالَ سَعِيدٌ: مَنْ يَسُبُّ هَذَا الرَّجُلُ؟ قَالَ: يَسُبُّ عَلِيًّا. قَالَ: أَلاَ أَرَى أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَبُّونَ عِنْدَكَ ثُمَّ لاَ تُنْكِرُ وَلاَ تُغَيِّرُ! أَنَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: وَإِنِّي لَغَنِيٌّ أَنْ أَقُولَ عَلَيْهِ مَا لَمْ يَقُلْ, فَيَسْأَلُنِي عَنْهُ غَدًا إِذَا لَقِيتُهُ: (أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ, وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ). وَسَاقَ مَعْنَاهُ, ثُمَّ قَالَ: لَمَشْهَدُ رَجُلٍ مِنْهُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْبَرُّ فِيهِ وَجْهُهُ, خَيْرٌ مِنْ عَمَلِ أَحَدِكُمْ عُمْرَهُ وَلَوْ عُمِّرَ عُمْرَ نُوحٍ.

واتە: لە ڕەیاحی کوڕی (حارث)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە مزگەوتی کوفە لەلای فڵان کەس دانیشتبووم - واتە لەلای موغیرەی کوڕی شوعبە -، خەڵکی کوفە لەلای موغیرە بوون، سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل هات موغیرە زۆرخۆشحاڵ بوو بە هاتنی و سڵاوی لێ کردو بەخێرهاتنی گەرمی کرد و لەلای خۆیەوە داینشاند، پیاوێکی خەڵکی کوفە بەناوی قەیسی کوڕی عەلقەمەوە هات، موغیرە پێشوازی لێ کرد یان بە پێچەوانەوە، پیاوەکە جنێو لەدوای جنێوی دەدا، سەعید وتی: ئەو پیاوە ئەو جنێوانە بە کێ دەدات؟ موغیرە وتی: بە پێشەوا عەلی، سەعیدی کوڕی زەید وتی: لەلای تۆدا جنێو دەدرێت بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تۆش ڕێگری ناکەیت و تووڕە نابیت و لێی و بێدەنگی، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو بێگومان من شتێ ناڵێم کە ئەو نەیفەرمووبێت، چونکە سبەینێ لە قیامەتدا کە پێی گەیشتم پرسیاری ئەمەم لێ دەکات دەیفەرموو: (ئەبو بەکر بەهەشتیەو، عومەریش بەهەشتیە ...). جا بە هەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە، لەپاشدا وتی: تەنیا ئامادەبونێکیان لە غەزادا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم و تۆزێ نیشتبێ لە ڕوخساریان خێرتر و چاکترە لەو کاروکردەوانەی کەسێکتان کە لە هەموو تەمەنیدا ئەنجامی دەدات ئەگەرچی ئەوەندەی نوح پێغەمبەریش بژی.

٤٦٥١ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِدَ أُحُدًا فَتَبِعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ فَضَرَبَهُ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرِجْلِهِ وَقَالَ (اثْبُتْ أُحُدُ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ).

واته: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرکەوتە سەر کێوی ئوحود پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر (عثمان) رەزای خوایان لێ بێ بە دوای ئەودا سەرکەوتن، کێوی ئوحود لەرزی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە قاچی لێی داو فەرموو: (ئەی کێوی ئوحود دامەزرێ پێغەمبەرێك و (صدیق)راستگۆیەك و دوو شەهید بەسەرتەوەن).

٤٦٥٢ - (صحيح) عن جابر: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ).

واته: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەژێر درەختەکەی (رضوان)دا بەڵێن و پەیمانی دابێت ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە).

٤٦٥٣ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: قال موسى: (فَلَعَلَّ اللَّهَ). وَقَالَ ابْنُ سِنَانٍ: (اطَّلَعَ اللَّهُ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بەوانەی کە بەشداری جەنگی بەدریان کرد فەرموو: چی دەکەن بیکەن بەڕاستی من لێتان خۆش بووم).

٤٦٥٤ - (ضعيف) عن المسور بن مخرمة قال: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. قَالَ فَأَتَاهُ - يَعْنِي عُرْوَةَ بْنَ مَسْعُودٍ - فَجَعَلَ

يُكَلِّمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَكُلَّمَا كَلَّمَهُ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ, وَالْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ فَضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ, وَقَالَ أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَتِهِ. فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ, فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ.

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەکاتی رێکەوتنی حودەیبییەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - بە خۆی و هەزار و چوار سەد کەس لە هاوەڵانیەوە لەمەدینە - دەرچو بەرەو مەککە بۆ عومرە، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.
راوی وتی: عوروەی کوڕی مەسعود هات، لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم گفتوگۆیان کرد، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قسەیەکی دەکرد عوروە ریشی دەگرت، موغیرەی کوڕی شوعبە بەڕاسەری پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم راوەستا بوو، شمشێرێکی پێ بوو کڵاو زرێیەکی بەسەرەوە بوو، بە بەشی خواروی کێلانی شمشێرەکەی دای لەدەستی عوروە، پێی وت: دەستت لابە، عوروە سەریِ بەرزکردەوەو وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان: موغیرەی کوڕی شوعبەیە. - بەسەرهاتەکەی پێشتر بە تەواوی لە فەرموودەی (٢٧٦٥) لە بەرگی سێیەم دا هاتوە - .

٤٦٥٥ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَرَانِي بَابَ الْجَنَّةِ الَّذِي تَدْخُلُ مِنْهُ أُمَّتِي). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ مَعَكَ حَتَّى أَنْظُرَ إِلَيْهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا إِنَّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جبریل هات بۆلام دەستی گرتم و ئەو دەرگایەی نیشان دام کە ئوممەتەکەم لێیەوە دەچنە ناو بەهەشت). پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خۆزگە لەتەکدا دەبووم

بەڵکو سەیرم بکردایە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر تۆ یەکەم کەس دەبیت لە ئوممەتم کە دەچیتە بەهەشت).

٤٦٥٦ - (ضعيف الإسناد) عن الأقرع مؤذن عمر بن الخطاب قال: بَعَثَنِي عُمَرُ إِلَى الأُسْقُفِّ, فَدَعَوْتُهُ, فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: وَهَلْ تَجِدُنِي فِي الْكِتَابِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ كَيْفَ تَجِدُنِي؟ قَالَ: أَجِدُكَ قَرْنًا. فَرَفَعَ عَلَيْهِ الدِّرَّةَ, فَقَالَ: قَرْنُ مَهْ؟ فَقَالَ: قَرْنٌ حَدِيدٌ أَمِينٌ شَدِيدٌ. قَالَ: كَيْفَ تَجِدُ الَّذِي يَجِيءُ مِنْ بَعْدِي؟ فَقَالَ: أَجِدُهُ خَلِيفَةً صَالِحًا غَيْرَ أَنَّهُ يُؤْثِرُ قَرَابَتَهُ, قَالَ عُمَرُ: يَرْحَمُ اللَّهُ عُثْمَانَ ثلاَثًا, فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدُ الَّذِي بَعْدَهُ؟ قَالَ: أَجِدُهُ صَدَأَ حَدِيدٍ, فَوَضَعَ عُمَرُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ, فَقَالَ: يَا دَفْرَاهُ, يَا دَفْرَاهُ. فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّهُ خَلِيفَةٌ صَالِحٌ وَلَكِنَّهُ يُسْتَخْلَفُ حِينَ يُسْتَخْلَفُ وَالسَّيْفُ مَسْلُولٌ وَالدَّمُ مُهْرَاقٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الدَّفْرُ النَّتْنُ.

واتە: لە ئەقرەعی بانگبێژی پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ ناردمی بەشوێن سەرۆك قەشە (ئەسقەف)ی گاورەکاندا، کە بۆم بانگ کرد پێی فەرموو: لە نامەی ئێوەدا ناونیشانی من هەیە یان نا؟ وتی: بەڵێ هەیە، پێشەوا عومەر فەرمووی: چیەو چۆنە؟ وتی: بە شاخ لەقەڵەم دراویت، پێشەوا عومەر قامچی لێ ڕاست کردەوە وایزانی زەمی دەکات، فەرمووی: شاخی چیت مەبەستە؟ وتی: شاخی ئاسنین، دەستپاك و ئەمین و بەتین، فەرمووی: ئەی ئەوەی لەپاش من دێ چۆنە؟ وتی: خۆی جێنشینێکی باشە، بەڵام خزمەکانی خۆی پێش دەخات، پێشەوا عومەر سێ جار فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە پێشەوا (عثمان)، جا فەرمووی: ئەی ئەوەی لەدوای ئەو دێ چیەو چۆنە؟ وتی: وەك ژەنگی ئاسن وایە، پێشەوا عومەر دەستی دانا لەسەر سەری خۆی و فەرمووی: ئای لە بۆگەنی، ئای لە بۆگەنی، ئەویش وتی: خۆی جێنشینێکی باشە، بەڵام لەوکاتەدا شمشێر لەکالان دەرکێشراوەو خوێن لەهەرلا ڕژاوە.

# سەبارەت بە فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

## ١٠ - باب فِي فَضْلِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٤٦٥٧ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (خَيْرُ أُمَّتِى الْقَرْنُ الَّذِينَ بُعِثْتُ فِيهِمْ, ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ, ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ). وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَذَكَرَ الثَّالِثَ أَمْ لاَ (ثُمَّ يَظْهَرُ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ, وَيَنْذِرُونَ وَلاَ يُوفُونَ, وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ, وَيَفْشُو فِيهِمُ السِّمَنُ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین خەڵکانی ئومەتی من ئەوانەن لەم سەدەیەدان کە منی تێدا رەوانەکراوم بۆیان، پاشان چینی دوای ئەوان، پاشان چینی دوای ئەوان). عیمران وتی: خوای گەورە خۆی باش دەیزانێ باسی چینی سێیەمی کرد یان نا: (لەپاشدا خەڵکانێ پەیدا دەبن کەس داوای شایەتیدانیان لێ ناکات کەچی لەخۆیانەوە دەبن بە شایەت و شایەتی دەدەن، نەزردەکەن و جێبەجێی ناکەن، ناپاکی و خیانەت دەکەن و جێگەی متمانەو باوەڕ پێ کردن نین، قەڵەویش لەناویاندا بڵاودەبێتەوە).

## باسی نەهی کردن لە جنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

## ١١ - باب فِي النَّهْيِ عَنْ سَبِّ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٤٦٥٨ - (صحيح) عن أبو سعيد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَوْ أَنْفَقَ أَحَدُكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جنێو مەدەن بە هاوەڵانم سوێند بە (الله) کە روحی منی بەدەستە ئەگەر کەسێ لەئێوە بە قەد کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێت ناگاتە مشتی یەکێکیان بگرە نیوەی مشتیشیان).

٤٦٥٩ - (صحيح) عن عمرو بن أبي قرة قال: كَانَ حُذَيْفَةُ بِالْمَدَائِنِ, فَكَانَ يَذْكُرُ أَشْيَاءَ قَالَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فِي الْغَضَبِ, فَيَنْطَلِقُ نَاسٌ مِمَّنْ سَمِعَ ذَلِكَ مِنْ حُذَيْفَةَ فَيَأْتُونَ سَلْمَانَ فَيَذْكُرُونَ لَهُ قَوْلَ حُذَيْفَةَ, فَيَقُولُ سَلْمَانُ: حُذَيْفَةُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُ, فَيَرْجِعُونَ إِلَى حُذَيْفَةَ فَيَقُولُونَ لَهُ: قَدْ ذَكَرْنَا قَوْلَكَ لِسَلْمَانَ فَمَا صَدَّقَكَ وَلاَ كَذَّبَكَ. فَأَتَى حُذَيْفَةُ سَلْمَانَ وَهُوَ فِي مَبْقَلَةٍ فَقَالَ: يَا سَلْمَانُ مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تُصَدِّقَنِي بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ سَلْمَانُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْضَبُ فَيَقُولُ فِي الْغَضَبِ لِنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ, وَيَرْضَى فَيَقُولُ فِي الرِّضَا لِنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ, أَمَا تَنْتَهِي حَتَّى تُوَرِّثَ رِجَالاً حُبَّ رِجَالٍ, وَرِجَالاً بُغْضَ رِجَالٍ, وَحَتَّى تُوقِعَ اخْتِلاَفًا وَفُرْقَةً؟ وَلَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ,

فَقَالَ: (أَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي سَبَبْتُهُ سَبَّةً أَوْ لَعَنْتُهُ لَعْنَةً فِي غَضَبِي, فَإِنَّمَا أَنَا مِنْ وَلَدِ آدَمَ, أَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُونَ, وَإِنَّمَا بَعَثَنِي رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ, فَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ صَلاَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ). وَاللَّهِ لَتَنْتَهِيَنَّ أَوْ لأَكْتُبَنَّ إِلَى عُمَرَ.

واتە: لە عەمری کوڕی ئەبو قوڕەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ (حذيفة) لە مەدائین بوو، باسی شتانێکی دەکرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی توڕەیدا فەرمووبوی بە کەسانێ لە هاوەڵانی، هەندێ لەوانەی کە ئامادەبوون چوون بۆ لای سەلمانی فارسی وتەکانی (حذيفة)یان پێ ڕاگەیاند، سەلمان وتی: (حذيفة) خۆی دەزانێ چی دەڵێ. گەڕانەوە بۆ لای (حذيفة) پێیان ڕاگەیاند کە قسەکانی تۆمان باسکرد بۆ سەلمان نە بەڕاستی زانیت و نە بەدرۆی خستیتەوە، (حذيفة) هەستا چو بۆ لای سەلمان لەوکاتەدا سەلمان لەناو زەویەکی سەوزەواتدا بوو پێی وت: چۆن بەڕاستم نازانی لەکاتێکدا کە من بۆ خۆم ئەم فەرمایشتەم لەپێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بیستوە؟ سەلمان وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ جار لەکاتی توڕەییدا هەندێ شتی فەرمووە بە کەسانێ لە هاوەڵانی، هەروەها لەکاتی لەسەرخۆیی و ڕەزامەندیدا هەندێ شتی فەرمووە بە کەسانێ لە هاوەڵانی، ئەگەر وازنەهێنی لەم قسانە ئەوا هەندێ کەس لەدڵەوە هەندێ کەسیان - لە هاوەڵان - خۆش دەوێ و ڕقیان لەهەندێ کەسی دەبێ لەهەندێ کەسی تر و، پارچە چارچە دەبن و دەبن بە چەند تاقمێکەوە، بەڕاستی تۆ خۆت دەزانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا فەرمووی: (هەر کەسێ لە ئوممەتی من قسەم پێ وتبێ یان نەفرینم لێ کردبێ لەکاتی توڕەیمدا، بێگومان من لە نەوەی ئادەمم، توڕە دەبم وەك چۆن هەریەکێ لەئێوە توڕە دەبێت، بەڵام خوای گەورە منی بە ڕەحمەت و سۆز و بەزەیی ڕەوانەکردوە بۆ سەرجەم جیهان، بۆیە ئەو قسەپێوتن و نەفرینە دەبێتە ڕەحمەت بۆیان لەڕۆژی قیامەتدا). سوێند بە (الله) یان ئەوەتا وازدەهێنن یان لەوبارەوە نامە دەنوسم بۆ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ.

## سەبارەت بە جێنشینی
## پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ
## ١٢ - باب فِي اسْتِخْلاَفِ أَبِي بَكْرٍ رضى الله عنه.

٤٦٦٠ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن زمعة قال: لَمَّا اسْتُعِزَّ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا عِنْدَهُ فِي نَفَرٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ دَعَاهُ بِلاَلٌ إِلَى الصَّلاَةِ, فَقَالَ: (مُرُوا مَنْ يُصَلِّي لِلنَّاسِ). فَخَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَمَعَةَ, فَإِذَا عُمَرُ فِي النَّاسِ, وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ غَائِبًا, فَقُلْتُ: يَا عُمَرُ, قُمْ فَصَلِّ بِالنَّاسِ, فَتَقَدَّمَ فَكَبَّرَ فَلَمَّا سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَوْتَهُ - وَكَانَ عُمَرُ رَجُلاً مُجْهِرًا - قَالَ: (فَأَيْنَ أَبُو بَكْرٍ يَأْبَى اللَّهُ ذَلِكَ وَالْمُسْلِمُونَ, يَأْبَى اللَّهُ ذَلِكَ وَالْمُسْلِمُونَ). فَبَعَثَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَجَاءَ بَعْدَ أَنْ صَلَّى عُمَرُ تِلْكَ الصَّلاَةَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ.

واتە: (عبد الله)ی كوڕی زەمعە دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەخۆشیەكەی تینی بۆ هێنا من و چەند كەسێ لە خزمەتیدا بووین، بیلالی بانگ كرد بۆ نوێژ، فەرمووی: (بڕۆ بە یەكێ بڵێ با پێشنوێژی بكات بۆ خەڵك). (عبد الله)ی كوڕی زەمعە دەرچوو، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەناو خەڵكەكەدا بوو، پێشەوا ئەبو بەكری ڕەزای خوای لێ بێ لێ نەبوو غائیب بوو، وتم: ئەی عومەر، هەستە پێشنوێژی بكە بۆ ئەو خەڵكە، عومەر پێشكەوت و (الله أكبر)ی كردو نوێژی دابەست، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لەدەنگی بوو - بێگومان پێشەوا عومەر دەنگی گەورە بوو- فەرمووی: (ئەوە ئەبو بەكر لە كوێیە، خوای گەورە ئەمەی ناوێ هەروەها موسوڵمانانیش نایەنەوێ جگە لە ئەبو بەكر كەسی تر پێشنوێژی بكات بۆ خەڵك، خوای گەورە ئەمەی ناوێ هەروەها موسوڵمانانیش نایەنەوێ جگە لە ئەبو بەكر كەسی تر پێشنوێژی بكات بۆ خەڵك)، جا ناردی بەدوای ئەبو

بەکردا ئەویش هات و لەپاش ئەو نوێژە ئیتر ئەو پێشنوێژی خەڵکی دەکرد — ئەم فەرموودە فەزڵی پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ دەردەخات و، ئاماژەشە بەوەی کە لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو دەبێتە خەلیفەو جێنشینی -.

٤٦٦١ - (صحيح) عن عبيد الله بن عبد الله بن عتبة أن عبد الله بن زمعة أخبره بهذا الخبر قال: لَمَّا سَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَوْتَ عُمَرَ, قَالَ ابْنُ زَمَعَةَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَطْلَعَ رَأْسَهُ مِنْ حُجْرَتِهِ, ثُمَّ قَالَ: (لاَ لاَ لاَ لِيُصَلِّ لِلنَّاسِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ). يَقُولُ ذَلِكَ مُغْضَبًا.

واتە: لە (عبید الله)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی عوتبەوە دەگێرنەوە، کە (عبد الله)ی کوڕی زەمعە ئەم بەسەرهاتەی پێ راگەیاندوە — واتە فەرموودەی پێشو - وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لەدەنگی پێشەوا عومەر بوو، ئیبنو زەمعە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهۆدەکەی خۆی سەری هێنایەدەرەوە، لەپاشدا فەرمووی: (نا نا نا - نابێ عومەر و غەیری عومەر- پێشنوێژی بکەن بۆ خەڵك، بەڵکو دەبێ ئیبنو ئەبی قوحافە واتە ئەبو بەکر پێشنوێژی بکات بۆ خەڵك). بەتوڕەییەوە ئەمەی فەرموو.

# ئەوەی کە دەبێتە بەڵگە بۆ وازهێنان لە قسەکردن لە فیتنەدا.

## ١٣ - باب مَا يَدُلُّ عَلَى تَرْكِ الْكَلاَمِ فِي الْفِتْنَةِ.

٤٦٦٢ - (صحيح) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم للحسن بن علي: (إِنَّ ابْنِى هَذَا سَيِّدٌ, وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُصْلِحَ اللَّهُ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنْ أُمَّتِى). وَقَالَ فِي حَدِيثِ حَمَّادٍ: (وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَظِيمَتَيْنِ).

واتە: لە ئەبی بەکرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەم نەوەی منە سەییدە، داوادەکەم ببێتە هۆکاری ئاشتەوایی نێوانی دوو کۆمەڵ لە ئومەمەتەکەی من) - کە بریتی بوون لە کۆمەڵی حەسەن و موعاویە - . لە فەرموودەکەی حەماددا فەرمووی: (لەوانەیە خوای گەورە بیکاتە هۆکاری ئاشتەوایی نێوانی دوو کۆمەڵی گەورە لە موسوڵمانان).

٤٦٦٣ – (صحيح) عن حذيفة: مَا أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ تُدْرِكُهُ الْفِتْنَةُ إِلاَّ أَنَا أَخَافُهَا عَلَيْهِ إِلاَّ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ, فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تَضُرُّكَ الْفِتْنَةُ).

واتە: لە (حذیفة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرکەسێ بگەیشتایە بە فیتنەو ئاژاوەوە ئیللا من دەترسام توش ببێ و زیانی پێ بگەیەنێت جگە لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە نەبێ، بۆ خۆم گوێ لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو پێی فەرموو: (فیتنەو ئاژاوە زیانت پێ ناگەیەنێت).

٤٦٦٤ - (صحيح بما قبله) عن أبو ثعلبة بن ضبيعة قال: دَخَلْنَا عَلَى حُذَيْفَةَ, فَقَالَ: إِنِّي لأَعْرِفُ رَجُلاً لاَ تَضُرُّهُ الْفِتَنُ شَيْئًا. قَالَ: فَخَرَجْنَا فَإِذَا فُسْطَاطٌ مَضْرُوبٌ, فَدَخَلْنَا, فَإِذَا فِيهِ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ, فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ, فَقَالَ: مَا أُرِيدُ أَنْ يَشْتَمِلَ عَلَيَّ شَيْءٌ مِنْ أَمْصَارِكُمْ حَتَّى تَنْجَلِيَ عَمَّا انْجَلَتْ.

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی کوڕی (ضبيعة)وە وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوین بۆ خزمەت (حذيفة) وتی: من پیاوێ دەناسم بەهیچ شێوەیە فیتنەو ئاژاوەوە زیانی پێ ناگەیەنێت. راوی وتی: ئێمەش دەرچوین خێمەیەکی هەڵدراومان دی چوینەژوورەوە دەبینین موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی تێدایە، لەوبارەوە پرسیارمان لێ کرد، وتی: نامەوێ بە هیچ شێوەیە تێکەڵی خەڵك بکەم و گۆشەگیر دەبم هەتا ئەم فیتنەو ئاژاوە نامێنێ.

٤٦٦٥ – عن أبو بردة, عن أبو ثعلبة بن ضبيعة قال: بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو (بردة)وە، لە ئەبو (ثعلبة)ی کوڕی (ضبيعة)وە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٤٦٦٦ - (صحيح الإسناد) عن قيس بن عباد قال: قلت لعلي رضي الله عنه: أَخْبِرْنَا عَنْ مَسِيرِكَ هَذَا أَعَهْدٌ عَهِدَهُ إِلَيْكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْ رَأْيٌ رَأَيْتَهُ؟ فَقَالَ: مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَيْءٍ وَلَكِنَّهُ رَأْيٌ رَأَيْتُهُ.

واتە: لە قەیسی کوڕی عوبادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب) رەزای خوای لێ بێ ئەم رۆشتنەت - بۆ بەصرە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی لەشکری عائیشە لە جەنگی (جەمەل) دا - بەڵێنێکە پێت دراوە لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم یان راوبۆچون و ئیجتیهادی خۆتە؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هیچ بەڵێنێکی پێ نەداوم بەڵام راوبۆچون و ئیجتیهادی خۆمە.

٤٦٦٧ - (صحيح) عن أبو سعيد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (تَمْرُقُ مَارِقَةٌ عِنْدَ فُرْقَةٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَقْتُلُهَا أَوْلَى الطَّائِفَتَيْنِ بِالْحَقِّ).

واته: له ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەكاتی پەرتەوازەیی موسوڵماناندا كەسانێك لەدین دەردەچن كام پێر زیاتر پابەند بن بەهەقەوە ئەو لەدین دەرچوانە لەناو دەبەن).

## دەربارەی فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەران بەسەر هەندێكی تریاندا.

## ١٤ - باب فِي التَّخْيِيرِ بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ.

٤٦٦٨ - (صحيح) (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ).

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەخۆتانەوە فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەران مەدەن بەسەر هەندێكی تریاندا) - وەك ئەوەی لەخۆتانەوە بڵێن فلان پێغەمبەر چاكترە لە فلان پێغەمبەر - .

٤٦٦٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رجل من اليهود: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى. فَرَفَعَ الْمُسْلِمُ يَدَهُ فَلَطَمَ وَجْهَ الْيَهُودِيِّ, فَذَهَبَ الْيَهُودِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخْبَرَهُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تُخَيِّرُونِي عَلَى مُوسَى, فَإِنَّ النَّاسَ يُصْعَقُونَ فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُفِيقُ, فَإِذَا مُوسَى بَاطِشٌ فِي جَانِبِ الْعَرْشِ, فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ مِمَّنْ صَعِقَ فَأَفَاقَ قَبْلِي, أَوْ كَانَ مِمَّنِ اسْتَثْنَى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی جولەکە وتی: سوێند بە (الله) کە موسای هەڵبژارد - بەسەر هەموو جیهانیاندا -، موسوڵمانێ زللەیەکی لێ دا، جولەکەکە چو بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسەرهاتەکەی پێ راگەیاند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فەزڵی من مەدەن بەسەر موسادا، کاتێ کە سەرجەم خەڵك لەهۆش خۆیان دەچن، یەکەم کەس من بە هۆش دێمەوەو دێمەوە سەرخۆم، لەوکاتەدا دەبینم موسا بە توندی دەستی گرتوە بە شتێ لەعەرشەوە، جا نازانم موسا پێش من هۆشی هاتۆتەوە یان خوای گەورە ئەوی رزگار کردوەو سەرەتا هەر لەهۆش خۆی نەچوە).

٤٦٧٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ, وَأَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ, وَأَوَّلُ شَافِعٍ, وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من سەیدی نەوەی ئادەمم، یەکەم کەسم کە زەویم بۆ شەق دەکرێت - واتە زیندودەکرێمەوەو لە گۆڕەکەم دێمەدەرەوە -، یەکەم کەسم کە تکا دەکەم، یەکەم کەسیشم کە تکام لێ وەردەگیرێت و قبوڵ دەبێت).

٤٦٧١ - (صحيح) عن ابن عباس: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ: إِنِّي خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ بەندەیە نیە لەخۆیەوە بڵێ: من لە یونوسی کوڕی مەتا چاکترم).

٤٦٧٢ - (صحيح بما قبله) عن عبد الله بن جعفر قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَا يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ أَنْ يَقُولَ: إِنِّي خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە.
کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە بڵێ: من لە یونوسی کوڕی مەتا چاکترم).

٤٦٧٣ - (صحيح) عن أنس قال: قال رجل لرسول الله صلى الله عليه وسلم: يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ذَاكَ إِبْرَاهِيمُ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ وتی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (یا خیر البریة) ئەی چاکترین خەڵق، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە ئیبراهیمە). - ئەو وەسفە بۆ ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەربێ بەکاردەهێنرێت و ئەو (خیر البریة) یە - .

٤٦٧٤ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا أَدْرِي أَتُبَّعٌ لَعِينٌ هُوَ أَمْ لاَ؟ وَمَا أَدْرِي أَعُزَيْرٌ نَبِيٌّ هُوَ أَمْ لاَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نازانم قەومی توببەع نەفرین لێ کراون یان نا؟ هەروەها نازانم عوزەیر پێغەمبەرە یان نا؟).- ئەمە لەپێش ئەوەدا فەرموویەتی کە دەربارەی قەومی توببەع وەحی بۆ نەهاتبو، بەڵام لەپاشدا کە وەحی بۆ هات موسوڵمان بوون ئیتر بۆی دەرکەوت کە نەفرین لێ کراو نین - .

٤٦٧٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ, الأَنْبِيَاءُ أَوْلاَدُ عَلاَّتٍ, وَلَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (من لەپێشترین کەسم بە عیسای کوڕی مەریەم، هەموو پێغەمبەران برای یەکترن دایکانیان جیایە، لەنێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبەرێك نیە).

# سەبارەت بە بەرپەرچدانەوەی (مورجیئە)کان.

## ١٥ - باب فِي رَدِّ الإِرْجَاءِ.

٤٦٧٦ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ أَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْعَظْمِ عَنِ الطَّرِيقِ, وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشە، چاکترینی وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه)یە، لای خواروی لابردنی ئێسکێ یان بەردێ یان دارێ یا هەرشتێ کە ببێتەهۆی ئازار بۆ رێبواران لەسەر رێگادا، شەرم و شکۆش بەشێکە لە ئیمان).

٤٦٧٧ – (صحيح) عن ابن عباس: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ لَمَّا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ, قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ؟). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ, قَالَ: (شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ, وَإِقَامُ الصَّلاَةِ, وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ, وَصَوْمُ رَمَضَانَ, وَأَنْ تُعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْمَغْنَمِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْس) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانی پێ کردن بە باوەڕهێنان بە خوای تاقانە، فەرمووی: (ئایا دەزانن باوەڕهێنان بە خوای تاقانە چۆنە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: شایەتیدانە بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە لەلایەن خواوە رەوانەکراوە، نوێژکردن و، زەکات دەرکردن و، پێنج یەك لە دەستکەوتی جەنگی دەربکەن).

٤٦٧٨ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاَةِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم. فەرموویەتی: (نێوانی بەندەو نێوانی کوفر و بێ باوەڕی وازهێنانە لە نوێژ).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات.

## ١٦ - باب الدَّلِيلِ عَلَى زِيَادَةِ الإِيمَانِ وَنُقْصَانِهِ.

٤٦٧٩ - (صحيح) عن ابن عباس قال: لَمَّا تَوَجَّهَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْكَعْبَةِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژدا ڕووی وەرگێڕا بەرەو کەعبە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەی ئەوانە حاڵیان چۆنە کە مردن و لەنوێژەکانیاندا ڕوویان دەکردە (بيت المقدس)؟ خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾. سورة البقرە: ١٤٣. واتە: خۆ خوای گەورە پاداشتی ئەو نوێژ و بڕوای جارانتانە بەفیڕۆ نادا.

٤٦٨٠ - (صحيح) عن أبو أمامة: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ).

واتە: لە ئەبو ئوومامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خۆشەویستیی و رق و قینی و بەخشین و نەبەخشینی لەپێناوی خوای گەورەدا بێت لەبەر رەزامەندی ئەو بێ ئەو کەسە ئیمانی تەواوە).

٤٦٨١ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَلاَ دِينٍ أَغْلَبَ لِذِى لُبٍّ مِنْكُنَّ). قَالَتْ: وَمَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ وَالدِّينِ؟ قَالَ: (أَمَّا نُقْصَانُ الْعَقْلِ فَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ شَهَادَةُ رَجُلٍ، وَأَمَّا نُقْصَانُ الدِّينِ فَإِنَّ إِحْدَاكُنَّ تُفْطِرُ رَمَضَانَ وَتُقِيمُ أَيَّامًا لاَ تُصَلِّى).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسم نەدیوە وەك ئێوە ئاوا کەم ئەقڵ و هۆش و کەم دین بێ لەگەڵ ئەوەشدا پیاو بەو زیرەکیەوە تەفرەدەدەن و دەیخەڵەتێنن). وتیان: کەم هۆش و کەم دینیەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: (کەم ئەقڵ و هۆشیەکەتان بریتیە لەوەی شایەتی دوو ئافرەت بە شایەتی پیاوێ دێتەهەژمار و حیساب دەکرێت، کەم دینەکەشتان بریتیە لەوەی یەکێکتان لەکاتی بێ نوێژیدا رۆژووی رەمەزان ناگرێت چەند شەو رۆژێ دەمێنێتەوە نوێژ ناکات).

٤٦٨٢ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەواترینی ئیمان هی ئەو کەسەتانە کە ئاکار و رەوشتی جوانە).

٤٦٨٣ - (صحيح) عن سعد بن أبي وقاص قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَسَّمَ بَيْنَ النَّاسِ قَسْمًا, فَقُلْتُ: أَعْطِ فُلاَنًا فَإِنَّهُ مُؤْمِنٌ, قَالَ: (أَوْ مُسْلِمٌ, إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ الْعَطَاءَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ مَخَافَةَ أَنْ يُكَبَّ عَلَى وَجْهِهِ).

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شتێکی دابەشکرد، وتم: بەشی فلاّن کەسیش بدە لەبەرئەوەی باوەڕدارە، فەرمووی: (موسوڵمانە، من دەبەخشم بە کەسێ لەکاتێکدا کە کەسانی ترم لەو خۆشتردەوێ لەترسی ئەوەی نەوەکا وەرگەڕێ لەدین).

٤٦٨٤ - (صحيح) عن عامر بن سعد بن أبي وقاص, عن أبيه قال: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِجَالاً, وَلَمْ يُعْطِ رَجُلاً مِنْهُمْ شَيْئًا, فَقَالَ سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطَيْتَ فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَلَمْ تُعْطِ فُلاَنًا شَيْئًا وَهُوَ مُؤْمِنٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَوْ مُسْلِمٌ). حَتَّى أَعَادَهَا سَعْدٌ ثَلاَثًا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (أَوْ مُسْلِمٌ). ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنِّي أُعْطِي رِجَالاً وَأَدَعُ مَنْ هُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُمْ لاَ أُعْطِيهِ شَيْئًا مَخَافَةَ أَنْ يُكَبُّوا فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ).

واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شتێکی دابەشکرد بەشی چەند پیاوێکی دا، بەڵام هیچی نەدا بە پیاوێ لەوان، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەشی فلاّن و فلاّنت دا، بەڵام بەشی فلاّن کەست نەدا لەکاتێکدا کە کەسێکی باوەڕدارە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو موسوڵمانە)، هەتا سەعد سێ جار دوپاتی کردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو موسوڵمانە)، لەپاشدا فەرمووی: (من دەبەخشم بە پیاوانێ لەکاتێکدا کە پیاوانێکی ترم لەوان خۆشتردەوێ و پێشیان نابەخشم، لەترسی ئەوەی نەوەکا بەسەر روخساریاندا رایکێشن لەئاگری دۆزەخدا).

٤٦٨٥ - (صحيح الإسناد مقطوع) قال الزهري: (قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا) قَالَ: نَرَى أَنَّ الإِسْلَامَ الْكَلِمَةُ, وَالإِيمَانَ الْعَمَلُ.

واتە: پێشەوا زوهری دەڵێت: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا﴾. سورة الحجرات:١٤. واتە: بڵێ باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: موسوڵمان و مل کەچ بووین.

هەروەها پێشەوا زوهری دەڵێت: پێم وایە ئیسلام وتەیە، ئیمان کردارە.

٤٦٨٦ - (صحيح) عن ابن عمر: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی و هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان).

٤٦٨٧ - (صحيح) عن ابن عمر: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَيُّمَا رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْفَرَ رَجُلاً مُسْلِمًا: فَإِنْ كَانَ كَافِرًا, وَإِلاَّ كَانَ هُوَ الْكَافِرَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێکی موسوڵمان کەسێکی موسوڵمان تەکفیر بکات و بە کافری دابنێ ئەگەر کافر بوو ئەوە هیچی لەسەر نیە، خۆ ئەگەر کافر نەبوو ئەوا خۆی پێی کافر دەبێ).

٤٦٨٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ خَالِصٌ, وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْ نِفَاقٍ حَتَّى يَدَعَهَا, إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ, وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ, وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك ئەم چوار سیفەتەی تێدا بێت ئەوە دووڕوویەکی تەواوە، هەرکەس یەکێکیانی تێدا بێت ئەوە بەشێ لە دووڕوویی تێدایە هەتا وازی لێ دەهێنێ: کاتێ کە قسەی کرد درۆبکات بەبێ بەهانەیەکی شەرعی، ئەگەر بەڵێن و پەیمانی دا نەیباتەسەر و پێچەوانەی بجوڵێتەوە، کاتێ کە توشی شەڕ و دەمەقاڵێ بوو هەڵچێ و قسەی ناشیرین بڵێ و جنێوفرۆش بێت).

٤٦٨٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ, وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ, وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ, وَالتَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ بَعْدُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زیناکار ئیمانی تەواوی نیە لەکاتێکدا کە زینا دەکات، دز ئیمانی تەواوی نیە لەکاتێکدا کە دزی دەکات، مەشروب خۆر ئیمانی تەواوی نیە لەکاتێکدا کە عەرەق و مەی دەخواتەوە، لەدوای ئەوە دەرگای تەوبەو پەشیمانی کراوەیەو بۆی هەیە تەوبە بکات).

٤٦٩٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الإِيمَانُ كَانَ عَلَيْهِ كَالظُّلَّةِ فَإِذَا انْقَطَعَ رَجَعَ إِلَيْهِ الإِيمَانُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زیناکار لەکاتێکدا کە زینا دەکات ئیمانەکەی دەردەچێت وەك سێبەرێ یان هەورێ بەسەر سەریەوە دەبێت هەتا زیناکەی تەواو دەکات، کاتێ کە لێ بویەوە ئەوکاتە ئیمانەکە دەگەڕێتەوە بۆی).

## سەبارەت بە (قەدەر) ئەندازەگیری.

## ١٧ - باب فِي الْقَدَرِ.

٤٦٩١ - (حسن) عن ابن عمر: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الْقَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ إِنْ مَرِضُوا فَلاَ تَعُودُوهُمْ, وَإِنْ مَاتُوا فَلاَ تَشْهَدُوهُمْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قەدەریەكان (مەجوس)ئاگرپەرستی ئەم ئوممەتەن ئەگەر نەخۆشكەوتن سەردانیان مەكەن، ئەگەر مردن ئامادەی جەنازەو بەخاك سپاردنیان مەبن). — قەدەریەكان خەیریان دەدایە پاڵ خوای گەورەو شەڕ و خراپەیان دەدایە پاڵ غەیری خوا، وەك چۆن ئاگرپەرستەكان خەیریان دەدایە پاڵ نور و روناكی و شەڕ و خراپەیان دەدایە پاڵ تاریكی، بێگومان قەدەر بە خێر و خراپەیەوە هەردوكیان لەلایەن خوای گەورەن و دەبێ باوەڕمان پێی هەبێت- .

٤٦٩٢ - (ضعيف بزيادة (وَهُمْ شِيعَةُ الدَّجَّالِ...) عن حذيفة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لِكُلِّ أُمَّةٍ مَجُوسٌ, وَمَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّذِينَ يَقُولُونَ: لاَ قَدَرَ, مَنْ مَاتَ مِنْهُمْ فَلاَ تَشْهَدُوا جَنَازَتَهُ, وَمَنْ مَرِضَ مِنْهُمْ فَلاَ تَعُودُوهُمْ وَهُمْ شِيعَةُ الدَّجَّالِ, وَحَقٌّ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُلْحِقَهُمْ بِالدَّجَّالِ).

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو گەلێ مەجوسی هەیە، مەجوسی ئەم ئوممەتی من ئەوانەن كە دەڵێن: قەدەر نیە واتە باوەڕیان بە قەدەر نیە، هەركەسێ لەوانە مرد ئامادەی جەنازەو بەخاك سپاردنی مەبن، هەركەسێ لەوانە نەخۆشكەوت سەردانی مەكەن، ئەوانە دۆست و لایەنگر و شوێنكەوتەی دەجالی درۆزنن،

خوای گەورە بە هەقی داناوە لەسەر خۆی بیانگەیەنێ بە دەجالی درۆزن و لەگەڵی بیانخاتە دۆزەخەوە).

٤٦٩٣ - (صحيح) عن أبو موسى قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الأَرْضِ, فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ: جَاءَ مِنْهُمُ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وَبَيْنَ ذَلِكَ, وَالسَّهْلُ وَالْحَزْنُ, وَالْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ). زَادَ فِي حَدِيثِ يَحْيَى: (وَبَيْنَ ذَلِكَ). وَالإِخْبَارُ فِي حَدِيثِ يَزِيدَ.

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان خوای گەورە ئادەمی دروستكرد لە مشتێ خۆڵ لەهەموو بەش و پارچەكانی سەر زەوی هەڵیگرتوە، بۆیە نەوەكانی لەسەر شێوازی هەموو زەوین، لەنێوانیاندا رەنگی سور و سپی و رەش و تێكەڵ هاتوە- ئەم سیانە ئەسڵی رەنگەكانن، رەنگی گڵەكانی زەوی -، هەروەها كەسانی لەسەرخۆ و رۆح سوك و توند و رەق و خەمۆكی و، دەرون پیس و دەرون پاك و جیاواز لەمانەش بە تێكەڵی هاتوون).

٤٦٩٤ - (صحيح) عن علي قال: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَقِيعِ الْغَرْقَدِ, فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَلَسَ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ, فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِالْمِخْصَرَةِ فِي الأَرْضِ, ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ, ومَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ قَدْ كَتَبَ اللَّهُ مَكَانَهَا مِنَ النَّارِ أَوْ مِنَ الْجَنَّةِ, إِلاَّ قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ, أَفَلاَ نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ, فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ لَيَكُونَنَّ إِلَى السَّعَادَةِ, وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشِّقْوَةِ لَيَكُونَنَّ إِلَى الشِّقْوَةِ؟ قَالَ: (اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ (لما خلق له): أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِلسَّعَادَةِ, وَأَمَّا أَهْلُ الشِّقْوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِلشِّقْوَةِ). ثُمَّ قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى . فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە مەدینە لەگۆڕستانی بەقیع لەگەڵ تەرمێکدابووین پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لەوێ ئامادەبوو، هات لەلامان دانیشت داردەستێکی بەدەستەوە بوو، بە بێ دەنگی کەم کەم داردەستەکەی دەخشاند لە زەوی - وەك ئەوەی بیر لەشتێکی گرنگ بکاتەوە -، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (یەك بە یەکتان، یەك بە یەکی ڕوحە دروستکراوەکان، ئیللا خوای گەورە جێگەی ئەوی لە بەهەشت دا یان لەدۆزەخ دا نوسیوە، ئیللا نوسراوە کە بەدبەختە یان بەختەوەرە). پێشەوا عەلی وتی: یەکێ لە ئامادەبوان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا کەوایە بۆ پشت نەبەستین بەو نوسراوەمان و باڵی لێ نەدەینەوەو واز لەکاروکردەوەی چاکە نەهێنین، ئەوەی بەختەوەر بێ ئەوە بەختەوەرەو، ئەوەشی بەدبەخت بێ ئەوە بەدبەختەو لە ئەزەلدا بۆیان نوسراوە؟ فەرمووی: (هەوڵ بدەن و با کردەوەتان هەبێت، هەموو کەسێ بۆچی دروستکراوە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت و بۆی ئاسان دەبێت، بەختیار ڕێگەی چاکەو بەختەوەری دەگرێ و، بەدبەختیش ڕێگەی خراپەو بەدبەختی دەگرێ). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾. سورة الليل: ٥- ١٠: .

واتە: ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێ و لەخوا بترسێت و پارێزکار بێ. وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە (کە (لا اله إلا الله)یە یان بەهەشتە). ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان. وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات خۆی بێ نیاز بزانێت. وە بڕوای نەبێ بە چاکە (کە (لا اله إلا الله)یە یان بەهەشتە). ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین.

٤٦٩٥ - (صحيح) عن يحيى بن يعمر قال: كَانَ أَوَّلَ مَنْ تَكَلَّمَ فِي الْقَدَرِ بِالْبَصْرَةِ مَعْبَدٌ الْجُهَنِيُّ, فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحِمْيَرِيُّ حَاجَّيْنِ, أَوْ مُعْتَمِرَيْنِ, فَقُلْنَا: لَوْ لَقِينَا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْنَاهُ عَمَّا يَقُولُ هَؤُلَاءِ فِي الْقَدَرِ. فَوَفَّقَ اللَّهُ لَنَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ دَاخِلاً فِي

الْمَسْجِدِ, فَاكْتَنَفْتُهُ أَنَا وَصَاحِبِي, فَظَنَنْتُ أَنَّ صَاحِبِي سَيَكِلُ الْكَلاَمَ إِلَيَّ, فَقُلْتُ: أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ, إِنَّهُ قَدْ ظَهَرَ قِبَلَنَا نَاسٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ, وَيَتَقَفَّرُونَ الْعِلْمَ, يَزْعُمُونَ أَنْ لاَ قَدَرَ, وَالأَمْرُ أُنُفٌ. فَقَالَ: إِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي بَرِيءٌ مِنْهُمْ, وَهُمْ بُرَآءُ مِنِّي, وَالَّذِي يَحْلِفُ بِهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لَوْ أَنَّ لأَحَدِهِمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا فَأَنْفَقَهُ مَا قَبِلَهُ اللَّهُ مِنْهُ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ, ثُمَّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ, شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ, لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ نَعْرِفُهُ, حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ, وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ, وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ, أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ, وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ, وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ, وَتَصُومَ رَمَضَانَ, وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً). قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ). قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ: (أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ, فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ). قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: (مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ). قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا؟ قَالَ: (أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا, وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ). قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ, فَلَبِثْتُ ثَلاَثًا, ثُمَّ قَالَ: (يَا عُمَرُ, هَلْ تَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟). قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ).

واتە: لە یەحیای کوڕی یەعمەرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: یەکەم کەسێ کە ئینکاری قەدەری کردو دەربارەی قەدەر دوا مەعبەدی جوهەنی بوو لە بەصرە، من و حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ی حیمیەری بۆ حەج یان بۆ عومرە دەرچوین، وتمان خۆزگە توشی یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەبووین دەربارەی قەدەریەکان - مەعبەد و هاوڕێکانی - پرسیارمان

لێ دەکرد کەچی دەڵێن، خوای گەورە سەرکەوتوی کردین و بۆی رێکخستین لەوکاتەدا (عبد الله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ ئەیویست بچێتە ناو مزگەوتەوە، من و هاوڕێکەم ئەملاو لامان لێگرت، یەکێکمان لای راستەوەو ئەوی تریشمان لای چەپەوە، وام زانی هاوڕێکەم قسەکردن بەمن دەسپێرێت، بۆیە وتم: ئەی باوکی (عبد الرحمن) لەلای ئێمە کۆمەڵێك سەریان هەڵداوە قورئان دەخوێنن و عەوداڵی خوێندنن و هەوڵی کۆکردنەوەی زانست ئەدەن، کەچی ئینکاری قەدەر دەکەن و دەڵێن: قەدەر نیەو، کاروبار هەتا رونەدات کەس نایزانێ و کاتێ خوا بە کردەوەکان دەزانێ کە روودەدات، (عبد الله)ی کوڕی عومەر وتی: ئەگەر گەیشتی بەوانە پێیان رابگەیەنە کە من لەوانە بەریم، ئەوانیش لە من بەرین، بەو (الله)یە کە (عبد الله)ی کوڕی عومەر سوێندی پێ دەخوات، ئەگەر هەر یەکێ لەوانە بەقەد کێوی ئوحود زێڕ و تەڵای هەبێت و بیبەخشێ لەڕێی خوای گەورەدا خوا لێی وەرناگرێت، هەتا باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت، لەپاشدا وتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ بۆی باس کردم وتی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوین، کاتێ زانیمان پیاوێك دەرکەوت پۆشاکی سپی بلورین بوو، موو رەشی تۆخ بوو، ماندوێتی رێگای پێوە نەدەبینرا، کەس لە ئێمە نەیدەناسی، هاتەپێشەوە هەتا لەبەرامبەر پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دانیشت و هەردوو ئەژنۆی نا بە هەردو ئەژنۆیەوەو، هەردوو دەستی نایە سەر هەردوو رانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و وتی: ئەی موحەممەد ئیسلام چیە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئیسلام ئەوەیە کە شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، نوێژ بکەیت و، زەکات بدەیت و، رۆژووی مانگی رەمەزان بگریت و، ئەگەر توانای مادی و مەعنەویت هەبوو حەجی ماڵی خوا بکەیت). وتی: راست دەکەیت، ئێمە لامان سەیر بوو کە پرسیاری لێ دەکردو دەیوت راست دەکەیت، وتی: ئەی ئیمان چیە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئیمان ئەوەیە کە باوەڕ بهێنی بە خوای گەورەو بە مەلائیکەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و بە رۆژی قیامەت و بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕیەوە). وتی: راست دەکەیت، وتی: ئەی (ئیحسان)چاکە چیە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی:

(ئەوەیە بەشێوەیە خوای گەورە بپەرستی وەك ئەوەی لەبەرچاوتەو دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینێت). وتی: راست دەکەیت، وتی: چ کاتێ ئەم جیهانە کۆتایی دێت و قیامەت بەرپادەبێ؟ پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمووی: (پرسیارلێکراو زاناتر نیە پێی لەپرسیارکەر). وتی: راست دەکەیت، وتی: ئەی نیشانەکانی چین؟ پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمووی: (ئەوەیە کە منداڵ بە چاوی نۆکەر و کارەکەر تەماشای دایك و باوکی خۆیان بکەن، یان ئافرەتی کۆیلە وەك گەورەکەی خۆی لێ بێت، پێ پەتی و رەش و روت و رەجاڵ و شوان و گاوان ببن بە خاوەن موڵك و کۆشك و تەلاری لێ رابکێشن و فیز و دەعیەی پێوە بکەن). پێشەوا عومەر وتی: لەپاشدا کابرا دەرچوو، منیش ماوەیە مات و بێدەنگ بووم، ئینجا پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم پێی فەرمووم: (ئەی عومەر، دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو؟). وتم: نەخێر، خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (ئەوە جبریل بوو هاتە ناوتان کاروباری دینەکەتان فێربکات).

٤٦٩٦ - (صحيح) عن يحيى بن يعمر وحميد بن عبد الرحمن, قالا: لَقِينَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ, فَذَكَرْنَا لَهُ الْقَدَرَ وَمَا يَقُولُونَ فِيهِ, فَذَكَرَ نَحْوَهُ, زَادَ: قَالَ: وَسَأَلَهُ رَجُلٌ مِنْ مُزَيْنَةَ, أَوْ جُهَيْنَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, فِيمَا نَعْمَلُ؟ أَفِي شَيْءٍ قَدْ خَلاَ أَوْ مَضَى, أَوْ شَيْءٍ يُسْتَأْنَفُ الآنَ؟ قَالَ: (فِي شَيْءٍ قَدْ خَلاَ وَمَضَى). فَقَالَ الرَّجُلُ أَوْ بَعْضُ الْقَوْمِ: فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ قَالَ: (إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ, وَإِنَّ أَهْلَ النَّارِ يُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ).

واتە: لە یەحیای کوڕی یەعمەر و حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: گەیشتین بە (عبد اللە)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ، باسی قەدەرمان بۆ کرد لەگەڵ ئەوەی کە قەدەریەکان دەیڵێن دەربارەی قەدەر، جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتی: پیاوێکی هۆزی موزەینە یان جوهەینە لێی پرسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم، کاروکردەوە بۆ کامیان بکەین بۆ ئەو شتەی لەوەوپێش

بۆمان نوسراوەو رابورد یان بۆ ئەو شتەی کە ئێستا دەست پێ دەکات؟ فەرموی: (بۆ ئەو شتەی کە لەوەوپێش نوسراوەو رابورد). پیاوەکە یان یەکێکی تر لە ئامادەبووان وتی: جا کەوایە ئەم خەڵکە بۆ خۆیان ماندوو دەکەن، بۆچی کاروکردەوە بکەن لەکاتێکدا بیکەن یان نەیکەن لەوەوپێش بۆیان نوسراوەو جێگەیان بۆ دیاریکراوە کە بەهەشتین یان دۆزەخین؟ فەرمووی: (هەوڵ بدەن و با کردەوەتان هەبێت، هەموو کەسێ بۆچی دروستکراوە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت، ئەهلی بەهەشت رێگەی بەهەشت دەگرێ و ئەهلی دۆزەخیش رێگای دۆزەخ دەگرێ).

٤٦٩٧ - (صحيح) عن علقمة بن مرثد, عن سليمان بن بيدة, عن ابن يعمر بهذ الحديث: يَزِيدُ وَيَنْقُصُ, قَالَ: فَمَا الإِسْلاَمُ قَالَ: (إِقَامُ الصَّلاَةِ, وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ, وَحَجُّ الْبَيْتِ, وَصَوْمُ شَهْرِ رَمَضَانَ, وَالاِغْتِسَالُ مِنَ الْجَنَابَةِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ عَلْقَمَةُ مُرْجِئٌ.

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی (مرثد)ەوە، لە سولەیمانی کوڕی (بریده)وە، لە ئیبنو یەعمەرەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەڵام وتەکانی فەرمودەکە بۆی زیاد کراوەو لێی کەم کراوەتەوە، کابرا وتی: ئەی ئیسلام چیە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئیسلام ئەوەیە کە نوێژ بکەیت و، زەکات بدەیت و، حەجی ماڵی خوا بکەیت و، رۆژووی مانگی رەمەزان بگریت و، لە لەشگرانی خۆت بشۆیت). ئەبو داود دەڵێت: عەلقەمەی کوڕی (مرثد) مورجیئەیە.

٤٦٩٨ - (صحيح) عن أبو ذر وأبو هريرة, قالا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْلِسُ بَيْنَ ظَهْرَىْ أَصْحَابِهِ, فَيَجِيءُ الْغَرِيبُ فَلاَ يَدْرِي أَيُّهُمْ هُوَ حَتَّى يَسْأَلَ, فَطَلَبْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَجْعَلَ لَهُ مَجْلِسًا يَعْرِفُهُ الْغَرِيبُ إِذَا أَتَاهُ, قَالَ: فَبَنَيْنَا لَهُ دُكَّانًا مِنْ طِينٍ, فَجَلَسَ عَلَيْهِ, وَكُنَّا نَجْلِسُ بِجَنْبَتَيْهِ, وَذَكَرَ نَحْوَ هَذَا الْخَبَرِ, فَأَقْبَلَ رَجُلٌ - فَذَكَرَ هَيْئَتَهُ - حَتَّى سَلَّمَ مِنْ طَرْفِ السِّمَاطِ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ. قَالَ: فَرَدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو (ذر) و ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانیدا دانیشتبو، ئەگەر کەسێکی غەریب بهاتایە نەیدەزانی کامەیە هەتا پرسیاری نەکردایە، بۆیە داوامان لێ کرد کە جێگە دانیشتنێکت بۆ دروست بکەین ئەگەر کەسی غەریب هات پێویستی بە پرسیارکردن نەبێ، راوی وتی: جێگەیەکی بەرزمان لەگڵ بۆ دروست کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەری دانیشت، ئێمەش لەم لاو لایەوە دانیشتین، جا راوی هەمان بەسەرهاتی گێڕایەوە، جا پیاوێ هات - راوی باسی شکڵ و شێوەی پیاوەکەی کرد - سڵاوی کرد لەو کۆمەڵە خەڵکەی لەدەوری دانیشتبوون، لەپاشدا وتی: سڵاوی خوات لەسەربێ ئەی موحەممەد. راوی وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە.

٤٦٩٩ - (صحيح) عن ابن الديلمي قال: أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ لَهُ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ الْقَدَرِ, فَحَدِّثْنِي بِشَيْءٍ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُذْهِبَهُ مِنْ قَلْبِي. فَقَالَ: لَوْ أَنَّ اللَّهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ عَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ, وَلَوْ رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ, وَلَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا قَبِلَهُ اللَّهُ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ, وَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ, وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ, وَلَوْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا لَدَخَلْتَ النَّارَ. قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ, فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ, قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ, فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ, قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ, فَحَدَّثَنِي, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو دەیلەمیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ خزمەت ئوبەی کوڕی کەعب پێم وت: دەربارەی قەدەر شتێ لەدڵما دروست بووە، فەرموودەیەکم بۆ باس بکە بەڵکو خوای گەورە لەدڵم دەری بکات، ئوبەی وتی: ئەگەر خوای گەورەی سزای سەرجەم خەڵکانی سەرزەوی بدات، ئەوە بەڕاستی بەو سزایەی ستەمیان لێ ناکات، ئەگەر روحمیان پێ بکات، ئەوە بەڕاستی ئەو رەحمەتە

بەهۆی کردەوە چاکەکانیانەوە نیە بەڵکو ئەو سۆز و بەزەیی و رەحمەتە فەزڵی خۆیەتی، ئەگەر بەقەد کێوی ئوحود زێڕ و تەڵات هەبێ و بیبەخشی لەڕێی خوای گەورەدا خوا لێت وەرناگرێت، هەتا باوەڕ بە قەدەر نەهێنیت، ئەمە چاك بزانە: هەرچی توشت دەبێ نەدەبوو کە نەیەتە رێت و، ئەوەشی کە توشت نابێ ناگونجێ کە بێتە رێت، ئەگەر لەسەر غەیری ئەم باوەڕە بمریت ئەوە دەچیتە ئاگری دۆزەخەوە. ئیبنو دەیلەمی وتی: چووم بۆ خزمەت (عبد الله)ی کوڕی مەسعود هەر هەمان شتی پێ وتم، لەپاشدا چووم بۆ خزمەت (حذيفة)ی کوڕی یەمان هەر هەمان شتی پێ وتم، وتی: لەپاشدا چووم بۆ خزمەت زەیدی کوڕی (ثابت) لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە.

٤٧٠٠ - (صحيح) عن أبي حفصة قال: قَالَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ لِابْنِهِ: يَا بُنَيَّ إِنَّكَ لَنْ تَجِدَ طَعْمَ حَقِيقَةِ الإِيمَانِ حَتَّى تَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ, وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ, فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ. قَالَ: رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ). يَا بُنَيَّ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَذَا فَلَيْسَ مِنِّي).

واتە: لە ئەبو حەفصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عوبادەی کوڕی صامیت بە کوڕەکەی خۆی وت: ئەی کوڕی خۆم تامی شیرینی ئیمان ناچێژی هەتا چاك ئەمە نەزانی: هەرچی توشت دەبێ نەدەبوو کە نەیەتە رێت و، ئەوەشی کە توشت نابێ ناگونجێ کە بێتە رێت، گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (یەکەم شتێ کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو، فەرمووی: بنوسە، وتی پەروەردگارم چی بنوسم؟ فەرمووی: قەدەر و ئەندازەگیری هەموو شتێ هەتا رۆژی قیامەت). ئەی کوڕی خۆم بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەس لەسەر غەیری ئەم باوەڕە بمریت ئەوە لەسەر سوننەت و رێبازی من نیە).

٤٧٠١ - (صحيح) عن أبو هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى, فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ, فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلاَمِهِ وَخَطَّ لَكَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ, تَلُومُنِى عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ عَلَىَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِى بِأَرْبَعِينَ سَنَةً, فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێغەمبەران ئادەم و موسا سەلامی خوایان لەسەر بێ لەنێوانیاندا بوو بە راجیایی و بەڵگە هێنانەوە، موسا فەرمووی: ئەی ئادەم تۆ باوکی هەموومانی - کەچی بە هۆی گوناهێکەوە - بێ هیواو نائومێدت کردین و لە بەهەشت دەرتپەڕاندین بۆ سەر زەوی، ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسایەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردی و پەسەندی کردی و کردیتی بە پێغەمبەر و قسەی لەگەڵ کردی و لەچەند تەختەو لەوحێکدا تەوراتی بۆ ناردی، کەچی لەسەر کردنی کارێ سەرزەنشتم دەکەی کە خوای گەورە چل ساڵ پێش ئەوەی من دروست بکات لەسەری نوسیوم کە ئەو کارە بکەم، بەو بەڵگە ئادەم موسای بۆرداو بەزاندی).

٤٧٠٢ - (حسن) عن عمر بن الخطاب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مُوسَى قَالَ: يَا رَبِّ, أَرِنَا آدَمَ الَّذِى أَخْرَجَنَا وَنَفْسَهُ مِنَ الْجَنَّةِ, فَأَرَاهُ اللَّهُ آدَمَ, فَقَالَ: أَنْتَ أَبُونَا آدَمُ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ: نَعَمْ. قَالَ: أَنْتَ الَّذِى نَفَخَ اللَّهُ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ, وَعَلَّمَكَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا, وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى أَنْ أَخْرَجْتَنَا وَنَفْسَكَ مِنَ الْجَنَّةِ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ: وَمَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى. قَالَ: أَنْتَ نَبِىُّ بَنِى إِسْرَائِيلَ الَّذِى كَلَّمَكَ اللَّهُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ لَمْ يَجْعَلْ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ رَسُولاً مِنْ خَلْقِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَمَا وَجَدْتَ أَنَّ ذَلِكَ كَانَ فِى كِتَابِ اللَّهِ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَفِيمَ تَلُومُنِى فِى شَىْءٍ سَبَقَ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى فِيهِ الْقَضَاءُ قَبْلِى). قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ ذَلِكَ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى, فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (موسا سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم، داوات لێ دەکەم ئادەمم نیشان بدەیت کە خۆی و ئێمەشی لەبەهەشت وەدەرنا، خوای گەورە ئادەمی نیشاندا، فەرمووی: تۆ ئادەمی باوکمانی، ئادەم پێی فەرموو: بەڵێ، فەرمووی: تۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە لە ڕوحی خۆی گیانی بەبەردا کردی و، سەرجەم ناوەکانی فێرکردی و، فەرمانی کرد بە مەلائیکەکان کە سەجدەت بۆ بەرن؟ فەرمووی: بەڵێ، موسا فەرمووی: کەواتە چی وای لەتۆ کرد کە خۆت و ئێمەش لەبەهەشت وەدەرنێی؟ ئادەم پێی فەرموو: ئەی تۆ کێیت؟ فەرمووی: من موسام، ئادەم فەرمووی: پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیلیت، ئەو کەسەی کە خوای گەورە لەپشت پەردەوە قسەی لەگەڵ کردیت بەبێ دانانی مەلائیکەیە لە نێوان تۆ و خۆیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، ئادەم فەرمووی: ئایا نازانی ئەوەی من کردوومە لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوە پێش ئەوەی من دروست بکرێم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئادەم فەرمووی: دەی کەواتە بۆچی سەرزەنشتم دەکەی لەسەر کردنی کارێ کە بڕیاری پێشتری خوای گەورەی لەسەر بووە پێش ئەوەی من دروست بکرێم). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا فەرمووی: (ئادەم موسای بەزاند، ئادەم موسای بەزاند).

٤٧٠٣ - (صحيح) عن مسلم بن يسار الجهني: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سُئِلَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِى آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ). قَالَ: - قَرَأَ الْقَعْنَبِيُّ الآيَةَ - فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنْهَا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ آدَمَ, ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ بِيَمِينِهِ, فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً, فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلاَءِ لِلْجَنَّةِ, وَبِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَعْمَلُونَ, ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ, فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً, فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلاَءِ لِلنَّارِ, وَبِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ يَعْمَلُونَ). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ

لِلْجَنَّةِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيُدْخِلَهُ بِهِ الْجَنَّةَ, وَإِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ لِلنَّارِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ النَّارِ فَيُدْخِلَهُ بِهِ النَّارَ).

واتە: لە موسلیمی کوڕی یەساری جوهەنیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیاریان کرد لە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴾.

سورة الأعراف: ١٧٢.

واتە: کاتێ کە پەروەردگارت وەریگرت (دەری هێنا) لەپشتی ئادەمی یەکان وەچە و نەوەکانیان وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە (پێی ووتن) ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ (لە وەڵامدا) ووتیان: بەڵێ شایەتیمان دا تا نەڵێن لە ڕۆژی دوایی دا بەڕاستی ئێمە بێ ئاگا بووین لەمە (کەخوا پەروەردگارمانە).
پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیاریان لێ کرد فەرمووی: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، دەستی ڕاستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو، فەرمووی: ئەمانە بۆ بەهەشت، بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کار دەکەن، لەپاشدا دەستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو، فەرمووی: ئەمانە بۆ دۆزەخ، بە کردەوەی ئەهلی دۆزەخ کار دەکەن). پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کەواتە بۆ کار بکەین لەکاتێکدا کە سەرەنجامـمان دیاریکراوە بۆ بەهەشت یان دۆزەخ؟ فەرمووی: (کاتێ کە خوای گەورە بەندەیەکی دروستکرد بۆ بەهەشت بەکاری دەهێنێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی بەهەشت هەتا سەرەنجام لەسەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی بەهەشت دەمرێ و بەوەش دەچێتە بەهەشتەوە، کاتێ کە بەندەیەکی دروستکرد بۆ دۆزەخ بەکاری دەهێنێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی دۆزەخ هەتا سەرەنجام لەسەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی دۆزەخ دەمرێ و بەوەش دەچێتە دۆزەخەوە).

٤٧٠٤ - عن مسلم بن يسار، عن نعيم بن ربيعة قال: كُنْتُ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بِهَذَا الْحَدِيثِ, وَحَدِيثُ مَالِكٍ أَتَمُّ.

٤٧٠٥ - (صحيح) عن أبي بن كعب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْغُلاَمُ الَّذِى قَتَلَهُ الْخَضِرُ طُبِعَ كَافِرًا, وَلَوْ عَاشَ لأَرْهَقَ أَبَوَيْهِ طُغْيَانًا وَكُفْرًا).

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو منداڵەی کە (خضر) کوشتی ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە دروستی کردو مۆری پێدانا، بەکافری دروستی کردو مۆری پێدانا، ئەگەر بژیایا ئەوەندە خراپەکاری دەکرد باوك و دایکیشی گومڕا و کافر و بێ باوەڕ دەکرد).

٤٧٠٦ - (صحيح) عن أبي بن كعب قال: قال سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول في قوله: (وَأَمَّا الْغُلاَمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ). (وَكَانَ طُبِعَ يَوْمَ طُبِعَ كَافِرًا).

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەربارەی ئەم ئایەتە دەیفەرموو: ﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ ﴾ سورة الكهف: ٨٠. واتە: لاوەکەش (کە کوشتم) ئەوە باوك و دایکی ئیماندار بوون. (ئەو منداڵە ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە دروستی کردو مۆری پێدانا، بەکافری دروستی کردو مۆری پێدانا).

٤٧٠٧ - (صحيح) عن أبي بن كعب: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَبْصَرَ الْخَضِرُ غُلاَمًا يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ فَتَنَاوَلَ رَأْسَهُ فَقَلَعَهُ, فَقَالَ مُوسَى: (أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً)). الآيَةَ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((خضر) منداڵێکی بینی لەناو منداڵاندا یاری دەکرد سەری گرت و ملی پەڕاند سەری لە جەستەی کردەوە، موسا وتی: ﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا﴾. سورة الكهف: ٧٤. واتە: کەسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناڕەوات کرد.

٤٧٠٨ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود قال: حدثنا رسول الله صلى الله عليه و سلم وهو الصادق المصدوق: (إِنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا, ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ, ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ, ثُمَّ يُبْعَثُ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: فَيُكْتَبُ رِزْقُهُ وَأَجَلُهُ وَعَمَلُهُ ثُمَّ يُكْتَبُ شَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ, ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ, فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ أَوْ قِيدُ ذِرَاعٍ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا, وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ أَوْ قِيدُ ذِرَاعٍ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە راستگۆیەو بە راست زانراوەو فەرمایشتی جێگەی باوەڕە فەرموویەتی: (هەریەکێ لەئێوە کە خوای گەورە دروستی دەکات چل رۆژ لەسکی دایکیدا بە (نوتفە)تۆمەیی کۆدەکرێتەوەو دەمێنێتەوە، لەپاشدا دەبێت بە پارچە خوێنێکی مەیو چل رۆژیش بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، لەپاشدا دەبێت بە پارچە گۆشتێ چل رۆژیش بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، ئینجا خوای گەورە فەرمان دەکات بەو مەلائیکەیە کە روح دەکات بە بەریا ئەم چوار وشەیە بنوسێت: رۆزی و کاروکردەوەیی و ئەجەل و ئاکامی لەپاشدا بۆی دەنوسێت کامەران و بەختەوەرە یان بەدبەخت و بەدکارە، لەپاشدا روح دەکات بە بەریا، کەسی واتان هەیە کردەوەی خەڵکی بەهەشت دەکات تا لەنێوانی ئەو و بەهەشتدا

تەنها باڵێك دەمێنێ، جا نوسراوەكەی پێشی دەكەوێت و كردەوەی خەڵكی ئاگر دەكات و دەچێتە ئاگرەوە، وە كەسی وەهاشتان هەیە كردەوەی خەڵكی ئاگر دەكات تا لەنێوانی ئەو و ئاگردا تەنها باڵێك دەمێنێ، جا نوسراوەكەی پێشی دەكەوێت و كردەوەی خەڵكی بەهەشت دەكات و دەچێتە بەهەشتەوە).

٤٧٠٩ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعُلِمَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قَالَ: فَفِيمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ؟ قَالَ: (كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ).

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا ئەهلی بەهەشت ئەهلی دۆزەخ دەزانن كە نوسراوەكەیان پێشیان كەوتوە بەهەشتین یان دۆزەخین؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتی: كەواتە بۆچی كاركەران كردەوە بكەن؟ فەرمووی: (هەموو كەسێ بۆ چی دروستكراوە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت، ئەهلی بەهەشت ڕێگەی بەهەشت دەگرێ و ئەهلی دۆزەخیش ڕێگای دۆزەخ دەگرێ).

٤٧١٠ - (ضعيف) عن عمر بن الخطاب: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُجَالِسُوا أَهْلَ الْقَدَرِ وَلاَ تُفَاتِحُوهُمْ).

واتە: لە پێشەوا عومەری كوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەگەڵ قەدەریەكان دامەنیشن و قسەوباسیان بۆ دامەمەزرێنن).

## سەبارەت بە مندالانی هاوبەش بۆ خوا دانەران.

## ١٨ - باب فِي ذَرَارِيِّ الْمُشْرِكِينَ.

٤٧١١ - (صحيح) عن ابن عباس: أن النبي صلى الله عليه وسلم سئل عن أولاد المشركين قال: (اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە سەبارەت بە مندالانی هاوبەش بۆ خوا دانەران ئەوانەی كە لەپێش بالغ بووندا مردوون پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم كە بەهەشتین یان دۆزەخین، ئەویش فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ كاروكردەوەیان چی دەبوو). - پێشەوا نەوەوی دەڵێ: رای دروست ئەوەیە كە ئەهلی بەهەشتن - عون المعبود: ٧٣/٧.

٤٧١٢ -(صحيح الإسناد) عن عائشة قالت: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَرَارِيُّ الْمُؤْمِنِينَ؟ فَقَالَ: (هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِلاَ عَمَلٍ؟ قَالَ: (اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, فَذَرَارِيُّ الْمُشْرِكِينَ؟ قَالَ: (مِنْ آبَائِهِمْ). قُلْتُ: بِلاَ عَمَلٍ؟ قَالَ: (اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، ئەی حوكمی مندالانی باوەڕداران چیە؟ فەرمووی: (هەمان حوكمی باوك و دایكیان بۆ هەیە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەچنە بەهەشتەوە بەبێ كردەوە؟ فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ كاروكردەوەیان چی دەبوو). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، ئەی حوكمی مندالانی هاوبەش بۆ خوا دانەران

چیه؟ فەرمووی: (هەمان حوکمی باوك و دایکیان بۆ هەیە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەبێ کردەوە؟ فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ کاروکردەوەیان چی دەبوو).

٤٧١٣ - (صحيح) عن عائشة أم المؤمنين قالت: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِصَبِيٍّ مِنَ الأَنْصَارِ يُصَلِّي عَلَيْهِ, قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ طُوبَى لِهَذَا لَمْ يَعْمَلْ شَرًّا وَلَمْ يَدْرِ بِهِ. فَقَالَ: (أَوَغَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ, إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْجَنَّةَ وَخَلَقَ لَهَا أَهْلاً, وَخَلَقَهَا لَهُمْ وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ, وَخَلَقَ النَّارَ وَخَلَقَ لَهَا أَهْلاً, وَخَلَقَهَا لَهُمْ وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ).

واتە: لە خاتو عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم بانگ کرد بۆ سەر تەرمی منداڵێکی یاریدەدەران، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خۆشبەتی بۆ ئەم منداڵە کردەوەی خراپی نەکردەوە فریای کاروکردەوەی خراپە نەکەوت، فەرمووی: (ئەی عائیشە، ئەوە بەو شێوەیە نیە، خوای گەورە بەهەشتی دروست کردوە و کەسانێکی بۆ دروست کردوە، هەر لەپشتی باوکیاندا بۆ بەهەشت دروستیکردون، هەروەها ئاگری دۆزەخی دروست کردوە و کەسانێکی بۆ دروست کردوە، هەر لەپشتی باوکیاندا بۆ ئاگری دۆزەخ دروستیکردون).

٤٧١٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ, فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ كَمَا تَنَاتَجُ الإِبِلُ مِنْ بَهِيمَةٍ جَمْعَاءَ, هَلْ تُحِسُّ مِنْ جَدْعَاءَ؟). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَفَرَأَيْتَ مَنْ يَمُوتُ وَهُوَ صَغِيرٌ؟ قَالَ: (اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو منداڵێ کە لەدایك دەبێ لەسەر فیترەتی پاك

و بە موسوڵمانی لەدایك دەبێ، لەپاشدا باوك و دایکی دەیکەنە جولەکە یان گاور وەك چۆن بەچکەی وشتر لەسەرەتاوە بەتێکڕا بەتەواوی و بەبێ کەموکوڕی لەدایك دەبن، هەرگیز بینیوتانە بە گوێ بڕاوی یان بە نوقسانی لەدایك بن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی ئەوانەی کە پێش باڵغ بوون و بە منداڵی مردن؟ فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ کاروکردەوەیان چی دەبوو).

٤٧١٥ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن ابن وهب قال: سَمِعْتُ مَالِكًا قِيلَ لَهُ: إِنَّ أَهْلَ الأَهْوَاءِ يَحْتَجُّونَ عَلَيْنَا بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ مَالِكٌ: احْتَجَّ عَلَيْهِمْ بِآخِرِهِ. قَالُوا: أَرَأَيْتَ مَنْ يَمُوتُ وَهُوَ صَغِيرٌ؟ قَالَ (اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ).

واتە: لە ئیبنو وەهبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا مالیك بوو پێی وترا: ئەهلی هەواو هەوەس و قەدەریەکان ئەم فەرموودەیان کردوە بە بەڵگە لەسەرمان و ڕەخنەمان لێ دەگرن پێی، پێشەوا مالیك وتی: ئێوەش بە ڕۆژی دوایی بەڵگەیان بۆ بهێننەوەو گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن. وتیان: رات چیە بەرامبەر بەو منداڵانەی کە پێش باڵغ بوون و بە بچوکی مردن؟ وتی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ کاروکردەوەیان چی دەبوو).

٤٧١٦ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن حماد يفسر الحديث: (كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ). قَالَ: هَذَا عِنْدَنَا حَيْثُ أَخَذَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْعَهْدَ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ حَيْثُ قَالَ: (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى).

واتە: لە حەمادەوە دەگێڕنەوە، کە ڕاڤەی ئەم فەرموودەی کرد: (هەموو منداڵێ کە لەدایك دەبێ لەسەر فیترەتی پاك و بە موسوڵمانی لەدایك دەبێ ...). وتی: ئەمە لەلای ئێمە بە پێی ئەو بەڵێن و پەیمانەیە کە خوای گەورە لێی وەرگرتن لەکاتێکدا کە ئەو منداڵانە لەپشتی باوکانیاندا بوون پێی فەرموون: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾. سورة الأعراف:١٧٢. واتە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ وتیان: بەڵێ شایەتیماندا).

٤٧١٧ - (صحيح) عن عامر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْوَائِدَةُ وَالْمَوْءُودَةُ فِي النَّارِ).

واتە: لە عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( ئەو دایکەی کە کچەکەی زیندەبەچاڵ دەکات لە ئاگری دۆزەخدایە هەروەها زیندەبەچاڵ کراوەکەش). - ئەگەر باڵغ بوو باوەڕی نەهێنا بوو، بەڵام ئەگەر باڵغ بوو بوو ئەوە ئیشکالی تێدایە - .

٤٧١٨ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ أَبِي؟ قَالَ: (أَبُوكَ فِي النَّارِ). فَلَمَّا قَفَّى, قَالَ (إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باوکم لە کوێ یە؟ فەرمووی: (لە ئاگری دۆزەخدایە). کاتێ کە ویستی بڕوات، فەرمووی: (بێگومان باوکی من و باوکی تۆیش لە ئاگردان).

٤٧١٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان شەیتان بەناو دەمارەکانی خوێنی ئادەمیزاد دا هاتوچۆ دەکات).

٤٧٢٠ - (ضعيف) عن عمر بن الخطاب: ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُجَالِسُوا أَهْلَ الْقَدَرِ, وَلاَ تُفَاتِحُوهُمْ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەگەڵ قەدەریەکان دامەنیشن و قسەوباسیان بۆ دامەمەزرێنن).

## سەبارەت بە جەهمیەکان.

## ١٩ - باب فِي الْجَهْمِيَّةِ.

٤٧٢١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ هَذَا: خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ, فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەردەوام خەڵك پرسیار دەکەن هەتا ئەمە دەڵێن: خوای گەورە ئەم دروستکراوانەی دروستکردووە، ئەی کێ خوای دروستکردوە؟ هەرکەس ئەوەی بۆ دروست بوو با بڵێ: (باوەڕم هێنا بە خوای گەورە).

٤٧٢٢ - (حسن) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول فَذَكَرَ نَحْوَهُ, قَالَ: (فَإِذَا قَالُوا ذَلِكَ فَقُولُوا (اللَّهُ أَحَدٌ, اللَّهُ الصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) ثُمَّ لْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثًا وَلْيَسْتَعِذْ مِنَ الشَّيْطَانِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو، جا راوی فەرمودەکەی بەهەمان شێوە گێڕایەوە، فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی وت بڵێن: (ئەوە، خوای تاك و تەنتا. ئەو خوایەی بێ نیازەو جێی ناز و ئومێدە، کەسی لێ نەبوەو لەکەس نەبوە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای نیە). لەپاشدا سێ جار تف رۆبکات بەلای چەپیداو، پەنا بگرێت بە خوای گەورە لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو).

٤٧٢٣ - (ضعيف) عن عباس بن عبد المطلب قال: كُنْتُ فِي الْبَطْحَاءِ فِي عِصَابَةٍ فِيهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَمَرَّتْ بِهِمْ سَحَابَةٌ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا فَقَالَ: (مَا تُسَمُّونَ هَذِهِ؟). قَالُوا: السَّحَابَ. قَالَ: (وَالْمُزْنَ). قَالُوا: وَالْمُزْنَ. قَالَ: (وَالْعَنَانَ). قَالُوا: وَالْعَنَانَ. - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ أُتْقِنِ الْعَنَانَ جَيِّدًا - قَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مَا بُعْدُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ؟). قَالُوا: لاَ نَدْرِي. قَالَ: (إِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَهُمَا إِمَّا وَاحِدَةٌ أَوِ اثْنَتَانِ أَوْ ثَلاَثٌ وَسَبْعُونَ سَنَةً، ثُمَّ السَّمَاءُ فَوْقَهَا كَذَلِكَ). حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ (ثُمَّ فَوْقَ السَّابِعَةِ بَحْرٌ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ فَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةُ أَوْعَالٍ بَيْنَ أَظْلاَفِهِمْ وَرُكَبِهِمْ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ عَلَى ظُهُورِهِمُ الْعَرْشُ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَوْقَ ذَلِكَ).

واتە: لە عەباسی کوڕی (عبد المطلب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێکدا بووم لە (بطحاء) پێغەمبەری خواشیان صلى الله عليه وسلم لەناودا بوو، هەورێ تێپەڕی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەمە چی پێ دەوترێت؟). وتیان: (السَّحَاب)هەور، فەرمووی: (الْمُزْن)یشی پێ دەوترێت، وتیان: بەڵێ (الْمُزْن)یشی پێ دەوترێت، فەرمووی: (الْعَنَان)یشی پێ دەوترێت، وتیان: بەڵێ (الْعَنَان)یشی پێ دەوترێت، فەرمووی: (ئایا دەزانن ماوەی دوری نێوانی ئاسمان و زەوی چەندە؟). وتیان: نازانین، فەرمووی: (دوری نێوانیان حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو یا حەفتاو سێ ساڵە. لەپاشدا ئاسمانی دووەم دێت ئەویش ماوەی دوریەکەی بە هەمان ئەندازەیە). هەتا حەوت ئاسمانی بەو جۆرە ژمارد (لەپاشدا لەسەروی حەوت ئاسمانەکەوە دەریایەکە ماوەی دوری نێوانی سەرو خوارووی وەك دوری نێوانی ئاسمانێ بۆ ئاسمانێکی تر وایە، ئینجا لەسەروی ئەوەوە هەشت ئاژەڵە کێوی دێت نێوانی سمیان هەتا ئەژنۆکانیان بە ئەندازەی دوری نێوانی ئاسمانێ بۆ ئاسمانێکی ترە، ئینجا لەسەر پشتی ئەوانەوە عەرشە دوری نێوانی سەرو خوارووی عەرش وەك دوری نێوانی ئاسمانێ بۆ ئاسمانێکی تر وایە، لەپاشدا خوای گەورە لەسەر عەرشە).

٤٧٢٤ - عن سماك, بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ.

واتە: لە سەمماکەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٤٧٢٥ - عن سماك, بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَى هَذَا الْحَدِيثِ الطَّوِيلِ.

واتە: لە سەمماکەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، ئەم فەرمودە درێژە.

٤٧٢٦ - (ضعيف) عن جبير بن مطعم قال: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْرَابِيٌّ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, جُهِدَتِ الأَنْفُسُ, وَضَاعَتِ الْعِيَالُ, وَنُهِكَتِ الأَمْوَالُ, وَهَلَكَتِ الأَنْعَامُ, فَاسْتَسْقِ اللَّهَ لَنَا, فَإِنَّا نَسْتَشْفِعُ بِكَ عَلَى اللَّهِ, وَنَسْتَشْفِعُ بِاللَّهِ عَلَيْكَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَيْحَكَ!! أَتَدْرِى مَا تَقُولُ؟) وَسَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا زَالَ يُسَبِّحُ حَتَّى عُرِفَ ذَلِكَ فِي وُجُوهِ أَصْحَابِهِ, ثُمَّ قَالَ: (وَيْحَكَ!! إِنَّهُ لاَ يُسْتَشْفَعُ بِاللَّهِ عَلَى أَحَدٍ مِنْ خَلْقِهِ, شَأْنُ اللَّهِ أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ, وَيْحَكَ!! أَتَدْرِى مَا اللَّهُ إِنَّ عَرْشَهُ عَلَى سَمَوَاتِهِ لَهَكَذَا). وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ مِثْلَ الْقُبَّةِ عَلَيْهِ: (وَإِنَّهُ لَيَئِطُّ بِهِ أَطِيطَ الرَّحْلِ بِالرَّاكِبِ). قَالَ ابْنُ بَشَّارٍ فِي حَدِيثِهِ: (إِنَّ اللَّهَ فَوْقَ عَرْشِهِ, وَعَرْشُهُ فَوْقَ سَمَوَاتِهِ).

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەڵکەکە کەوتونەتە زەحمەت و نارەحەتیەوە، خاوخێزان و منداڵان فەوتان و تیاچون، ماڵ و سامان کەمی کردو بەرەو نەمان دەچێت، ئاژەڵ و ماڵات فەوتان و لەناوچون، داوابکە لە خوای گەورە بارانمان بۆ ببارێنێ، ئێمە تۆ دەکەینە تکاکار لای خوای گەورە، خوای گەورەش دەکەینە تکاکار لەلای تۆ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وەیل بۆ تۆ!! ئەوە تۆ ئەزانی دەڵێی چی؟)، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە (سبحان

الله)ی کرد هەتا هاوەڵان زانیان کە تووڕە بووە لە قسەی کابرای دەشتەکی بۆیە ئەوانیش ترسان بەروخسارياندا دەزانرا، لەپاشدا فەرمووی: (وەیل بۆ تۆ!! خوای گەورە زۆر زۆر لەوە گەورەترە پێویستی بە یەکێ لە دروستکراوەکانی بێت، وەیل بۆ تۆ!! تۆ ئەزانی خوای گەورە عەرشەکەی لەسەروی ئاسمانەکانەوەیە ئەویش لەسەر عەرشە بەم شێوەیە). بەدەستی ئاماژەی پێدا وەك قوبەیە، عەرش دەنگی لێوە دێت، (رحل) ئەو تەختەیە بەسەر پشتی وڵاخەوە سوار لەسەری دادەنیشێ ئەگەر سوارەکە قورس بێت دەنگێکی لێوە دێت)، - ئەمە وێکچواندنە بەڵام بۆ ئەوەی دەشتەکیەکە تێ بگات ئەمەی فەرمووە، بێگومان فەرموودەکەش لاوازە خوای گەورە خۆی باش دەیزانێ - . ئیبنو بەشار لە فەرموودەکەیدا وتی: (خوای گەورە لەسەر عەرشە، عەرشیش لەسەروی ئاسمانەکانەوەیە).

٤٧٢٧ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أُذِنَ لِي أَنْ أُحَدِّثَ عَنْ مَلَكٍ مِنْ مَلَائِكَةِ اللَّهِ مِنْ حَمَلَةِ الْعَرْشِ: إِنَّ مَا بَيْنَ شَحْمَةِ أُذُنِهِ إِلَى عَاتِقِهِ مَسِيرَةُ سَبْعِمِائَةِ عَامٍ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مۆڵەتم پێدرا لەلایەن خوای گەورەوە باسی سیفەت شکڵی مەلائیکەیە لە مەلائیکەکانی هەڵگری عەرش بکەم بۆ خەڵك و هاوەڵانم: مەسافەی نێوان نەرمایی گوێی بۆ دەفەی شانی حەوت سەد ساڵە).

٤٧٢٨ - (صحيح الإسناد) عن أبو هريرة , يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا) إِلَى قَوْلِهِ تَعَالَى: (سَمِيعًا بَصِيرًا). قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ إِبْهَامَهُ عَلَى أُذُنِهِ وَالَّتِي تَلِيهَا عَلَى عَيْنِهِ, قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ. رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَؤُهَا وَيَضَعُ إِصْبَعَيْهِ. قَالَ ابْنُ يُونُسَ: قَالَ الْمُقْرِئُ يَعْنِي: (إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ) يَعْنِي أَنَّ لِلَّهِ سَمْعًا وَبَصَرًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا رَدٌّ عَلَى الْجَهْمِيَّةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾. سورة النساء: ٥٨.

واتە: بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان، وە کاتێك دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا بەداد حوکم بکەن، بەڕاستی خوا بە چاکی ئامۆژگاریتان دەکات، بەڕاستی خوا هەمیشە بیسەری بینایە.

ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی پەنجە گەورەی لەسەر گوێی داناو پەنجەی دوای ئەو واتە پەنجەی شایەتومانی لەسەر چاوی دانا - ئەمەش وێکچواندن نیە بەڵکو سەلماندنی سیفەتی بیستن و بینین و رونکردنەوەی بووە - . ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی ئایەتەکەی خوێندەوەو پەنجەی لەسەر دانان. ئیبنو یونوس وتی: (مُقْرِئ) وتی واتە: (إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ) واتە: خوای گەورە چاو و گوێی هەیە - بەڵام وەك هی دروستکراوەکانی نیە - . ئەبو داود دەڵێ: ئەمەش رەدە بۆ جەهمیەکان.

## دەربارەی بینینی خوای گەورە.

## ٢٠ - باب فِي الرُّؤْيَةِ.

٤٧٢٩ - (صحيح) عن جرير بن عبد الله قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جُلُوسًا, فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْلَةَ أَرْبَعَ عَشْرَةَ فَقَالَ: (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ, فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا). ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: (فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا).

واتە: لە جەریری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوین، تەماشای مانگی چواردەی کرد فەرموی: (ئێستا ئێوە چۆن ئەم مانگی چواردە دەبینن، لە قیامەتدا ئاوا پەروەردگاری خۆتان دەبینن لەبینینی دا توشی هیچ زەحمەتێ نابن، دەی بە هیوای شادبوون بەو بەهرە گەورەیە هەتا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر بن و مەیانفەوتێنن). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴾. سورة طه: ١٣٠.

واتە: پەروەردگارت بەپاکی ڕابگرەو سوپاسی بکە لەپێش هەڵهاتنی خۆر و لەپێش ئاوابوونی دا.

٤٧٣٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال الناس: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: (هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ فِي الظَّهِيرَةِ لَيْسَتْ فِي سَحَابَةٍ؟). قَالُوا: لاَ. قَالَ: (هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ فِي سَحَابَةٍ؟). قَالُوا: لاَ. قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ, إِلاَّ كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە قیامەتدا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: (ئایا لەکاتی نیوەڕۆدا بۆ بینینی خۆر توشی هیچ زەحمەتێ دەبن ئەگەر هەور نەبێ؟) وتیان: نەخێر. فەرمووی: (ئایا لەشەودا بۆ بینینی مانگی چواردە توشی هیچ زەحمەتێ دەبن ئەگەر هەور نەبێ؟) وتیان: نەخێر. فەرمووی: (دەی سوێند بە (الله) وەك چۆن لەبینینی دا ئەو دوانەدا توشی هیچ زەحمەتێ نابن و بێ گومانن ئاوا لە قیامەتدا پەروەردگاری خۆتان دەبینن و لەبینینی دا توشی هیچ زەحمەتێکیش نابن).

٤٧٣١ - (حسن) عن أبو رزين - قال موسى: العقيلي - قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَكُلُّنَا يَرَى رَبَّهُ؟ قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ: مُخْلِيًا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, وَمَا آيَةُ ذَلِكَ فِي خَلْقِهِ؟ قَالَ: (يَا أَبَا رَزِينٍ أَلَيْسَ كُلُّكُمْ يَرَى الْقَمَرَ). - قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ: (لَيْلَةَ الْبَدْرِ مُخْلِيًا بِهِ). ثُمَّ اتَّفَقَا – قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: (فَاللَّهُ أَعْظَمُ). قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ: قَالَ: (فَإِنَّمَا هُوَ خَلْقٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ, فَاللَّهُ أَجَلُّ وَأَعْظَمُ).

واتە: لە ئەبو رەزینەوە دەگێرنەوە - موسا لە ریوایەتەکەیدا وتی: لە ئەبو رەزینی عوقەیلیەوە- کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، هەر یەکێ لە ئێمە پەروەردگارمان دەبینین؟ ئیبنو (معاذ) لە ریوایەتەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: سەربەخۆ دەیبینێ و توشی هیچ زەحمەتێ نابێ، ئەبو رەزین وتی: دەی بەڵگەی ئەو بینینە چیە لە دروستکراوەکانیدا؟ فەرمووی: (ئەی ئەبا رەزین ئایا ئێوە هەمووتان سەربەخۆ مانگ نابینن؟) ئیبنو (معاذ) لە ریوایەتەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: (شەوی چواردە سەربەخۆ دەیبینی و توشی هیچ زەحمەتێ نابی). لەپاشدا موساو ئیبنو (معاذ) رێك و یەکدەنگن - وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەی خوای گەورە گەورەترە و لەپێشترە بە بینین و ئەوەش بەدی دێت)، ئیبنو (معاذ) وتی: فەرمووی: (دەی مانگ یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا، بێگومان خوای گەورە گەورەتر و لەپێشترە بە بینین).

## سەبارەت بە ڕەتدانەوەی جەهمیەكان.

## ٢١ - باباب فِي الرَّدِّ عَلَى الْجَهْمِيَّةِ.

٤٧٣٢ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَطْوِى اللَّهُ السَّمَوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى, ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ, أَيْنَ الْجَبَّارُونَ, أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ, ثُمَّ يَطْوِى الأَرَضِينَ, ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ). قَالَ ابْنُ الْعَلاَءِ: (بِيَدِهِ الأُخْرَى, ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ, أَيْنَ الْجَبَّارُونَ, أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەكان دەپێچێتەوەو بەدەستی ڕاستی هەڵیاندەگرێت و دەفەرمووێت: من پادشا و فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتم، ڕۆحزل و لوتبەرز و ستەمكار و خۆبەگەورەزانەكان و خۆبەزلزانەكان لەكوێن، لەپاشدا گۆی زەوی دەپێچێتەوەو هەڵیدەگرێت). ئیبنو عەلا دەڵێ: بەدەستەكەی تری. ئینجا دەفەرمووێت: (من پادشاو فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتم، ڕۆحزل و لوتبەرز و ستەمكار و خۆبەگەورەزانەكان و خۆبەزلزانەكان لەكوێن).

٤٧٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَنْزِلُ رَبُّنَا كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرِ فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِى فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِى فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِى فَأَغْفِرَ لَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورەو پەروەردگار هەموو شەوێ لەسێیەكی دوایی

شەودا دێتەخوارەوە[1] بۆ ئاسمانی دونیا، دەفەرموێت: کێ لێم دەپاڕێتەوەو هاناو هاوارم بۆ دێنێ هەتا بێم بەهاواریەو نزاکانی گیرا بکەم، کێ داوام لێ دەکات هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبونم لێ دەکات تا لێی خۆش ببم).

## سەبارەت بە قورئان کە کەلامی خوایە.

## ٢٢ - باب فِي الْقُرْآنِ.

٤٧٣٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْرِضُ نَفْسَهُ عَلَى النَّاسِ فِي الْمَوْقِفِ فَقَالَ: (أَلاَ رَجُلٌ يَحْمِلُنِي إِلَى قَوْمِهِ, فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلاَمَ رَبِّي).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی حەجدا خۆی نیشانی کۆمەڵی خەڵك داو فەرمووی: (ئایا پیاوێ نیە بمباتەوە بۆ ناو گەل و هۆزەکەی خۆی، لەبەرئەوەی قورەیش کەلامی خوای گەورەم لێ قەدەغەدەکەن).

٤٧٣٥ - (صحيح) عن عامر بن شهر قال: كُنْتُ عِنْدَ النَّجَاشِيِّ فَقَرَأَ ابْنٌ لَهُ آيَةً مِنَ الإِنْجِيلِ, فَضَحِكْتُ, فَقَالَ : أَتَضْحَكُ مِنْ كَلاَمِ اللَّهِ؟.

واتە: لە عامیری کوڕی شەهرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای نەجاشی بووم، کوڕێکی ئایەتێکی لە ئینجیل خوێندەوە، منیش پێکەنیم، وتی: ئەوە بە کەلامی خوای گەورە پێدەکەنی؟

(١) دابەزینێ کە شایەنی گەورەیی شکۆمەندی و کەمالی ئەو بێت بەبێ ئەوەی بچوێنرێت بە دروستکراوەکانی و، چۆنیەتیەکەی نازانین خوا خۆی دەیزانێ.

٤٧٣٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیَ بیَ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە دەرونی خۆمدا دەموت زۆر لەوە کەمترم کە دەربارەی ئەستۆپاکی من لەو بوختانەی کە بۆیان هەڵبەستم خوای گەورە بدویَ کەلامی خۆی دابەزێنیَ و بخوێنرێتەوە - ئاماژەیە بۆ دابەزینی ئایەتەکانی (الإفك) کە لە سورەتی (النور)دا هاتوون - .

٤٧٣٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ: (أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ, مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ, وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ). ثُمَّ يَقُولُ: (كَانَ أَبُوكُمْ يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْقُرْآنَ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیَ بیَ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعای پەناگرتنی بۆ حەسەن و حوسەین دەکردوو دەیفەرموو: (پەناتان پیَ دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە، لەشەڕ و خراپەی شەیتان و جانەوەران کە ژەهریان هەبیَ و، لەهەموو چاوێکی پیس). لەپاشدا دەیفەرموو: (باوکتان ئیبراهیم دوعای پەناگرتنی بۆ ئسماعیل و ئیسحاق دەکردو ئەمەی دەیخوێند بەسەر ئسماعیل و ئیسحاق دا). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی خوایەو دروستکراو نیە.

٤٧٣٨ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا, فَيُصْعَقُونَ, فَلاَ يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ, حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ, فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ مَاذَا قَالَ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ, فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ, الْحَقَّ).

واته: له (عبد الله)وه دهگێڕنهوه، كه وتویهتی: پێغهمبهری خوا صلی الله علیه وسلم فهرموویهتی: (كاتێ كه خوای گهوره وهحی دادهبهزێنێت دانیشتوانی ئاسمان گوێ بیستی دهنگێك دهبن وهك دهنگی زنجیره ئهڵقهی زرێ كاتێ رابكێشرێت لهشوێنێكی رهقدا، یهكسهر لهشوێنی خۆیاندا بێ هۆش دهبن و دهكهون، بهردهوام بهو شێوهیهن ههتا ئهوكاتهی جبریل دێتهلایان، كاتێ كه هات بهترس و لهرزهوه دهڵێن: ئهی جبریل پهروهردگارت چی فهرمووی؟ جبریل دهڵێ: حهق و راستی فهرموو، ئهوانیش دهڵێن: ههق و راسته، ههق و راسته).

## باسی زیندوبونەوەی مردوان و فوكردن بە كەرەنادا.

## ٢٣ - باب فِي ذِكْرِ الْبَعْثِ وَالصُّورِ.

| ٤٧٣٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الصُّورُ قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ). |
|---|

واته: له (عبد الله)ی كوڕی عهمرهوه دهگێڕنهوه، كه پێغهمبهر صلی الله علیه وسلم فهرموویهتی: ( (صور) شهیپور یان كهرهنایه فووی پێدا دهكرێت). - ئیسرافیل دوو جار فووی پێدا دهكات - .

| ٤٧٤٠ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (كُلَّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُ الأَرْضُ إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ, مِنْهُ خُلِقَ, وَفِيهِ يُرَكَّبُ). |
|---|

واته: له ئهبو هورهیره دهگێڕنهوه، كه پێغهمبهری خوا صلی الله علیه وسلم فهرموویهتی: (ههموو جهستهی ئادهمیزاد خاك و خۆڵ دهیخوات جگه له ئێسكه كلێنچكه نهبێت، كه سهرتای دروستبونی لهوهوه دهستی پێ كردوهو، زیندووبونهوهشی لهوهوه دهست پێ دهكاتهوه).

## سەبارەت بە تكاكردن.

## ٢٣ - باب فِي الشَّفَاعَةِ.

٤٧٤١ - (صحيح) عن أنس بن مالك: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (شَفَاعَتِي لأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (تكاو شەفاعەتی من ئەو كەسانە دەبێت كە لە ئوممەتی منن و خاوەنی تاوانە گەورەكانن).

٤٧٤٢ - (صحيح) عمران بن حصين: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَيُسَمَّوْنَ الْجَهَنَّمِيِّينَ).

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قەومێ بە تكاو شەفاعەتی موحەممەد لە ئاگر دەهێنرێنە دەرەوە و دەخرێنە بەهەشتەوە پێیان دەوترێت جەهەنمیەكان).

٤٧٤٣ - (صحيح) عن جابر قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ).

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خەڵكی بەهەشت لەبەهەشتدا دەخۆن و دەخۆنەوە).

# باسی بەهەشت و دۆزەخ کە دروستکراون.

## ٢٥ - باب فِي خَلْقِ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ.

٤٧٤٤ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْجَنَّةَ قَالَ لِجِبْرِيلَ: اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا. فَذَهَبَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا, ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: أَىْ رَبِّ وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا, ثُمَّ حَفَّهَا بِالْمَكَارِهِ, ثُمَّ قَالَ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا فَذَهَبَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا, ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: أَىْ رَبِّ وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَدْخُلَهَا أَحَدٌ). قَالَ: (فَلَمَّا خَلَقَ اللَّهُ النَّارَ قَالَ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا. فَذَهَبَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا, ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: أَىْ رَبِّ وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلُهَا فَحَفَّهَا بِالشَّهَوَاتِ ثُمَّ قَالَ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا. فَذَهَبَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: أَىْ رَبِّ وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَبْقَى أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە بەهەشتی دروستکرد بە جبریلی فەرموو: برۆ تەماشای بکە، جبریل رۆشت تەماشای کرد، لەپاشدا هاتەوە وتی: ئەی پەروەردگارم بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ هەرکەس بیەوێ و هەوڵی بۆ بدات ئیللا دەچێتە ناویەوە، لەپاشدا چواردەوری گرت بە قورسی و نارەحەتی - مەبەست لەو تەکالیفە شەرعیانەیە کە نەفس پێی ناخۆشەو قورسە بەلایەوەو هەوڵ و رەنج و ماندوبوونی زۆری دەوێ -، ئینجا فەرمووی: (ئەی جبریل برۆ تەماشای بکە، جبریل رۆشت تەماشای کرد، لەپاشدا هاتەوە وتی ئەی پەروەردگارم بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ ئەترسم کەس نەچێتە ناویەوە، فەرمووی: (کاتێ کە خوای گەورە ئاگری دۆزەخی دروستکرد بە جبریلی فەرموو: برۆ تەماشای بکە، جبریل رۆشت تەماشای کرد، لەپاشدا هاتەوە وتی: ئەی پەروەردگارم بە

گەورەیی و شکۆمەندی تۆ هەرکەس بیەوێ و هەوڵی بۆ بدات ئیللا دەچێتە ناویەوە، لەپاشدا چواردەوری گرت بە شەهوەت و ئارەزووبازی، ئینجا فەرمووی: (ئەی جبریل بڕۆ تەماشای بکە، جبریل ڕۆشت و سەیری کرد، لەپاشدا هاتەوە وتی ئەی پەروەردگارم بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ ئەترسم کەس نەمێنێ نەچێتە ناویەوەو کەس رزگاری بێ لێی). - بەهۆی مەیلی نەفس بۆ شەهوەت و ئارەزووبازی و تەمەڵی لە پەرستشەکان - [1] .

## سەبارەت بە حەوزی (الكَوْثَر).

## ٢٦ - باب فِي الْحَوْضِ.

٤٧٤٥ - (صحيح) عن أبن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا مَا بَيْنَ نَاحِيَتَيْهِ كَمَا بَيْنَ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەبەهەشتدا حەوزێ لەپێشتانە نێوانی هەردوولای لەجەربائەوە هەتا (أَذرُح) دەبێت. - (جَرْبَاء) و (أَذرُح) دوو ئاوایین لەشام ماوەی نێوانیان سێ شەو ڕێگایە- .

٤٧٤٦ - (صحيح) عن زيد بن أرقم قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَقَالَ: (مَا أَنْتُمْ جُزْءٌ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ جُزْءٍ مِمَّنْ يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ). قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: سَبْعَمِائَةٍ أَوْ ثَمَانَمِائَةٍ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا

(١) ئەم فەرموودە بەرپەرچی ئەو کەس و لایەنانە دەداتەوە کە دەڵێن بەهەشت و دۆزەخ هێشتا دروست نەکراون، بەڵکو دروستکراون و ئامادەن و هەتا هەتایی و هەمیشەییشن.

لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین لەجێگەو مەنزڵگایەکدا دابەزی فەرمووی: (ئێوە بەیەك بەش لەسەد هەزار بەشی ئەوانە نابن کەدێن بۆلام بۆسەر حەوزی (الكَوْثَر) ). راوی وتی: وتم: ئەو کاتە ئێوە چەند کەس دەبوون؟ وتی: حەوت سەد کەس یان هەشت سەد کەس دەبووین.

٤٧٤٧ - (حسن) عن أنس بن مالك قال: أَغْفَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِغْفَاءَةً فَرَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا, فَإِمَّا قَالَ لَهُمْ, وَإِمَّا قَالُوا لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ ضَحِكْتَ؟ فَقَالَ: (إِنَّهُ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ). فَقَرَأَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) حَتَّى خَتَمَهَا فَلَمَّا قَرَأَهَا قَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِي الْجَنَّةِ, وَعَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ, عَلَيْهِ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ, آنِيَتُهُ عَدَدُ الْكَوَاكِبِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرخەوێکی شکاندو سەری بەرزکردەوە زەردەخەنەیەکی کرد، یان خۆی فەرمووی بەوان، یان ئەوان وتیان بەو: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆچی پێکەنیت؟ فەرمووی: (بەم نزیکانە ئەم سورەتەم بۆ دابەزی). دەستی کرد بە خوێندنی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) .. هەتا کۆتایی سورەتەکە). کاتێ کە خوێندیەوە فەرمووی: (ئایا دەزانن (كَوْثَر) چییە؟). وتیان خواو پێغەمبەرەکەی دەیزانن، فەرمووی: (بێگومان (كَوْثَر) دەریایەکە لە بەهەشتدا خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە بۆ من بێت، خێر و بێری زۆری لەسەرە، حەوزێکی لەسەرە لەرۆژی قیامەتدا ئوممەتەکەم دەچنە سەر ئەو حەوزە، ژمارەی پەرداخ و جامەکانی ئەو حەوزە بەقەد ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان دەبن).

٤٧٤٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: لَمَّا عُرِجَ بِنَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْجَنَّةِ - أَوْ كَمَا قَالَ - عُرِضَ لَهُ نَهْرٌ حَافَتَاهُ الْيَاقُوتُ الْمُجَيَّبُ - أَوْ قَالَ

الْمُجَوَّفُ - فَضَرَبَ الْمَلَكُ الَّذِى مَعَهُ يَدَهُ, فَاسْتَخْرَجَ مِسْكًا, فَقَالَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْمَلَكِ الَّذِى مَعَهُ: (مَا هَذَا؟). قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِى أَعْطَاكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرزکرایەوە بۆ بەهەشت، دەریایەکیان نیشاندا لایەکانی یاقوتی ناوبۆش بوون، ئەو مەلائیکەیەی لەگەڵی بوو دەستی کرد بەناو قوڵایی دەریاکەدا، میسکی دەرهێنا، موحەممەد صلى الله عليه وسلم بە مەلائیکەکەی فەرموو: (ئەوە چییە؟) فەرمووی: ئەوە ئەو (کَوْثَر)ەیە کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە تۆ.

٤٧٤٩ - (صحيح) عن عبد السلام بن أبو حازم أبو طالوت قال: شَهِدْتُ أَبَا بَرْزَةَ دَخَلَ عَلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ زِيَادٍ فَحَدَّثَنِى فُلاَنٌ - باسمه سَمَّاهُ مُسْلِمٌ - وَكَانَ فِى السِّمَاطِ, فَلَمَّا رَآهُ عُبَيْدُ اللَّهِ قَالَ: إِنَّ مُحَمَّدِيَّكُمْ هَذَا الدَّحْدَاحُ, فَفَهِمَهَا الشَّيْخُ, فَقَالَ: مَا كُنْتُ أَحْسِبُ أَنِّى أَبْقَى فِى قَوْمٍ يُعَيِّرُونِى بِصُحْبَةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ: إِنَّ صُحْبَةَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَكَ زَيْنٌ غَيْرُ شَيْنٍ, ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا بُعِثْتُ إِلَيْكَ لأَسْأَلَكَ عَنِ الْحَوْضِ, سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ فِيهِ شَيْئًا؟ فَقَالَ أَبُو بَرْزَةَ: نَعَمْ لاَ مَرَّةً وَلاَ ثِنْتَيْنِ وَلاَ ثَلاَثًا وَلاَ أَرْبَعًا وَلاَ خَمْسًا, فَمَنْ كَذَّبَ بِهِ فَلاَ سَقَاهُ اللَّهُ مِنْهُ, ثُمَّ خَرَجَ مُغْضَبًا.

واتە: لە (عبد السلام)ی کوڕی ئەبو حازیم (أبو طالوت)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو (بَرْزَة)م بینی چووە لای (عبيد الله)ی کوڕی زیاد - لەوکاتەدا (عبيد الله) ئەمیری کوفە بوو لەلایەن یەزیدی کوڕی موعایەوە -، فڵان کەس بۆی گێڕامەوە - ناوی کەسەکەی برد، موسلیمی کوڕی ئیبراهیم شێخی ئەبو داود ناوی کەسەکەی برد - ئەو فڵان کەسە لەناو ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا بوو کە لەدەوری (عبيد الله) بوون، وتی: کاتێ کە (عبيد الله) ئەبو (بَرْزَة)ی

بینی وتی: ئەم هاوەڵەی موحەممەدتان کورت و قەڵەو و گۆشتنە، ئەبو (بَرْزَة) تێگەیشت وتی: پێم وانەبوو لەناو گەلێکدا بمێنمەوە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بە عەیبەو خراپە بۆ حساب بکەن، (عبید الله) پێی وت: هاوەڵێتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ تۆ خێرەو شەڕ و خراپە نیە. لەپاشدا وتی: بۆ ئەوە ناردومە بەدواتا تا دەربارەی حەوز پرسیارت لێ بکەم، کە ئایا هیچ شتێکت گوێ لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کە دەربارەی فەرموویێتی؟ ئەبو (بَرْزَة) وتی: بەڵێ نە جارێ نە دوو جار نە سێ جار نە چوار جار نە پێنج جار بەڵکو زیاتریش بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو بوونی ئەو حەوزەی سەلماند، ئەوەی ئەو حەوزە بەدرۆ بزانێ خوای گەورە لە ئاوی ئەو حەوزەی نەداتێ و لێی نەخواتەوە، ئینجا بە توڕەییەوە هاتەدەرەوە.

## سەبارەت بە کاروباری گۆڕ و سزاو نەهامەتیەکانی.

## ٢٧ - باب فِي الْمَسْأَلَةِ فِي الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ.

٤٧٥٠ - عن البراء بن عازب: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ فَشَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ موسوڵمان لەگۆڕدا پرسیاری لێ دەکرێت شایەتومان دێنێ و دەڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، ئەوە دەق ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت:

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾. سورة ابراهيم: ٢٧.

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو لەقووڵایی دڵیاندا جێگیر بووە، ئەوە خوا لەسەر ئەو ئیمان و وتە راستەیان لەژیانی دنیاو قیامەتدا سەقامگیرو دامەزراویان دەکات، ستەمکارانیش گومڕا دەکات، خودا هەرچی بوێت دەیکات.

٤٧٥١ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ نَخْلاً لِبَنِي النَّجَّارِ, فَسَمِعَ صَوْتًا فَفَزِعَ! فَقَالَ: (مَنْ أَصْحَابُ هَذِهِ الْقُبُورِ؟). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَاسٌ مَاتُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ. فَقَالَ: (تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ وَمِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ). قَالُوا: وَمِمَّ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ أَتَاهُ مَلَكٌ فَيَقُولُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَعْبُدُ؟ فَإِنِ اللَّهُ هَدَاهُ قَالَ: كُنْتُ أَعْبُدُ اللَّهَ, فَيُقَالُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: هُوَ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ, فَمَا يُسْأَلُ عَنْ شَيْءٍ غَيْرَهَا, فَيُنْطَلَقُ بِهِ إِلَى بَيْتٍ كَانَ لَهُ فِي النَّارِ فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا بَيْتُكَ كَانَ لَكَ فِي النَّارِ, وَلَكِنَّ اللَّهَ عَصَمَكَ وَرَحِمَكَ فَأَبْدَلَكَ بِهِ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ, فَيَقُولُ: دَعُونِي حَتَّى أَذْهَبَ فَأُبَشِّرَ أَهْلِي. فَيُقَالُ لَهُ: اسْكُنْ. وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ أَتَاهُ مَلَكٌ فَيَنْتَهِرُهُ فَيَقُولُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَعْبُدُ؟ فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي. فَيُقَالُ لَهُ: لاَ دَرَيْتَ وَلاَ تَلَيْتَ. فَيُقَالُ لَهُ: فَمَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ فَيَقُولُ: كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ. فَيَضْرِبُهُ بِمِطْرَاقٍ مِنْ حَدِيدٍ بَيْنَ أُذُنَيْهِ فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا الْخَلْقُ غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە ناو دارخورماکانی بەنی نەجار، دەنگێکی بیست، ترسا، فەرموی: (خاوەنانی ئەم گۆڕانە کێن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوانە خەڵکانێکن لەسەردەمی نەفامی دا مردوون، فەرمووی: (پەنابگرن بە خوای گەورە لە سزاو ئازاری ئاگر، وە لەئاژاوەو فیتنەی دەجالی درۆزن) وتیان: لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (باوەڕدار کاتێ کە دەخرێتە گۆڕەوەو دایدەنێن مەلائیکەیە دێتە لای و پێی دەڵێ: تۆ لەژیانی دونیادا چیت دەپەرست؟ خوای گەورە رێنموویی دەکات و

دەڵێ: خوای گەورەم دەپەرست، پێی دەڵێ: دەربارەی ئەو پیاوە - واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - چیت دەوت؟ دەڵێ: بەندەو پێغەمبەری خوایە، ئیتر پرسیاری هیچی تری لێ ناکرێت، جا دەبرێت بۆماڵێك لە ئاگری دۆزەخ پێی دەوترێت: ئەوە ماڵی تۆ بوو لە دۆزەخدا، بەڵام خوای گەورە پاراستیتی و سۆزو میهرەبانی نواند بەرامبەرت ئەو ماڵەی بۆ گۆڕیت بەماڵێك لەبەهەشتدا، دەڵێت: وازم لێ بهێنن تاکو بڕۆم موژدە بدەم بە خانەوادەو کەسوکارەکەم، پێی دەوترێت: دامەزرێ بۆ خۆت و بمێنەرەوە، (کافر و بێ باوەڕ کاتێ کە دەخرێتە گۆڕەوەو دایدەنێن مەلائیکەیە دێتە لای تێی دەخوڕێت و پێی دەڵێ: تۆ لەژیانی دونیادا چیت دەپەرست؟ دەڵێ: نازانم، پێی دەوترێت: با هەر نەزانیت و هیچ نەڵێی - نەتزانی کامە هەق و راستیەو، قورئانیشت نەخوێندۆتەوە-، پێی دەوترێت: دەربارەی ئەو پیاوە - واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - چیت دەوت؟ دەڵێ: ئەو خەڵکە چیان دەوت منیش هەرئەوەم دەوت، چەکوشێکی ئاسن دەدات بە نێوان هەردوو گوێچکەی دا، هاوارێك دەکات هەموو بونەوەرێك دەیبیستێت جگە لە مرۆڤ و جنۆکە).

٤٧٥٢ - (صحيح) عن عبد الوهاب, بِمِثْلِ هَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ قَالَ: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ, فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيَقُولاَنِ لَهُ). فَذَكَرَ قَرِيبًا مِنْ حَدِيثِ الأَوَّلِ قَالَ فِيهِ: (وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُ فَيَقُولاَنِ لَهُ). زَادَ: (الْمُنَافِقُ). وَقَالَ: (يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ).

واتە: لە (عبد الوهاب)ەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، وتی: (کاتێ کە بەندە دەخرێتە گۆڕەوەو دایدەنێن هاوڕێکانی و ئەوانەی کە ناشتویانە بڵاوەی لێ دەکەن و دەگەڕێنەوە دەنگی پێڵاو و نەعلەکانیان دەبیستێت، دوو مەلائیکە دێنەلای پێی دەڵێن ...). جا راوی نزیك لە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوەو تێیدا وتی: (کافر و بێ باوەڕ و دووڕوو کاتێ کە دەخرێنە گۆڕەوە پێیان دەوترێت ...). راوی وشەی (دووڕووی) بۆ زیاد کردو، فەرمووی: (هەموو بونەوەرێك هاوارەکەیان دەیبیستێت جگە لە مرۆڤ و جنۆکە).

٤٧٥٣ - (صحيح) عن البراء بن عازب: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ, فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمَّا يُلْحَدْ, فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرُ, وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ فِي الأَرْضِ, فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ). مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا - زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ هَا هُنَا - وَقَالَ: (وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ حِينَ يُقَالُ لَهُ: يَا هَذَا مَنْ رَبُّكَ؟ وَمَا دِينُكَ؟ وَمَنْ نَبِيُّكَ؟). قَالَ هَنَّادٌ: قَالَ: (وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ. فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: دِينِي الإِسْلاَمُ. فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ قَالَ: فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَيَقُولاَنِ: وَمَا يُدْرِيكَ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ). زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ: (فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا)). الآيَةَ. ثُمَّ اتَّفَقَا قَالَ: (فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ قَدْ صَدَقَ عَبْدِي, فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ, وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى الْجَنَّةِ, وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ). قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا). قَالَ: (وَيُفْتَحُ لَهُ فِيهَا مَدَّ بَصَرِهِ). قَالَ: (وَإِنَّ الْكَافِرَ). فَذَكَرَ مَوْتَهُ, قَالَ: (وَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ, وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِي. فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِي. فَيَقُولاَنِ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِي. فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ كَذَبَ, فَأَفْرِشُوهُ مِنَ النَّارِ, وَأَلْبِسُوهُ مِنَ النَّارِ, وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى النَّارِ). قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا). قَالَ: (وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلاَعُهُ). زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ قَالَ: (ثُمَّ يُقَيَّضُ لَهُ أَعْمَى أَبْكَمُ مَعَهُ مِرْزَبَّةٌ مِنْ حَدِيدٍ لَوْ ضُرِبَ بِهَا جَبَلٌ لَصَارَ تُرَابًا). قَالَ: (فَيَضْرِبُهُ بِهَا ضَرْبَةً يَسْمَعُهَا مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ فَيَصِيرُ تُرَابًا). قَالَ: (ثُمَّ تُعَادُ فِيهِ الرُّوحُ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی اللە علیە وسلم لەگەڵ جەنازەی پاوێکی ئەنصاریدا دەرچوین بۆ

گۆڕستان بۆ ناشتنی، كاتێ كە گەیشتین گۆڕەكە بەتەواوەتی هەڵنەكەنرا بوو.
جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشت و ئێمەش لەدەوری دانیشتین ئەوەندە بێ دەنگ بووین وەك باڵندە بەسەر سەرمانەوە بێ بەو شێوەیە، دارێكی بەدەستەوەبوو بەهێواشی دەیخشاند لەزەوی وەك ئەوەی بیر لەشتێكی گرنگ بكاتەوە، سەری بەرزكردەوەو دوو جار یان سێ جار فەرمووی: (پەنابگرن بە خوای گەورە لە سزاو ئازاری گۆڕ)، لە فەرموودەكەی جەریردا لێرەدا ئەمەی بۆ زیاد كرد، فەرمووی: (كاتێ كە خەڵكەكە بڵاوەیان لێ كردو گەڕانەوە مردووەكە دەنگی پێڵاو و نەعلەكانیان دەبیستێت، لەوكاتەدا پێی دەوترێت: ئەی ئەوە، پەروەردگاری تۆ كێ یە؟ دینی تۆ چی یە؟ پێغەمبەری تۆ كێ یە؟)، هەناد وتی: فەرمووی: (دوو مەلائیكە دێنە لای دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگاری تۆ كێ یە؟ دەڵێ: (الله) پەروەردگارمە، پێی دەڵێن: دینی تۆ چی یە؟ دەڵێ: دینی من ئیسلامە، ئەو پیاوە چ كارە بوو لەناوتاندا رەوانەكرابوو؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، پێی دەڵێن: چۆن دەزانی؟ دەڵێ: قورئانم خوێندەوەو باوەڕم پێی هێناو بەڕاستم زانی). لە فەرموودەكەی جەریردا ئەمەی بۆ زیاد كرا: ئەوە دەق ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە كە دەفەرموێت:

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾. سورة ابراهیم: ٢٧.
واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو لەقووڵایی دڵیاندا جێگیر بووە، ئەوە خوا لەسەر ئەو ئیمان و وتە راستەیان لەژیانی دنیاو قیامەتدا سەقامگیرو دامەزراویان دەكات، ستەمكارانیش گومڕا دەكات، خودا هەرچی بوێت دەیكات.

لەپاشدا هەردوو راوی رێك و یەكدەنگن، فەرمووی: (جاڕچیە لەئاسمان جاڕ دەدات و دەڵێت: بەڕاستی بەندەكەم راست دەكات، لە راخەری بەهەشتی بۆ راخەن، پۆشاك و جل و بەرگی بەهەشتی لەبەركەن، دەرگایەكی بۆ بكەنەوە رووەو بەهەشت). فەرمووی: (با بۆن و بەرامەی خۆش و نەسیمی بەهەشتی بۆ بێت). فەرمووی: (هەتا چاوبڕ بكات گۆڕەكەی بۆ فراوان بكەن). فەرمووی:

(ئەمما کافر و بێ باوەڕ) باسی حاڵی مردنەکەی کرد، فەرمووی: (روحەکەی دەکرێتەوە بە بەریاو دەگەڕێتەوە بۆ جەستەی، دوو مەلائیکە دێنە لای دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگاری تۆ کێ یە؟ دەڵێ: ها ها نازانم، پێی دەڵێن: دینی تۆ چی یە؟ دەڵێ: ها ها نازانم، پێی دەڵێن: ئەو پیاوە چ کارە بوو لەناوتاندا رەوانەکرابوو؟ دەڵێ: ها ها نازانم، جا جارچیە لەئاسمان جاڕ دەدات و دەڵێت: بەڕاستی بەندەکەم راست دەکات، لە راخەری دۆزەخی بۆ راخەن، پۆشاك و جل و بەرگی دۆزەخی لەبەرکەن، دەرگایەکی بۆ بکەنەوە روەو دۆزەخ). فەرمووی: (با گڕەو گەرمای دۆزەخی بۆ بێت). فەرمووی: (گۆڕەکەی لێ تەنگ بێ هەتا پەراسوەکانی دەچن بەناو یەکدا). لە فەرموودەکەی جەریردا ئەمەی بۆ زیاد کرد، فەرمووی: (جا کەڕ و کوێر رادەسپێرن چەکوشێکی ئاسنی پێ یە ئەگەر بیدات لە کێو دەیکات بە خاك و خۆڵ)، فەرمووی: (کە لێی دەدات نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا گوێیان لێی دەبێ و دەیبستن جگە لە ئادەمیزاد جنۆکە، دەیکات بە خاك و خۆڵ، فەرمووی: ئینجا روح دەکرێتەوە بە بەریا).

٤٧٥٤ - عن أبة عمر زاذان, قال: سمعت البراء, عن النبي صلى الله عليه وسلم, فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

## باسی تەرازووی کێشانەی کردەوەکان.

## ٢٨ - باب فِي ذِكْرِ الْمِيزَانِ.

٤٧٥٥ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّهَا ذَكَرَتِ النَّارَ فَبَكَتْ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا يُبْكِيكِ؟). قَالَتْ: ذَكَرْتُ النَّارَ فَبَكَيْتُ, فَهَلْ تَذْكُرُونَ أَهْلِيكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا فِي ثَلاَثَةِ مَوَاطِنَ فَلاَ يَذْكُرُ أَحَدٌ أَحَدًا: عِنْدَ الْمِيزَانِ حَتَّى يَعْلَمَ أَيَخِفُّ مِيزَانُهُ أَوْ يَثْقُلُ, وَعِنْدَ الْكِتَابِ حِينَ يُقَالُ: (هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ) حَتَّى يَعْلَمَ أَيْنَ يَقَعُ كِتَابُهُ: أَفِي يَمِينِهِ, أَمْ فِي شِمَالِهِ, أَمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ, وَعِنْدَ الصِّرَاطِ إِذَا وُضِعَ بَيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ).

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ جارێ بیر لە ئاگری دۆزەخ دەکاتەوەو دەست دەکات بە گریان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت: (ئەوە بۆچی دەگریت؟). دەڵێ: بیرم لە ئاگری دۆزەخ کردەوەو گریام، ئایا ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بیری کەسوکاری خۆتان دەبێ؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەم سێ جێگەدا کەس بیری کەسی نیە: لەکاتی تەرازووی کێشانەی کردەوەکاندا تا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە کێشەکەی سوکە یان قورسە، لەکاتی وەرگرتنی نامەی کردەوەکاندا، لەوکاتەدا کە موسوڵمان نامەی کردەوەکانی بە دەستی ڕاست وەردەگرێ و لە خۆشی و شادیدا دەڵێ: (هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ). لەپێش وەرگرتنی ئەو نامەیەدا کەس بیری کەسی نیە هەتا بۆی دەردەکەوێت کە بەدەستی ڕاستی یان بەدەستی چەپی یا لە پشتیەوە نامەکە دەدەنە دەستی).

## باسی دەججال.

## ٢٩ - باب فِي الدَّجَّالِ.

٤٧٥٦ - (ضعيف) عن أبو عبيدة بن الجراح قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ بَعْدَ نُوحٍ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ الدَّجَّالَ قَوْمَهُ, وَإِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ). فَوَصَفَهُ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (لَعَلَّهُ سَيُدْرِكُهُ مَنْ قَدْ رَآنِي وَسَمِعَ كَلاَمِي). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, كَيْفَ قُلُوبُنَا يَوْمَئِذٍ؟ أَمِثْلُهَا الْيَوْمَ؟ قَالَ: (أَوْ خَيْرٌ).

واتە: لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەدوای نوح سەرجەم پێغەمبەران گەلەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەججال، منیش ئێوەی لێ ئاگادار دەکەمەوەو دەتانترسێنم). جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەسفی دەججالی بۆ کردین و فەرمووی: (لەوانەیە هەندێ کەس کە من دەبینن یان قسەکانی من دەبیستن لەئایندەدا بگەن بە دەججال)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا دڵەکانمان چۆن دەبێ؟ وەك ئەمڕۆ دامەزراو دەبێ؟ فەرمووی: (ئومێد دەکەم لە ئێستا گەلێ باشتر بێ).

٤٧٥٧ - (صحيح) عن سالم عن أبيه قال: قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ فَذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: (إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ, وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ, لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ, وَلَكِنِّي سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: إِنَّهُ أَعْوَرُ, وَإِنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ).

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله

علیه وسلم هەستایەوە وتارێکی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە، سوپاسێ کە شایستەی خودا بێ کردی، باسی دەججالی کردو فەرمووی: (من هۆشیارتان دەکەمەوە. سەرجەم پێغەمبەران گەلەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەججال، نوح گەلەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەججال، بەڵام من قسەیەکتان لەبارەیەوە بۆ دەکەم هیچ پێغەمبەرێ ئەم قسەیەی بۆ گەلەکەی خۆی نەکردوە. ئەوەیە کە دەججال چاوێکی کوێرە، خوای گەورە بەو شێوەیە نیە).

## سەبارەت بە دژایەتی کردنی خەواریجەکان.

## ٣٠ - باب فِي قَتْلِ الْخَوَارِجِ.

٤٧٥٨ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلاَمِ مِنْ عُنُقِهِ).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە ئەندازەی بستێ لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیابێتەوە ئەوە (رەشمە)پەیمانی ئیسلامی لە گەردنی خۆی داکەندوە).

٤٧٥٩ - (ضعيف) عن أبو ذر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كَيْفَ أَنْتُمْ وَأَئِمَّةٌ مِنْ بَعْدِى يَسْتَأْثِرُونَ بِهَذَا الْفَىْءِ؟!). قُلْتُ: إِذًا وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ أَضَعُ سَيْفِى عَلَى عَاتِقِى ثُمَّ أَضْرِبُ بِهِ حَتَّى أَلْقَاكَ أَوْ أَلْحَقَكَ. قَالَ: (أَوَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ تَصْبِرُ حَتَّى تَلْقَانِى).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دەبێ ئێوە هەڵوێست و حاڵتان چۆن بێ لەدوای من هەندێ کاربەدەست و پێشەوا پەیدا دەبن ماڵی دەستکەوتی جەنگی و گەنجینەی

موسوڵمانان دەبەن بۆ خۆیان و بەشی ئەوانەی لێ نادەن کە شایستەی ئەوەن بەشیان پێ بدرێت؟). وتم: سوێند بە (الله) کە بە هەق تۆی رەوانەکردوە شمشێرەکەم دەخەمە سەرشانم و لەسەر ئەو ماڵە دەجەنگم هەتا دەکوژرێم و دەگەمەوە بە تۆ؟ فەرمووی: (با رێگەیەکت پێ نیشان بدەم لەوە باشتر بێ کە تۆ دەیلێیت دان بەخۆتدا بگرە و ئارم بە هەتا دەگەیتەوە بە خۆم).

٤٧٦٠ - (صحيح) عن أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (سَتَكُونُ عَلَيْكُمْ أَئِمَّةٌ تَعْرِفُونَ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُونَ, فَمَنْ أَنْكَرَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ هِشَامٌ: (بِلِسَانِهِ فَقَدْ بَرِئَ, وَمَنْ كَرِهَ بِقَلْبِهِ فَقَدْ سَلِمَ, وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ). فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَقْتُلُهُمْ؟ قَالَ ابْنُ دَاوُدَ: (أَفَلاَ نُقَاتِلُهُمْ). قَالَ: (لاَ مَا صَلَّوْا).

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ژنی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەدوای من هەندێ کاربەدەست و پێشەوا پەیدا دەبن کاری چاك دەکەن و کاری خراپیش دەکەن، ئەوەی بەرهەڵستی کارە خراپەکانیان بکات) ئەبو داود دەڵێت: هیشام دەڵێت: (بە زمانی ئەوە بەرییە لەتاوان، ئەو کەسەی بە دڵ پێی ناخۆش بێ و بەشداریان نەکات ئەوە سەلامەتە، ئەو کەسەی رازی بێ و شوێنیان بکەوێ ئەوە تاوانبارەو شەریکی ئەوانە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جەنگیان لەدژ نەکەین؟ فەرمووی: نا مادەم نوێژ دەکەن نەجەنگن لەگەڵیان).

٤٧٦١ - (صحيح) عن أم سلمة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بمعناه, قال: (فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ). قَالَ قَتَادَةُ: يَعْنِي مَنْ أَنْكَرَ بِقَلْبِهِ وَمَنْ كَرِهَ بِقَلْبِهِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرمودەی پێشو بەهەمان مانا هاتووە، کە وتویەتی: فەرمووی: (ئەو کەسەی بە دڵ پێی

ناخۆش بێ ئەوە بەرییە لە تاوانەکانیان، ئەو کەسەی ئینکاریان بکات ئەوە سەلامەتە). قەتادە دەڵی: واتە بەدڵ ئینکاری بکات و بەدڵ پێی ناخۆش بێ.

٤٧٦٢ - (صحيح) عن عرفجة قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (سَتَكُونُ فِي أُمَّتِى هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ وَهَنَاتٌ, فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ وَهُمْ جَمِيعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ كَائِنًا مَنْ كَانَ).

واتە: لە عەرفەجەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەم ئوممەتەی مندا فیتنەو ئاژاوەو خراپەکاری پەیدا دەبێت، ئەگەر موسوڵمانان کۆ بوون و قسەیان یەك بوو هەرکەس بیەوێ جیایان بکاتەوە بە شمشێر لێی بدەن هەرکەسێ بێ و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێ).

٤٧٦٣ - (صحيح) عن عبيدة: أَنَّ عَلِيًّا ذَكَرَ أَهْلَ النَّهْرَوَانِ, فَقَالَ: فِيهِمْ رَجُلٌ مُودَنُ الْيَدِ أَوْ مُخْدَجُ الْيَدِ أَوْ مَثْدُونُ الْيَدِ لَوْلاَ أَنْ تَبْطَرُوا لَنَبَّأْتُكُمْ مَا وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ يَقْتُلُونَهُمْ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ: قُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْهُ؟ قَالَ: إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ.

واتە: لە (عبیدة)وە دەگێرنەوە، کە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ باسی خەڵکی نەهرەوانی کرد وتی: پیاوێکیان لەناودایە دەستی بچوك و نوقسانە وەك گۆی مەمك وایە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە سەرسام بن بە خۆتان و توشی عوجب ببن و زیادەڕەوی بکەن لە کوشتنیان و کەسیان نەهێڵن ئەوا لەسەر زمانی موحەممەد صلی الله علیه وسلم بەڵێنی ئەو خێر و پاداشتەم پێ رادەگەیاندن کە دەستان دەکەوێت لەلایەن خوای گەورەوە بەرامبەر بەو جەنگەی کە دەیکەن لەدژیان، کە داویەتی (عبیدة) وتی: وتم: تۆ خۆت ئەمەت لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیستووە؟ وتی: بەڵێ بە پەروەردگاری کەعبە.

٤٧٦٤ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري قال: بَعَثَ عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذُهَيْبَةٍ فِي تُرْبَتِهَا, فَقَسَّمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةٍ: بَيْنَ الأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الْحَنْظَلِيِّ, ثُمَّ الْمُجَاشِعِيِّ, وَبَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ الْفَزَارِيِّ, وَبَيْنَ زَيْدِ الْخَيْلِ الطَّائِيِّ, ثُمَّ أَحَدِ بَنِي نَبْهَانَ, وَبَيْنَ عَلْقَمَةَ بْنِ عُلاَثَةَ الْعَامِرِيِّ, ثُمَّ أَحَدِ بَنِي كِلاَبٍ, قَالَ: فَغَضِبَتْ قُرَيْشٌ وَالأَنْصَارُ وَقَالَتْ: يُعْطِي صَنَادِيدَ أَهْلِ نَجْدٍ وَيَدَعُنَا. فَقَالَ: (إِنَّمَا أَتَأَلَّفُهُمْ). قَالَ: فَأَقْبَلَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ, مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ, نَاتِئُ الْجَبِينِ, كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقٌ, قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ يَا مُحَمَّدُ. فَقَالَ: (مَنْ يُطِعِ اللَّهَ إِذَا عَصَيْتُهُ؟ أَيَأْمَنُنِي اللَّهُ عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ وَلاَ تَأْمَنُونِي؟!). قَالَ: فَسَأَلَ رَجُلٌ قَتْلَهُ - أَحْسِبُهُ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ - قَالَ: فَمَنَعَهُ. قَالَ: فَلَمَّا وَلَّى, قَالَ: (إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا أَوْ فِي عَقِبِ هَذَا قَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ, يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ, يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ, وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ, لَئِنْ أَنَا أَدْرَكْتُهُمْ قَتَلْتُهُمْ قَتْلَ عَادٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ پارچەیە ئاڵتونی خۆڵاوی پوختە نەکراوی نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش دابەشی کرد بەسەر ئەم چوار کەسەدا: ئەقرەعی کوڕی حابسی (حنظلي) لەپاشدا موجاشیعی، عویەیینەی کوڕی بەدری فەزاری، زیدی (خیل الطائي)، حنظلي) لەپاشدا یەکێ لە بەنی نەبهان، عەلقەمەی کوڕی (علاثة) عامری، لەپاشدا یەکێ لە بەنی کیلاب، وتی: قورەیش و ئەنصارەکان توڕەبوون وتیان: بەشی گەورە گەورەکانی نەجد دەدات، کەچی بەشی ئێمە نادات، فەرمووی: (بۆ ئەوەی دڵیان هۆگری ئیسلام بکەم)، وتی: پیاوێکی چاو بەقوڵاچوی، سەرکوڵم دەرپەڕیوی، ناوچاوان قۆقزی، ریش پڕی سەرتاشراو، وتی: ئەی موحەممەد لەخوا بترسە! ناهەقی مەکە، لە دابەشکردندا، فەرمووی: ئەگەر من بەگوێی خوا نەکەم ئەی کێ بەگوێی دەکات؟ من خوای گەورە کردومی بە ئەمیندار لەسەر دانیشتوانی سەر زەوی، کەچی ئێوە متمانەم پێ ناکەن؟ وتی: یەکێ داوای کرد ڕێگەی پێ بدات

هەتا بیکوژێت، ڕێگەی نەدا، کاتێ کە ڕۆشت، فەرمووی: لە نەوەی ئەمە وەچەیە دەکەونەوە قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەرویان ناچێتەخوارەوە، ئەوەی سەر بە ئیسلامە دەیکوژن ئەوەی بت پەرستە وازی لێ دەهێنن، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێ و لێی دەرپەڕێ ئەوانیش ئاوا لە دین دەردەچن، ئەگەر من فریایان بکەوم دەیانکوژم و لەناویان دەبەم وەك چۆن خوای گەورە هۆزی عادی لەناوبرد.

٤٧٦٥ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري وأنس بن مالك: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي اخْتِلاَفٌ وَفُرْقَةٌ, قَوْمٌ يُحْسِنُونَ الْقِيلَ, وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ, وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ, يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ لاَ يَرْجِعُونَ حَتَّى يَرْتَدَّ عَلَى فُوقِهِ, هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ, طُوبَى لِمَنْ قَتَلَهُمْ وَقَتَلُوهُ, يَدْعُونَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ وَلَيْسُوا مِنْهُ فِي شَيْءٍ, مَنْ قَاتَلَهُمْ كَانَ أَوْلَى بِاللَّهِ مِنْهُمْ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا سِيمَاهُمْ؟ قَالَ: (التَّحْلِيقُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری و ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەناو ئوممەتەی مندا دووبەرەکی و ناکۆکی ڕوودەدات کۆمەڵێ پەیدا دەبن قسەی جوان دەکەن و کردەوەی خراپ، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەرویان تێپەڕ ناکات، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێ و لێی دەرپەڕێ ئەوانیش ئاوا لە دین دەردەچن، ناگەڕێنەوە بۆ دین هەتا ئەو تیرە نەگەڕێتەوە ئەو شوێنەی کە لێی دەردەچێت ئەوەش شتێکی مەحاڵەو هەرگیز ناگونجێ، ئەوانە بەدترین و خراپترین دروستکراوانی خوای گەورەن لەناو خەڵك و ئاژەڵان دا، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانکوژێ یان ئەوان ئەو دەکوژن، خەڵك بانگ دەکەن بۆ لای قورئان کەچی فریان بە قورئانەوە نیەو پەیڕەوی ناکەن، هەرکەس لەئوممەتی من جەنگیان لەگەڵ بکات ئەوە ئەو لەپێشترە لەلای خوا هەتا ئەوانەی کە لەگەڵیان ناجەنگن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نیشانەیان چی یە؟ فەرمووی: (سەریان دەتاشن).

٤٧٦٦ - (صحيح) عن أنس, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم, نحوه, قال: (سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ وَالتَّسْبِيدُ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَأَنِيمُوهُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: التَّسْبِيدُ اسْتِئْصَالُ الشَّعْرِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە هەمان شێوە فەرموویەتی: (نیشانەیان ئەوەیە سەریان دەتاشن و مووی جەستەیان هەڵدەكەنن و لەبن دەری دەهێنن ئەگەر پێیان گەیشتن بیانكوژن). ئەبو داود دەڵێت: (التَّسْبِيد) واتە: مووی جەستەیان هەڵدەكەنن و لەبن دەری دەهێنن.

٤٧٦٧ - (صحيح) عن سويد بن غفلة قال: قال علي رضي الله عنه: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا فَلأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَكْذِبَ عَلَيْهِ وَإِذَا حَدَّثْتُكُمْ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ, فَإِنَّمَا الْحَرْبُ خُدْعَةٌ, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَأْتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ, سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ, يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ الْبَرِيَّةِ, يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ, لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ, فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ, فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە سوەیدی كوڕی غەفەلەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وتی: كە فەموودەیەكتان بۆ دەگێڕمەوە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئەگەر لە ئاسمانەوە بەربیمەوە پێم خۆشترە وەك لەوەی بە ناوی ئەوەوە درۆ بكەم، ئەگەر فەرمایشتێكم بۆ باسكردن لەنێوان خۆم و ئێوەدا ئەوە بەڕاستی جەنگ فێڵە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەكۆتایی زەماندا كۆمەڵێ پەیدا دەبن هەرزەو نەفام و كەم ئەقڵن، قسەی چاك دەكەن قورئان و فەرموودە باس دەكەن بۆ خەڵك، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێ و لێی دەربەڕێ ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن، ئیمان و باوەڕەكەیان لە گەرویان تێپەڕ ناكات، لەهەرشوێنێ پێیان گەیشتن بیانكوژن، بەڕاستی بۆ بكوژانی ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا خێر و پاداشت هەیە).

٤٧٦٨ - (صحيح) عن زيد بن وهب الجهني: أَنَّهُ كَانَ فِي الْجَيْشِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَ عَلِيٍّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ الَّذِينَ سَارُوا إِلَى الْخَوَارِجِ, فَقَالَ عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّتِي يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَيْسَتْ قِرَاءَتُكُمْ إِلَى قِرَاءَتِهِمْ شَيْئًا, وَلاَ صَلاَتُكُمْ إِلَى صَلاَتِهِمْ شَيْئًا, وَلاَ صِيَامُكُمْ إِلَى صِيَامِهِمْ شَيْئًا, يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَحْسَبُونَ أَنَّهُ لَهُمْ وَهُوَ عَلَيْهِمْ, لاَ تُجَاوِزُ صَلاَتُهُمْ تَرَاقِيَهُمْ, يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ, لَوْ يَعْلَمُ الْجَيْشُ الَّذِينَ يُصِيبُونَهُمْ مَا قُضِيَ لَهُمْ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَنَكَلُوا عَلَى الْعَمَلِ, وَآيَةُ ذَلِكَ أَنَّ فِيهِمْ رَجُلاً لَهُ عَضُدٌ وَلَيْسَتْ لَهُ ذِرَاعٌ, عَلَى عَضُدِهِ مِثْلُ حَلَمَةِ الثَّدْيِ عَلَيْهِ شَعَرَاتٌ بِيضٌ). أَفَتَذْهَبُونَ إِلَى مُعَاوِيَةَ وَأَهْلِ الشَّامِ وَتَتْرُكُونَ هَؤُلاَءِ يَخْلُفُونَكُمْ فِي ذَرَارِيِّكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ؟! وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونُوا هَؤُلاَءِ الْقَوْمَ, فَإِنَّهُمْ قَدْ سَفَكُوا الدَّمَ الْحَرَامَ وَأَغَارُوا فِي سَرْحِ النَّاسِ, فَسِيرُوا عَلَى اسْمِ اللَّهِ. قَالَ سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ: فَنَزَّلَنِي زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ مَنْزِلاً مَنْزِلاً, حَتَّى مَرَّ بِنَا عَلَى قَنْطَرَةٍ, قَالَ: فَلَمَّا الْتَقَيْنَا وَعَلَى الْخَوَارِجِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ الرَّاسِبِيُّ فَقَالَ لَهُمْ: أَلْقُوا الرِّمَاحَ وَسُلُّوا السُّيُوفَ مِنْ جُفُونِهَا, فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يُنَاشِدُوكُمْ كَمَا نَاشَدُوكُمْ يَوْمَ حَرُورَاءَ, قَالَ: فَوَحَّشُوا بِرِمَاحِهِمْ وَاسْتَلُّوا السُّيُوفَ وَشَجَرَهُمُ النَّاسُ بِرِمَاحِهِمْ, قَالَ: وَقَتَلُوا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضِهِمْ . قَالَ: وَمَا أُصِيبَ مِنَ النَّاسِ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ رَجُلاَنِ, فَقَالَ عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: الْتَمِسُوا فِيهِمُ الْمُخْدَجَ فَلَمْ يَجِدُوا, قَالَ: فَقَامَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِنَفْسِهِ حَتَّى أَتَى نَاسًا قَدْ قُتِلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ, فَقَالَ: أَخْرِجُوهُمْ فَوَجَدُوهُ مِمَّا يَلِي الأَرْضَ, فَكَبَّرَ, وَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ, وَبَلَّغَ رَسُولُهُ. فَقَامَ إِلَيْهِ عَبِيدَةُ السَّلْمَانِيُّ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ, وَاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَقَدْ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: إِى وَاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ, حَتَّى اسْتَحْلَفَهُ ثَلاَثًا وَهُوَ يَحْلِفُ.

واتە: لە زەیدی کوڕی وەهەبی جوهەنییەوە دەگێڕنەوە، کە خۆی یەکێ بوو لەو لەشکرەی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ کە دەرچوون و چوون بۆسەر

خەواریجەکان، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (کۆمەڵێ لە ئوممەتم پەیدا دەبن بە شێوەیە قورئان خوێندن و نوێژ کردن و رۆژوو گرتنی ئێوە لەچاو هی ئەواندا هیچ نیە، قورئان دەخوێنن بە خەیاڵی خۆیان قورئان لەپشتیانە، کەچی قورئان لە دژیانە، نوێژەکانیان لە گەروویان تێپەڕ ناکات، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێ و لێی دەربەڕێ ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن، ئەو لەشکرەی کە جەنگیان لەگەڵ دەکەن ئەگەر بزانن خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیان صلی الله علیه وسلم چەندە خێر و پاداشتی بۆ داناون ئەوا پاڵیان لێ دەدایەوەو چیتر هەوڵی کردەوەی چاکیان نەدەدا تەنها ئەوەیان بەس بوو، نیشانەیان واتە هی خەواریجەکان ئەوەیە پیاوێکیان تێدایە قۆڵێکی کۆڵە هەتا ئانیشکێتی و بازووی نیە، وەك گۆی مەمك وا بەسەر قۆڵە کۆڵەکەیەوە، مووی سپی لەسەرە).

ئیتر چۆن ئەم خەواریجانە لەناو ماڵ و منداڵی خۆتاندا بەجێدەهێڵن وازیان لێ دەهێنن و دەچن بۆ سەر موعاویەو خەڵکی شام؟! سوێند بە (الله) بەش بە حاڵی خۆم ئومێد دەکەم ئەمانە ئەوانە بن - کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی پێ کردوون لە ئیسلام دەردەچن .. - ئەوەتا ئەوانە خوێنی نارەوا دەرێژن، ئاژەڵی خەڵك دەفرێنن، کەواتە بەناوی خواوەو بە بەرەکەتی خوا بکەونەرێ بۆ کوشتاریان.

سەلەمەی کوری کوهەیل وتی: جا زەیدی کوری وەهەب لەدوای وتارەکەی پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ قۆناغ بە قۆناغ باسی رۆیشتنی لەشکرەکەی کرد، جا کەوتینەرێ هەتا لە هەوارێ لاماندا، لەپاشدا لە پردی دەبەرجان پەرینەوە، کاتێ کە هەردوو لەشکرەکە بەرامبەر بەك راوەستان بۆ جەنگ، سەرکردەی خەواریجەکان (عبد الله)ی کوری وەهەبی (الراسبی) بوو، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ ئەم وتارەی بۆ لەشکرەکەی خۆی خوێندینەوەو پێی وتن: ئادەی رمەکانتان بهاوێژن و شمشێرەکانتان لە کالان دەرکێشن و بە شمشێری روتەوە پەلاماریان بدەن و لەناویان بەرن، چونکە دەترسم دیسانەوە وەك رۆژەکەی حەرەورا داواتان لێ بکەن لەبەر خاتری خوای گەورە لەگەڵیان رێك بکەون بەم بەهانەیە تەفرەتان بدەنەوە، وتی: ئیتر ئەوانیش تیربارانیان کردن و، بە شمشێریان

هەڵکێشاو بە رمەوە هەڵیان کوتایە سەریان و بووبە شەڕی دەستەو یەخە کەلاکیان بەسەر یەکدا خستن و هەموویان کوشتن و لەناویان بردن، وتی: لەو رۆژەدا لە لەشکرەکەی ئێمە تەنها دوو کەس بریندار بوون، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: ئادەی بگەڕێن بۆ پیاوە بێ باڵەکەی ناویان، ئەوانیش گەڕان نەیاندۆزیەوە، خۆی هەستا گەڕا بەدوایا سەیردەکات چەند کەلاکێ کەوتون بەسەر یەکدا، وتی: ئادەی ئەمانە جیا بکەنەوە کاتێ کە جیایان کردنەوە لەبنی بنەوە دۆزیانەوە، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ (الله اکبر)ی کردو وتی: فەرموودەی خوای گەورە هەق و راستەو، پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم رایگەیاندوە بە ئێمە. عەبیدەی سەلمانی هەستایەوە وتی: ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران، تو ئەو خوایەی کە هەر خۆی خودایە بەراستی تۆ خۆت ئەمەت بیست لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ وتی: بەڵێ بەو خوایەی کە هەر خۆی خودایە بەراستی، هەتا سێ جار بەو شێوەیە سوێندی دا، ئەویش سوێندی بۆ خوارد.

٤٧٦٩ - (صحيح الإسناد) عن أبو الوضيء قال: قال علي رضي الله عنه: اطْلُبُوا الْمُخْدَجَ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, فَاسْتَخْرَجُوهُ مِنْ تَحْتِ الْقَتْلَى فِي طِينٍ, قَالَ أَبُو الْوَضِيءِ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ: حَبَشِيٌّ عَلَيْهِ قُرَيْطَقٌ لَهُ إِحْدَى يَدَيْنِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ عَلَيْهَا شُعَيْرَاتٌ مِثْلُ شُعَيْرَاتِ الَّتِي تَكُونُ عَلَى ذَنَبِ الْيَرْبُوعِ.

واتە: لە ئەبو (الوضيء)ەوە دەگێرنەوە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: برۆن بگەڕێن بەدوای پیاوە قۆڵ نوقسانەکەدا، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، لەژێر کوژراوەکاندا دەریان هێنا لە قوڕدا، ئەبو (الوضيء) وتی: وەك ئەوەی کە ئێستا چاوم لێی بێ: جۆرە جل و بەرگێکی لەبەردا بوو قۆڵێکی کۆڵ بوو هەتا ئانیشکێتی و بازووی نەبوو وەك گۆی مەمك بەسەر قۆڵە کۆڵەکەیەوە موو هەبوو وەك ئەو مووەی کە بە کلکی (الْيَرْبُوعِ)ەوەیە کە گیاندارێکە لە دەشت و دەردا دەژی لە شێوەی جرجدایە.

٤٧٧٠ - (ضعيف الإسناد) عن أبو مريم قال: إِنْ كَانَ ذَلِكَ الْمُخْدَجَ لَمَعَنَا يَوْمَئِذٍ فِي الْمَسْجِدِ, نُجَالِسُهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ, وَكَانَ فَقِيرًا, وَرَأَيْتُهُ مَعَ الْمَسَاكِينِ يَشْهَدُ طَعَامَ عَلِيٍّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ مَعَ النَّاسِ, وَقَدْ كَسَوْتُهُ بُرْنُسًا لِي. قَالَ أَبُو مَرْيَمَ: وَكَانَ الْمُخْدَجُ يُسَمَّى نَافِعًا ذَا الثُّدَيَّةِ, وَكَانَ فِي يَدِهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ, عَلَى رَأْسِهِ حَلَمَةٌ مِثْلُ حَلَمَةِ الثَّدْيِ, عَلَيْهِ شُعَيْرَاتٌ مِثْلُ سِبَالَةِ السِّنَّوْرِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ عِنْدَ النَّاسِ اسْمُهُ حَرْقُوسُ.

واتە: لە ئەبو مەریەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر ئەو پیاوە قۆڵ نوقسانە لە مزگەوت لەگەڵمان بوایە شەو و ڕۆژ لەگەڵی دادەنیشتین، پیاوێکی هەژار بوو، لەگەڵ هەژاراندا دەمبینی، ئامادەی خوانی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەبوو لەگەڵ خەڵك و نانی دەخوارد، پۆشاکێکم هەبوو کڵاوی پێوە بوو کردمە بەری، ئەبو مەریەم وتی: قۆڵ نوقسانەکە نافیع ناوی خاوەن گۆی مەمکەکە، سەری قۆڵی وەك گۆی مەمکی پێوە بوو، بەسەر قۆڵە کۆڵەکەیەوە موو هەبوو وەك سمێڵی پشیلە. ئەبو داود دەڵێت: خەڵك پێیان دەوت: (حرقوس).

## سەبارەت بە کوشتنی ئەو کەسانەی کە دز و جەردەن.

## ٣٢ - باب فِي قِتَالِ اللُّصُوصِ.

٤٧٧١ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أُرِيدَ مَالُهُ بِغَيْرِ حَقٍّ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی ماڵ و سامانەکەی ببەن بە ناهەق با جەنگ بکات و نەیەڵێت ببەن ئەگەر کوژرا ئەوە شەهیدە).

٤٧٧٢ - (صحيح) عن سعيد بن زيد: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ, وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ أَوْ دُونَ دَمِهِ أَوْ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ).

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لەسەر سەر و ماڵ و سامان و دین و پاراستنی شەرەف و کەرامەتی کەسوکاری بکوژرێت ئەوە شەهیدە - یان پاداشتی شەهیدی بۆ هەیە - ).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی ئەدەب و ئاکاری جوان.

# ٤٢ – أول كتاب الأدب

## سەبارەت بە میهرەبانی و لەسەرخۆیی و لێبوردن و ئاکار و رەوشتی جوانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

## ١ - باب فِي الْحِلْمِ وَأَخْلاَقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٤٧٧٣ - (حسن) عن أنس قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا, فَأَرْسَلَنِي يَوْمًا لِحَاجَةٍ, فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ أَذْهَبُ. وَفِي نَفْسِي أَنْ أَذْهَبَ لِمَا أَمَرَنِي بِهِ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: فَخَرَجْتُ حَتَّى أَمُرَّ عَلَى صِبْيَانٍ وَهُمْ يَلْعَبُونَ فِي السُّوقِ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَابِضٌ بِقَفَاىَ مِنْ وَرَائِي فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَضْحَكُ, فَقَالَ: (يَا أُنَيْسُ اذْهَبْ حَيْثُ أَمَرْتُكَ). قُلْتُ: نَعَمْ أَنَا أَذْهَبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ أَنَسٌ: وَاللَّهِ لَقَدْ خَدَمْتُهُ سَبْعَ سِنِينَ أَوْ تِسْعَ سِنِينَ مَا عَلِمْتُ قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُ لِمَ فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا. وَلاَ لِشَيْءٍ تَرَكْتُ هَلاَّ فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەهەموو کەس ئاکار و رەوشتی جوانتر بوو، رۆژێ ناردمی بۆ کارێ، وتم: سوێند بە (الله) ناڕۆم، بەڵام لە دڵەوە نیازم هەبوو بڕۆم و فەرمانەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جێبەجێ بکەم، وتی: منیش دەرچووم رۆشتم هەتا

بەلای هەندێ منداڵدا تێپەڕیم لەبازاڕ یاریان دەکرد، چوومە ناویان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوامەوە پشتەملی گرتم، کە سەیرم کرد پێدەکەنی، فەرمووی: (ئەی ئونەیس بڕۆ ئەوەی فەرمانم پێکردی جێبەجێی بکە). وتم: بەڵێ، دەڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا چووم، ئەنەس وتی: سوێند بە (الله) حەوت یان نۆ ساڵ خزمەتم کردوە، لەبیرم نایە کە شتێکم کردبێ یان شتێکم نەکردبێ پێمی فەرموبێ بۆ ئەمەت واکردوە، بۆ ئەوەت وانەکردوە).

٤٧٧٤ - (صحيح) عن أنس قال: خَدَمْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشْرَ سِنِينَ بِالْمَدِينَةِ وَأَنَا غُلاَمٌ لَيْسَ كُلُّ أَمْرِي كَمَا يَشْتَهِي صَاحِبِي أَنْ أَكُونَ عَلَيْهِ مَا قَالَ لِي فِيهَا: أُفٍّ قَطُّ, وَمَا قَالَ لِي لِمَ فَعَلْتَ هَذَا, أَوْ أَلاَ فَعَلْتَ هَذَا.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: منداڵ بوو دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم کردووە لەمەدینە هەموو کارێکم بەدڵ ئەو نەکردووە بەڵام هەرگیز پێی نەفەرمووم: ئۆف لەدەستی تۆ، وە هەرگیز پێی نەفەرمووم: بۆ ئەو کارەت واکردوە، بۆ ئەو کارەت وانەکردوە).

٤٧٧٥ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْلِسُ مَعَنَا فِي الْمَجْلِسِ يُحَدِّثُنَا, فَإِذَا قَامَ قُمْنَا قِيَامًا حَتَّى نَرَاهُ قَدْ دَخَلَ بَعْضَ بُيُوتِ أَزْوَاجِهِ, فَحَدَّثَنَا يَوْمًا, فَقُمْنَا حِينَ قَامَ, فَنَظَرْنَا إِلَى أَعْرَابِيٍّ قَدْ أَدْرَكَهُ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ فَحَمَّرَ رَقَبَتَهُ, قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَكَانَ رِدَاءً خَشِنًا, فَالْتَفَتَ, فَقَالَ لَهُ الأَعْرَابِيُّ, احْمِلْ لِي عَلَى بَعِيرَيَّ هَذَيْنِ فَإِنَّكَ لاَ تَحْمِلُ لِي مِنْ مَالِكَ وَلاَ مِنْ مَالِ أَبِيكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ, لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ, لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ, لاَ أَحْمِلُ لَكَ حَتَّى تُقِيدَنِي مِنْ جَبْذَتِكَ الَّتِي جَبَذْتَنِي). فَكُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ لَهُ الأَعْرَابِيُّ: وَاللَّهِ لاَ أُقِيدُكَهَا. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, قَالَ: ثُمَّ دَعَا رَجُلاً فَقَالَ لَهُ: (احْمِلْ لَهُ عَلَى بَعِيرَيْهِ هَذَيْنِ: عَلَى بَعِيرٍ شَعِيرًا, وَعَلَى الآخَرِ تَمْرًا). ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا فَقَالَ: (انْصَرِفُوا عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ تَعَالَى).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوت لەناوماندا دادەنیشت و قسەی بۆ دەکردین، کاتێ کە هەڵئەسا ئێمەش هەڵەساین هەتا دەمانبینی خۆی دەکرد بە ماڵی یەکێ لە هاوسەرەکانیدا، جارێ قسەی بۆ دەکردین، لەکاتێکدا کە ئەو هەستا ئێمەش هەستاین، سەیرمان کرد عەرەبێکی دەشتەکی پێ گەیشت یەخەی توند گرت و جەڕاندی و رایکێشا بۆ خۆی ئەوەندە توند رایکێشا لاملی سورکردەوە، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پۆشاکەکەی زبر بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئاوڕی دایەوە سەیری کرد، کابراکە وتی: دەمەوێ ئەو دوو وشترەم بۆ باربکەی لە شمەك، خۆ لە ماڵ و سامانی خۆت یان لە ماڵی باوکت بۆم بارناکەی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ جار فەرمووی: (نا، (استغفر الله)، نا، (استغفر الله)، نا، (استغفر الله) داوای لێ بوردن لەخوای گەورە دەکەم ئەگەر ئەم کارە وا نەبێ، ئەو دوو وشترەت بۆ بارناکەم هەتا نەهێڵی تۆڵەی ئەم کێش کردنەت لێ بسێنم)، کابراش هەموو جارێ دەیوت: سوێند بە (الله) نایەڵم تۆڵەی ئەوەم لێ بکەیتەوە، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە. وتی: لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بانگ کرد پێی فەرموو: (برۆ بارێ جۆ و بارێ خورمای بۆ بار بکە). لەپاشدا لای کردەوە بەلای ئێمەدا فەرمووی: (ئادەی بە هیوای بەرەکەتی خوای گەورە بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە).

## سەبارەت بە ڕێز و شکۆداری و ویقار

## ٢ - باب فِي الْوَقَارِ.

٤٧٧٦ - (حسن) عن عبد الله بن عباس, أن نبي الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الْهَدْىَ الصَّالِحَ وَالسَّمْتَ الصَّالِحَ وَالاِقْتِصَادَ: جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕێ پێ نیشاندانی خەڵك بە جوانی و شکڵ و شێوەی جوان و ڕێکوپێك و میانەڕەوی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارداو بەردەوامبوون لەسەری: بەشێکن لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی). — واتە ئەمان خوای گەورە بەخشیونی بە پێغەمبەران ئێوەش شوێنیان بکەون و بیانکەنە پێشەنگی خۆتان -.

## باسی ئەو کەسەی ڕقی خۆی دەخواتەوەو خۆڕاگرە.

## ٣ - باب مَنْ كَظَمَ غَيْظًا.

٤٧٧٧ - (حسن) عن سهل بن معاذ عن أبيه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ دَعَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّهُ مِنَ الْحُورِ مَا شَاءَ).

واتە: لە سەهلی کوڕی موعازەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی:

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی بتوانێ رقی خۆی بە یەکێ بڕێژێ بەڵام لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە رقەکەی بخواتەوە، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار لەناو ئاپۆڕای خەڵدا بە بەرچاوی سەرجەم دروستکراوەکانیەوە بانگی دەکات و خۆی سەر پشك دەکات بە ئارەزووی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت هەڵیبژێرێت).

٤٧٧٨ - (ضعيف) عن سويد بن وهب, عن رجل من أبناء أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم نحوه، قال: (مَلأَهُ اللَّهُ أَمْنًا وَإِيمَانًا). لَمْ يَذْكُرْ قِصَّةَ (دَعَاهُ اللَّهُ). زَادَ (وَمَنْ تَرَكَ لُبْسَ ثَوْبِ جَمَالٍ وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ). قَالَ بِشْرٌ أَحْسِبُهُ قَالَ (تَوَاضُعًا كَسَاهُ اللَّهُ حُلَّةَ الْكَرَامَةِ, وَمَنْ زَوَّجَ لِلَّهِ تَعَالَى تَوَّجَهُ اللَّهُ تَاجَ الْمُلْكِ).

واتە: لە سوەیدی کوڕی وەهبەوە، لە پیاوێ لە نەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشو هاتوە، دەفەرموێت: ( - ئەو کەسەی رقی بخواتەوە لەکاتێکدا دەسەڵاتی هەبێ بیرێژێ ئەوە - خوای گەورە دڵی پڕ دەکات لە باوەڕ و ئاشتی و ئارامی). باسی بە سەرهاتەکەی نەکرد (خوای پەروەردگار لەناو ئاپۆڕای خەڵکداو بە بەرچاوی سەرجەم دروستکراوەکانیەوە بانگی دەکات) راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هەرکەس توانای لەبەرکردنی جلی ناویانگ و شۆرەت و جوان و کەشخەو گرانبەهای هەبێت بەڵام لەبەر بێ فیزی و بێ هەوایی لەبەری نەکات) بیشر وتی: وا ئەزانم راوی وتی: فەرمووی: (خوای گەورە جل و بەرگی رێز و کەرامەتی لەبەردەکات، وە هەرکەس لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە هاوسەرگیری بکات لەگەڵ موسوڵمانێکی خاوەن تەقوادا ئەوە خوای گەورە لە قیامەتدا پاداشتی دەداتەوەو تاجی پاشایەتی لەسەر دەکات) - واتە بە ئەندازی مەملەکەتی پاشەیە موڵکی لەبەهەشت دەداتێ - .

٤٧٧٩ - (صحيح) عن الحارث بن سويد عن عبد الله أنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ؟). قَالُوا الَّذِى لاَ يَصْرَعُهُ الرِّجَالُ. قَالَ: (لاَ وَلَكِنَّهُ الَّذِى يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ).

واتە: لە (حارث)ی کوڕی سوەیدی کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە کێ بە پاڵەوان و ئازا دەزانن؟) وتیان: ئەو کەسەی هیچ پیاوێ ناتوانێ پشتی بدات لەزەوی دەرەقەتی نەیەت، فەرمووی: (نا ئەو کەسە نیە، بەڵکو ئەو کەسەی پاڵەوان و ئازاو دلێرە کە لەکاتی هەڵچون و توڕیی دا رقی خۆی بخواتەوە).

## لەکاتی هەڵچون و توڕیی دا چی بوترێت باشە.

## ٤ - باب مَا يُقَالُ عِنْدَ الْغَضَبِ.

٤٧٨٠ - (ضعيف) عن معاذ بن جبل قال: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَغَضِبَ أَحَدُهُمَا غَضَبًا شَدِيدًا حَتَّى خُيِّلَ إِلَيَّ أَنَّ أَنْفَهُ يَتَمَزَّعُ مِنْ شِدَّةِ غَضَبِهِ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّى لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُهُ مِنَ الْغَضَبِ). فَقَالَ: مَا هِىَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). قَالَ: فَجَعَلَ مُعَاذٌ يَأْمُرُهُ, فَأَبَى وَمَحِكَ, وَجَعَلَ يَزْدَادُ غَضَبًا.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دوو پیاو بوو بە شەڕە جنێویان، یەکێکیان ئەوەندە توڕە بوو خەریك بوو لوتی شەق بەرێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من وشەیە دەزانم ئەگەر ئەو پیاوە بیڵێ رقەکەی دەنیشێتەوەو نامێنێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو وشە کامەیە؟

فەرمووی: بلّێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). واتە: خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانی رەجم كراو و دوور لە رەحمەتی خودا. راوی وتی: (معاذ) فەرمانی پێ دەكرد كە بیلّێ بەلاّم ئەو نەیدەویست بیلّێ و زیاتر تووڕە بوو.

٤٧٨١ - (صحيح) عن سليمان بن صرد قال: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا تَحْمَرُّ عَيْنَاهُ وَتَنْتَفِخُ أَوْدَاجُهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لأَعْرِفُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا هَذَا لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). فَقَالَ الرَّجُلُ: هَلْ تَرَى بِي مِنْ جُنُونٍ.

واتە: لە سولەیمانی كوڕی صورەدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دوو پیاو بوو بە شەڕە جنێویان، یەكێكیان چاوی سور بوو رەگی لاملی هەستا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من وشەیە دەزانم ئەگەر ئەو پیاوە بیلّێ رقەكەی دنیشێتەوەو نامێنێ ئەویش: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)ە. واتە: پەنادەگرم بە خوا لەشەیتانی رەجم كراو و دوور لە رەحمەتی خوا. پیاوەكە وتی: بۆ لەتۆ وایە منْ شێت بووم.

٤٧٨٢ - (صحيح) عن أبي ذر قال: إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال لنا: (إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ وَإِلاَّ فَلْيَضْطَجِعْ).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموویین: (ئەگەر یەكێكتان رقی هەڵساو توڕەبوو بەپێوە بوو با دانیشێت، ئەگەر رقەكەكەی نیشتەوە باشە ئەگینا با راكشێت).

٤٧٨٣ - صحيح بما قبله) عن بكر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ أَبَا ذَرٍّ, بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا أَصَحُّ الْحَدِيثَيْنِ.

واتە: لە بەکرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەبو (ذر)ی نارد بۆ کارێکی پێویست، جا راوی فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە.
ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە فەرموودەی پێشو صەحیح ترە.

٤٧٨٤ - (صحيح) عن أبو وائل القاص قال: دَخَلْنَا عَلَى عُرْوَةَ بْنِ مُحَمَّدٍ بْنِ السَّعْدِيِّ فَكَلَّمَهُ رَجُلٌ فَأَغْضَبَهُ, فَقَامَ فَتَوَضَّأَ, ثُمَّ رَجَعَ وَقَدْ تَوَضَّأَ, فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي, عَنْ جَدِّي عَطِيَّةَ, قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ, وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ, وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ, فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ).

واتە: لە ئەبو وائیلی ئەلقاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوین بۆ خزمەت موحەممەدی کوڕی سەعدی پیاوێ قسەی لەگەڵ کرد توڕەی کرد هەستا چوو دەسنوێژی گرت، لەپاشدا گەڕایەوە دەسنوێژی گرت، وتی: باوکم، لە باپیرم(عَطِيَّة)وە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەڵچون و تووڕەیی لە شەیتانەوەیەو، شەیتانیش لەئاگر دروستکراوەو، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، کاتێ کە یەکێکتان رقی هەستا با دەسنوێژ بگرێت).

٤٧٨٤ - (ضعيف) عن أبو وائل القاص قال: دَخَلْنَا عَلَى عُرْوَةَ بْنِ مُحَمَّدٍ بْنِ السَّعْدِيِّ فَكَلَّمَهُ رَجُلٌ فَأَغْضَبَهُ, فَقَامَ فَتَوَضَّأَ, ثُمَّ رَجَعَ وَقَدْ تَوَضَّأَ فَقَالَ حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ جَدِّي عَطِيَّةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ, وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ, وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ, فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ).

واتە: لە ئەبو وائیلی ئەلقاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوین بۆ لای موحەممەدی کوڕی سەعدی پیاوێ قسەی لەگەڵ دەکرد توڕەی کرد، عوروە

هەستا چوو دەسنوێژی گرت و هاتەوە وتی: باوکم لە باپیرمەوە(عطیة) بۆی گێڕامەوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەڵچون و تووڕەیی لە شەیتانەوەیەو، شەیتانیش لەئاگر دروستکراوەو، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، کاتێ کە یەکێکتان رقی هەستا با دەسنوێژ بگرێت).

## سەبارەت بە دەستگرتن بە کاری ئاسانەوە.

## ٥ - باب في التجاوز (في الأمر).

٤٧٨٥ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا, فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ, وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِنَفْسِهِ, إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ تَعَالَى فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ بِهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرکاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی بکرایەتە سەرپشك لەنێوان دوو کاردا ئیللا کامەیان ئاسانتر بوایە ئەوەیانی هەڵدەبژارد بە مەرجێ ئەو کارە گوناهو تاوان نەبوایە، بەڵام ئەگەر گوناهو تاوان بوایە لە هەموو کەس زیاتر لێی دوردەکەوتەوە، هەرگیز هەق و تۆڵەی لەکەس نەدەسەند بۆ نەفسی خۆی بەڵکو کەسەکەی دەبەخشی، مەگەر کەسێ کە قەدر و ڕێزی شەریعەتی خوای گەورەی بشکاندایە، ئەوە تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند.

٤٧٨٦ - (صحيح) عن عائشة قالت: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَادِمًا وَلاَ امْرَأَةً قَطُّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری

خوا صلى الله عليه وسلم هەرگیز نەیدەدا لە خزمەتکار و لە ئافرەت.

٤٧٨٧ - (صحيح) عن عبد الله يعني: ابن الزبير في قوله: (خُذِ الْعَفْوَ). قَالَ أُمِرَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْخُذَ الْعَفْوَ مِنْ أَخْلَاقِ النَّاسِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: (خُذِ الْعَفْو). واتە: هەموو کات بۆ جێبەجێکردنی کارەکانت ڕێگەی ئاسان بگرە بەر و، عەفوو لێبوردنیش با ڕەوشتت بێ.
(عبد الله) وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەلایەن خوای گەورەوە فەرمانی پێ کراوە بەرامبەر بە کاروکردەوەی خەڵك ئەگەر چاك بوو لێیان وەربگرێ، ئەگەر خراپیش بوو ڕێگەی ئاسان بگرێتە بەر و، لێبوردنیشی هەبێ.

## دەربارەی مامەڵە و هەڵسوکەوتی چاك بەرامبەر بە خەڵك.

## ٦ - باب فِي حُسْنِ الْعِشْرَةِ.

٤٧٨٨ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَلَغَهُ عَنِ الرَّجُلِ الشَّيْءُ لَمْ يَقُلْ: مَا بَالُ فُلَانٍ يَقُولُ؟ وَلَكِنْ يَقُولُ: (مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَقُولُونَ: كَذَا وَكَذَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم عادەتی وابوو ئەگەر شتێکی لەبارەی پیاوێکەوە پێ بگەیشتایەتەوە نەیدەفەرموو: ئەو پیاوە بۆ ئاواو ئاوا دەڵێ، بەڵکو دەیفەرموو: ئەوە بۆچی هەندێ کەس ئاواو ئاوا دەڵێن).

٤٧٨٩ - (ضعيف) عن أنس: أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ, وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَلَّمَا يُوَاجِهُ رَجُلاً فِي وَجْهِهِ بِشَيْءٍ يَكْرَهُهُ, فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ: (لَوْ أَمَرْتُمْ هَذَا أَنْ يَغْسِلَ ذَا عَنْهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَلْمٌ لَيْسَ هُوَ عَلَوِيًّا, كَانَ يُبْصِرُ فِي النُّجُومِ, وَشَهِدَ عِنْدَ عَدِيِّ بْنِ أَرْطَاةَ عَلَى رُؤْيَةِ الْهِلاَلِ فَلَمْ يُجِزْ شَهَادَتَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ چوەژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم زۆر کەم پێشوازی لە کەسێك دەکرد کە شتێ بە روخساریەوە بوایە پێی ناخۆش بوایە، کاتێ کە چوەدەرەوە فەرمووی: (فەرمانتان بکردایە بەم پیاوە بیشۆردایەو زەعفەرانەکەی لێ بکردایەتەوە).

٤٧٩٠ - (حسن) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْمُؤْمِنُ غِرٌّ كَرِيمٌ, وَالْفَاجِرُ خِبٌّ لَئِيمٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باوەڕدار دڵ ساف و سادەو بەڕێز و بەخشندەیە، خراپەکاریش ئاژاوەگێڕ و فێڵباز و خوێڕی و ناڕەسەنە).

٤٧٩١ - (صحيح) عن عائشة قالت: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ). أَوْ (بِئْسَ رَجُلُ الْعَشِيرَةِ). ثُمَّ قَالَ: (ائْذَنُوا لَهُ). فَلَمَّا دَخَلَ أَلاَنَ لَهُ الْقَوْلَ, فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ وَقَدْ قُلْتَ لَهُ مَا قُلْتَ؟ قَالَ: (إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ وَدَعَهُ - أَوْ تَرَكَهُ - النَّاسُ لاِتِّقَاءِ فُحْشِهِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ داوای

مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بچێتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ڕێگەی بدەن با بێتەژوورەوە بەڕاستی کابرایەکی خراپە لەناو قەومەکەیدا). کاتێ کە هاتەژوورەوە بۆ خزمەتی رووی خۆش بوو بەرامبەری، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، تۆ پێشتر قسەیەکی ئاوات دەکرد دەربارەی کە کابرایەکی خراپە کەچی ئێستا بە هێمنی و نەرمونیانی لەگەڵی دەدوێی؟ فەرمووی: (خراپترین پایە لەڕۆژی قیامەتدا لەلای خوای گەورە پایەی ئەو کەسەیە کە خەڵك لەترسی هەرزەگۆی و زمان پیسی وازی لێ بهێنن و خۆیانی لێ بپارێزن).

٤٧٩٢ - (حسن صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَجُلاً اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ). فَلَمَّا دَخَلَ انْبَسَطَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَلَّمَهُ, فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, لَمَّا اسْتَأْذَنَ قُلْتَ: (بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ). فَلَمَّا دَخَلَ انْبَسَطْتَ إِلَيْهِ! فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بچێتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ڕێگەی بدەن با بێتەژوورەوە بەڕاستی برایەکی خراپە لەناو قەومەکەیدا). کاتێ کە هاتەژوورەوە بۆ خزمەتی بە زەردەخەنەو رووی خۆشەوە دواندی، کاتێ کە ڕۆشتەدەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە ڕێگەت دا بێتەژوورەوە فەرمووت: (ڕێگەی بدەن با بێتەژوورەوە بەڕاستی برایەکی خراپە لەناو قەومەکەیدا). کەچی کە هاتەژوورەوە تۆ بە زەردەخەنەو رووی خۆشەوە دواندت! فەرمووی: (ئەی عائیشە بەڕاستی خوای گەورە کەسی هەرزەگۆ و بەدگۆ و بەدفەڕ و خراپەکاری خۆش ناوێت).

٤٧٩٣ - (ضعيف الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها, بهذه القصة, قالت: فقال: - تعني النبي صلى الله عليه سلم - : (يَا عَائِشَةُ, إِنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ الَّذِينَ يُكْرَمُونَ اتِّقَاءَ أَلْسِنَتِهِمْ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هەمان بەسەرهات هاتوە، عائیشە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عائیشە، بەڕاستی خراپترین کەس ئەو کەسانەن کە خەڵك ڕێزیان لێ دەگرن لەترسی زمانیان واتە لەبەر ئەوەی سەلامەت بن لە زمانیان ئەوەندە بەدگۆ و زمان پیسن).

٤٧٩٤ - (حسن) عن أنس قال: مَا رَأَيْتُ رَجُلاً الْتَقَمَ أُذُنَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُنَحِّى رَأْسَهُ, حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ هُوَ الَّذِى يُنَحِّى رَأْسَهُ, وَمَا رَأَيْتُ رَجُلاً أَخَذَ بِيَدِهِ فَتَرَكَ يَدَهُ, حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ هُوَ الَّذِى يَدَعُ يَدَهُ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرگیز نەمدیوە پیاوێ دەمی بەرێ بۆ لای گوێی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی بەنهێنی قسەی لەگەڵ بکات سەری لابەرێ هەتا ئەو کەسە قسەکەی تەواو نەکردایەو دەمی خۆی دورنەخستایەتەوە، وە هەرکەس تەوقەی لەگەڵ بکردایە هەتا خۆی دەستی بەرنەدایە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی ئەوی بەرنەدەدا.

## سەبارەت بە حەیاو شەرم و شکۆ.

## ٧ - باب فِي الْحَيَاءِ

٤٧٩٥ - (صحيح) عن ابن عمر قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (دَعْهُ فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای پیاوێکی ئەنصاریدا لەسەر حەیاو شەرم گلەیی دەکرد لە برایەکی موسوڵمانی و ئامۆژگاری دەکرد،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وازی لێ بێنە چونکە حەیاو شەرم بەشێکە لە ئیمان و باوەڕ).

٤٧٩٦ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْحَيَاءُ خَيْرٌ كُلُّهُ). أَوْ قَالَ: (الْحَيَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ). فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: إِنَّا نَجِدُ فِي بَعْضِ الْكُتُبِ أَنَّ مِنْهُ سَكِينَةً وَوَقَارًا وَمِنْهُ ضَعْفًا. فَأَعَادَ عِمْرَانُ الْحَدِيثَ, وَأَعَادَ بُشَيْرٌ الْكَلَامَ, قَالَ: فَغَضِبَ عِمْرَانُ حَتَّى احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَقَالَ: أَلَا أَرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَتُحَدِّثُنِي عَنْ كُتُبِكَ!! قَالَ: قُلْنَا: يَا أَبَا نُجَيْدٍ! إِيهٍ, إِيهٍ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەیاو شەرم و شکۆ خێر و بێرە هەمووی) یان فەرمووی: (حەیاو شەرم و شکۆ هەمووی خێر و بێرە). بوشەیری کوڕی کەعب وتی: ئێمە لە هەندێ پەرتوکدا دیومانە حەیاو شەرم و شکۆ هەندێکی مایەی ویقار و ئارامی و شکۆمەندیە، هەشیەتی مایەی زەبوونی و لاوازیە بۆ ئادەمیزاد، عیمران فەرموودەکەی دوپات کردەوە، بوشەیریش قسەکەی خۆی دوپات کردەوە، ڕاوی وتی: عیمران ئەوەندە توڕە بوو چاوەکانی سور هەڵگەڕان وتی: من پێت دەڵێم: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاوا دەفەرموێت، کەچی تۆ دەڵێی: لە فلان پەرتوکدا وا هاتوە، ڕاوی وتی: وتمان: ئەی باوکی نوجەید! هێواش، هێواش. - توڕە مەبە بوشەیر پیاوێکی ڕاستگۆیەو لەخۆمانە - .

٤٧٩٧ - (صحيح) عن أبو مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَافْعَلْ مَا شِئْتَ).

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی لە پێغەمبەرە پێشینەکانەوە دەماو دەم گەیشتۆتەوە بەم خەڵکەو بۆمان ماوەتەوە ئەمەیە: ئەگەر شەرم ناکەی چی دەکەی بیکە).

## سەبارەت بە خورەوشت و ئاکاری جوان.

## ٨ - باب فِي حُسْنِ الْخُلُقِ.

٤٧٩٨ - (حسن صحيح) عن عائشة رحمها الله قالت: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی خاوەن باوەڕ بە هۆی خورەوشت و ئاکاری جوانەوە پلەو پایەی دەگاتە پلەو پایەی رۆژووەوانی شەونوێژکەر).

٤٧٩٩ - (صحيح) عن أبو الدرداء, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی هیچ شتێ لە خورەوشت و ئاکاری جوان قورس تر نیە لەسەر تەرازووی کردەوەکان). - ئەوەندە خێر و پاداشتی زۆر و گەورەیە لەلای خوای پەروەردگار - .

٤٨٠٠ - (حسن) عن أبو أمامة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا, وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا, وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله

عليه وسلم فەرموویەتی: (من دەبم بە كەفیل و دەستەبەری كۆشك و تەلاری لەدەورووبەری بەهەشتدا بۆ كەسێ كە وازبهێنێ لە چەقەو دەمەدەمێ با لەسەر هەق بێ، وە دەبم بە كەفیل و دەستەبەری خانویەك لەناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ كەسێ كە وازبهێنێ لەدرۆ با بە گاڵتەشەوە بێ، هەروەها دەبم بە كەفیل و دەستەبەری خانویە لەلای ژووروی بەهەشتەوە بۆ كەسێ كە خوڕەوشت و ئاكاری جوان بێ).

٤٨٠١ - (صحيح) عن حارثة بن وهب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ الْجَوَّاظُ, وَلاَ الْجَعْظَرِيُّ). قَالَ: وَالْجَوَّاظُ: الْغَلِيظُ الْفَظُّ.

واتە: لە (حارثە)ی كوڕی وەهبەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (كەسی بەدڕەوشت و ڕۆح زل و دڵڕەق و بای هەوا ناچێتە بەهەشتەوە).

## سەبارەت بە شت گەورەكردن كە كارێكی باش نیە.

## ٩ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الرِّفْعَةِ فِي الأُمُورِ.

٤٨٠٢ - (صحيح) عن أنس قال: كَانَتِ الْعَضْبَاءُ لاَ تُسْبَقُ, فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ لَهُ فَسَابَقَهَا فَسَبَقَهَا الأَعْرَابِيُّ, فَكَأَنَّ ذَلِكَ شَقَّ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لاَ يَرْفَعَ شَيْئًا مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وشترە مێینەیەكی هەبوو ناوی (عضباء) بوو، ئەوەندە خێرا دەڕۆیشت هیچ وشترێ پێشی نەدەدایەوە، جارێ عەرەبێكی دەشتەكی هات نۆبەنە وشترێكی

پێ بوو پێش (عضباء) کەوت، ئەمەش زۆر قورس و گران بوو لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (بووە بە هەق لەسەر خوای گەورە کە هەرچی لەم دونیایەدا سەربەرزبکاتەوە ئیللا سەری پێ دادەنەوێنێتەوە).

٤٨٠٣ - (صحيح) عن أنس, بهذه القصة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ حَقًّا عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لاَ يَرْتَفِعَ شَيْءٌ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ).

واتە: لە ئەنەسەوە، هەمان بەسەرهات هاتوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بووە بە هەق لەسەر خوای گەورە کە هەرچی لەم دونیایەدا سەربەرزبکاتەوە ئیللا سەری پێ دادەنەوێنێتەوە).

## سەبارەت بە تاریفکردن کە کارێکی باش نیە.

## ١٠ - باب فِي كَرَاهِيَةِ التَّمَادُحِ.

٤٨٠٤ - (صحيح) عن همام قال: جَاءَ رَجُلٌ فَأَثْنَى عَلَى عُثْمَانَ فِي وَجْهِهِ فَأَخَذَ الْمِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ تُرَابًا فَحَثَا فِي وَجْهِهِ, وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا لَقِيتُمُ الْمَدَّاحِينَ فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ).

واتە: لە هەمامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات دەستی کرد بەستایش و تاریفکردنی پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ، میقدادی کوڕی ئەسوەد هەندێ خۆڵی هەڵگرت و وەشاندی بە رووی پیاوەکەدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ گەیشتن بەو کەسانەی ستایش و تاریفی خەڵك دەکەن خۆڵ بکەن بە دەم و چاویاندا).

٤٨٠٥ - (صحيح) عن أبو بكرة: أَنَّ رَجُلاً أَثْنَى عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ: (قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, ثُمَّ قَالَ: (إِذَا مَدَحَ أَحَدُكُمْ صَاحِبَهُ لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: إِنِّي أَحْسِبُهُ كَمَا يُرِيدُ أَنْ يَقُولَ, وَلاَ أُزَكِّيهِ عَلَى اللَّهِ).

واتە: لە ئەبو بەکرەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم وەسفی چاکەی پیاوێکی کردو تاریفی کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سێ جار پێی فەرموو: (ملی هاوڕێکەت شکاندو بە هیلاکتا برد)، لەپاشدا فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان ناچار بوو تاریفی کەسێ بکات با بڵێ: من وا ئەزانم ئەو پیاوە ئاواو ئاوایە، بە مەرجێ بەو شێوەیەش بێت، بە هیچ شێوەیە نابێ بڕیار بدات و بڵێ فڵان کەس لای خوا پاکە چونکە ئەوە خوا خۆی دەیزانێ).

٤٨٠٦ - (صحيح) عن مطرف قال: قال أبي: انْطَلَقْتُ فِي وَفْدِ بَنِي عَامِرٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْنَا: أَنْتَ سَيِّدُنَا. فَقَالَ: (السَّيِّدُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى). قُلْنَا: وَأَفْضَلُنَا فَضْلاً وَأَعْظَمُنَا طَوْلاً. فَقَالَ: (قُولُوا بِقَوْلِكُمْ أَوْ بَعْضِ قَوْلِكُمْ وَلاَ يَسْتَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ).

واتە: لە (مُطَرِّف)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: باوکم وتی: لەگەڵ نوێنەری بەنی عامردا چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتمان: تۆ گەورەو سەیدی ئێمەیت، فەرمووی: (گەورەو سەید هەر خوای بەرز و شکۆمەندە). - بەو سیفەتەی کە هەموو خەڵك بەندەی ئەون هەر خوایە - وتمان: تۆ گەورەو سەروەرمانی بۆ چاکی و فەزڵ و بەخشندەیی و سەخاوەت، فەرمووی: (قسەی گونجاو بڵێن و هەندێ لەم قسانەتان بڵێن قەیدی نیە بەڵام وریابن شەیتان کارێکتان پێ نەکات پێی لێ هەڵبڕن لەڕادە دەری بکەن وە شەیتان نەتانکاتە وەکیلی خۆی).

## سەبارەت بە نەرم و نیانی.

## ١١ - باب فِي الرِّفْقِ.

٤٨٠٧ - (صحيح) عبد الله بن المغفل, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ, وَيُعْطِي عَلَيْهِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عوغەفەلەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە خۆی نەرم و نیانەو لەهەموو شتێكدا نەرم و نیانی پێ خۆشە، ئەو پاداشت و بەخششەی كە خوا دەیدات بە بەندەی خۆی لەسەر نەرم و نیانی لەسەر هیچ شتێكی تر پاداشتی ناداتەوە بەو شێوەیە).

٤٨٠٨ - (صحيح) عن المقدام بن شريح, عن أبيه قال: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْبَدَاوَةِ, فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْدُو إِلَى هَذِهِ التِّلاَعِ وَإِنَّهُ أَرَادَ الْبَدَاوَةَ مَرَّةً فَأَرْسَلَ إِلَيَّ نَاقَةً مُحَرَّمَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ فَقَالَ لِي: (يَا عَائِشَةُ, ارْفُقِي فَإِنَّ الرِّفْقَ لَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ زَانَهُ, وَلاَ نُزِعَ مِنْ شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ شَانَهُ).

واتە: لە میقدامی كوڕی شورەیحەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: سەبارەت بە ڕۆشتن بۆ بیابان لە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ وتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوو بۆ شوێنێ لە بیابان ئاوێكی لێ بوو لەسەرەوە دەهاتە خوارەوە وەك تاڤگە، جا وشترێكی زەكاتی بۆ ناردم كە كەس سواری نەبوو بوو وە باری لێ نەنرا بوو، پێی فەرمووم: (ئەی عائیشە نەرم و نیان و لەسەرخۆ بە، چونكە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی لە هەر شتێكدا بوو ئەوە بێگومان جوانی دەكات، لە هەر شتێكیشدا نەمێنێت ناشیرین و ناڕێكی دەكات).

٤٨٠٩ - (صحيح) عن جرير قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ كُلَّهُ).

واتە: لە جەریرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بێ بەش بێ لە نەرم و نیانی ئەوە بەڕاستی بێ بەش لەو هەموو خێر و چاکەیە).

٤٨١٠ - (صحيح) عن مصعب بن سعد, عن أبيه، قال الأعمش : ولا أعلمه إلا عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (التُّؤَدَةُ فِي كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ فِي عَمَلِ الآخِرَةِ).

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە، لە باوکیەوە، ئەعمش وتی: پێ نازانم ئیللا ئەوە نەبێ کە ئەم فەرمودە لە پێغەمبەردوە صلى الله عليه وسلم ریوایەت کراوە فەرموویەتی: (نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی لەهەموو شتێکدا باشە، مەگەر لەئیش و کاری قیامەتدا لەوەدا دەست وبردو پەلەی لێ بکرێت باشە).

## سەبارەت بە سوپاسگوزاری چاکەکار.

## ١٢ - باب فِي شُكْرِ الْمَعْرُوفِ.

٤٨١١ - (صحيح) عن أبي هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَشْكُرُ اللَّهَ مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سوپاسی خوای گەورە ناکات کەسێك کە سوپاسی خەڵك نەکات لەسەر چاکە).

٤٨١٢ - (صحيح) عن أنس, أَنَّ الْمُهَاجِرِينَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَهَبَتِ الأَنْصَارُ بِالأَجْرِ كُلِّهِ. قَالَ: (لاَ مَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ لَهُمْ وَأَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِمْ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە (مهاجرین)کۆچ کەرەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم هەموو پاداشت و خێرو بێرێ بۆ ئەنصارەکانە، فەرمووی: (نا، مادەم ئێوەش بپاڕێنەوە بۆیان و ستایشیان بکەن).

٤٨١٣ - (حسن) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أُعْطِيَ عَطَاءً فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ, فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ بِهِ, فَمَنْ أَثْنَى بِهِ فَقَدْ شَكَرَهُ, وَمَنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد اللە)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کەسێ بەخششێکی دەدەنێ ئەگەر هەیبو با تۆڵەی بۆ بکاتەوەو بە چاکە پاداشتی بداتەوە، ئەگەر نەیبو ئەوە با بۆی بپاڕێتەوەو ستایشی بکات و پێ بزانێ، ئەگەر بۆی پاڕایەوەو دوعای خێری بۆ کرد بێگومان ئەوە سوپاسی کردووە، ئەوەی بیشارێتەوەو پێ نەزانێ ئەوە کوفری نیعمەتەکەی کردوەو کەسێکی سپڵەو پێ نەزانە).

٤٨١٤ - (صحيح) عن جابر, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال (مَنْ أَبْلَى بَلاَءً فَذَكَرَهُ فَقَدْ شَكَرَهُ, وَإِنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد اللە)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کەسێ بەخششێکی دەدەنێ ئەگەر باسی کردو بۆی پاڕایەوەو پێ بزانێ ئەوە سوپاسی کردووە، ئەوەی بیشارێتەوەو پێ نەزانێ ئەوە کوفری نیعمەتەکەی کردوەو کەسێکی سپڵەیە).

## سەبارەت بە دانیشتن لە سەرە ڕێگاكاندا

## ١٣ - باب فِي الْجُلُوسِ فِي الطُّرُقَاتِ.

٤٨١٥ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا بُدٌّ لَنَا مِنْ مَجَالِسِنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ أَبَيْتُمْ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ؟). قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (غَضُّ الْبَصَرِ, وَكَفُّ الأَذَى, وَرَدُّ السَّلاَمِ, وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ, وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن نەكەن لەسەر ڕێگەو باندا دانیشن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چارمان نیەو زەرورە شوێنێ نیە دەمەتەقێی لێ بكەین ئەوێ نەبێ، فەرمووی: (ئەگەر ناچار بوون ئەوە مافی ڕێگەوبان بدەن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مافی ڕێگەوبان چییە؟) فەرمووی: (چاوی خۆتان بگرن لە نامەحرەم، ئازاری كەس مەدەن، وەڵامی سڵاو بدەنەوە، فەرمان بكەن بە چاكەو، ڕێگری بكەن لە خراپە).

٤٨١٦ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم في هذه القصة, قال (وَإِرْشَادُ السَّبِيلِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەمان بەسەرهات هاتوە، ئەبو هورەیرە وتی: (ڕێگەی چاك نیشانی خەڵك بدەن).

٤٨١٧ - (صحيح) عن ابن حجير العدوي قال سمعت عمر بن الخطاب, عن النبي صلى الله عليه وسلم, في هذه القصة, قال: (وَتُغِيثُوا الْمَلْهُوفَ, وَتَهْدُوا الضَّالَّ).

واتە: لە ئیبنو حوجەیری عەدەویەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) بوو ڕەزای خوای لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەمان بەسەرهات هاتوە، ڕاوی وتی: (بە هاناوەچون و یارمەتیدانی لێ قەوماوان و ستەم لێ کراوەن، ڕێگ نیشانی خەڵك).

٤٨١٨ - (صحيح) عن أنس قال: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً. فَقَالَ لَهَا: (يَا أُمَّ فُلَانٍ اجْلِسِي فِي أَيِّ نَوَاحِي السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَجْلِسَ إِلَيْكِ). قَالَ: فَجَلَسَتْ, فَجَلَسَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهَا حَتَّى قَضَتْ حَاجَتَهَا. وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ عِيسَى (حَتَّى قَضَتْ حَاجَتَهَا).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کارێکی پێویستم پێتە، پێی فەرموو: (ئەی دایکی فلان برۆ لە چ لایەکی ڕێگادا دادەنیشی لەلات دادەنیشم). ڕاوی وتی: ئافرەتەکە دانیشت و، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دانیشت هەتا پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ کرد. ئیبنو عیسا باسی (هەتا پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ کرد)ی نەکرد.

٤٨١٩ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ, بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ تۆزێ هۆشی تەواو نەبوو، جا ڕاوی فەرمودەکەی گێڕایەوە بە هەمان مانای فەرمودەی پێشوو.

## سەبارەت بە فراوانی کۆڕ و دانیشتنەکان

## ١٤ - باب فِي سَعَةِ الْمَجْلِسِ.

٤٨٢٠ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول (خَيْرُ الْمَجَالِسِ أَوْسَعُهَا).

واته: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (چاکترین کۆڕ و دانیشتنەکان فراوانترینیانە).

## سەبارەت بە دانیشتن لەنێوان و خۆرو سێبەردا

## ١٥ - باب فِي الْجُلُوسِ بَيْنَ الظِّلِّ وَالشَّمْسِ.

٤٨٢١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال أبو القاسم صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الشَّمْسِ). وَقَالَ مَخْلَدٌ (فِي الْفَيْءِ). (فَقَلَصَ عَنْهُ الظِّلُّ وَصَارَ بَعْضُهُ فِي الشَّمْسِ وَبَعْضُهُ فِي الظِّلِّ فَلْيَقُمْ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو قاسیم صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان لەبەر خۆر دایشتبوو سێبەرەکەی لەسەر لاچوو بەشێوەیە هەندێ لە جەستەی لەبەر خۆردا بوو هەندێکی تری لەبەر سێبەردا بوو با هەستێ یان بچێتە بەر سێبەرەکە یا بچێتە بەرخۆرەکە).

٤٨٢٢ - (صحيح) عن قيس, عن أبيه, أَنَّهُ جَاءَ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ, فَقَامَ فِي الشَّمْسِ, فَأَمَرَ بِهِ فَحُوِّلَ إِلَى الظِّلِّ.

واتە: لە قەیسەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ باوکم هات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا، باوکم لەبەر هەتاو دانیشت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد بچێتە بەر سێبەر.

## سەبارەت بە دانیشتنی هەڵقە هەڵقە بۆ قورئان خوێندن و فێربوونی زانستی شەرعی و زیکر و یادی خوا.

## ١٦ - باب فِي التَّحَلُّقِ.

٤٨٢٣ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْجِدَ وَهُمْ حِلَقٌ فَقَالَ (مَا لِي أَرَاكُمْ عِزِينَ).

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە مزگەوتەوە، خەڵکەکە هەڵقە هەڵقە دانیشتبوون، فەرمووی: (ئەوە بۆ دەتانبینم بازنە بازنەو کۆمەڵ کۆمەڵ پەرت و بڵاو دانیشتوون). - بۆ ریز نابن بۆ نوێژکردن -.

٤٨٢٦ - (صحيح) عن الأعمش, بهذا, قال: كَأَنَّهُ يُحِبُّ الْجَمَاعَةَ.

واتە: لە ئەعمەشەوە هەمان فەرموودە هاتوە، وتی: وەك بڵێی حەزی دەکرد پەرت و بڵاو نەبن و کۆمەڵ بن).

٤٨٢٧ - عن جابر بن سمرة قال: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە کە دەچوینە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ریزی کۆڕەکە تا کوێ گەیشتبو لەویا دادەنیشتین.

## سەبارەت بە دانیشنی لە ناوەڕاستی هەڵقەی کۆڕ و دانیشتندا

### ١٧ - باب الْجُلُوسِ وَسْطَ الْحَلْقَةِ.

٤٨٢٦ - (ضعيف) عن حذيفة, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ مَنْ جَلَسَ وَسْطَ الْحَلْقَةِ.

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرەتی کردوە لەو کەسەی لەناوەڕاستی هەڵقەی کۆڕ و دانیشتندا دادەنیشێت.

## سەبارەت بە کەسێ لەجێی خۆی هەستێ بۆ کەسێکی تر.

### ١٨ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُومُ لِلرَّجُلِ مِنْ مَجْلِسِهِ.

٤٨٢٧ - (ضعيف) عن سعيد بن أبو الحسن قال: جَاءَنَا أَبُو بَكْرَةَ فِي شَهَادَةٍ, فَقَامَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ مَجْلِسِهِ, فَأَبَى أَنْ يَجْلِسَ فِيهِ وَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ذَا, وَنَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَمْسَحَ الرَّجُلُ يَدَهُ بِثَوْبِ مَنْ لَمْ يَكْسُهُ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو بەکرە هات بۆ شایەتی دان، پیاوێ لەشوێنەکەی خۆی هەستا بۆئەوەی ئەبو بەکرە دانیشێ، بەڵام دانەنیشت وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو کارەی قەدەغەکردوە، هەروەها ڕێگری کردوە لەوەی کەسێ دەستی بسڕێ بە پۆشاکی کەسێکی تردا لەکاتێکدا لەبەری نەکردبێ.

٤٨٢٨ - (حسن) عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَامَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ مَجْلِسِهِ, فَذَهَبَ لِيَجْلِسَ فِيهِ, فَنَهَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پیاوێ لەشوێنەکەی خۆی هەستا بۆئەوەی ئەو پیاوە دانیشێ، پیاوەکە ویستی بڕوات لە شوێنەکەی ئەو دانیشێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری لێ کردو نەیهێشت دانیشێ.

## باسی کێ شایستەیە بۆ هاودەم و هاوڕێیەتی.

## ١٩ - باب مَنْ يُؤْمَرُ أَنْ يُجَالَسَ.

٤٨٢٩ - (صحيح) عن أنس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ, وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا, وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ, وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ وَلاَ رِيحَ لَهَا, وَمَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْمِسْكِ إِنْ لَمْ يُصِبْكَ مِنْهُ شَىْءٌ أَصَابَكَ مِنْ رِيحِهِ, وَمَثَلُ جَلِيسِ السُّوءِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْكِيرِ إِنْ لَمْ يُصِبْكَ مِنْ سَوَادِهِ أَصَابَكَ مِنْ دُخَانِهِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نموونەی ئەو موسڵمانەی قورئان دەخوێنێت وەك تورنج (پرتەقاڵ و مزرەمەنیەکان) وایە بۆنی خۆشە، چونکە دەیخوێنێ، تامیشی خۆشە، چونکە کاری پێدەکات، نموونەی ئەو موسڵمانەی قورئان ناخوێنێت وەك خورما وایە، تامی خۆشە بەڵام بۆنی نیە، نموونەی ئەو دووڕوو مونافیقەی قورئان دەخوێنێت وەك رەیحانە وایە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە، ئەو دووڕووەی قورئان ناخوێنێت ئەوە وەك گوژاڵکە وایە بۆنی نیە و تامیشی زۆر تاڵە، نموونەی هاودەمی چاك وەك میسك فرۆشە ئەگەر هیچت لێی دەست نەکەوێت بۆنە خۆشەکەیت بۆ دێت، نموونەی هاودەمی خراپیش وەك ئاسنگەرە ئەگەر گڕ و رەشیەکەیت بەرنەکەوێت دوکەڵەکەی دێت بەسەرتدا).

٤٨٣٠ - (صحيح) عن أنس, عن أبو موسى, عن النبي صلى الله عليه وسلم بهذا الكلام الأول إلى قوله: (وَطَعْمُهَا مُرٌّ). وَزَادَ ابْنُ مُعَاذٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: وَكُنَّا نَتَحَدَّثُ: أَنَّ مَثَلَ جَلِيسِ الصَّالِحِ. وَسَاقَ بَقِيَّةَ الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئەنەسەوە، لە ئەبو موساوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، فەرموودەی پێشوو هەتا (وَطَعْمُهَا مُرٌّ) هاتوە، ئیبنو (معاذ) بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتی: ئەنەس وتی: ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد کە: (نموونەی هاودەمی چاك وەك میسك فرۆشە ...) جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٤٨٣١ - (صحيح بما قبله) عن أنس بن مالك, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ). فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نموونەی هاودەمی چاك وەك میسك فرۆشە ...) جا راوی فەرموودەکەی بە هەمان شێوە گێڕایەوە.

٤٨٣٢ - (حسن) عن أبو سعيد, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا, وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ).

واته: له ئەبو سەعیدەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هاوڕێیەتی کەس مەکە جگە لە باوەڕدار، با جگە لە خاوەن تەقواو خواناس کەس نانیشت نەخوات). - مەبەست لەوەیە موسوڵمان تێکەڵی غەیری باوەڕدار و خاوەن تەقوا نەکات - .

٤٨٣٣ - (حسن) عن أبي هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال:(الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ, فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاو لەسەر ڕێباز و دینی هاوڕێ و برادەرەکەیەتی، با هەر یەکێ لەئێوە سەیر بکات و سەرنج بدات بزانێ کێ برادەریەتی). - ئەگەر لەدین و ڕەوشتی ڕازی بوو ئەوە با هاوڕێیەتی بکات، ئەگەر ئەوەش نەبوو وردە وردە لێی دوور بکەوێتەوەو تێکەڵاوی نەکات - .

٤٨٣٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ, وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕوحەکان وەك چەند کۆمەڵێ سەربازی مەشق پێکراو وان، کە هەر لەسەرەتاوە خوای گەورە لەپێش دروستکردنی جەستەدا دروستی کردون، لە عالەمی ڕوحدا جۆرە مەشقێکی پێ کردوون جا ئەوانەیان کە ئاشنابوون بە یەکتر و هۆگری یەکتربوون لەژیانی دونیاشدا هۆگری یەکتردەبن و پێکەوە دەگونجێن، وە ئەوانەشیان کە لەیەك جودابوون لەژیانی دونیاشدا لەیەك جیادەبن و پێکەوە ناگونجێن).

## سەبارەت بە
## چەقەو دەمەقاڵە کە شتێکی خراپە.

## ٢٠ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الْمِرَاءِ.

٤٨٣٥ - (صحيح) عن أبو موسى قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ: (بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا, وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکێ لە هاوەڵانی دەنارد بۆ کارێ دەیفەرموو: (موژدە بدەن و دوورخەرەوە مەبن ئەوەندە خەڵك مەترسێنن نائومێد ببن لەڕەحمەتی خوا بەهۆی تاوانەکانیانەوە، ئاسانکاری بکەن و کار قرس و گران مەکەن لەسەر خەڵك).

٤٨٣٦ - (صحيح) عن السائب قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَعَلُوا يُثْنُونَ عَلَيَّ وَيَذْكُرُونِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَنَا أَعْلَمُكُمْ). يَعْنِي بِهِ. قُلْتُ: صَدَقْتَ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي! كُنْتَ شَرِيكِي فَنِعْمَ الشَّرِيكُ كُنْتَ: لاَ تُدَارِي وَلاَ تُمَارِي.

واتە: لە سائیبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاوڕێکانم دەستیان کرد بە وەسف کردنی من و باسکردنم بە چاکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من لەئێوە چاکتر دەیناسم)، وتم: راست دەفەرمووی دایك و باوکم بە قوربانت بن، تۆ کاتێ شەریکی من بووی بەڕاستی شەریکێکی چاك بوویت و مامەڵەت خۆش بوو نە گەڕ و گێچەڵ و تەشقەڵەت دەکرد نە لامنجی و نە دەمەقاڵەت دەکرد.

# باسی ڕێباز و
# ڕێگەی چاك لە چۆنیەتی قسەکردندا.

## ٢١ - باب الْهَدْيِ فِي الْكَلاَمِ.

٤٨٣٧ - (ضعيف) عن عبد الله بن سلام, قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ يَتَحَدَّثُ يُكْثِرُ أَنْ يَرْفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَّمَاءِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی سەلامەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتایەو فەرمایشتی بفەرموایە زۆرترین کات سەری بەرزدەکردەوە بۆ ئاسمان.

٤٨٣٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كَانَ فِي كَلاَمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرْتِيلٌ أَوْ تَرْسِيلٌ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە شێنەیی و لەسەرخۆ و بەشیکراوەیی قسەی دەکرد - واتە گوێگر دەیتوانی قسەکانی بژمێرێت - .

٤٨٣٩ – (حسن) عن عائشة رضى الله عنها قالت: كَانَ كَلاَمُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلاَمًا فَصْلاً يَفْهَمُهُ كُلُّ مَنْ سَمِعَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گفت و گۆی ڕون و ئاشکراو کۆتایی پێهێنەر بوو، هەرکەسێ گوێی لێی بوایە لێی حاڵی دەبوو.

٤٨٤٠ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كُلُّ كَلاَمٍ لاَ يُبْدَأُ فِيهِ بِ لْحَمْدُ لِلَّهِ فَهُوَ أَجْذَمُ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر قسەیە بە (الحمد لله) دەست پێ نەکات ناتەواوە).

## سەبارەت بە وتاردان.

## ٢٢ - باب فِي الْخُطْبَةِ.

٤٨٤١ - ((صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا تَشَهُّدٌ فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر وتارێ شایەتومان(أشهد ان لا اله الا الله، وأشهد ان محمدا رسول الله)ی تێدا نەوترێت ئەو وتارە ناتەواوەو وەك دەستی براو وایە سودی نیە).

## سەبارەت بە هەموو كەس
## بەپێی پلەو پایەی خۆی ڕێزی لێ دەگیرێ.

## ٢٣ - باب فِي تَنْزِيلِ النَّاسِ مَنَازِلَهُمْ.

٤٨٤٢ - (ضعيف)عن ميمون بن أبو شبيب: أَنَّ عَائِشَةَ عَلَيْهَا السَّلاَمُ مَرَّ بِهَا سَائِلٌ فَأَعْطَتْهُ كِسْرَةً, وَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابٌ وَهَيْئَةٌ فَأَقْعَدَتْهُ فَأَكَلَ, فَقِيلَ لَهَا فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَحَدِيثُ يَحْيَى مُخْتَصَرٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ مَيْمُونٌ لَمْ يُدْرِكْ عَائِشَةَ.

واتە: لە مەیمونی كوڕی ئەبو شەبیبەوە دەگێرنەوە، كە سواڵكەرێ هات بۆ لای عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ لەتێ نانی دایە، لەپاش ئەو پیاوێكی پۆشتەو پەرداخ هات داینیشاند هەتا نانی خوارد، بۆ ئەمە لێیان پرسی؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو كەسێ بەپێی پلەو پایەی خۆی قەدر و ڕێزی بگرن).

٤٨٤٣ - (حسن) عن أبو موسى الأشعري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِى الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ, وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ, وَإِكْرَامَ ذِى السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ).

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس قەدر و ڕێزی پیاوی پیری موسوڵمان و قورئان خوێن و كاربەدەستی دادگەر بگرێت ئەوە قەدر و ڕێزی خوای گرتوەو بە بەرز ڕایگرتوە، بە مەرجێ قورئان خوێنەكە زۆر قوڵی نەكاتەوەو لەسنور دەرنەچێ و پیتەكانی زیادو كەم نەكات و ئەحكامەكانی قورئان خوێندن لەبەرچاو بگرێت).

## دەربارەی پیاوێ لە نیوان دوو پیاودا دانیشێ بەبێ ڕەزامەندی ئەوان.

## ٢٤ - باب فِي الرَّجُلِ يَجْلِسُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ بِغَيْرِ إِذْنِهِمَا.

٤٨٤٤ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (لاَ يُجْلَسُ بَيْنَ رَجُلَيْنِ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با پیاوێ لەنیوان دوو پیاودا دانەنیشێ ئیللا بە ڕەزامەندی ئەوان نەبێت).

٤٨٤٥ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێ کە دوو کەس لەتەنیشت یەکەوە دانیشتون جیایان بکاتەوەو لە نێوانیاندا دانیشێ ئیللا بە ڕەزامەندی ئەوان نەبێ).

# سەبارەت بە دانیشتنی پیاو.

## ٢٥ - باب فِي جُلُوسِ الرَّجُلِ.

٤٨٤٦ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا جَلَسَ احْتَبَى بِيَدِهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دادەنیشێت ئەژنۆکانی دەنا بە سنگیەوەو هەردوو دەستی تێدەپەڕاند بە بەرئەژنۆیدا.

٤٨٤٧ - (حسن) عن قيلة بنت مخرمة: أَنَّهَا رَأَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ قَاعِدٌ الْقُرْفُصَاءَ, فَلَمَّا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُخْتَشِعَ - وَقَالَ مُوسَى: الْمُتَخَشِّعَ فِي الْجِلْسَةِ - أُرْعِدْتُ مِنَ الْفَرَقِ.

واتە: (قَيْلَة)ی کچی (مَخْرَمَة) دەڵێت، پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم دی بە چیچکانەوە دانیشتبوو، (قَيْلَة) وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی بە ملکەچی و گەردنکەچی دانیشتووە، لەترساندا ترس و لەرز دایگرتم.

## سەبارەت بە دانیشتنی خراپ.

## ٢٦ - باب فِي الْجِلْسَةِ الْمَكْرُوهَةِ.

٤٨٤٨ - (صحيح) عن الشريد بن سويد قال: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا جَالِسٌ هَكَذَا وَقَدْ وَضَعْتُ يَدِيَ الْيُسْرَى خَلْفَ ظَهْرِي وَاتَّكَأْتُ عَلَى أَلْيَةِ يَدِي, فَقَالَ: (أَتَقْعُدُ قِعْدَةَ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ).

واتە: شەریدی کوڕی سوەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دای بە لامدا بەم شێوەیە دانیشتبووم دەستی چەپم لەپشتمەوە دانابوو خۆم دابوو بەسەر ئەو گۆشتە نەرمەی بە پەنجە گەورەی دەستی راستیەوەیەتی، فەرمووی: (ئەوە چۆن ئاوا دادەنیشیت وەك دانیشتنی ئەو کەسانەی کە بەر تووڕەیی و قار و غەزەبی خوا کەوتون - کە جولەکەکانن - ).

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی قسەکردن لەدوای نوێژی عیشا.

## ٢٧ - باب النَّهْيِ عَنِ السَّمَرِ بَعْدَ الْعِشَاءِ.

٤٨٤٩ - (صحيح) عن أبو برزة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنِ النَّوْمِ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثِ بَعْدَهَا.

واتە: لە ئەبو بەرزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێگری کردوە لە خەوتنی پێش نوێژی عیشا - لەترسی فەوتاندنی جەماعەتی نوێژی عیشا-، هەروەها قسەکردنی لەدوای نوێژی عیشا - چونکە زۆرجار ئەویش دەبێتەهۆی فەوتاندنی شەونوێژ و نوێژی بەیانی - .

## دەربارەی كەسێ بە چوارمشقی دانیشێت.

## ٢٨ - باب فِي الرَّجُلِ يَجْلِسُ مُتَرَبِّعًا.

٤٨٥٠ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ تَرَبَّعَ فِي مَجْلِسِهِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَسْنَاءَ.

واتە: شەریدی كوڕی سوەیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ كە لەنوێژی بەیانی دەبووەوە لەجێگاكەی خۆی چوارمشقی لێی دادەنیشت هەتا خۆر بە جوانی هەڵدەهات.

## سەبارەت بە چپەكردن.

## ٢٩ - باب فِي التَّنَاجِي.

٤٨٥١ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَنْتَجِي اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ).

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ كە سێ كەس پێكەوە بوون با دوانیان بە پەنامەكی و بەچپە قسەنەكەن پێكەوە چونكە ئەوە دەبێتە هۆی دڵگرانی ئەوی تریان).

٤٨٥٢ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم, مِثْلَهُ. قَالَ أَبُو صَالِحٍ: فَقُلْتُ لاِبْنِ عُمَرَ: فَأَرْبَعَةٌ؟ قَالَ: لاَ يَضُرُّكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی، جا راوی بەهەمان شێوە فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە. ئەبو صالح وتی: وتم بە ئیبنو عومەر ئەی ئەگەر چوار كەس بوون دوانیان پێكەوە بە چپە قسەبكەن؟ وتی: ئەوە زیانی نیەو دروستە.

## دەربارەی ئەگەر كەسێك لە كۆڕ و دانیشتنێكدا هەستا رۆشت و لەپاشدا گەڕایەوە.

## ٣٠ - باب إِذَا قَامَ مِنْ مَجْلِسٍ ثُمَّ رَجَعَ.

٤٨٥٣ - (صحيح) عن سهيل بن أبو صالح, قال: كُنْتُ عِنْدَ أَبِي جَالِسًا وَعِنْدَهُ غُلَامٌ, فَقَامَ ثُمَّ رَجَعَ, فَحَدَّثَ أَبِي, عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا قَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسٍ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ).

واتە: لە سوهەیلی كوڕی ئەبو صالحەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەلای باوكم دانیشتبووم لەوكاتەدا غولامێكی لەلا بوو، غولامەكە هەستا لەپاشدا گەڕایەوە، باوكم ئەم فەرمودەی گێڕایەوە، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ لە كۆڕ و دانیشتنێكدا هەستا لەپاشدا گەڕایەوە ئەوە ئەو شایستەترە بە شوێنەكەی خۆی هەتا كەسێكی تر).

٤٨٥٤ - (ضعيف) عن أبو الدرداء قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ, فَقَامَ, فَأَرَادَ الرُّجُوعَ نَزَعَ نَعْلَيْهِ أَوْ بَعْضَ مَا يَكُونُ عَلَيْهِ, فَيَعْرِفُ ذَلِكَ أَصْحَابُهُ, فَيَثْبُتُونَ.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، كە وتويەتى: كاتێ پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم دادەنيشت ئێمەش لەدەوروبەرى دادەنيشتين، كە هەستايەو بيويستايە بگەڕێتەوە نەعلەكانى لەپێ داكەند، يان شتێكى بەجێ دەهێشت ئيتر بەوەدا هەواڵەكانى دەيانزانى دەگەڕێتەوە، لەشوێنى خۆيان نەدەجولاًن و چاوەڕێيان دەكرد.

## باسى كەراهەتى هەيە كەسێك لەكۆڕ و دانيشتنێكدا هەستێ بەبێ ئەوەى زيكر و يادى خوا بكات.

## ٣١ - باب كَرَاهِيَةِ أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ وَلاَ يَذْكُرُ اللَّهَ.

٤٨٥٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ فِيهِ: إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ, وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێرنەوە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (هەر كۆمەڵێ لەكۆڕێكدا دابنيشن هەتا بلاوەى لێ دەكەن زيكر و يادى خوا لەو كۆڕەدا نەكەن: وەك ئەوە وايە لەسەر كەلاكى بۆگەنى كەرى تۆپيو هەستن، لەڕۆژى قيامەتدا دەبێ بە داخ و حەسرەت بۆى).

٤٨٥٦ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللَّهِ تِرَةً, وَمَنِ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لاَ يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللَّهِ تِرَةً).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێرنەوە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (هەر كەسێ لەهەر شوێنێ دابنيشێ زيكر و يادى خواى

تێدا نەکات ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەیکات بە داخ و خەفەت بۆی، هەروەها هەر کەسێ لەهەر جێگایەکدا رابکشێ و زیکر و یادی خوای تێدا نەکات ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەیکات بە داخ و خەفەت بۆی).

## دەربارەی کەفارەتی کۆڕ و دانیشتن.

## ٣٢ - باب فِي كَفَّارَةِ الْمَجْلِسِ.

٤٨٥٧ - (صحيح دون قوله: (ثلاث مرات) ) عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: كَلِمَاتٌ لاَ يَتَكَلَّمُ بِهِنَّ أَحَدٌ فِي مَجْلِسِهِ عِنْدَ قِيَامِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ إِلاَّ كُفِّرَ بِهِنَّ عَنْهُ, وَلاَ يَقُولُهُنَّ فِي مَجْلِسِ خَيْرٍ وَمَجْلِسِ ذِكْرٍ إِلاَّ خُتِمَ لَهُ بِهِنَّ عَلَيْهِ, كَمَا يُخْتَمُ بِالْخَاتَمِ عَلَى الصَّحِيفَةِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرکەسێ لەکۆڕێکدا ویستی هەستێ چەند وشەیەك هەیە سێ جار بیانڵێ ئیللا دەبنە کەفارەت و سڕینەوەی گوناهەکانی ئەو کۆڕەی، لەهەر کۆڕێکی خێر و زیکر و یادی خوای پەروەردگاردا بخوێنرێن دەبێتە خیتام و کۆتایی کۆڕەکە، وەك چۆن لەکۆتایی نامە مۆر دەکرێت ئەمەش ئەو وشانەن: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ).

٤٨٥٨ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي الله صلى الله عليه وسلم, مثله.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

٤٨٥٩ - (حسن صحيح) عن أبو برزة الأسلمي قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ بِأَخَرَةٍ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ مِنَ الْمَجْلِسِ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ, أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ لَتَقُولُ قَوْلاً مَا كُنْتَ تَقُولُهُ فِيمَا مَضَى؟ قَالَ: (كَفَّارَةٌ لِمَا يَكُونُ فِي الْمَجْلِسِ).

واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکۆتایی تەمەنیدا ئەگەر بیویستایە لە کۆڕێکدا هەستێ دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ, أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ). پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم فەرمایشتەی کە ئێستا دەیفەرمووی لەمەوپێش نەتدەفەرموو؟ فەرمووی: (ئەو وتەیە دەبێتە کەفارەت و سڕینەوەی ئەو گوناهانەی لە کۆڕەکەدا روودەدات).

## گواستنەوەی قسە لەکۆڕێکەوە بۆ کەسانی تر.

### ٣٣ - باب فِي رَفْعِ الْحَدِيثِ مِنَ الْمَجْلِسِ.

٤٨٦٠ - (ضعيف) عن عبد الله بن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يُبَلِّغْنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِي عَنْ أَحَدٍ شَيْئًا فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَخْرُجَ إِلَيْكُمْ وَأَنَا سَلِيمُ الصَّدْرِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە هەواڵێ یان قسەیەکم بۆ نەهێنێ لە یەکێ لە هاوەڵەکانمەوە کە پێم ناخۆش بێ و لێی تورە بم، چونکە من پێم خۆشە بە دڵێکی ساف و بێگەردەوە بێم بۆ ناوتان). - واتە جاسوسی و سیخوڕی بەسەر یەکەوە مەکەن - .

## دەربارەی پارێز و ترس لە خەڵك.

## ٣٤ - باب فِي الْحَذَرِ مِنَ النَّاسِ.

٤٨٦١ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو بن الفغواء الخزاعي, عن أبيه قال: دَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَقَدْ أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَنِي بِمَالٍ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ يَقْسِمُهُ فِي قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ بَعْدَ الْفَتْحِ – فَقَالَ: (الْتَمِسْ صَاحِبًا). قَالَ: فَجَاءَنِي عَمْرُو بْنُ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيُّ, فَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تُرِيدُ الْخُرُوجَ وَتَلْتَمِسُ صَاحِبًا. قَالَ: قُلْتُ: أَجَلْ . قَالَ: فَأَنَا لَكَ صَاحِبٌ. قَالَ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قُلْتُ: قَدْ وَجَدْتُ صَاحِبًا. قَالَ: فَقَالَ: (مَنْ؟). قُلْتُ: عَمْرَو بْنَ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيَّ. قَالَ: (إِذَا هَبَطْتَ بِلاَدَ قَوْمِهِ فَاحْذَرْهُ, فَإِنَّهُ قَدْ قَالَ الْقَائِلُ: أَخُوكَ الْبِكْرِيُّ وَلاَ تَأْمَنْهُ). فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِالأَبْوَاءِ قَالَ: إِنِّي أُرِيدُ حَاجَةً إِلَى قَوْمِي بِوَدَّانَ, فَتَلْبَثُ لِي, قُلْتُ: رَاشِدًا, فَلَمَّا وَلَّى ذَكَرْتُ قَوْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَشَدَدْتُ عَلَى بَعِيرِي حَتَّى خَرَجْتُ أُوضِعُهُ, حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِالأَصَافِرِ, إِذَا هُوَ يُعَارِضُنِي فِي رَهْطٍ, قَالَ: وَأَوْضَعْتُ فَسَبَقْتُهُ, فَلَمَّا رَآنِي قَدْ فُتُّهُ انْصَرَفُوا, وَجَاءَنِي فَقَالَ كَانَتْ لِي إِلَى قَوْمِي حَاجَةٌ. قَالَ: قُلْتُ: أَجَلْ, وَمَضَيْنَا حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ فَدَفَعْتُ الْمَالَ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی فەغوائی خوزاعیەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپاش رزگارکردنی شاری مەککە ویستی هەندێ ماڵ و سامان بنێرێ بۆ ئەبو سوفیان دابەشی بکات بەسەر قورەیش دا، منی بانگ کردو فەرمووی: (کەسێ پەیدا بکە بۆ هاوسەفەرت)، وتی: عەمری کوڕی ئومەییەی (الضَّمْرِيّ) هات بۆلام وتی: پێم گەیشتوە تۆ دەتەوێت بچی بۆ سەفەر و هاوسەفەرێکت دەوێ، وتی: وتم:

بەڵێ، وتی: من دەبمە هاوسەفەرت، وتی: چومەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتم: هاوڕام دەستکەوت، وتی: فەرمووی: (کێیە؟) وتم: عەمری کوڕی ئومەییەی (الضَّمْرِیّ)ە، فەرمووی: (باشە، بەڵام کە لە وڵاتەکەی دابەزیت ئاگات لەخۆت بێ و مەترسی لێ بکە، لەبرای باوك و دایکی خۆت ئەمین مەبە). جا پێکەوە دەرچوین و ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە (أَبْوَاء) وتی: من کەمێ ئیشم هەیە بە خزمەکانم لە وەددان چاوەڕێم بکە هەتا دەگەڕێمەوە، وتم: بڕۆ بە خۆشی بڕۆیت و بێیتەوە، جا کە ڕۆیشت فەرمایشتەکەی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بیرکەوتەوە، لەبەرئەوە نەوەستام وشترەکەمم توند کردەوەو خێرا لێم خوڕی هەتا لە (أَبْوَاء) دەرچووم، کە گەیشتمە ئەصافیر لەوێ لەگەڵ چەند کەسێکدا بەرەنگارم بوونەوە، منیش خێرا لێم خوڕی و پێشیان کەوتم، جا کە زانی رزگارم بوو هات بۆلام وتی: کەمێ کارم بە خزمەکانم هەبوو بۆیە چووم، وتی: وتم: بەڵێ، جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە مەککە لەوێ ماڵ و سامانەکەم دا بە ئەبو سوفیان.

٤٨٦٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (موسوڵمانی ئاقڵ و هۆشیار لەکونێکەوە دووجار ناگەزرێت).

## سەبارەت بە ڕێبازی ڕۆشتنی پیاو.

## ٣٥ - باب فِي هَدْيِ الرَّجُلِ.

٤٨٦٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا مَشَى كَأَنَّهُ يَتَوَكَّأُ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێك ڕێی دەکرد دەتوت پاڵ دەداتەوە.

٤٨٦٤ - (صحيح) عن أبو الطفيل قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ: كَيْفَ رَأَيْتَهُ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحًا إِذَا مَشَى كَأَنَّمَا يَهْوِي فِي صَبُوبٍ.

واتە: لە ئەبو (طفیل)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دیوە، وتم: کە دیوتە ڕەنگ و ڕوو شێوەی چۆن بوو؟ وتی: سور و سپیەکی جوان بوو، کاتێ کە ڕێی دەکرد دەتوت لە شوێنێکی نزمەوە دادەبەزێت.

## سەبارەت بە پیاوێ لنگ بخاتە سەر لنگ.

## ٣٦ - باب فِي الرَّجُلِ يَضَعُ إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى.

٤٨٦٥ - (صحيح) عن جابر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَضَعَ [الرجل]- وَقَالَ قُتَيْبَةُ: يَرْفَعَ الرَّجُلُ إِحْدَى - رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى - زَادَ قُتَيْبَةُ - وَهُوَ مُسْتَلْقٍ عَلَى ظَهْرِهِ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی کردوە پیاو لنگی بخاتە سەر لنگی - قوتەیبە ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەسەر پشت راکشابوو. - ئەگەر شەروالی فراوانی لەپێدا بوو ئەوە دروستە، وە ئەگەر قاچێکی راکێشێ و قاچەکەی تری بخاتە سەر ئەوەش هەر دروستە ئەوکاتە شەرمگەی نابینرێت - .

٤٨٦٦ - (صحيح) عن عبد الله بن زيد بن عاصم الأنصاري, أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُسْتَلْقِيًا - قَالَ الْقَعْنَبِيُّ: فِي الْمَسْجِدِ - وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى.

واتە: (عبد الله)ی کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاری دەڵێ بە چاوی خۆم دیم پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لەمزگەوتدا لەسەر پشت راکشابوو قەدەغەی کردوە پیاو لنگی بخاتە سەر لنگی.

٤٨٦٧ - (صحيح الإسناد عنَ عثمان) عن سعيد بن مسيب: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ كَانَا يَفْعَلاَنِ ذَلِكَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێرنەوە، کە هەردوو پێشەوایان عومەری کوڕی (خطاب) و (عثمان)ی کوڕی عەففان رەزای خوایان لێ بێ ئەو کارەیان کردووە.

# سەبارەت بە قسە گێڕانەوە.

## ٣٧ - باب فِي نَقْلِ الْحَدِيثِ.

٤٨٦٨ - (حسن) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەکاتی قسەکردندا ئاوڕی دایەوە بەملاو بەو لادا هەتا بزانێ کەس گوێی لە قسەکەیەتی یان نا ئەوە قسەکەی ئەمانەت و سپاردەیە). - بۆیە دروست نیە گوێگر بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی بۆ کەسی تری بگێڕێتەوە - .

٤٨٦٩ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْمَجَالِسُ بِالأَمَانَةِ إِلاَّ ثَلاَثَةَ مَجَالِسَ: سَفْكُ دَمٍ حَرَامٍ, أَوْ فَرْجٌ حَرَامٌ, أَوِ اقْتِطَاعُ مَالٍ بِغَيْرِ حَقٍّ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو قسەیەکی ناو کۆڕ و دانیشتن ئەمانەت و سپاردەیە گێڕانەوەیان بە مەبەستی دوو زمانی دروست نیە تەنیا ئەم سێ جۆرە نەبێت: باسی خوێنڕشتنی ناڕەوا، باسی داوێن پیسی و زیناکردن، باسی زەوتکردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا. - بۆ نمونە ئەگەر کەسێ وتی: دەمەوێ فلان کەس بکوژم، یان زینا بکەم لەگەڵ فلانە ئافرەت، یا ماڵ سامانی فلان کەس زەوت بکەم، ئەوە گێڕانەوەیان بە مەبەستی ئەوەی ئەو تاوانانە روونەدەن دروستە - .

٤٨٧٠ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الأَمَانَةِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلَ يُفْضِى إِلَى امْرَأَتِهِ وَتُفْضِى إِلَيْهِ, ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترین ئەمانەت و سپاردە لە قیامەتدا لەلای خوای گەورە و پەروەردگار ئەوەیە ژن و پیاو لە جێگای خەوتندا پێکەوە باسی کاری سەرجێی دەکەن، لەپاشدا پیاوەکە دەچێ ئەو باس و خواسە بۆ خەڵك دەگێڕێتەوە و رازو نهێنی ژنەکەی بڵاو دەکاتەوە).

## سەبارەت بە دووزمانی.

## ٣٨ - باب فِي الْقَتَّاتِ.

٤٨٧١ - (صحيح) عن حذيفة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ).

واتە: لە (حذيفة)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە).

## سەبارەت بە دووڕوو.

## ٣٩ - باب فِي ذِى الْوَجْهَيْنِ.

| ٤٨٧٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مِنْ شَرِّ النَّاسِ ذُو الْوَجْهَيْنِ الَّذِى يَأْتِي هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خراپترین کەس ئەو کەسانەن کە دووڕوون: ئەچێت بۆ لای ئەوانە بەڕوویەکەوە بەڕوویەکی ترەوە دەچێت بۆ لای ئەوانەی تر). - بۆ نمونە دەچێ بۆ لای موسوڵمانان خۆی بە موسوڵمان نیشان دەدات و دەچێت بۆ لای غەیری موسوڵمانانیش بە ناموسوڵمان خۆی لەقەڵەم دەدات - .

| ٤٨٧٣ - (صحيح) عن عمار قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: عَنْ عَمَّارٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ كَانَ لَهُ وَجْهَانِ فِي الدُّنْيَا، كَانَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِسَانَانِ مِنْ نَارٍ). |
|---|

واتە: لە عەمارەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەوی لە دونیادا دووڕوو بێ لە قیامەتدا دوو زمانی ئاگرینی دەبێ).

# سەبارەت بە غەیبەتکردن.

## ٤٠ - باب فِي الْغِيبَةِ.

٤٨٧٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, أَنَّهُ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْغِيبَةُ؟ قَالَ (ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ). قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: (إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ بَهَتَّهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم غەیبەت چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە لەپاش ملە باسی برا موسوڵمانەکەت بکەی پێی ناخۆش بێت). وترا: ئەی ئەگەر ئەوەی دەیڵێم لە براکەمدا هەبوو هەر غەیبەتە؟ فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی تێدا بوو ئەوە غەیبەتی دەکەی خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو ئەوە درۆ و بوختانی بۆ دەکەی).

٤٨٧٥ - (صحيح) عن عائشة قالت: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا - قَالَ غَيْرُ مُسَدَّدٍ - تَعْنِي قَصِيرَةً. فَقَالَ: (لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ). قَالَتْ: وَحَكَيْتُ لَهُ إِنْسَانًا, فَقَالَ: (مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنْسَانًا وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە صەفیە ئەوەت بەسە کە ئاواو ئاوایە - جگە لە موسەددەد دەڵێن - واتە کورتە باڵایە، فەرمووی: (بەڕاستی ئەو قسەی کە تۆ کردت ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە ئەگەر تێکەڵی ئاوی دەریا بکرێ هەمووی بۆگەن دەکات). عائیشە وتی: جارێ لاسایی مرۆڤێکم کردەوە بۆی، فەرمووی: (ئەگەر بە ئەوەندەو ئەوەندە واتە لەماڵ و سامانێکی زۆریش بووە حەز ناکەم لاسایی کەس بکەمەوە).

٤٨٧٦ - (صحيح) عن سعيد بن زيد: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الِاسْتِطَالَةَ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ).

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترین و حەرامترین سود (ریبا) ئەمەیە پیاو زمان درێژی بکات بەرامبەر بە شەرەف و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بە ناڕەواو ئابڕووی بەرێت).

٤٨٧٧ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ اسْتِطَالَةَ الْمَرْءِ فِي عِرْضِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ بِغَيْرِ حَقٍّ, وَمِنَ الْكَبَائِرِ السَّبَّتَانِ بِالسَّبَّةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترینی تاوانە هەرە گەورەکان ئەمەیە پیاو زمان درێژی بکات بەرامبەر بە شەرەف و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بە ناڕەواو ئابڕووی بەرێت، دوو جنێو لەباتی یەك جنێو ئەویش یەکێکە لە تاوانە هەرە گەورەکان).

٤٨٧٨ - (صحيح) عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ, فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شەوی میعراج کاتێ کە بەرزیان کردمەوە دام بەلای کۆمەڵێکدا نینۆکی مسیان هەبوو روخسار و سینگی خۆیانیان پێ دەڕوشاند، وتم: ئەی جبریل ئەوانە کێن، وتی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە غەیبەتی خەڵیان دەکردو باسی شەرەف و ناموسیان دەکردن و ئابڕوویان دەبردن).

٤٨٧٩ - عَنْ أَبِي الْمُغِيرَةِ, كَمَا قَالَ ابْنُ الْمُصَفَّى.

٤٨٨٠ - (حسن صحيح) عن أبي برزة الأسلمي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ: لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ, فَإِنَّهُ مَنِ اتَّبَعَ عَوْرَاتِهِمْ, يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ, وَمَنْ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ).

واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی کە بە زمان موسوڵمانن و ئیمان نەچۆتە دڵتانەوە: غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن و شوێن عەیبەیان مەکەون واتە جاسوسی بەسەر عەیبەیانەوە مەکەن، چونکە ئەوەی شوێن عەیبەیان بکەوێ خوای گەورە شوێن عەیبەی دەکەوێت، ئەو کەسەش کە خوای گەورە شوێن عەیبەی بکەوێت، لەناو ماڵەکەی خۆیدا ئابڕووی دبات و سوك ریسوای دەکات).

٤٨٨١ - (صحيح) عن الموستورد, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَكَلَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْلَةً فَإِنَّ اللَّهَ يُطْعِمُهُ مِثْلَهَا مِنْ جَهَنَّمَ, وَمَنْ كُسِيَ ثَوْبًا بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَكْسُوهُ مِثْلَهُ مِنْ جَهَنَّمَ, وَمَنْ قَامَ بِرَجُلٍ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَقُومُ بِهِ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە موستەوریدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەهۆی تێچاندنەوە بۆ پیاوێکی موسوڵمان پارویە بخوات خوای گەورە لە دۆزەخدا پاروویەکی وەك ئەوەی دەرخوارد دەداتەوە، هەرکەس بەهۆی تێچاندنەوە بۆ پیاوێکی موسوڵمان جل و بەرگێ لەبەر بکات خوای گەورە لە دۆزەخدا جل و بەرگێکی وەك ئەوەی لەبەر دەکات، هەرکەس بۆ ناوبانگ و شۆرەت خۆی بکات بە پیاوی باش و خۆی لە پیاوێ بباتە پێشەوە بۆ تەماعی ماڵی دونیا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا ناوبانگ و شۆرەتی دەزڕێنێ و بەدرۆی دەخاتەوەو سزای دەدات و سوك و ریسوای دەکات).

٤٨٨٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: مَالُهُ, وَعِرْضُهُ, وَدَمُهُ, حَسْبُ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو شتێکی موسوڵمان بە موسوڵمانێکی تر حەرامە: خوێن و ماڵ و سامانی و، شەرەف و ناموس و ئابڕووی، ئەوەندە بەسە بۆ خراپی موسوڵمان بە چاوی سوك تەماشای برا موسوڵمانەکەی بکات).

## باسی هەرکەسێ
## موسوڵمانێ لە غەیبەتێ بپارێزێ

### ٤١ - باب مَنْ رَدَّ عَنْ مُسْلِمٍ غِيبَةً.

٤٨٨٣ - (حسن) عن سهل بن معاذ بن أنس الجهني, عن أبيه: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ حَمَى مُؤْمِنًا مِنْ مُنَافِقٍ). أُرَاهُ قَالَ: (بَعَثَ اللَّهُ مَلَكًا يَحْمِي لَحْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ, وَمَنْ رَمَى مُسْلِمًا بِشَيْءٍ يُرِيدُ شَيْنَهُ بِهِ حَبَسَهُ اللَّهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ).

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ی کوڕی جوهەنیەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ موسوڵمانێ لەزمانی دووڕوویە بپارێزێ خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا مەلائیکەیە دەنێرێ جەستەی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ، هەرکەسێ درۆیە بۆ موسوڵمانێ هەڵبەستێ بۆ ئەوەی لەکەدار و عەیبداری بکات خوای گەورە لەسەر پردی دۆزەخ رایدەگرێ هەتا رزگاری دەبێت لەو قسەیەی کە کردویەتی).

٤٨٨٤ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله وأبا طلحة بن سهل الأنصاري يقولان: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنِ امْرِئٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيهِ حُرْمَتُهُ وَيُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ إِلاَّ خَذَلَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ فِيهِ نُصْرَتَهُ, وَمَا مِنِ امْرِئٍ يَنْصُرُ مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ يُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ وَيُنْتَهَكُ فِيهِ مِنْ حُرْمَتِهِ إِلاَّ نَصَرَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ نُصْرَتَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله) و ئەبو (طلحة)ی کوڕی سەهلی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر موسوڵمانێ بینی کەسێ دەیەوێ موسوڵمانێ سوك بکات و ئابڕووی ببات و بێ ڕێزی بەرامبەر بکات دەبێ لەسەری بکاتەوەو پشتی بگرێ و بەرگری لێ بکات ئەگینا خوای گەورە پشتی ناگرێ و یارمەتی نادات بە تایبەتی لەوکاتانەدا کە زۆر پێویستی بە پشتگیری و یارمەتیە، بەڵام ئەگەر لەسەری بکاتەوەو پشتی بگرێ ئەوە خوای گەورە لەکاتی تەنگانەدا پشتی دەگرێ و یارمەتی دەدات لە دونیاو لە قیامەتدا).

## باسی ئەو کەسەی کە غەیبەتی دروستە

## ٤٢ - باب مَنْ لَيْسَتْ لَهُ غِيبَةٌ.

٤٨٨٥ - (ضعيف بزيادة (فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ...) وهو صحيح بدونها, بزيادة الأخرى) عن جندوب قال: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَنَاخَ رَاحِلَتَهُ, ثُمَّ عَقَلَهَا, ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ, فَصَلَّى خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَتَى رَاحِلَتَهُ فَأَطْلَقَهَا, ثُمَّ رَكِبَ, ثُمَّ نَادَى اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا وَلاَ تُشْرِكْ فِي رَحْمَتِنَا أَحَدًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَتَقُولُونَ هُوَ أَضَلُّ أَمْ بَعِيرُهُ أَلَمْ تَسْمَعُوا إِلَى مَا قَالَ). قَالُوا بَلَى.

واتە: لە جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هات وشترەکەی یخ دا، لەپاشدا بەستیەوە، ئینجا چوە مزگەوتەوە لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم نوێژی کرد، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە، چوو پەتی وشترەکەی کردەوەو سواری بوو، لەپاشدا بەدەنگی بەرز هاواری کرد وتی: خودایە بەزەیت بێتەوە بە من و بە موحەممەد دا، کەس نەکەی بە هاوبەشمان و لەگەڵ ئێمەدا بەزەیت بە هیچ کەسێکی تردا نەیەتەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێوە پێتان وایە ئەو کابرایە نەزانە یان وشترەکەی گوێتان لێ بوو چی وت - ڕەحمەتی فراوانی خوای پەروەردگاری تەنگ کردەوە - ). وتیان: بەڵێ.

## ئەوەی هاتوە دەربارەی
## پیاوێ گەردنی ئەوە ئازاد بکات غەیبەتی دەکات

## ٤٣ - باب مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُحِلُّ الرَّجُلَ قَدِ اغْتَابَهُ.

٤٨٨٦ - (صحيح مقطوع) عن قتادة قال: أَيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكُونَ مِثْلَ أَبِي ضَيْغَمٍ, أَوْ ضَمْضَمٍ, شَكَّ ابْنُ عُبَيْدٍ, كَانَ إِذَا أَصْبَحَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي قَدْ تَصَدَّقْتُ بِعِرْضِي عَلَى عِبَادِكَ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کەستان دەتوانن وەك ئەبو (ضَيْغَم)، یان ئەبو (ضَمْضَم) بکەن، ئیبنو عوبەید گومانی هەبوو، هەموو سەر لە بەیانیە دەیوت: خودایە تۆ بە شایەت بە هەرکەس دەربارەی شەرەف و ناموسی من شتێکی خراپ دەڵێ گەردنی ئازاد بێ.

٤٨٨٧ - (ضعيف مرسل) عن عبد الرحمن بن عجلان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكُونَ مِثْلَ أَبِي ضَمْضَمٍ). قَالُوا: وَمَنْ أَبُو

ضَمْضَمٍ؟ قَالَ: (رَجُلٌ فِيمَنْ كَانَ مِنْ قَبْلِكُمْ). بِمَعْنَاهُ قَالَ: (عِرْضِي لِمَنْ شَتَمَنِي).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەجلانەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەستان دەتوانن وەك ئەبو (ضَمْضَم) بکەن)؟ وتیان: ئەبو (ضَمْضَم) کێیە؟ فەرمووی: (پیاوێ بوو لەنەوەکانی پێش ئێوە هەموو سەر لە بەیانیە دەیوت: خودایە تۆ بە شایەت بە هەرکەس جنێو بەمن دەدات گەردنی ئازاد بێ).

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی سیخوڕی کردن

## ٤٤ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ التَّجَسُّسِ.

٤٨٨٨ - (صحيح) عن معاوية قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ). فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةٌ سَمِعَهَا مُعَاوِيَةُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَفَعَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِهَا.

واتە: لە موعاویەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بێگومان ئەگەر تۆ شوێن عەیبەی خەڵك بکەوی دەبێ بەهۆی خراپ بوونیان، یان نزیکە ببێ بەهۆی خراپ بوونیان). ئەبو دەرداء وتی: وشەیەکی پیرۆز بوو موعاویە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستبوو لە سایەی خوای گەورە سودێکی باشی لێ وەرگرتبوو.

٤٨٨٩ – (صحيح بما قبله) عن أبو أمامة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الأَمِيرَ إِذَا ابْتَغَى الرِّيبَةَ فِي النَّاسِ أَفْسَدَهُمْ).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان ئەگەر فەرمانڕەواو کاربەدەست دڵ لەخەڵك پیس بکات و گومانی خراپیان پێ ببات ئەوە خراپیان دەکات).

٤٨٩٠ - (صحيح الإسناد) عن ابن مسعود: أَنَّهُ أُتِيَ بِرَجُلٍ فَقِيلَ لَهُ : هَذَا فُلَانٌ تَقْطُرُ لِحْيَتُهُ خَمْراً ، فَقَالَ : إِنَّا قَدْ نُهِينَا عَنِ التَّجَسُّسِ ، ولكِنْ إِنْ يَظْهَرْ لَنَا شَيْءٌ، نَأْخُذ بِهِ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە کابرایەکیان هێنا بۆ لای بۆ مەحکەمە وتیان: ئەمە فلان کەسە ئارەق لەڕیشی دەتکێ، ئەویش وتی: ئێمە - لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم - رێگریمان لێ کراوە سیخوڕی و جاسوسی بکەین بەسەر خەڵکەوە، بەڵام هەرکاتێ شتێکمان بە بەڵگەوە بۆ ساغ بوەوە ئەو کاتە دەستی پێوە دەگرین و بە پێی شەرع حوکمی دەدەین.

## سەبارەت بە پۆشینی عەیبەو نهێنی موسوڵمان

## ٤٥ - باب فِي السَّتْرِ عَنِ الْمُسْلِمِ.

٤٨٩١ - (ضعيف) عن عقبة بن عامر, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ رَأَى عَوْرَةً فَسَتَرَهَا كَانَ كَمَنْ أَحْيَا مَوْءُودَةً).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی عەیب و عەوورەت و نهێنی کەسێ بپۆشێ بە ئەندازەی ئەو کەسە خێری دەگات کە کچێ کەسوکارەکەی دەیانەوێ زیندە بە چاڵی بکەن ئەو نەهێڵێ و لەمردن رزگاری بکات).

٤٨٩٢ - (ضعيف) عن كعب بن علقمة أنه سمع أبا الهيثم يذكر أنه سمع دحينا كاتب عقبة بن عامر قال: كَانَ لَنَا جِيرَانٌ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ فَنَهَيْتُهُمْ فَلَمْ يَنْتَهُوا, فَقُلْتُ لِعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: إِنَّ جِيرَانَنَا هَؤُلاَءِ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ, وَإِنِّي نَهَيْتُهُمْ فَلَمْ يَنْتَهُوا, فَأَنَا دَاعٍ لَهُمُ الشُّرَطَ. فَقَالَ: دَعْهُمْ. ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى عُقْبَةَ مَرَّةً أُخْرَى فَقُلْتُ: إِنَّ جِيرَانَنَا قَدْ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنْ شُرْبِ الْخَمْرِ, وَأَنَا دَاعٍ لَهُمُ الشُّرَطَ. قَالَ: وَيْحَكَ دَعْهُمْ, فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ مُسْلِمٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ هَاشِمُ بْنُ الْقَاسِمِ, عَنْ لَيْثٍ, فِي هَذَا الْحَدِيثِ, قَالَ: لاَ تَفْعَلْ وَلَكِنْ عِظْهُمْ وَتَهَدَّدْهُمْ.

واتە: کەعبی کوڕی عەلقەمە، لە (أَبَا الْهَيْثَم)ی بیستوە گێڕاویەوە، لە دوخەینی نوسەری عوقبەی کوڕی عامیری بیستوە وتویەتی: هەندێ لە دراوسێکانمان ئارەقیان دەخواردەوە ڕێگریم لێ کردن بەڵام ئەوان وازیان لێ نەهێناو هەر بەردەوام بوون لەسەری، بۆیە منیش بە عوقبەی کوڕی عامیرم وت: هەندێ لە دراوسێیەکانمان ئارەق دەخۆنەوە منیش ڕێگریم لێ کردن بەڵام ئەوان وازی لێ ناهێنن، پۆلیسیان بۆ بانگ نەکەم، عوقبە وتی: وازیان لێ بێنە، لەپاشدا جارێکی تر چومەوە بۆ لای عوقبەی کوڕی عامیر پێم وت: هەندێ لە دراوسێیەکانمان ئارەق دەخۆنەوە منیش ڕێگریم لێ کردن بەڵام ئەوان واز لە ئارەق خواردنەوە ناهێنن، منیش پۆلیسیان بۆ بانگ دەکەم، عوقبە وتی: هاوار بۆ تۆ وازیان لێ بێنە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو. جا ڕاوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی موسلیمی گێڕایەوە واتە فەرمودەی پێشو، ئەبو داود دەڵێت: هاشیمی کوڕی قاسیم لە (ليث)وە ریوایەتی کردوە لەم فەرمودەدا، وتویەتی: ئەو کارە مەکە پۆلیسیان بۆ بانگ مەکە ئامۆژگاریان بکە بە سزاو تۆڵەی خوا بیانترسێنە.

# باسی کەسێ موسوڵمانێ بکات بە برای خۆی لەبەر خوا.

## ٤٦ - باب الْمُؤَاخَاةِ.

٤٨٩٣ - (صحيح) عن سالم, عن أبيه: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِم ، لا يَظْلِمهُ، وَلاَ يُسْلمُهُ. مَنْ كَانَ فِي حَاجَة أخيه، كَانَ اللهُ فِي حَاجَته، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِم كُرْبَةً، فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ بها كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَومِ القِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَومَ القِيامَةِ).

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (موسوڵمانی برای موسوڵمانە، زوڵم و ستەمی لێ ناکات، رادەستێ دوژمنی ناکات، هەرکەس ناخۆشی و خەم و پەژارەیەکی دونیا لەسەر موسوڵمانێ سوك بکات و لە تەنگانەیە رزگاری بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ناخۆشی و خەم و پەژارەیەکی لەسەر سوك دەکات و لە تەنگانەیە رزگاری دەکات، وە هەرکەس نهێنی و عەیب و عاری موسوڵمانێ بپۆشێ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا نهێنی و عەیب و عاری ئەو دەپۆشێت).

## باسی جنێو بە یەك دان.

## ٤٧ - باب الْمُسْتَبَّانِ.

٤٨٩٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْمُسْتَبَّانِ: مَا قَالاَ: فَعَلَى الْبَادِي مِنْهُمَا, مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو دوو کەسەی جنێو بە یەکتر دەدەن گوناهی ئەو جنێوانە لە ئەستۆی ئەوەیانە لەپێشدا جنێو دەدات، بە مەرجێ ستەم لێ کراوەکە یان ئەوی تریان دەستدرێژی نەکات).

## باسی بێ فیزی و خۆ بە کەمگرتن.

## ٤٨ - باب فِي التَّوَاضُعِ.

٤٨٩٥ - (صحيح) عن عياض بن حمار قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لاَ يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ, وَلاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ).

واتە: لە (عیاض)ی کوڕی حیمارەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە وەحی بۆ من کردووە: کە بێ فیز بن و خۆتان بەکەم بگرن بە جۆرێ کەس زوڵم و ستەم لەکەس نەکات و، کەس بەسەر کەسدا فەخر و شانازی نەکات و کەس خۆی لە کەسی تر بە گەورەتر نەزانێ).

# باسی تۆڵەکردنەوە.

## ٤٩ - باب فِي الانْتِصَارِ.

٤٨٩٦ - (حسن بما بعده) عن سعيد بن مصيب قال: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ وَمَعَهُ أَصْحَابُهُ, وَقَعَ رَجُلٌ بِأَبِي بَكْرٍ فَآذَاهُ, فَصَمَتَ عنه أَبُو بَكْرٍ, ثُمَّ آذَاهُ الثَّانِيَةَ فَصَمَتَ عَنْهُ أَبُو بَكْرٍ, ثُمَّ آذَاهُ الثَّالِثَةَ فَانْتَصَرَ مِنْهُ أَبُو بَكْرٍ, فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ انْتَصَرَ أَبُو بَكْرٍ, فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَوَجَدْتَ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَزَلَ مَلَكٌ مِنَ السَّمَاءِ يُكَذِّبُهُ بِمَا قَالَ لَكَ, فَلَمَّا انْتَصَرْتَ وَقَعَ الشَّيْطَانُ, فَلَمْ أَكُنْ لأَجْلِسَ إِذْ وَقَعَ الشَّيْطَانُ).

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو، پیاوێ جنێوی دا بە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری دووەم جنێوی پێ دایەوە هەر وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری سێیەم جنێوی پێ دایەوە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ وەڵامی دایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا بڕوات، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆ لەمن زویر نەبووی وەڵامم دایەوە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مەلائیکەیە لە ئاسمانەوە هاتەخوارەوە ئەو قسانەی کە پێی دەوتی بە درۆی دەخستەوە، کاتێ وەڵامت دایەوە مەلائیکەکە

ڕۆیشت و شەیتان هاتە نێوانەوە، بۆیە منیش لەجێگایەکدا دانانیشم شەیتانی لێ بێ).

٤٨٩٧ - (حسن) عن أبو هريرة: أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَسُبُّ أَبَا بَكْرٍ, وَسَاقَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ جنێوی دا بە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ. جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٤٨٩٨ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عون قال: كُنْتُ أَسْأَلُ عَنْ الِانْتِصَارِ: (وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ) فَحَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ, عَنْ أُمِّ مُحَمَّدٍ امْرَأَةِ أَبِيهِ - قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: وَزَعَمُوا أَنَّهَا كَانَتْ تَدْخُلُ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ – قَالَ: قَالَتْ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَنَا زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ, فَجَعَلَ يَصْنَعُ شَيْئًا بِيَدِهِ, فَقُلْتُ: بِيَدِهِ, حَتَّى فَطَنْتُهُ لَهَا, فَأَمْسَكَ, وَأَقْبَلَتْ زَيْنَبُ تَقْحَمُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَنَهَاهَا, فَأَبَتْ أَنْ تَنْتَهِيَ, فَقَالَ لِعَائِشَةَ: (سُبِّيهَا) فَسَبَّتْهَا, فَغَلَبَتْهَا, فَانْطَلَقَتْ زَيْنَبُ إِلَى عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَالَتْ: إِنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَقَعَتْ بِكُمْ, وَفَعَلَتْ. فَجَاءَتْ فَاطِمَةُ فَقَالَ لَهَا: (إِنَّهَا حِبَّةُ أَبِيكِ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ). فَانْصَرَفَتْ, فَقَالَتْ لَهُمْ: إِنِّي قُلْتُ لَهُ كَذَا وَكَذَا, فَقَالَ لِي كَذَا وَكَذَا. قَالَ: وَجَاءَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمَهُ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عەونەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی (الأنتصار) پرسیارم کرد:
﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾. سورة الشورى: ٤١.
واتە: وە هەرکەس تۆڵە بسەنێ لە پاش ئەوەی ستەمی لێکراوە ئا ئەوانە هیچ خەتایەکیان لەسەر نیە.
عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعان، لە دایکی موحەممەدەوە کە ژنی باوکی بوو، بۆی گێڕامەوە - ئیبنو عەون وتی: پێی وابوو وتیان: دایکی موحەممەد چوەتە خزمەت عائیشەی دایکی باوەڕداران - موحەممەد وتی: عائیشەی

دایکی باوەڕداران وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلام لەوکاتەدا زەینەبی کچی جەحشی هاوسەری پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم لەلابوو، بەدەستی شتێکی کرد وەك ئەوەی لەنێوان ژن و مێردا روودەدات. بەدەستم ئاماژەم بۆ کرد کە ئایا دەزانیت زەینەب لێرەیە، ئیتر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی لابردو وازی هێنا، زەینەب قسەی وت بە عائیشە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری لێ کرد کە قسە بڵێ بە عائیشە، بەڵام ئەو هەر وازی نەهێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عائیشەی فەرموو: (تۆش قسەی پێ بڵێ، ئەویش قسەی پێ وت و سەرکەوت بە سەریاو بەزاندی، زەینەب رۆشت بۆ لای پێشەوا عەلی کوڕی رەزای خوای لێ بێ وتی: عائیشە قسەی پێ وتون - واتە قسەی وتوە بە بەنی هاشم چونکە زەینەب دایکی کچی (عبد المطلب) بوو پوری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو -، (فاطمة) هات بۆ خزمەت باوکی شکاتی لە عائیشە کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (سوێند بە پەروەردگاری کەعبە عائیشە خۆشەویستی باوکتە). - قسەی پێ نەڵێی - (فاطمة) هەستا هاتەوە پێی وتن: رۆشتم ئاواو ئاوام وت بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش ئاواو ئاوای پێ فەرمووم. راوی وتی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی کێشەکە قسەی لەگەڵ کرد.

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی جنێودان بە مردوان.

### ٥٠ - باب فِي النَّهْيِ عَنْ سَبِّ الْمَوْتَى.

٤٨٩٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها, قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا مَاتَ صَاحِبُكُمْ فَدَعُوهُ لاَ تَقَعُوا فِيهِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو موسوڵمانەی کە هاورێیەتیتان

کردوە ئیتر بەهۆی خزمایەتی و ژن و ژنخوازی و دراوسێیەتیەوە بێت یان بەهەر هۆیەکەوە بێت، کاتێ کە مرد وازی لێ بێنن باسی شەرەف و ناموسی مەکەن بە خراپەو قسەی ناشیرینی پێ مەڵێن چونکە ئەو رووبەڕووی کردەی خۆی بۆتەوە چ چاك چ خراپ).

٤٩٠٠- (ضعيف) عن ابن عمر رضي الله عنه, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اذْكُرُوا مَحَاسِنَ مَوْتَاكُمْ وَكُفُّوا عَنْ مَسَاوِيهِمْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (باسی چاکەی مردوەکانتان بکەن، باسی خراپەکانیان مەکەن).

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی جەور و ستەم و زیناکردن و لادان لە هەق.

## ٥١ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْبَغْيِ.

٤٩٠١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (كَانَ رَجُلَانِ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ مُتَوَاخِيَيْنِ, فَكَانَ أَحَدُهُمَا يُذْنِبُ, وَالآخَرُ مُجْتَهِدٌ فِي الْعِبَادَةِ, فَكَانَ لاَ يَزَالُ الْمُجْتَهِدُ يَرَى الآخَرَ عَلَى الذَّنْبِ, فَيَقُولُ أَقْصِرْ. فَوَجَدَهُ يَوْمًا عَلَى ذَنْبٍ, فَقَالَ لَهُ: أَقْصِرْ. فَقَالَ: خَلِّنِي وَرَبِّي أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيبًا, فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ أَوْ لاَ يُدْخِلُكَ اللَّهُ الْجَنَّةَ! فَقُبِضَ أَرْوَاحُهُمَا, فَاجْتَمَعَا عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ, فَقَالَ لِهَذَا الْمُجْتَهِدِ: أَكُنْتَ بِي عَالِمًا أَوْ كُنْتَ عَلَى مَا فِي يَدِي قَادِرًا؟ وَقَالَ لِلْمُذْنِبِ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِي, وَقَالَ لِلآخَرِ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى النَّارِ). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَوْبَقَتْ دُنْيَاهُ وَآخِرَتَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (دوو پیاو لە نەوەی ئیسرائیل دۆست و هاورێی یەك بوون، یەكێكیان خەریكی پەرستش بوو، ئەوی تریشیان خەریكی گوناهو تاوان كردن بوو، ئەوەی خەریكی پەرستش بوو بەردەوام ئامۆژگاری هاورێكەی دەكرد كە دەست لە گوناهو تاوان هەڵگرێت، رۆژێ بینی تاوانێكی ئەنجام دەدا پێی وت: واز لە تاوان بێنە، ئەویش وتی: وازم لێ بێنەو برۆ بەرۆكم بەریدە خۆم و پەروەردگاری خۆم، تۆ چاودێری بەسەر منەوە، ئەویش تورە بوو وتی: سوێند بە (الله) خوای گەورە لێت خۆش نابێ و ناتخاتە بەهەشتەوە! پەروەردگاری كاربەجێ رۆحی هەردووكیانی كێشا، كۆبوونەوە لەلای خوای پەروەردگاری جیهانیاندا، خوای گەورە بەوەیان كە پەرستشی دەكرد فەرمووی: تۆ زانای بە من، یان تۆ دەسەڵاتت هەیە بەسەر ئەوەی لەدەستی مندایە؟ لەپاشدا بە تاوانبارەكەی فەرموو: تۆ بە بەبەزەیی و رەحمەتی خۆم بچۆرە بەهەشتەوە، بەوی تریشیانی فەرموو: بیبەن بۆ ناو ئاگر). ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ وتی: سوێند بە (الله) كە گیانی منی بەدەستە! بە وتەیە دنیاو دوارۆژی لەدەست چوو.

٤٩٠٢ - (صحيح) عن أبو بكرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللَّهُ تَعَالَى لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ: مِثْلُ الْبَغْيِ, وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ).

واتە: لە ئەبو بەكرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ تاوانێ جەور و ستەم و برینی سیلەی رەحم و پشت هەڵكردن لە خزم و كەس و كار شایەنی ئەوە نیە خوای گەورە لە دونیادا بە زوویی تۆڵە لە خاوەنەكەی بسێنێ، چ جای ئەو هەموو سزاو ئازارەیش كە لە دوارۆژیشدا بۆی دانراوە).

## سەبارەت بە حەسودی.

## ٥٢ - باب فِي الْحَسَدِ.

٤٩٠٣ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِيَّاكُمْ وَالْحَسَدَ, فَإِنَّ الْحَسَدَ يَأْكُلُ الْحَسَنَاتِ كَمَا تَأْكُلُ النَّارُ الْحَطَبَ). أَوْ قَالَ: (الْعُشْبَ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیار و ئاگاداری حەسودی بن، چونکە بەراستی حەسودی کردەوە چاکەکان لەناو دەبات وەك چۆن ئاگر داری وشك و پوش و پەلاش دەسوتێنێ).

٤٩٠٤ - (ضعيف عدا ما بين المعقوفتين) عن سهل بن أبي أمامة: أَنَّهُ دَخَلَ هُوَ وَأَبُوهُ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ بِالْمَدِينَةِ, فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ, فَإِذَا هُوَ يُصَلِّي صَلاَةً خَفِيفَةً دَقِيقَةً كَأَنَّهَا صَلاَةُ مُسَافِرٍ أَوْ قَرِيبًا مِنْهَا, فَلَمَّا سَلَّمَ, قَالَ أَبِي: يَرْحَمُكَ اللَّهُ أَرَأَيْتَ هَذِهِ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ أَوْ شَيْءٌ تَنَفَّلْتَهُ؟ قَالَ: إِنَّهَا الْمَكْتُوبَةُ, وَإِنَّهَا لَصَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَخْطَأْتُ إِلاَّ شَيْئًا سَهَوْتُ عَنْهُ, فَقَالَ (أنس): إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: (لاَ تُشَدِّدُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَيُشَدَّدَ عَلَيْكُمْ, فَإِنَّ قَوْمًا شَدَّدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ فَشَدَّدَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ فَتِلْكَ بَقَايَاهُمْ فِي الصَّوَامِعِ وَالدِّيَارِ (رَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ)). ثُمَّ غَدَا مِنَ الْغَدِ فَقَالَ: أَلاَ تَرْكَبُ لِتَنْظُرَ وَلِتَعْتَبِرَ قَالَ: نَعَمْ, فَرَكِبُوا جَمِيعًا فَإِذَا هُمْ بِدِيَارٍ بَادَ أَهْلُهَا وَانْقَضَوْا وَفَنَوْا خَاوِيَةً عَلَى عُرُوشِهَا, فَقَالَ: (أَتَعْرِفُ هَذِهِ الدِّيَارَ؟). فَقُلْتُ مَا أَعْرَفَنِي بِهَا وَبِأَهْلِهَا, هَذِهِ دِيَارُ قَوْمٍ أَهْلَكَهُمُ الْبَغْيُ وَالْحَسَدُ إِنَّ الْحَسَدَ يُطْفِئُ نُورَ الْحَسَنَاتِ, وَالْبَغْيُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ, وَالْعَيْنُ تَزْنِي وَالْكَفُّ وَالْقَدَمُ وَالْجَسَدُ وَاللِّسَانُ وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی ئەبو ئومامەوە هاتووە، کە خۆی و باوکی لە مەدینە چونەتە خزمەت ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەنەس کاربەدەستی مەدینە بوو لەلایەن عومەری کوڕی (عبد العزیز)ەوە، ئەنەس نوێژێکی سوکەڵەی کورت و پوختی کرد بەجوانی ئەتوت نوێژی موسافیرە یان نزیك لەو، کاتێ کە سڵاوی دایەوە، باوکم وتی: خوا رەحمەت پێ بکات پێم بڵێ ئەوە نوێژی فەرز بوو یان نوێژی سونەت؟ وتی: نوێژی فەرز بوو، ئەمە وەك نوێژی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم هەڵەم نەکردووە مەگەر لە شتێکدا سەهوم کردبێ و لەبیرم چوبێ.
ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (قورسی مەکەن لەسەر خۆتان، فەرز دەبێ لەسەرتان و دەکەونە نارەحەتیەوەو بەرگەی ناگرن و بێ هێز و لاواز دەبن و هەندێ لەو فەرزانەتان لەکیس دەچێت، چونکە بەڕاستی قەومێ پەرستش و عیبادەتەکانیان لەسەر خۆیان قورس و گران کرد، خوای گەورەش قورس و گرانی کردلەسەریان، لەناو پەرستگاو دێر و شوێنی خواپەرستی دا دەمانەوە: ﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ ﴾.سورة الحدید:٢٧. واتە: گۆشەگیریان داهێناو کردیانە پیشەیان ئێمەش پێویستمان نەکردبوو لەسەریان کە تەرکی دونیا بکەن.
لەپاشدا بۆ بەیانی ئەبو ئومامە دەرچوو، ئەنەس وتی: ئەوە بۆ سەرناکەوی و سواری وڵاخەکەت نابێ بڕۆی سەرنج بدەیت و پەند و عیبرەت وەرگریت، وتی: بەڵێ باشە، هەموویان سەرکەوتن و دایان بەلای ئاواییەکی وێرانەو کاول بوودا خەڵکەکەی لەناوچوبوون و دارو بەردی کەوتبو بەسەر یەکدا ﴿ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾. سورة البقرە:٢٥٩. واتە: دارو بەردی هەموو بەسەر یەکدا کەوتوەو چۆڵ وێرانەیەو دیوارەکانی بە سەقفەکەیەوە تەپیوە.
وتی: ئەزانی ئەم ئاواییە کوێیە؟ وتم: نازانم، خەڵکەکەیشی ناناسم، ئەمە ئاواییەکە جەور و ستەم و بەدڕەوشتی و بەدکاری و حەسودی بوو بەهۆی لەناوچونیان، حەسودی نور و روناکی چاکەکان ئەکوژێنێتەوەو جەور و ستەم و بەدڕەوشتی و بەدکاری بەڕاستی دەخاتەوە یان بەدرۆی دەخاتەوە، چاو و دەست و قاچ و جەستەو زمان و زینا دەکەن، جا شەرمگە بەڕاستی دەخاتەوە یان بەدرۆی دەخاتەوە.

## سەبارەت بە نەفرەتکردن.

## ٥٣ - باب فِي اللَّعْنِ.

٤٩٠٥ - (حسن) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا لَعَنَ شَيْئًا صَعِدَتِ اللَّعْنَةُ إِلَى السَّمَاءِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ دُونَهَا, ثُمَّ تَهْبِطُ إِلَى الأَرْضِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُهَا دُونَهَا, ثُمَّ تَأْخُذُ يَمِينًا وَشِمَالاً, فَإِذَا لَمْ تَجِدْ مَسَاغًا رَجَعَتْ إِلَى الَّذِى لُعِنَ, فَإِنْ كَانَ لِذَلِكَ أَهْلاً وَإِلاَّ رَجَعَتْ إِلَى قَائِلِهَا).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەندەی خوا کاتێ کە نەفرەت لەشتێ دەکات، ئەو نەفرەتە بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان بەڵام دەرگاکانی ئاسمانی لێ دادەخرێت، لەپاشدا دێتەوە خوارەوە بۆ زەوی دەرگاکانی زەوی لێ دادەخرێت، ئینجا بەلای راست و چەپدا دەڕوات، ئەگەر رێگەی دەرچوونی دەست نەکەوت بەرەو لای نەفرەت لێ کراوەکە دەڕوات، جا ئەگەر نەفرەت لێکراوەکە شایەنی ئەو نەفرەتە بێت ئەوا بەری دەکەوێت، ئەگەر شایەنیشی نەبوو دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی).

٤٩٠٦ - (حسن) عن سمرة بن جندب: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَلاَعَنُوا بِلَعْنَةِ اللَّهِ وَلاَ بِغَضَبِ اللَّهِ, وَلاَ بِالنَّارِ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بە یەکتر مەڵێن بەر نەفرەتی خوا کەوی یان نەفرەتی خوات لێ بێ، یان بەر خشم و قین و توڕەیی خوا بکەوی، یا خوای گەورە بتخاتە ئاگری دۆزەخەوە).

٤٩٠٧ - (صحيح) عن أبو الدرداء قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَكُونُ اللَّعَّانُونَ شُفَعَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نەفرین کاران لەڕۆژی قیامەتدا پلەو پایەی شەهیدی و پلەو پایەی تکاکاریان پێ نادرێت).

٤٩٠٨ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً لَعَنَ الرِّيحَ - وَقَالَ مُسْلِمٌ: إِنَّ رَجُلاً نَازَعَتْهُ الرِّيحُ رِدَاءَهُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَعَنَهَا - فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَلْعَنْهَا فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ, وَإِنَّهُ مَنْ لَعَنَ شَيْئًا لَيْسَ لَهُ بِأَهْلٍ رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ)..

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ نەفرەتی لە با کرد - موسلیم وتی: پیاوێ لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم با پۆشاکەکەی هەڵدەدایەوەو بەم لاو لادا دەیبرد، ئەویش نەفرەتی لێ کرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (نەفرەتی لێ مەکە چونکە ئەو بایە لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە، هەرکەس نەفرەت لەشتێ بکات ئەو شتە شایەنی ئەو نەفرەتە نەبێت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆی).

## ئەوەی دوعا دەکات لەو کەسەی ستەمی لێ کردووە.

## ٥٤ - باب فِيمَنْ دَعَا عَلَى مَنْ ظَلَمَ.

٤٩٠٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: سُرِقَ لَهَا شَيْءٌ فَجَعَلَتْ تَدْعُو عَلَيْهِ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ تُسَبِّخِي عَنْهُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە داپۆشەرێكی هەبوو دزییان، دوعای دەكرد لەوەی كە دزیویەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو سزایەی كە دزەكە شایستەیەتی بە دوعاكردن لێی لەسەری سوك مەكە). (پێشتر بە ژمارە: ١٤٨٧ هاتووە).

## سەبارەت بە كەسێ دەنگ لەبرا موسوڵمانەكەی دابڕێ

## ٥٥ - باب في هجرة الرجل أخاه المسلم.

٤٩١٠ - (صحيح) عن أنس بن مالك, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَبَاغَضُوا, وَلاَ تَحَاسَدُوا, وَلاَ تَدَابَرُوا, وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا, وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با ڕقتان لەیەكتر نەبێ و یەكتر مەبوغزێنن، حەسودی بە یەكتر مەبەن - ئاواتەخواز مەبن نیعمەتەكانی برا موسوڵمانەكەتان لەناوبچێ -، پشت لە یەكتر مەكەن، بەندەی خوا و برای یەكتر بن، بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەكات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر).

٤٩١١ -(صحيح) عن أبو أيوب الأنصاري, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ, يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا وَخَيْرُهُمَا الَّذِى يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ).

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه

وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەکات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر، بەشێوەیە کاتێ کە بگەن بە یەك هەریەکەیان ڕوو بکات بە لایەکداو پشت لەیەکتر هەڵکەن، چاکترینیان ئەو کەسەیانە لەپێشەوە سەلام لەوی تریان دەکات).

٤٩١٢ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَحِلُّ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَهْجُرَ مُؤْمِنًا فَوْقَ ثَلاَثٍ, فَإِنْ مَرَّتْ بِهِ ثَلاَثٌ فَلْيَلْقَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ فَإِنْ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ فَقَدِ اشْتَرَكَا فِي الأَجْرِ, وَإِنْ لَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ فَقَدْ بَاءَ بِالإِثْمِ). زَادَ أَحْمَدُ (وَخَرَجَ الْمُسَلِّمُ مِنَ الْهِجْرَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەکات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر، لەپاش ئەو سێ شەو و ڕۆژە ئەگەر پێی گەیشت با سڵاوی لێ بکات، ئەگەر وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە ئەوە لەخێر و چاکەدا هاوبەشن، بەڵام ئەگەر وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە ئەوە گوناهو تاوانەکە دەگەڕێتەوە بۆی و لەئەستۆی ئەوە). پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەو کەسەی کە سڵاوەکە دەکات گوناهو تاوانەکەی لەئەستۆ دەردەچێت).

٤٩١٣ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَكُونُ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ مُسْلِمًا فَوْقَ ثَلاَثَةٍ, فَإِذَا لَقِيَهُ سَلَّمَ عَلَيْهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ كُلُّ ذَلِكَ لاَ يَرُدُّ عَلَيْهِ فَقَدْ بَاءَ بِإِثْمِهِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ دروست نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەکات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر، لەپاش ئەو سێ شەو و ڕۆژە ئەگەر پێی گەیشت با سێ جار سڵاوی لێ

بكات، ئەگەر لەهەر سێ جارەكەدا وەڵامی سڵاوەكەی نەدایەوە ئەوە گوناهو تاوانەكە دەگەڕێتەوە بۆی و لەئەستۆی ئەودایە).

٤٩١٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ, فَمَنْ هَجَرَ فَوْقَ ثَلاَثٍ فَمَاتَ دَخَلَ النَّارَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەكات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر، ئەگەر لەوە زیاتر قسەی لەگەڵ نەكات و لەسەر ئەو حاڵە بمرێ دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە).

٤٩١٥ - (صحيح) عن أبو خراش السلمي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ هَجَرَ أَخَاهُ سَنَةً فَهُوَ كَسَفْكِ دَمِهِ).

واتە: لە ئەبو خیراشی سولەمیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەس بۆ ماوەی ساڵێ دەنگ لەبرایەكی موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەكات وەك ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێ واتە ئەوەندە گوناهی دەگات).

٤٩١٦ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ كُلَّ يَوْمِ اثْنَيْنِ وَخَمِيسٍ, فَيُغْفَرُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمَيْنِ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ مَنْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ, فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَجَرَ بَعْضَ نِسَائِهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا. وَابْنُ عُمَرَ هَجَرَ ابْنًا لَهُ إِلَى أَنْ مَاتَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِذَا كَانَتِ الْهِجْرَةُ لِلَّهِ فَلَيْسَ مِنْ هَذَا بِشَيْءٍ, وَإِنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ غَطَّى وَجْهَهُ عَنْ رَجُلٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو رۆژانێکی دوو شەممان و پێنج شەممان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، لەو دوورۆژەدا خوای گەورە لە هەموو بەندەیە خۆش دەبێت بەمەرجێ ئەو بەندەیە هیچ هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ، وە لەو دوو کەسەش خۆش نابێ کە ناکۆکن لەناوخۆیانداو رقیان لە یەکترەو قسە لەگەڵ یەك ناکەن، دەوترێ: وازبهێنن لەو دوو کەسە هەتا ئاشت دەبنەوە ئەو کاتە قەڵەمی عەفو بێنن بەسەر تاوانەکانیاندا). ئەبو داود دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چل رۆژ قسەی لەگەڵ یەکێ لە هاوسەرەکانی نەکردوە. ئیبنو عومەر کوڕێکی هەبوو هەتا مرد قسەی لەگەڵ نەکرد. ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر دەنگ دابڕین لەبەر خوای گەورە بێت هیچی تێدا نیە، عومەری کوڕی (عبد العزیز) رووخساری خۆی داپۆشی لە پیاوێ.

## سەبارەت بە گومان

## ٥٦ - باب فِي الظَّنِّ.

٤٩١٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ, وَلاَ تَحَسَّسُوا, وَلاَ تَجَسَّسُوا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن و دووربن لە گومان، چونکە گومانی خراپ درۆی رووتە، داوای شت مەکەن بە هەستەکان و بەدوای عەیب و عاری خەڵدا مەگەڕێن و سیخوڕی و جاسوسی مەکەن بەسەر یەکەوە).

## سەبارەت بە ئامۆژگاری كردن و پاراستنی موسوڵمان.

## ٥٧ - باب فِي النَّصِيحَةِ وَالْحِيَاطَةِ.

٤٩١٨ - (حسن) عن أبو هريرة, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ, وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ, يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ, وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە، بڕوادار برای بڕوادارە، دەبێ بەپێی توانا لەڕوو لەپاش ملە سەر و ماڵی بپارێزێ و نەیەڵێ لەناوبچێ و زیانی پێ بگات و لەسەری بكاتەوە).

## سەبارەت بە چاكسازی نێوان خەڵك.

## ٥٨ - باب فِي إِصْلاَحِ ذَاتِ الْبَيْنِ.

٤٩١٩ - (صحيح) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟). قَالُوا: بَلَى. قَالَ: (إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ؛ وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ: الْحَالِقَةُ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەواڵتان بدەمێ بە چاكتر لە پلەو پایەی ڕۆژوو نوێژ

و خێر و خێرات؟). وتیان: بەڵێ: فەرمووی: (چاکسازی نێوان خەڵك - واتە ئاشتکردنەوەی ئەو کەسانەی قسە لەگەڵ یەك ناکەن و ناکۆکن و نێوانیان تێك چووە - تێکدانی نێوان خەڵك تاشەری دینە واتە وەك چۆن گوێزان موو دەتاشێ ئەویش ئاوا دین دەتاشێ).

٤٩٢٠ - (صحيح) عن حميد بن عبد الرحمن عن أمه: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَمْ يَكْذِبْ مَنْ نَمَى بَيْنَ اثْنَيْنِ لِيُصْلِحَ). وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ وَمُسَدَّدٌ (لَيْسَ بِالْكَاذِبِ مَنْ أَصْلَحَ بَيْنَ النَّاسِ فَقَالَ خَيْرًا أَوْ نَمَى خَيْرًا).

واتە: لە حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە، لە دایکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوکەسە درۆزن نیە لەنێوان دووکەسدا قسە دەهێنێ و دەیبات بۆئەوەی ڕێکیان بخاتەوە و ئاشتیان بکاتەوە). ئەحمەدی کوڕی موحەممەدو موسەددەد دەڵێن: (ئەوکەسە درۆزن نیە لەنێوان خەڵکدا قسەی خێر دەکات یان قسە دەهێنێ و دەیبات بۆئەوەی ڕێکیان بخاتەوە و ئاشتیان بکاتەوە).

٤٩٢١ - (صحيح) عن حميد بن عبد الرحمن عن أمه أم كلثوم بنت عقبة قالت: أن النبي صلى الله عليه وسلم قالت: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرَخِّصُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْكَذِبِ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (لاَ أَعُدُّهُ كَاذِبًا الرَّجُلُ يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ يَقُولُ الْقَوْلَ وَلاَ يُرِيدُ بِهِ إِلاَّ الإِصْلاَحَ, وَالرَّجُلُ يَقُولُ فِي الْحَرْبِ, وَالرَّجُلُ يُحَدِّثُ امْرَأَتَهُ وَالْمَرْأَةُ تُحَدِّثُ زَوْجَهَا).

واتە: لە حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە، لە دایکی (أم کلثوم)ی کچی عوقبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم روخسەتی درۆکردنی دابێت لە سێ حاڵەتدا نەبێت، پێغەمبەری

خوا صلى الله عليه وسلم دەيفەرموو: (ئەو پياوە بە درۆزن لەقەڵەم نادرێت چاكسازى بكات لەنێوان خەڵكدا قسەيە بكات تەنها مەبەستى خێر و چاكەو ئاشتەوايى بێت، لە جەنگدا - وەك ئەوەى بڵێ لەشكرى موسوڵمانان ژمارەيان زۆر زۆرە -، ژن و پياوێ بۆ رازيكردنى يەكتر).

٤٩٢١ - (صحيح) عن حميد بن عبد الرحمن عن أمه أم كلثوم بنت عقبة قالت: أن النبي صلى الله عليه وسلم قالت: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرَخِّصُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْكَذِبِ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (لاَ أَعُدُّهُ كَاذِبًا الرَّجُلُ يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ يَقُولُ الْقَوْلَ وَلاَ يُرِيدُ بِهِ إِلاَّ الإِصْلاَحَ, وَالرَّجُلُ يَقُولُ فِي الْحَرْبِ, وَالرَّجُلُ يُحَدِّثُ امْرَأَتَهُ وَالْمَرْأَةُ تُحَدِّثُ زَوْجَهَا).

واتە: لە حومەيدى كوڕى (عبد الرحمن)ەوە، لە دايكى (أم كلثوم)ى كچى عوقبەوە دەگێرنەوە، كە وتويەتى: هەرگيز نەمديوە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم روخسەتى درۆكردنى دابێت لە سێ حاڵەتدا نەبێت، پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم دەيفەرموو: (ئەو پياوە بە درۆزن لەقەڵەم نادرێت چاكسازى بكات لەنێوان خەڵكدا قسەيە بكات تەنها مەبەستى خێر و چاكەو ئاشتەوايى بێت، لە جەنگدا - وەك ئەوەى بڵێ لەشكرى موسوڵمانان ژمارەيان زۆر زۆرەو واش نەبێت -، ژن و مێرد بۆ رازيكردنى يەكتر و خۆشەويستى زياتر).

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی گۆرانی.

### ٥٩ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْغِنَاءِ.

٤٩٢٢ - (صحيح) عن الربيع بنت معوذ بن عفراء قالت: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ عَلَيَّ صَبِيحَةَ بُنِيَ بِي فَجَلَسَ عَلَى فِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ مِنِّي، فَجَعَلَتْ جُوَيْرِيَاتٌ يَضْرِبْنَ بِدُفٍّ لَهُنَّ، وَيَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ آبَائِي يَوْمَ بَدْرٍ إِلَى أَنْ قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ. فَقَالَ (دَعِي هَذِهِ وَقُولِي الَّذِي كُنْتِ تَقُولِينَ).

واتە: لە رەبیعی کچی (مُعَوِّذ)ی کوڕی عەفرائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کە شووم کردو گوێزرامەوە یەکەم شەوی بوکێنیم بۆ بەیانیەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لام لەسەر جێگاکەم دانیشت کچانی ئەنصار دەفیان لێ دەداو گۆرانیان دەوت لە گۆرانیەکانیاندا باسی چاکەو ئازایەتی باوکم و باپیرانی منیان دەکرد کە لەجەنگی بەدردا کوژرابوون - بێگومان باوکی و برایەکی کوژرابوون -، یەکێکیان دەیوت: لەناوماندا پێغەمبەرێك هەیە دەزانێ سبەینێ چی روودەدات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە مەڵێ واز لەو قسەیە بێنە - چونکە بەس خوای پەروەردگار غەیب دەزانێ - ئەوانەی پێشو بڵێ).

٤٩٢٣ - (صحيح الإسناد) عن أنس قال: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ لَعِبَتِ الْحَبَشَةُ لِقُدُومِهِ فَرَحًا بِذَلِكَ لَعِبُوا بِحِرَابِهِمْ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆچی کرد لە مەککەوە بۆ شاری مەدینەی منەوەرە بە گەیشتنی

خەڵکی مەدینە خۆشی و شادیان دەربڕی و حەبەشیەکان بە رمەکانیان یاریان دەکردو گۆرانیان دەوت.

## دەربارەی کەراهیەتی گۆرانی و ئەو ئامێرەی لەگەڵی لێی دەدەن

## ٦٠ - باب كَرَاهِيَةِ الْغِنَاءِ وَالزَّمْرِ.

٤٩٢٤ - (صحيح) عن نافع قال: سَمِعَ ابْنُ عُمَرَ مِزْمَارًا, قَالَ: فَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ عَلَى أُذُنَيْهِ, وَنَأَى عَنِ الطَّرِيقِ وَقَالَ لِي: يَا نَافِعُ هَلْ تَسْمَعُ شَيْئًا؟ قَالَ: فَقُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَرَفَعَ أُصْبُعَيْهِ مِنْ أُذُنَيْهِ, وَقَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمِعَ مِثْلَ هَذَا فَصَنَعَ مِثْلَ هَذَا. قَالَ أَبُو عَلِيٍّ اللُّؤْلُؤِيُّ: سَمِعْتُ أَبَا دَاوُدَ يَقُولُ: هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر گوێی لەدەنگی نای یان بلوێر بوو، پەنجەی خستە کونی گوێکانیەوە بۆ ئەوەی نەیبیستێ، لەرێگە لایداو دورکەوتەوەو پێی وتم: ئەی نافیع دەنگی هیچ شتێ دەبیستی؟ وتی: وتم: نا، وتی: پەنجەکانی دەرهێنا وتی: جارێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بوو گوێی لەشتێکی لەو جۆرە بوو بەم شێوەیەی کرد.

٤٩٢٥ - (حسن صحيح الإسناد) عن نافع قال: كُنْتُ رِدْفَ ابْنِ عُمَرَ إِذْ مَرَّ بِرَاعٍ يَزْمُرُ, فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەپشکۆی ئیبنو عومەرەوە سوار بوو

بووم کاتێ کە دای بەلای شوانەکەدا بلوێری لێ دەدا، جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە وەك فەرمووودەی پێشو.

٤٩٢٦ - (صحيح الإسناد) عن نافع قال: كُنَّا مَعَ ابْنِ عُمَرَ فَسَمِعَ صَوْتَ زَامِرٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە خزمەت ئیبنو عومەردا بووین گوێی لەدەنگی بلوێر بوو، جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە وەك فەرمووودەی پێشو.

٤٩٢٧ - (ضعيف) عن سلام بن مسكين عن شيخ: شَهِدَ أَبَا وَائِلٍ فِي وَلِيمَةٍ فَجَعَلُوا يَلْعَبُونَ يَتَلَعَّبُونَ يُغَنُّونَ فَحَلَّ أَبُو وَائِلٍ حَبْوَتَهُ وَقَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الْغِنَاءُ يُنْبِتُ النِّفَاقَ فِي الْقَلْبِ).

واتە: لە سەلامی کوڕی میسکینەوە، لە شێخەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو وائیل ئامادەی وەلیمەیە بوو یاری و گاڵتەو گەپیان دەکردو گۆرانیان دەوت ئەبو وائیل بە شێوەیە دانیشتبو هەردوو ئەژنۆی نابوو بە سنگیەوەو بە پۆشاکەکەی توندی کردبوو بە پشتیەوە شێوە دانیشتنەکەی خۆی تێکداو وتی: بۆ خۆم گوێم لە (عبد الله) بوو دەیوت: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (گۆرانی دەبێتەهۆی دروستبونی دووڕووی و نیفاق لەدڵداو گەشەی پێ دەکات).

## حوکم و بڕیار لەبارەی پیاوی سەر ژنانیەوە.

## ٦١ - باب فِي الْحُكْمِ فِي الْمُخَنَّثِينَ.

٤٩٢٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِمُخَنَّثٍ قَدْ خَضَبَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ بِالْحِنَّاءِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا بَالُ هَذَا). فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَتَشَبَّهُ بِالنِّسَاءِ. فَأُمِرَ بِهِ فَنُفِيَ إِلَى النَّقِيعِ, فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نَقْتُلُهُ؟ فَقَالَ (إِنِّي نُهِيتُ عَنْ قَتْلِ الْمُصَلِّينَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێکی سەر ژنانیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، هەردوو دەستی و هەردوو قاچی خۆی گرتبوە خەنە، فەرمووی: (ئەمە بۆ وای لەخۆی کردووە؟).پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە سەر ژنانیەو خۆی چواندووە بە ژنان و لاسایی ئەوان دەکاتەوە، فەرمانی دا شاربەدەری بکەن و نەفی بکەن بۆ نەقیع - لە دەورو بەری مەدینەیە-، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ نەیکوژین؟ فەرمووی: (کوشتنی نوێژکەرانم لێ قەدەغەکراوە).

٤٩٢٩ - (صحيح) عن أم سلمة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا مُخَنَّثٌ وَهُوَ يَقُولُ لِعَبْدِ اللَّهِ أَخِيهَا: إِنْ يَفْتَحِ اللَّهُ الطَّائِفَ غَدًا دَلَلْتُكَ عَلَى امْرَأَةٍ تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْمَرْأَةُ كَانَ لَهَا أَرْبَعُ عُكَنٍ فِي بَطْنِهَا.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە جارێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چووە بۆ لای لەوکاتەدا پیاوێکی سەر ژنانی لەلا بوو، بە (عبد الله)ی برای دەوت: ئەگەر سبەینێ خوای گەورە لەسەر دەستی موسوڵمانان قەڵای (طائف)ی زرگار کرد،

ژنێکت نیشان دەدەم لەپێشەوە نەرم و نۆڵەو چوار لۆیە، لەدواوە خڕ و خەپانەو هەشت لۆیە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە گوێی لەو قسانەی بوو فەرمووی: (لە ماڵەکانتان دەریان بکەن و مەهێڵن ئەمانە هاتوچۆتان بکەن).
ئەبو داود دەڵێت: ژنەکە چوار لۆچ لەسکیدا هەبوو.

٤٩٣٠ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنَ النِّسَاءِ, وَقَالَ (أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ وَأَخْرِجُوا فُلَانًا وَفُلَانًا). يَعْنِي الْمُخَنَّثِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردووە لە پیاوانی سەر ژنانی و لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دچوێنن بە پیاوان و لاسایی ئەوان دەکەنەوە، وە دەفەرمووێت: (لە ماڵەکانتان دەریان بکەن، فلان و فلان دەربکەن) واتە: پیاوە سەر ژنانیەکان.

## دەربارەی بوکڵەو یاری مناڵان.

## ٦٢ - باب فِي اللَّعِبِ بِالْبَنَاتِ.

٤٩٣١ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ, فَرُبَّمَا دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدِي الْجَوَارِي, فَإِذَا دَخَلَ خَرَجْنَ, وَإِذَا خَرَجَ دَخَلْنَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێ کیژۆڵەدا کە هاتبوون بۆلام یاریم دەکرد بە یاری مناڵانە، کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەهاتەوە ئەوان ئەچوونە دەرەوە، کاتێ کە ئەو ئەچووە دەرەوە ئەوان ئەهاتنەوە ژوورەوە.

٤٩٣٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ, أَوْ خَيْبَرَ, وَفِي سَهْوَتِهَا سِتْرٌ, فَهَبَّتْ رِيحٌ فَكَشَفَتْ نَاحِيَةَ السِّتْرِ عَنْ بَنَاتٍ لِعَائِشَةَ لُعَبٍ, فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ؟). قَالَتْ: بَنَاتِي. وَرَأَى بَيْنَهُنَّ فَرَسًا لَهُ جَنَاحَانِ مِنْ رِقَاعٍ, فَقَالَ: (مَا هَذَا الَّذِى أَرَى وَسْطَهُنَّ؟). قَالَتْ فَرَسٌ. قَالَ: (وَمَا هَذَا الَّذِى عَلَيْهِ؟). قَالَتْ: جَنَاحَانِ. قَالَ (فَرَسٌ لَهُ جَنَاحَانِ؟). قَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ أَنَّ لِسُلَيْمَانَ خَيْلاً لَهَا أَجْنِحَةٌ؟! قَالَتْ: فَضَحِكَ حَتَّى رَأَيْتُ نَوَاجِذَهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای تەبوك یان خەیبەر گەڕایەوە، بەسەر رەفەکەیانەوە پەردەیەك دەبێت، با هەڵ دەکات پەردەکە لادەدات و بوکەکانی عائیشە دەردەکەون، دەفەرمووێت: (ئەوانە چین ئەی عائیشە؟) دەڵێ: بوکەکانمە، لەنێوانیاندا ئەسپێکی دوو باڵ دەبینێ بە پارچە پەڕۆ دروستکراوە، دەفەرمووێت: (ئەوە چییە لە ناوەڕاستیاندا؟). دەڵێ: ئەسپە، دەفەرمووێت: (ئەوە چییە بەسەر پشتیەوە؟) دەڵێ: باڵن، دەفەرمووێت: (ئەسپ و باڵی هەبێ؟) دەڵێ: ئەی نەتبیستوە سولەیمان ئەسپی باڵداری هەبووە، عائیشە دەڵێ: ئەوەندە پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوتن.

## سەبارەت بە جۆلانە

## ٦٣ - باب فِي الأُرْجُوحَةِ.

٤٩٣٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَزَوَّجَنِي وَأَنَا بِنْتُ سَبْعٍ أو ستَّ سِنِينَ, فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ أَتَيْنَ نِسْوَةٌ, وَقَالَ بِشْرٌ: فَأَتَتْنِي أُمُّ رُومَانَ, وَأَنَا عَلَى أُرْجُوحَةٍ, فَذَهَبْنَ بِي, وَهَيَّأْنَنِي, وَصَنَعْنَنِي فَأُتِيَ بِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَنَى بِي, وَأَنَا ابْنَةُ تِسْعٍ, فَوَقَفَتْ بِي عَلَى الْبَابِ, فَقُلْتُ: هِيهْ هِيهْ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَيْ: تَنَفَّسَتْ, فَأُدْخِلْتُ بَيْتًا فَإِذَا فِيهِ نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ, فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: تەمەنم شەش یان حەوت ساڵان بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مارەی کردم، کاتێ کە کۆچمان کردو گەیشتینە مەدینە، ژنان هاتن، بیشر وتی: ئوممو ڕومانی دایکم هات بۆلام، لەوکاتەدا من لەناو جۆلانەدا بووم، بردمیان، سەریان شۆردم و ڕێکیان خستم و ڕازاندمیانەوەو گواستمیانەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و بوو بە زاوا، ئەو کاتە من نۆ ساڵان بووم، دایکم لەبەر دەرگای ماڵ ڕایوەستاندم، ئەوەندە ماندوو بووم هەناسەم سوار بوو بوو وتم: (هِيهْ هِيهْ). ئەبو داود دەڵێت: واتە: عائیشە هەناسەی سوار بوو بوو، چومە ماڵێکەوە ژنانی ئەنصاری لێ بوو دەیان وت: لەسەر خێر و بەرەکەت بە خۆشی.

٤٩٣٤ - (صحيح) عن أبو أسامة, مثله, قال: عَلَى خَيْرِ طَائِرٍ, فَسَلَّمَتْنِي إِلَيْهِنَّ, فَغَسَلْنَ رَأْسِي, وَأَصْلَحْنَنِي, فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضُحًى, فَأَسْلَمْنَنِي إِلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو ئوسامەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەختێکی زۆر زۆر باش، هیچ شتێ رای نەچڵەکاندم ئەوە نەبێ لەناکاو لەکاتی چێشتەنگاودا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی کرد بەژوردا، ئیتر ژنەکان رادەستی ئەویان کردم.

٤٩٣٥ - (صحيح الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها قالت: فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ جَاءَنِي نِسْوَةٌ وَأَنَا أَلْعَبُ عَلَى أُرْجُوحَةٍ, وَأَنَا مُجَمَّمَةٌ, فَذَهَبْنَ بِي, فَهَيَّأْنَنِي, وَصَنَّعْنَنِي, ثُمَّ أَتَيْنَ بِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَنَى بِي وَأَنَا ابْنَةُ تِسْعِ سِنِينَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە کۆچمان کردو گەیشتینە مەدینە، ژنان هاتن بۆ لامان، لەوکاتەدا من لەناو جۆلانەدا یاریم دەکرد، قژەکانم شۆڕ بوو بوونەوە بەسەر شانمدا، بردمیان، سەریان شۆردم و رێکیان خستم و رازاندمیانەوە، لەپاشدا گواستمیانەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو بە زاوا، ئەو کاتە نۆ ساڵان بووم.

٤٩٣٦ - (صحيح الإسناد) عن هشام بن عروة باسناده في هذا الحديث, قالت: وَأَنَا عَلَى الأُرْجُوحَةِ وَمَعِي صَوَاحِبَاتِي, فَأَدْخَلْنَنِي بَيْتًا, فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە بە سەنەدی خۆی هەمان فەرموودەی گێڕایەوە، عائیشە وتی: من لەناو جۆلانەدا بوو لەگەڵ هاوڕێ کیژۆڵەکانمدا یاریم دەکرد، ژنان هاتن بردمیانە ماڵێکەوە، هەندێ لە ئافرەتانی ئەنصاری لەوێ بوون وتیان: لەسەر خێر و بەرەکەت و بە خۆشی.

٤٩٣٧ - (حسن صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ, فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ, قَالَتْ: فَوَاللَّهِ إِنِّي لَعَلَى أُرْجُوحَةٍ بَيْنَ عَذْقَيْنِ, فَجَاءَتْنِي أُمِّي فَأَنْزَلَتْنِي, وَلِي جُمَيْمَةٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتیٚ کە کۆچمان کردو گەیشتینە مەدینە، لەلای بەنی (حارث)ی خەزرەجی لاماندا، لەوکاتەدا لەنێوان دوو دار خورمادا لەناو جۆلانەیەکدا یاریم دەکرد، دایکم هات دای بەزاندم، قژەکانم شۆڕ بوو بوونەوە بەسەر شانمدا.

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی یاری نرد.

## ٦٤ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ اللَّعِبِ بِالنَّرْدِ.

٤٩٣٨ - (حسن) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ).

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس یاری بە (نرد)زار بکات ئەوە لەخواو پێغەمبەرەکەی یاخی بووە).

٤٩٣٩ - (صحيح) عن سليمان بن بريدة, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا غَمَسَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ).

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس یاری بە نەردەشیر بکات وەکو ئەوە وایە دەستی خۆی بە گۆشتی بەرازو خوێنەکەی ڕەنگ کردبیٚ).

## سەبارەت بە یاریکردن بە کۆتر.

## ٦٥ - باب فِي اللَّعِبِ بِالْحَمَامِ.

٤٩٤٠ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يَتْبَعُ حَمَامَةً, فَقَالَ: (شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بینی کەوتبوە شوێن کۆترێك یاری لەگەڵ دەکرد، فەرمووی: (شەیتانێ کەوتۆتە شوێن شەیتانێ).

## سەبارەت بە سۆز و بەزەیی.

## ٦٦ - باب فِي الرَّحْمَةِ.

٤٩٤١ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم: عَنْ (الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ, ارْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، فەرمودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەوانەی خاوەن سۆز و بەزەیین خوای میهرەبان سۆز و بەزەیی و میهریانی دەنوێنێ بەرامبەریان، سۆز و بەزەیی بنوێنن بەرامبەر بە خەڵکانی سەر زەوی و گیانلەبەران تاکو ئەوەی لە ئاسمانە سۆز و بەزەیی و میهریانی بنوێنێ بەرامبەرتان کە خوای میهرەبانە).

٤٩٤٢ - (حسن) عن أبو هريرة قال: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَاحِبَ هَذِهِ الْحُجْرَةِ, يَقُولُ: (لاَ تُنْزَعُ الرَّحْمَةُ إِلاَّ مِنْ شَقِيٍّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە باوکی قاسیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم راستگۆ و بەڕاست زانراو خاوەنی ئەم حوجرە دەیفەرموو: (ئەو کەسەی نەگبەت و بەدبەخت نەبێ سۆز و بەزەیی لەدڵیدا داناڕنرێ).

٤٩٤٣ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو يرويه, قال ابن السرح: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال (مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا فَلَيْسَ مِنَّا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ریوایەت کراوە، ئیبنو سرج وتی: لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، کە فەرموویەتی: (ئەو کەسەی بەزەیی نەیەتەوە بە بچوکماندا و رێزی گەورەمان نەگرێت ئەوە لەسەر سوننەت و رێبازی ئێمە نیە).

## سەبارەت بە ئامۆژگاری کردن.

## ٦٧ - باب فِي النَّصِيحَةِ.

٤٩٤٤ - (صحيح) عن تميم الداري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ, إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ, إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ). قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (لِلَّهِ وَكِتَابِهِ وَرَسُولِهِ وَأَئِمَّةِ الْمُؤْمِنِينَ وَعَامَّتِهِمْ) أو (وَأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ).

واتە: لە تەمیمی دارییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دین ئامۆژگاریە، دین ئامۆژگاریە، دین ئامۆژگاریە). وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ فەرمووی: (بۆ خواو بۆ قورئانەکەی و بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ پێشەواو کاربەدەستانی موسوڵمانان و خەڵك بە گشتی).

- ئامۆژگاری بۆ خوا هەستانە بەجێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کە پێویستی کردوە لەسەرتان بە تەواوترین شێوە، ئامۆژگاری بۆ قورئانەکەی باوەڕبوونە پێی و بەگەورە دانانیەتی و شوێنکەوتنیەتی، ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەرەکەی باوەڕبوونە پێی و شوێنکەوتنی سوننەتەکانیەتی، ئامۆژگاری بۆ پێشەواو کاربەدەستانی موسوڵمانان گوێڕایەڵی کردنیانە لەسەر هەق و یارمەتی دانیانەو بەهێمنی لەسەرخۆیی بیرخستنەوەیانە، ئامۆژگاری بۆ خەڵك بە گشتی بانگ کردنیانە بۆ سەر رێبازی ئیسلام و پاراستنی بەرژەوەندیە شەرعیەکانیانە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ ئەوانیش پێی خۆش بێت -.

٤٩٤٥ - (صحيح الإسناد) عن جرير قال: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ, وَأَنْ أَنْصَحَ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. قَالَ: وَكَانَ إِذَا بَاعَ الشَّيْءَ أَوِ اشْتَرَاهُ قَالَ: أَمَا إِنَّ الَّذِى أَخَذْنَا مِنْكَ أَحَبُّ إِلَيْنَا مِمَّا أَعْطَيْنَاكَ, فَاخْتَرْ.

واتە: لە جەریرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بەڵێن و پەیمانم دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری، هەروەها ئامۆژگاری سەرجەم موسڵمانان بکەم. راوی وتی: جەریر کاتێ کە شتێکی دەفرۆشت یان دەیکڕی بە فرۆشیارەکەی دەوت: ئەوەی لێمان وەرگرتووی یان لێمان کڕیوی خۆشەویسترە لەلامان لەو نرخەی کە داومانە پێت، تۆش هەڵبژێرە واتە ئەگەر پەشیمانی فەرمووی ئەوە ماڵەکەت.

## سەبارەت بە هاوکاری و کۆمەکی کردنی موسوڵمان.

## ٦٨ - باب فِي الْمَعُونَةِ لِلْمُسْلِمِ.

٤٩٤٦ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ, وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ, وَمَنْ سَتَرَ عَلَى مُسْلِمٍ سَتَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ, وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ لَمْ يَذْكُرْ عُثْمَانُ عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ: (وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس ناخۆشی و خەم و پەژارەیەکی دونیا لەسەر موسوڵمانێ سوك بکات و لە تەنگانەیە رزگاری بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ناخۆشی و خەم و پەژارەیەکی لەسەر سوك دەکات و لە تەنگانەیە رزگاری دەکات، هەرکەس باری شانی موسوڵمانێ سوك بکات خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژدا باری شانی سوك دەکات، وە هەرکەس عەیب و عاری موسوڵمانێ بپۆشێ خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژدا عەیب و عاری ئەو دەپۆشێت، بەردەوام خوای گەورە یارمەتی دەری بەندەکانیەتی مادەم ئەوان یارمەتی دەری برا موسوڵمانەکانیان بن).

٤٩٤٧ - (صحيح) عن حذيفة قال: قال نبيكم صلى الله عليه و سلم: (كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ).

له (حذيفة)وه دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرەکەتان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەوو کارێکی چاك خێر و سەدەقەیە).

## سەبارەت بە گۆڕینی ناوەکان.

## ٦٩ - باب فِي تَغْيِيرِ الأَسْمَاءِ.

٤٩٤٨ - (ضعيف) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ, وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ, فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ).

واتە: ئەبو دەردائەوە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ئێوە لە رۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتان و باوکتانەوە بانگ دەکرێن، کەواتە با ناوەکانتان چاك و خۆش بێ).

٤٩٤٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆشەویسترین ناو بەلای خواوە ناوی (عبد الله) و (عبدالرحمن)ە.

٤٩٥٠ - (صحيح دون قوله: تسمو بأسماء الأنبياء) عن أبو وهب الجشمي وكانت له صحبة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: عَنْ أَبِي وَهْبٍ

الْجُشَمِيِّ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الأَنْبِيَاءِ, وَأَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ, وَأَصْدَقُهَا حَارِثٌ وَهَمَّامٌ, وَأَقْبَحُهَا حَرْبٌ وَمُرَّةٌ).

واتە: لە ئەبو وەهەبی جوشەمییەوە - کە هاوەڵێتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کردوە - دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ناوی پێغەمبەران بگرنەوە، خۆشەویسترین ناو بەلای خوای گەورەوە ناوی (عبد الله) و (عبد الرحمن)ە، راسترین ناویش حارس و هومامە، ناشیرینترین ناویش ناوی (حرب) و (مُرَّة).

٤٩٥١ - (صحيح) عن أنس قال: ذَهَبْتُ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ وُلِدَ, وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي عَبَاءَةٍ يَهْنَأُ بَعِيرًا لَهُ قَالَ: (هَلْ مَعَكَ تَمْرٌ؟). قُلْتُ: نَعَمْ, قَالَ: فَنَاوَلْتُهُ تَمَرَاتٍ فَأَلْقَاهُنَّ فِي فِيهِ فَلاَكَهُنَّ, ثُمَّ فَغَرَ فَاهُ, فَأَوْجَرَهُنَّ إِيَّاهُ, فَجَعَلَ الصَّبِيُّ يَتَلَمَّظُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (حِبُّ الأَنْصَارِ التَّمْرُ). وَسَمَّاهُ: عَبْدَ اللَّهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ (عبد الله)ی کوڕی ئەبو (طلحة)ی ئەنصاری لەدایك بوو بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە عەبایەکدا خۆی پێچابوویەوە چارەسەری وشترێکی خۆی دەکرد، فەرمووی: (هیچ خورمایەکت پێ یە؟) وتم: بەڵێ: وتی: چەند دەنکە خورمایەکم دایە خستییە ناودەمی مژی، لەپاشدا دەمی منداڵەکەی کردەوەو خستیە ناو دەمی منداڵەکەو ئەویش مژی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خورما خۆشەویستی ئەنصارەکانەو حەزیان لە خورمایە). جا ناوی نا: (عبد الله).

## سەبارەت بە گۆڕینی ناوی خراپ

## ٧٠ - باب فِي تَغْيِيرِ الاِسْمِ الْقَبِيحِ.

٤٩٥٢ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيَّرَ اسْمَ عَاصِيَةَ وَقَالَ: (أَنْتِ جَمِيلَةُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی عاصیەی گۆڕی بە جەمیلەو فەرمووی: (تۆ جەمیلەی ).

٤٩٥٣ - (حسن صحيح) عن محمد بن عمرو بن عطاء: أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ سَأَلَتْهُ: مَا سَمَّيْتَ ابْنَتَكَ؟ قَالَ: سَمَّيْتُهَا بَرَّةَ, فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ هَذَا الاِسْمِ, سُمِّيتُ بَرَّةَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ). فَقَالَ: مَا نُسَمِّيهَا؟ قَالَ: (سَمُّوهَا زَيْنَبَ).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی (عطاء )ەوە دەگێڕنەوە، کە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە لێی پرسی: کچەکەت ناو ناوە چی، وتی: ناوم ناوە(بَرَّة). زەینەب وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ناوەی قەدەغەکردووە، منیش کاتی خۆی ناوم (بَرَّة) بوو. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خۆتان بە پاك دامەنێن و تەزکیەی خۆتان مەکەن خوای پەروەردگار بۆ خۆی دەیزانێ کێ چاکەو کێ خراپە لەئێوە). وتی: ئەی ناوی بنێم چی؟ فەرمووی: ناوی بنێ زەینەب). - ئیتر ناویان نام زەینەب - .

٤٩٥٤ - (صحيح) عن أسامة بن أخدري: أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ أَصْرَمُ كَانَ فِي النَّفَرِ الَّذِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا اسْمُكَ؟). قَالَ: أَنَا أَصْرَمُ. قَالَ: (بَلْ أَنْتَ زُرْعَةُ).

واتە: لە ئوسامەی كوڕی ئەخدەریەوە دەگێرنەوە، كە یەكێ لەوانەی بە نوێنەری هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی ئەصرەم بوو واتە بڕین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ناوت چییە؟) وتی: من ناوم ئەصرەمە، فەرمووی: (نا تۆ ناوت زورعەیە). لە ناوی كشتوكاڵ (الزرع) وەرگیراوە.

٤٩٥٥ - (صحيح) عن هانيء: أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ قَوْمِهِ سَمِعَهُمْ يَكْنُونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ, فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ, وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ, فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ).فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِى إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ فَرَضِيَ كِلاَ الْفَرِيقَيْنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَحْسَنَ هَذَا فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ). قَالَ: لِي شُرَيْحٌ وَمُسْلِمٌ وَعَبْدُ اللَّهِ. قَالَ: (فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ). قُلْتُ: شُرَيْحٌ, قَالَ: (فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: شُرَيْحٌ هَذَا هُوَ الَّذِى كَسَرَ السِّلْسِلَةَ وَهُوَ مِمَّنْ دَخَلَ تُسْتَرَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَبَلَغَنِى أَنَّ شُرَيْحًا كَسَرَ بَابَ تُسْتَرَ وَذَلِكَ أَنَّهُ دَخَلَ مِنْ سِرْبٍ.

واتە: لە هانیئەوە دەگێرنەوە، كە لەگەڵ هۆزەكەی بە نوێنەری چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێی لێ بوو خەڵكەكە بە ئەبو حەكەم ناویان دەبرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بانگی كردو فەرمووی: (خوای گەورە تەنها خۆی دادوەرەو، حوكم و بڕیار تەنها هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، بۆچی ئەو نازناوەت هەڵبژاردووە بۆ خۆت؟) ئەویش وتی: هۆزو قەومەكەم هەركاتێ ناكۆكی و كێشەیان ببوایە دەهاتنە لای من منیش دادوەریم دەكرد لە نێوانیاندا ئەوانیش رازی دەبوون،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە شتێکی چاکە، ئایا تۆ کوڕت هەیە؟) وتی: بەڵێ، سێ کوڕم هەیە بە ناوەکانی شورەیح و موسلیم و (عَبْدُ اللَّه). پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کامیان گەورەکەیانە؟) وتی: شورەیح، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کەواتە تۆ ئەبو شورەیحی).

٤٩٥٦ - (صحيح) عن سعيد بن المسيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: (مَا اسْمُكَ؟). قَالَ: حَزْنٌ. قَالَ: (أَنْتَ سَهْلٌ). قَالَ: لاَ السَّهْلُ يُوطَأُ وَيُمْتَهَنُ. قَالَ سَعِيدٌ: فَظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُصِيبُنَا بَعْدَهُ حُزُونَةٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَغَيَّرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْمَ الْعَاصِ وَعَزِيزٍ وَعَتَلَةَ وَشَيْطَانٍ وَالْحَكَمِ وَغُرَابٍ وَحُبَابٍ, وَشِهَابٍ فَسَمَّاهُ هِشَامًا, وَسَمَّى حَرْبًا سَلْمًا, وَسَمَّى الْمُضْطَجِعَ: الْمُنْبَعِثَ, وَأَرْضًا تُسَمَّى عَفِرَةَ سَمَّاهَا خَضِرَةَ, وَشِعْبَ الضَّلاَلَةِ سَمَّاهُ شِعْبَ الْهُدَى, وَبَنُو الزِّنْيَةِ سَمَّاهُمْ بَنِي الرِّشْدَةِ, وَسَمَّى بَنِي مُغْوِيَةَ بَنِي رِشْدَةَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: تَرَكْتُ أَسَانِيدَهَا لِلاِخْتِصَارِ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ناوت چییە؟) منیش وتم: ناوم (حزن)خەمبارە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (نەخێر باناوت سەهل بێ) منیش وتم: ئەو ناوەی باوکم لێی ناوم نایگۆڕم. ئیبن موسەییب فەرموی: ئەو نەگۆڕینەی ناوی باپیرم بوو بەهۆی مانەوەی توندو تیژی لەناو نەوەکانی باپیرمدا.
ئەبو داود دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەم ناوانەی گۆڕیوە: (الْعَاصِ وَعَزِيزٍ وَعَتَلَةَ وَشَيْطَانٍ وَالْحَكَمِ وَغُرَابٍ وَحُبَابٍ, وَشِهَاب)، گرى ئاگر(شهاب)ى گۆڕی بۆ هیشام، ناوی حەربی گۆڕی و کردی بە (سَلْم)ئاشتی، ناوی (الْمُضْطَجِعَ)ی گۆڕی بە (الْمُنْبَعِثَ)، زەویەك ناوی (عَفِرَةَ) بوو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گۆڕی و کردی بە (خَضِرَةَ) واتە سەوزایی، هەروا ناوی

(شِعْبَ الضَّلاَلَةِ)شیوی گومڕایی گۆڕی و کردی بە (شِعْبَ الْهُدَی)شیوی هیدایەت و ڕێنموویی، هۆزی زیناکەر(بَنُو الزِّنْيَةِ)ی گۆڕی و کردی بە (بَنِی الرِّشْدَةِ). (بنِی مُغْوِيَةَ) گۆڕی و کردی بە (بَنِی رِشْدَةَ). ئەبو داود دەڵێت: لەبەر درێژی فەرموودەکە سەنەدەکانم واز لێ هێناوەو کورتم کردۆتەوە.

٤٩٥٧ - (ضعيف) عن مسروق قال: لَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مَسْرُوقُ بْنُ الأَجْدَعِ. فَقَالَ عُمَرُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الأَجْدَعُ شَيْطَانٌ).

واتە: لە مەسروقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گەیشتم بە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: تۆ کێیت؟ وتم: مەسروقی کوڕی ئەجدەع، پێشەوا عومەر وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرمووی: (ئەجدەع ناوی شەیتانێکە لە شەیاتینەکان).

٤٩٥٨ - (صحيح) عن سمرة بن جندب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُسَمِّيَنَّ غُلاَمَكَ يَسَارًا وَلاَ رَبَاحًا وَلاَ نَجِيحًا وَلاَ أَفْلَحَ, فَإِنَّكَ تَقُولُ: أَثَمَّ هُوَ, فَيَقُولُ: لاَ, إِنَّمَا هُنَّ أَرْبَعٌ فَلاَ تَزِيدَنَّ عَلَيَّ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەم ناوانە لە منداڵەکەت مەنێ: یەسار، ڕەباح واتە قازانج، نەجیح و ئەفلەح سەرکەوتو سەرفراز، چونکە جاری وا دەبێ تۆ دەپرسیت و دەڵێیت: ئەرێ هین لەوێ یە؟ ئەگەر لەوێ نەبوو دەڵێن: ئەو لێرە نیە). سەمورە وتی: ئەم ناوانە کە قەدەغەیکردن چوارن بەناوی منەوە زیادیان مەکەن.

٤٩٥٩ - (صحيح) عن سمرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُسَمِّيَ رَقِيقَنَا أَرْبَعَةَ أَسْمَاءٍ أَفْلَحَ وَيَسَارًا وَنَافِعًا وَرَبَاحًا.

واتە: لە سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگەی نەدەداین کۆیلەکانمان ناو بنێین: ئەفلەح و یەسار و نافیع و ڕەباح.

٤٩٦٠ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْهَى أُمَّتِي أَنْ يُسَمُّوا نَافِعًا وَأَفْلَحَ وَبَرَكَةَ). قَالَ الأَعْمَشُ: وَلاَ أَدْرِي ذَكَرَ نَافِعًا أَمْ لاَ (فَإِنَّ الرَّجُلَ يَقُولُ إِذَا جَاءَ أَثَمَّ بَرَكَةٌ, فَيَقُولُونَ: لاَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَى أَبُو الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ لَمْ يَذْكُرْ بَرَكَةَ.

واتە: لە جابیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەویستی خوا ئەگەر لەژیاندا مای ڕێگری بکە لە ئوممەتەکەم ئەم ناوانە لە منداڵەکانیان نەنێن: نافیع و ئەفلەح و بەرەکە). ئەعمەش وتی: نازانم باسی نافیعی کرد یان نا، (چونکە جاری وا دەبێ پیاو دەپرسیت و دەڵێیت: بەرەکە لەوێ یە؟ ئەگەر لەوێ نەبوو دەڵێن: نا). ئەبو داود دەڵێت: ئەبو زوبێر، لە جابیرەوە، لە سەمورەوە، پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشوی گێڕاوەتەوە بەڵام باسی بەرەکەی نەکرد.

٤٩٦١ - (صحيح) عن أبو هريرة, يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَخْنَعُ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ, عَنْ أَبِي الزِّنَادِ بِإِسْنَادِهِ, قَالَ: (أَخْنَى اسْمٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، فەرموودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی: (خراپترین و ناشیرینترین ناو بەلای خوای گەورەوە لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێکە ناوی شای شایان یان شاهەنشا بێت).

# سەبارەت بە ناو ناتۆرە

## ٧١ - باب فِي الأَلْقَابِ.

٤٩٦٢ - (صحيح) عن أبو جبيرة بن الضحاك قال: فِينَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي بَنِي سَلِمَةَ: (وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ) قَالَ قَدِمَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَيْسَ مِنَّا رَجُلٌ إِلاَّ وَلَهُ اسْمَانِ أَوْ ثَلاَثَةٌ, فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَا فُلاَنُ). فَيَقُولُونَ: مَهْ يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّهُ يَغْضَبُ مِنْ هَذَا الاِسْمِ, فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ).

واتە: لە ئەبو جوبەیرەی کوڕی (ضحاك)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەم ئایەتە لەبارەی هۆزەکەی ئێمەوە دابەزی هۆزی ئەبو سەلەمە:

﴿ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ ﴾ سورة الحجرات: ١١.

واتە: تانەو تەشەر لە یەکتری مەدەن، ناو ناتۆرە لە یەکتر مەنێن، دەرچوون لەشەرع بەدناو زڕاویە دوای باوەڕهێنان، واتە: ئەو جۆرە کارانە دەبێتە مایەی فاسق بوون و دوورکەوتنەوە لە ئیمان.

ئەبو جویەیر وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆچی کردو هات بۆ مەدینە بۆ ناومان هەریەکێ لەئێمە دوو ناو یان سێ ناوی هەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەی فلان). دەیانوت: (مَهْ) ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم واتە بەو ناوە بانگی مەکە چونکە پێی ناخۆشەو توڕە دەبێ، ئیتر بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ ...).

## دەربارەی ئەوانەی نازناویان باوکی عیسایە.

## ٧٢ - باب فِيمَنْ يَتَكَنَّى بِأَبِي عِيسَى.

٤٩٦٣ - (حسن صحيح) عن زيد بن أسلم، عن أبيه، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ضَرَبَ ابْنًا لَهُ تَكَنَّى أَبَا عِيسَى، وَأَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ تَكَنَّى بِأَبِي عِيسَى، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَمَا يَكْفِيكَ أَنْ تُكَنَّى بِأَبِي عَبْدِ اللَّهِ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَنَّانِي، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، وَإِنَّا فِي جَلْجَلَتِنَا، فَلَمْ يَزَلْ يُكْنَى بِأَبِي عَبْدِ اللَّهِ حَتَّى هَلَكَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ - پێی ناخۆش بوو بە ناوی باوکی عیساوە بانگی بکەن، چونکە عیسا سەلامی خوای لەسەر بێ باوکی نەبووە — موغیرەی کوڕی شوعبەش نازناوی باوکی عیسا بوو، پێشەوا عومەر پێی وت: ئەوەندە بەس نیە کە نازناوت ئەبو (عبد الله) بێت؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو نازناوەی لێ ناوم، پێشەوا عومەر وتی: بێگومان خوای پەروەردگار لە گوناهی ڕابردوو داهاتووی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆش بووە، ئێمەومانان کەس نازانێ حاڵمان چۆن دەبێت - ئەو نازناوە دروستە مادەم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی ناوی - ئیتر موغیرەی کوڕی شوعبە هەتا مرد نازناوی باوکی (عبد الله) بوو - وەك وەڵامدانەوەیە بۆ فەرمایشتەکەی پێشەوا عومەر - .

## دەربارەی پیاوێ بە کوڕێ بڵێ
## کوڕی خۆم لەکاتێکدا کوڕی خۆی نەبێ.

## ٧٣ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لاِبْنِ غَيْرِهِ يَا بُنَيَّ.

| ٤٩٦٤ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال له: (يَا بُنَيَّ). |
|---|

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووە: کوڕی خۆم.

## دەربارەی ئەوانەی
## نازناویان (ئەبو قاسم)باوکی قاسیمە.

## ٧٤ - باب فِي الرَّجُلِ يَتَكَنَّى بِأَبِي الْقَاسِمِ.

| ٤٩٦٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (تَسَمَّوْا بِاسْمِى, وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِى). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەناوی منەوە منداڵ ناوبنێن، بەڵام کونیەو نازناوی من دامەنێن).

## دەربارەی ئەوانەی پێیان وایە نابێ ناو و نازناوەکەی وەك ناو و نازناوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێ.

### ٧٥ - باب مَنْ رَأَى أَنْ لاَ يُجْمَعَ بَيْنَهُمَا.

| ٤٩٦٦ - (منكر) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ تَسَمَّى بِاسْمِي، فَلاَ يَكْتَنِي بِكُنْيَتِي، وَمَنْ تَكَنَّى بِكُنْيَتِي، فَلاَ يَتَسَمَّى بِاسْمِي). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەناوی منەوە منداڵ ناوبنێ، با نازناوەکەی من لەخۆی نەنێ، ئەوەی نازناوی من لەخۆی بنێ، با ناوی من لەخۆی نەنێ).

## دەربارەی روخسەت دراوە ناو و نازناوەکەی لەکەسێکدا کۆببێتەوە.

### ٧٦ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي الْجَمْعِ بَيْنَهُمَا.

| ٤٩٦٧ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ وُلِدَ لِي مِنْ بَعْدِكَ وَلَدٌ أُسَمِّيهِ بِاسْمِكَ وَأُكْنِيهِ بِكُنْيَتِكَ؟ قَالَ: (نَعَمْ). |
|---|

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر لەدوای تۆ کوڕێکم بوو بە ناوی تۆوە ناوی بنێم و نازناوەکەی تۆش لەخۆم بنێم؟ فەرمووی: (بەڵێ).

٤٩٦٨ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها قالت: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّ قَدْ وَلَدْتُ غُلاَمًا فَسَمَّيْتُهُ مُحَمَّدًا وَكَنَّيْتُهُ أَبَا الْقَاسِمِ, فَذُكِرَ لِي أَنَّكَ تَكْرَهُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (مَا الَّذِى أَحَلَّ اسْمِى, وَحَرَّمَ كُنْيَتِى؟). أَوْ (مَا الَّذِى حَرَّمَ كُنْيَتِى, وَأَحَلَّ اسْمِى؟).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە وتویەتی: ئافرەتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! من منداڵێکم بووە ناوم ناوە موحەممەد، کونیەو نازناوی ئەبا قاسیمم بۆ داناوە کەچی پێم گەیشتووە کە تۆ پێت ناخۆشە، فەرمووی: (ئەوە کێیە ناوەکەم حەڵاڵ دەکاو، نازناوەکەم حەرام دەکا لەسەر خەڵك؟). یان (ئەوە کێیە نازناوەکەم حەرام دەکاو، ناوەکەم حەڵاڵ دەکا لەسەر خەڵك؟).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی پیاوێ نازناوی هەبێ و منداڵی نەبێ.

## ٧٧ - باب مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَتَكَنَّى وَلَيْسَ لَهُ وَلَدٌ.

٤٩٦٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْخُلُ عَلَيْنَا وَلِي أَخٌ صَغِيرٌ يُكْنَى أَبَا عُمَيْرٍ وَكَانَ لَهُ نُغَرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ فَدَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ فَرَآهُ حَزِينًا, فَقَالَ: (مَا شَأْنُهُ). قَالُوا مَاتَ نُغَرُهُ فَقَالَ (يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەهات بۆ ماڵمان و تێکەڵی دەکردین برایەکی بچوکم هەبوو ناوی ئەبو عومەیر بوو، باڵندەیەکی بچوکی وەك چۆلەکەی هەبوو بەڵام ئەو دەنوکی سورە یاری پێ دەکرد، جارێ هات بۆ ماڵمان ئەبو عومەیری بینی

خەمبار بوو چونكە باڵندەكەی مرد بوو، فەرمووی: (ئەی ئەبو عومەیر باڵندە بچوكەكە چی بەسەرهات؟).

## دەربارەی نازناوی ئافرەتێ منداڵی نەبێ.

## ٧٨ - باب فِي الْمَرْأَةِ تُكْنَى.

٤٩٧٠ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ كُلُّ صَوَاحِبِى لَهُنَّ كُنًى, قَالَ: (فَاكْتَنِى بِابْنِكِ عَبْدِ اللَّهِ). يَعْنِى ابْنَ أُخْتِهَا. قَالَ مُسَدَّدٌ: عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ, قَالَ: فَكَانَتْ تُكَنَّى بِأُمِّ عَبْدِ اللَّهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو هاوڕێكانم نازناویان هەیە، فەرمووی: (دەی تۆش نازناوی كوڕەكەی خۆت دایكی (عبد الله) بۆ خۆت دابنێ). واتە: بەناوی خوشكەزاكەی خۆیەوە. موسەددەد وتی: (عبد الله)ی كوڕی زوبێر - خوشكی دایك لەجێی دایكە دایكی ئەویش ئەسمای كچی پێشەوا ئەبو بەكر خوشكی عائیشە بوو- ڕاوی وتی: ئیتر نازناوەكەی دایكی (عبد الله) بوو.

## سەبارەت بە کەسێ درۆ بکات بەرامبەرەکەی بە راستی بزانێ.

## ٧٩ - باب فِي الْمَعَارِيضِ.

٤٩٧١ - (ضعيف) عن سفيان بن أسيد الحضرمي قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول (كَبُرَتْ خِيَانَةً أَنْ تُحَدِّثَ أَخَاكَ حَدِيثًا هُوَ لَكَ بِهِ مُصَدِّقٌ وَأَنْتَ لَهُ بِهِ كَاذِبٌ).

واتە: لە سوفیانی کوڕی ئەسیدی (حضرمي)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (گەورەترین خیانەت و ناپاکی ئەوەیە بەدرۆ قسە بۆ براکەت بکەیت و ئەو باوەڕی بە تۆ هەبێ و بەراستی بزانێ).

## سەبارەت بە وتی وتی بێ بنج و بنەما.

## ٨٠ - باب في زعموا.

٤٩٧٢ - (صحيح) عن أبي قلابة قال: قال أبو مسعود لأبي عبد اللّه أو قال أبو عبد اللّه لأبي مسعود: ما سمعت النبي صلى اللّه عليه وسلم يقول في: زعموا؟ قال سمعت رسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم يقول: (بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ زَعَمُوا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو عَبْدِ اللَّهِ هَذَا: حُذَيْفَةُ.

واتە: لە ئەبو قیلابەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو مەسعود بە ئەبو (عبد الله)ی وت

یان ئەبو (عبد الله) بە ئەبو مەسعودی وت: دەربارەی (زعموا) چیت بیستوە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كە فەرموو بێتی، وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (خراپترین قسەی پیاو وتی وتی یە لەسەر شك و گومان و قسەكە بێ بنج و بنەما بێت).

## سەبارەت بە پیاوێ لە وتارەکەیدا بڵێ: (لە دوایی دا).

## ٨١ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ: (أَمَّا بَعْدُ).

٤٩٧٣ - (صحيح) عن زيد بن أرقم: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَهُمْ, فَقَالَ: (أَمَّا بَعْدُ).

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری بۆ داون فەرموویەتی: (لە دوایی دا).

## سەبارەت بە (كرم) و پاراستنی قسەو ئاخاوتن.

## ٨٢ - باب فِي الْكَرْمِ وَحِفْظِ الْمَنْطِقِ.

٤٩٧٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ الْكَرْمَ, فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ, وَلَكِنْ قُولُوا حَدَائِقَ الأَعْنَابِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ كەسێ لەئێوە بە مێو نەڵێ: بەخشندە(كرم) چونكە (كرم) پیاوی موسوڵمانە، بەڵكو با بڵێ: باخ و باخاتی ترێ).

## باسی با کۆیلە بە گەورەکەی نەڵێ: پەروەردگارم.

## ٨٣ - باب لاَ يَقُولُ الْمَمْلُوكُ: (رَبِّي وَرَبَّتِي).

٤٩٧٥ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَأَمَتِي, وَلاَ يَقُولَنَّ الْمَمْلُوكُ رَبِّي وَرَبَّتِي, وَلْيَقُلِ الْمَالِكُ: فَتَايَ وَفَتَاتِي, وَلْيَقُلِ الْمَمْلُوكُ: سَيِّدِي وَسَيِّدَتِي, فَإِنَّكُمُ الْمَمْلُوكُونَ وَالرَّبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە بە کۆیلەکەی نەڵێ: (عَبْدِي وَأَمَتِي) بەندەکەم کۆیلەکەم، وە با هیچ کۆیلەیەکیش بە گەورەکەی نەڵێ: (رَبِّي وَرَبَّتِي) پەروەردگارم بەڵکو با گەورەکە بە کۆیلەکەی بڵێ: (فَتَايَ وَفَتَاتِي)کوڕەکەم کچەکەم، کۆیلەکەش بڵێ: (سَيِّدِي وَسَيِّدَتِي)، چونکە ئێوە هەر هەمووتان بەندەن و (رب)پەروەردگار تەنها (الله)یە.

٤٩٧٦ - (صحيح) عن أبو هريرة في هذا الخبر, ولم يذكر النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَلْيَقُلْ سَيِّدِي وَمَوْلاَيَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ئەم هەواڵە هاتوە، بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با کۆیلەکە بڵێ: (سَيِّدِي وَمَوْلاَيَ).

٤٩٧٧ - (صحيح) عن عبد الله بن بريدة عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ سَيِّدٌ فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّدًا فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە مرۆڤی دووڕوو مونافیق مەڵێ: ئاغا و سەید، چونکە ئەگەر ئێوە ئەو بە ئاغاو سەید دابنێن بەوە خوای پەروەردگارتان لەخۆتان دەڕەنجێنن).

## با هیچ کەسێ لەئێوە نەڵێ: دڵم تێکەڵ دێ.

## ٨٤ - باب لاَ يُقَالُ : خَبُثَتْ نَفْسِي.

٤٩٧٨ - (صحيح) عن أبي أمامة بن سهل بن حنيف, عن أبيه: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي, وَلْيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي).

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە نەڵێ: (خَبُثَتْ نَفْسی) دڵم تێکەڵ دێ، گەدەم گەنیوە، بەڵکو با بڵێ: (لَقِسَتْ نَفْسی) دڵم تێك دەچێ، دڵم دێ بە یەکدا). - (خَبُثَتْ نَفْسی) و (لَقِسَتْ نَفْسی) هەر یەك مانایان هەیە بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فێرمان دەکات قسەی جوان بکەین - .

٤٩٧٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: جَاشَتْ نَفْسِي, وَلَكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە نەڵێ: (جَاشَتْ نَفْسی)، بەڵکو با بڵێ: دڵم تێك دەچێ، دڵم دێ بە یەکدا). - (جَاشَتْ نَفْسی) و (لَقِسَتْ نَفْسی) هەر یەك مانایان هەیە وەك فەرموودەی پێشو - .

## ٨٥ - باب

٤٩٨٠ - (صحيح) عن حذيفة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَاَ تَقُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ فُلَانٌ وَلَكِنْ قُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ شَاءَ فُلَانٌ).

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەڵێن: بەویستی خوا و ویستی فلان، بەڵکو بڵێن: بەویستی خوا، ئینجا بە ویستی فلان).

## ٨٦ - باب

٤٩٨١ - (صحيح) عن عدي بن حاتم: أَنَّ خَطِيبًا خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ وَمَنْ يَعْصِهِمَا. فَقَالَ: (قُمْ). أَوْ قَالَ: (اذْهَبْ, فَبِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ).

واتە: عەدی کوڕی حاتیم دەڵێت: بە ئامادەبوونی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاربێژێ وتاری دەدا وتی: هەرکەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی ڕێی ڕاستی دۆزیوەتەوە، وە هەرکەس سەرپێچیان بکات، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەستە) - یان فەرمووی: (بڕۆ، تۆ تاربێژێکی خراپی). - ئەم فەرموودە پێشتر بە ژمارە: (١٠٩٩) هاتوە-.

٤٩٨٢ - (صحيح) عن أبي المليح عن رجل قال: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَثَرَتْ دَابَّتُهُ فَقُلْتُ تَعِسَ الشَّيْطَانُ . فَقَالَ (لاَ تَقُلْ تَعِسَ الشَّيْطَانُ فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَعَاظَمَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الْبَيْتِ, وَيَقُولَ: بِقُوَّتِي: وَلَكِنْ قُلْ: بِسْمِ اللَّهِ, فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَصَاغَرَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الذُّبَابِ).

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە، لە پیاوێکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە پشکۆی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم سوار بوو بووم ولاخەکەی سەرسمێکی دا خەریك بوو بکەوێت، وتم: شەیتان لەناوچێ، فەرمووی: (مەڵێ: شەیتان لەناوچێ، چونکە بەو قسەیە ئەوەندە زل دەبێت تاکو وەك ماڵێکی لێ دێت، دەڵێ: بە هێزی خۆم ئەو کارە رویدا، بەڵکو بڵێ: (بسم الله)بەناوی خوا، چونکە بە وتنی: (بسم الله) ئەوەندە بچوك دەبێتەوە تاکو دەبێتە ئەوەندەی مێشێك).

٤٩٨٣ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا سَمِعْتَ). وَقَالَ مُوسَى: (إِذَا قَالَ الرَّجُلُ هَلَكَ النَّاسُ: فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مَالِكٌ: إِذَا قَالَ ذَلِكَ تَحَزُّنًا لِمَا يَرَى فِي النَّاسِ - يَعْنِي فِي أَمْرِ دِينِهِمْ - فَلاَ أَرَى بِهِ بَأْسًا, وَإِذَا قَالَ ذَلِكَ عُجْبًا بِنَفْسِهِ وَتَصَاغُرًا لِلنَّاسِ فَهُوَ الْمَكْرُوهُ الَّذِى نُهِيَ عَنْهُ.

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بیستت). موسا وتی: (ئەگەر پیاوێ وتی: خەڵك خراپ بوون و تیاچوون، ئەوە خۆی لەهەموو کەس خراپترەو خۆی تیاچووە). ئەبو داود دەڵێ: پێشەوا مالیك دەڵێ: ئەگەر خەمبار بوو بۆ حاڵی خەڵك و دڵی سوتا بۆیان لەبارەی کاروباری دینیانەوە ئەوە هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر توشی عوجب بوو خۆی بە گەورە زانی و خەڵك بە کەم ئەوە خراپەو قەدەغەکراوە.

## سەبارەت بە نوێژی عیشا.

## ٨٧ - باب فِي صَلاَةِ الْعَتَمَةِ.

٤٩٨٤ - (صحيح) عن أبو سلمة قال: سمعت ابن عمر, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَغْلِبَنَّكُمُ الأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلاَتِكُمْ أَلاَ وَإِنَّهَا الْعِشَاءُ وَلَكِنَّهُمْ يُعْتِمُونَ بِالإِبِلِ).

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێت: بۆ خۆم گوێم لە ئیبنو عومەر بوو، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئەم فەرموودەی گێڕایەوە، کە فەرموویەتی: (عەرەبە دەشتەکیەکان کارتان تێ نەکەن ناوی نوێژی عیشاتان پێ بگۆڕن بە: نوێژی (عتمە) ئاگاداربن لە قورئاندا بە نوێژی عیشا ناوی هاتوە - وەك لەم ئایەتەدا هاتوە: ﴿وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِ﴾ سورة النور:٥٨. - کەواتە ئێوەش پێی بڵێن: نوێژی عیشا، عەرەبە دەشتەکیەکان لەکاتی نوێژی عیشادا سەرقاڵ دەبوون بە وشترەکانیانەوەو تاکو دەیانکردنە پەچەوە تاریکی شەو دادەهات بەو هۆیەوە دوادەکەوتن لە نوێژی عیشاو بە نوێژی عیشایان دەوت: (العتمە) ).

٤٩٨٥ - (صحيح) عن سالم بن أبي الجعد قال: قَالَ رَجُلٌ - قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ مِنْ خُزَاعَةَ - لَيْتَنِى صَلَّيْتُ فَاسْتَرَحْتُ, فَكَأَنَّهُمْ عَابُوا عَلَيْهِ ذَلِكَ, فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَا بِلاَلُ أَقِمِ الصَّلاَةَ, أَرِحْنَا بِهَا).

واتە: لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ وتی: - میسعەر وتی: وائەزانم ئەو پیاوە لە هۆزی خوزاعە بوو - ئای خۆزگە نوێژی عیشام بکردایەو بە ئەنجامدانی و سەرقاڵ بوون پێیەوە ئیسراحەتم بکردایە چونکە حەوانەم لە نوێژدایە، وەك بڵێی ئینکاری قسەکەیان کرد، ئەویش وتی:

بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەيفەرموو: (ئەى بيلال هەستە قامەت بكە، با بە نوێژكردن بحەوێينەوەو ئيسراحەت بكەين).

٤٩٨٦ - (صحيح) عن عبد الله بن محمد ابن الحنفية قال: انْطَلَقْتُ أَنَا وَأَبِي إِلَى صِهْرٍ لَنَا مِنَ الأَنْصَارِ نَعُودُهُ فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ, فَقَالَ لِبَعْضِ أَهْلِهِ: يَا جَارِيَةُ ائْتُونِي بِوَضُوءٍ لَعَلِّي أُصَلِّي فَأَسْتَرِيحَ, قَال: فَأَنْكَرْنَا ذَلِكَ عَلَيْهِ, فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (قُمْ يَا بِلاَلُ أَقِمْ فَأَرِحْنَا بِالصَّلاَةِ).

واتە: لە (عبد الله)ى كوڕى موحەممەدى حەنەفييەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: من و باوكم ڕۆشتين بۆ سەردانى زاوايەكى ئەنصاريمان، كاتى نوێژ هاتەپێشەوە بە كەنيزەكێكى وت: ئاوم بۆ بێنە با دەستنوێژ بگرم و نوێژ بكەم بەڵكو بحەوێمەوەو ئيسراحەت بكەم، وتى: ئێمەش ئينكارى قسەكەيمان كرد، ئەويش وتى: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەيفەرموو: (ئەى بيلال هەستە قامەت بكە، با بە نوێژكردن بحەوێينەوەو ئيسراحەت بكەين).

٤٩٨٧ - (ضعيف الإسناد) عن عائشة قالت: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْسُبُ أَحَدًا إِلاَّ إِلَى الدِّينِ.

واتە: لە عائيشەوە ڕەزاى خواى لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: هەرگيز نەمبيستوە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم نيسبەتى غەيرى دين بداتە پاڵ كەس. - بۆ نمونە دەيفەرموو: ئەمە ئەنصاريە، ئەمە كۆچەرى يە ناو نازناوى دينى دەدانە پاڵ -.

## ئەوەی ریوایەت کراوە دەربارەی رێگەپێدانی.

## ٨٨ - باب ما روي من الرخصة في ذال.

٤٩٨٨ - (صحيح) عن أنس قال: كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ فَقَالَ: (مَا رَأَيْنَا شَيْئًا, أَوْ مَا رَأَيْنَا مِنْ فَزَعٍ وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە مەدینە هاوار و ناڵەیەکی ترسناك هات — وەك بڵێی دوژمن هێرش بکاتە سەر شاری مەدینە -، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پەلە سواری ئەسپەکەی ئەبو (طَلْحَةَ) بوو - بێ ئەوەی جلی بکات، پێش خەڵکەکەش کەوت و- ئازایانە بە تەنها بەرەو پیری هاوار و ناڵەکە رۆشت بزانێ چی یە، کاتێ کە هاتەوە فەرمووی: (هیچمان نەدی، یان هاوار و ناڵەی ترسناکمان نەدی، بەڵکو وەك هاژەی دەریا بوو).

## سەبارەت بە هەڕەشەی توند بەرامبەر بە درۆکردن.

## ٨٩ - باب فِي التَّشْدِيدِ فِي الْكَذِبِ.

٤٩٨٩ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(إِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ, فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِى إِلَى الْفُجُورِ, وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِى إِلَى النَّارِ, وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا؛ وَعَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ, فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِى إِلَى الْبِرِّ, وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِى إِلَى الْجَنَّةِ, وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە ئاگادربن و خۆتان بپارێزن لە درۆکردن، چونکە بەڕاستی درۆکردن مرۆڤ دەبات بەرەو خراپەو تاوان، خراپەو تاوانیش دەیبەن بەرەو ئاگری دۆزەخ، پیاو بەردەوام ئەوەندە درۆدەکات تا لای خوای گەورە بەدرۆزن دێتە هەژمار و ناوی لەریزی درۆزنان دەنوسرێ، راستگۆبن، چونکە بەڕاستی راستگۆیی مرۆڤ دەبات بەرەو خێر و چاکە، خێر و چاکەش دەیبەن بەرەو بەهەشت، پیاو بەردەوام ئەوەندە راستی دەڵێ تا لای خوای گەورە بە راستگۆ دێتە هەژمار و ناوی لەریزی راستگۆیان دەنوسرێ).

٤٩٩٠ - (حسن) عن بهز بن حكيم قال: حدثني أبي، عن أبيه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ، وَيْلٌ لَهُ، وَيْلٌ لَهُ).

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم ئەویش لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هاوارو واوەیلا بۆ کەسێ درۆ بکات بۆ ئەوەی خەڵك بێنێتە پێکەنین، هاوارو واوەیلا بۆ ئەو کەسە، هاوارو واوەیلا بۆ ئەو کەسە).

٤٩٩١ - (حسن) عن عبد الله بن عامر قال: دَعَتْنِي أُمِّي يَوْمًا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاعِدٌ فِي بَيْتِنَا، فَقَالَتْ: هَا تَعَالَ أُعْطِيكَ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَمَا أَرَدْتِ أَنْ تُعْطِيهِ؟). قَالَتْ: أُعْطِيهِ تَمْرًا. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا إِنَّكِ لَوْ لَمْ تُعْطِيهِ شَيْئًا كُتِبَتْ عَلَيْكِ كِذْبَةٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: رۆژێکیان دایکم بانگی کردم وتی: ها وەرە بتدەمێ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵمان دانیشتبوو پێی فەرموو: (ئەتەوێ چی بدەیتێ؟). وتی:

ئەمەوێ خورمای بدەمێ. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەگەر شتێکی نەدەیتی ئەوە درۆیەکت لەسەر تۆمار دەکرێت).

٤٩٩٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ).

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەندە بەسە بۆ گوناهباری پیاو، کە هەرچیەکی بیست بیگێڕێتەوە).

## سەبارەت بە گومانی باش بردن.

## ٩٠- باب فِي حُسْنِ الظَّنِّ.

٤٩٩٣ - (ضعيف) عن أبو هريرة - قال نصر: عن النبي صلى الله عليه وسلم- قال: (حُسْنُ الظَّنِّ مِنْ حُسْنِ الْعِبَادَةِ).

لە ئەبو هورەیرەوە - نەصر وتی: لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم -، هاتوە، کە فەرموویەتی: (گومانی باش بردن - بە خواو بە موسوڵمانان - لە باش خوا ناسی و باشی پەرستشەوەیە).

٤٩٩٤ - (صحيح) عن صفية قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُعْتَكِفًا فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلاً, فَحَدَّثْتُهُ وَقُمْتُ, فَانْقَلَبْتُ, فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي - وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ - فَمَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ, فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْرَعَا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَى رِسْلِكُمَا إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ). قَالاَ سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ, قَالَ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِى مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ, فَخَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا). أَوْ قَالَ (شَرًّا).

واتە: لە صەفیەی هاوسەری پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئیعتیکافدا بوو، شەوێ چووم بۆ سەردانی، گفتوگۆم لەگەڵ کرد، لەپاشدا کاتێ کە هەستام بێمەوە بۆ ماڵەوە ئەویش هەستا بۆ ئەوەی رەوانەم بکاتەوە، صەفیە لەو ماڵەدا دەژیا کە دواتر بوو بە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید، دوو پیاو لە ئەنصار تێپەڕین، کاتێ کە پێغەمبەریان صلى الله عليه وسلم دی پێیان هەڵگرت و بە پەلە رۆشتن، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هێواش بن و پەلەمەکەن، ئەمە صەفیەی کچی حویەییە کە هاوسەری خۆمە). وتیان: (سبحان الله) ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم!! - ئێمە چۆن گومان دەکەین لەتۆ - فەرمووی: (شەیتان لەناو جەستەی مرۆڤدا وەك خوێن هاتوچۆ دەکات، بۆیە ترسام گومانێ بخاتە دڵتانەوەو ببێتە هۆی تیاچونتان). یان فەرمووی: (شەڕ و خراپەیە بخاتە دڵتانەوە). - ئەم فەرمووده پێشتر بە ژمارە: (٢٤٧٠) هاتوە -.

## سەبارەت بە جێبەجێ کردنی بەڵێن لەکاتی خۆیدا.

### ٩١ - باب فِي الْعِدَةِ.

٤٩٩٥ - (ضعيف) عن زيد بن أرقم, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا وَعَدَ الرَّجُلُ أَخَاهُ وَمِنْ نِيَّتِهِ أَنْ يَفِيَ لَهُ فَلَمْ يَفِ, وَلَمْ يَجِئْ لِلْمِيعَادِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ بەڵێنێکی دا بە برایەکی موسوڵمانی خۆی لەدڵەوە نیاز و مەبەستی ئەوە بێ جێبەجێی بکات، بەڵام لەکاتی خۆیدا بۆی نەکرا جێبەجێی بکات بەهانەیەکی رەوای هەبوو ئەوە گوناهی ناگات).

٤٩٩٦ - (ضعيف الإسناد) عن عبد الله بن أبي الحمساء قال: بَايَعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَيْعٍ قَبْلَ أَنْ يُبْعَثَ, وَبَقِيَتْ لَهُ بَقِيَّةٌ, فَوَعَدْتُهُ أَنْ آتِيَهُ بِهَا فِي مَكَانِهِ, فَنَسِيتُ, ثُمَّ ذَكَرْتُ بَعْدَ ثَلَاثٍ, فَجِئْتُ فَإِذَا هُوَ فِي مَكَانِهِ, فَقَالَ: (يَا فَتَى لَقَدْ شَقَقْتَ عَلَيَّ أَنَا هَا هُنَا مُنْذُ ثَلَاثٍ أَنْتَظِرُكَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو حەمسائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەپێش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ببێت بە پێغەمبەر، شتێکم لێ کڕی، هەندێ لە بەهاکەی مابوو لەسەرم کە بیدەمێ بۆیە بەڵێن و پەیمانم دا بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆی ببەم بۆ ئەو شوێنە بەڵام لەیادم چوو، لەپاش سێ شەو بیرم کەوتەوە، کە چووم دەبینم لە شوێنی خۆی راوەستاوە چاوەڕوانی دەکات، فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم بە ڕاستی توشی سەغڵەتی و زەحمەتت کردم ئەوە سێ شەوە من لێرە چاوەڕوانیت دەکەم).

## سەبارەت بە کەسێ خۆی وەها نیشان بدات کە شتێکی هەیە بەڵام نەیبێ.

## ٩٢ - باب فِي الْمُتَشَبِّعِ بِمَا لَمْ يُعْطَ.

٤٩٩٧ - (صحيح) عن أسماء بنت أبي بكر: أن المرأة قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ لِي جَارَةً - تَعْنِي ضَرَّةً - هَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ لَهَا بِمَا لَمْ يُعْطِ زَوْجِي؟ قَالَ: (الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ).

واتە: لە ئەسمائی کچی پێشەوا ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من هەویەم هەیە ئایا گوناهم ناگا بڵێم مێردەکەم فلان شتی داوە پێم بەڵام لە ڕاستی دا نەیدابێ پێم؟ فەرمووی: (ئەوەی بەو شێوەیە بێت قسەکەی و کردەوەکەی درۆیە وەك ئەو

کەسە وایە کە خۆی خراپکارەو بەرگی پیاوچاکان دەپۆشێ و فێڵ لە خەڵك دەکات).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە سوعبەت.

## ٩٣ - باب مَا جَاءَ فِي الْمِزَاحِ.

٤٩٩٨ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, احْمِلْنِي, قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّا حَامِلُوكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ). قَالَ: وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای وشترێکی لێ کرد بۆ سواری، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من بەچکە وشترێکی مێینەت دەدەمێ)، وتی: جا چی لە بەچکە وشتر بکەم بەکەڵکی سواری نایەت؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئایا گەورەو بچوکیان بەچکەی وشتری مێ نین).

٤٩٩٩ - (ضعيف الإسناد) عن النعمان بن بشير قال: اسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمِعَ صَوْتَ عَائِشَةَ عَالِيًا, فَلَمَّا دَخَلَ تَنَاوَلَهَا لِيَلْطِمَهَا, وَقَالَ: لاَ أَرَاكِ تَرْفَعِينَ صَوْتَكِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْجُزُهُ, وَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ مُغْضَبًا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ: (كَيْفَ رَأَيْتِنِي أَنْقَذْتُكِ مِنَ الرَّجُلِ؟). قَالَ: فَمَكَثَ أَبُو بَكْرٍ أَيَّامًا, ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَهُمَا قَدِ اصْطَلَحَا, فَقَالَ لَهُمَا: أَدْخِلاَنِي فِي سِلْمِكُمَا كَمَا أَدْخَلْتُمَانِي فِي حَرْبِكُمَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ فَعَلْنَا قَدْ فَعَلْنَا).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بڕواتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لە عائیشەی کچی بوو دەنگی بەرزکردبوەوە بەسەر پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە چوە ژوورەوە پەلاماری دا ویستی بە زللە لێی بدات، وتی: ئەوە بۆ دەبینم دەنگی بەرزکردبوەوە بەسەر پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەیهێشت لێی بدات، جا پێشەوا ئەبو بەکر بە توڕەییەوە چووە دەرەوە، کاتێ کە چووە دەرەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (منت بینی چۆن رزگارم کردی لەدەست ئەو پیاوە؟) راوی وتی: پێشەوا ئەبو بەکر چەند رۆژێ مایەوە، لەپاشدا هاتەوە پێغەمبەری مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بڕواتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە چوە ژوورەوە سەیر دەکات ئەوان ڕێکەوتون، پێی وتن: ڕێگەتان دام لەکاتی خۆشی و ڕێکەوتنتاندا بێمە ژوورەوە وەك چۆن ڕێگەتان دام لەکاتی ناکۆکیتاندا بێمە ژوورەوە). پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو کارەمان کرد، ئەو کارەمان کرد).

٥٠٠٠ - (صحيح) عن عوف بن مالك الأشجعي قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ فَسَلَّمْتُ فَرَدَّ, وَقَالَ: (ادْخُلْ). فَقُلْتُ: أَكُلِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (كُلُّكَ). فَدَخَلْتُ.

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە جەنگی تەبوکدا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خێمەیەکی بچوکی لە چەرم دروستکراودا بوو، سڵاوم لێکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی سەلامەکی دامەوەو فەرمووی: (وەرە ژوورەوە بۆ ناو دەوارەکەم)، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو جەستەم بێنمە ژوورەوە، فەرمووی: (بەڵێ بە هەموو جەستەتەوە وەرە ژوورەوە)، منیش چوومە ژوورەوە. بێگومان عەوفی کوڕی مالیك لەبەر بچوکی دەوارەکە وای وت.

٥٠٠١ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن عثمان بن العاتكة قال: إِنَّمَا قَالَ أَدْخُلُ كُلِّي. مِنْ صِغَرِ الْقُبَّةِ.

واتە: لە (عثمان)ی کوڕی عاتیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بێگومان عەوف لەبەر بچوکی دەوارەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو جەستەم بێنمە ژوورەوە.

٥٠٠٢ - (صحيح) عن أنس قال: قال لي النبي صلى الله عليه وسلم (يَا ذَا الأُذُنَيْنِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی خاوەنی دوو گوێ).

## باسی کەسێ بەگاڵتەوە شت و مەکی کەسێ بەرێ.

## ٩٤ - باب مَنْ يَأْخُذُ الشَّيْءَ عَلَى الْمِزَاحِ.

٥٠٠٣ - (حسن) عن عبد الله بن السائب بن يزيد, عن أبيه, عن جده: أنه سمع رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (لاَ يَأْخُذَنَّ أَحَدُكُمْ مَتَاعَ أَخِيهِ لاَعِبًا وَلاَ جَادًّا). وَقَالَ سُلَيْمَانُ: (لَعِبًا وَلاَ جِدًّا). (وَمَنْ أَخَذَ عَصَا أَخِيهِ فَلْيَرُدَّهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی سائیبی کوڕی یەزیدەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە دەیفەرموو: (با هیچ کەسێ لەئێوە نە بەگاڵتەو نە بەراست شت و مەکی برا موسوڵمانەکەی نەبات). سولەیمان وتی: (نە بەگاڵتەو نە بەراست)، (ئەگەر یەکێکتان دار دەستی برا موسوڵمانەکەی برد با بیگێڕێتەوە بۆی).

٥٠٠٤ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي ليلا قال: حَدَّثَنَا أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُمْ كَانُوا يَسِيرُونَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَنَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ, فَانْطَلَقَ بَعْضُهُمْ إِلَى حَبْلٍ مَعَهُ فَأَخَذَهُ, فَفَزِعَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبو لەیلاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هاوەڵە بەڕێزەکانی موحەممەد صلی الله علیه وسلم بۆیان گێڕاینەوە کە لە خزمەتیدا دەرچوون بۆ شوێنێ، لە ڕێگادا پیاوێکیان خەوی لێکەوت، پەتێکی پێ بوو تێیان ئالاندوو رایانکێشا، ئەویش خەبەری بوویەوە زۆر ترسا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بۆ هیچ موسڵمانێك ڕەوا نیە برا موسڵمانەکەی بترسێنێ با بە گاڵتەشەوە بێت).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەو کەسەی لەکاتی قسەکردندا زمانی بەکون و قوژبنی دەمیدا دەگێڕێ.

## ٩٥ - باب مَا جَاءَ فِي الْمُتَشَدِّقِ فِي الْكَلاَمِ.

٥٠٠٥ - (صحيح) عن بشر بن عاصم, عن أبيه, عن عبد الله - قال أبو داود: هو ابن عمرو - قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبْغِضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِى يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ تَخَلُّلَ الْبَاقِرَةِ بِلِسَانِهَا).

واتە: لە بەشیری کوڕی عاصیمەوە، لە باوکیەوە، لە (عبد الله)وە - ئەبو داود دەڵێت: ئەو (عبد الله)یە ئیبنو عەمرە - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە رقی لەو پیاوە دەم هەراشەیە کە لەکاتی قسەکردندا زمانی بەکون و قوژبنی دەمیدا دەگێڕێ بۆ قسەی زل، وەك چۆن مانگا لەکاتی لەوەڕدا ئالف و شت دەماشێتەوە).

٥٠٠٦ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَعَلَّمَ صَرْفَ الْكَلَامِ لِيَسْبِيَ بِهِ قُلُوبَ الرِّجَالِ أَوِ النَّاسِ لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی فێری قسەی ڕەوان ببێ وتەکانی بڕازێنێتەوەو زیادەیان پێوە بنێ بۆ ئەوەی سەرنجی دڵی پیاوان یان خەڵك ڕاکێشێ، ئەوە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا نوێژی فەرز و سوننەتی لێ قبوڵ ناکات).

٥٠٠٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: قَدِمَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ, فَخَطَبَا, فَعَجِبَ النَّاسُ - يَعْنِى لِبَيَانِهِمَا - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا) أَوْ (إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوو پیاو لە رووی ڕۆژهەڵاتەوە هاتن وتاریان دا خەڵکەکە زۆر بە لایانەوە سەیر بوو - واتە بە دەربڕینی جوان و ڕەوانبێژیان -، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڕاستی قسەی ڕەوان و ڕونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە). یان: (بەڕاستی هەندێ قسەی ڕەوان و ڕونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە).

٥٠٠٨ - (حسن الإسناد) عن عمرو بن عاص قال: أنَّ رجلاً قام يوماً، فَأَكْثَرَ الْقَوْلَ, فَقَالَ عَمْرٌو: لَوْ قَصَدَ فِي قَوْلِهِ, لَكَانَ خَيْرًا لَهُ, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لَقَدْ رَأَيْتُ, أَوْ أُمِرْتُ, أَنْ أَتَجَوَّزَ فِي الْقَوْلِ, فَإِنَّ الْجَوَازَ هُوَ خَيْرٌ).

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پیاوێ هەستایەوە قسەی زۆری کرد، عەمر وتی: ئەگەر قسەکانی ناوەند بوایە واتە قسەی کەمی بکردایە، ئەوە چاکتر بوو بۆی، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (فەرمانم پێ کراوە قسەکانم کورت بێت، چونکە ئەوە خێرە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی شیعرو هۆنراوە

## ٩٦ - باب مَا جَاءَ فِي الشِّعر

٥٠٠٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا). قَالَ أَبُو عَلِيٍّ: بَلَغَنِي عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ أَنَّهُ قَالَ: وَجْهُهُ: أَنْ يَمْتَلِئَ قَلْبُهُ حَتَّى يَشْغَلَهُ عَنِ الْقُرْآنِ وَذِكْرِ اللَّهِ, فَإِذَا كَانَ الْقُرْآنُ وَالْعِلْمُ الْغَالِبُ فَلَيْسَ جَوْفُ هَذَا عِنْدَنَا مُمْتَلِئًا مِنَ الشِّعْرِ, وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا. قَالَ: كَأَنَّ الْمَعْنَى أَنْ يَبْلُغَ مِنْ بَيَانِهِ أَنْ يَمْدَحَ الإِنْسَانَ فَيَصْدُقَ فِيهِ حَتَّى يَصْرِفَ الْقُلُوبَ إِلَى قَوْلِهِ, ثُمَّ يَذُمَّهُ فَيَصْدُقَ فِيهِ حَتَّى يَصْرِفَ الْقُلُوبَ إِلَى قَوْلِهِ الآخَرِ, فَكَأَنَّهُ سَحَرَ السَّامِعِينَ بِذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ناوسکی کەسێکتان پڕبێ لە کێم و زوخاو ئەوە زۆر چاکترە بۆی لەوەی کە پڕبێ لە شیعر و هۆنراوە). ئەبو عەلی دەڵێ: پێم گەیشتوە کە ئەبو عوبەید وتویەتی: مانای فەرموودەکە: دڵی پڕ ببێ لە شیعر و هۆنراوە ئەوەیە سەرقاڵی بکات و دووری بخاتەوە لە قورئان خوێندن و یادی خوا، بەڵام بەلای ئێمەوە ئەگەر دڵی قورئان و زانستی شەرعی زیاتر تێدا بوو ئەوە پڕ نیە لە شیعر و هۆنراوە، (بەڕاستی هەندێ قسەی ڕەوان و ڕونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە). ڕاوی وتی: وەك بڵێی ماناکەی بەم شێوەیەیە: دەربڕین و ڕونکردنەوە جوانەکەی بگاتە ڕادەیە مەدح و ستایشی کەسێ بکات باوەڕی پێ بکەن هەتا دڵەکان ڕاکێشێ بۆ لای قسەکەی، یان بە پێچەوانەوە سەرزەنشتی کەسێ بکات باوەڕی پێ بکەن هەتا دڵەکان ڕاکێشێ بۆ لای قسەکەی، وەك ئەوەی بەو قسانەی سیحر بکات لە گوێگران.

٥٠١٠ - (صحيح) عن أبي بن كعب, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً).

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی شیعر و هۆنراوە دانایی و حیکمەتی تێدایە).

٥٠١١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَعَلَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا, وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەستی کرد بە قسەکردن ئەوەندە قسەی نەستەقی کرد و دەربڕین و ڕونکردنەوەی جوان بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بەڕاستی قسەی ڕەوان و ڕونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە، وە بەڕاستی شیعر و هۆنراوە دانایی و حیکمەتی تێدایە).

٥٠١٢ - (ضعيف) صخر بن عبد الله بن بريدة, عن أبيه, عن جده قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا, وَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ جَهْلاً, وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا, وَإِنَّ مِنَ الْقَوْلِ عِيَالاً). فَقَالَ صَعْصَعَةُ بْنُ صُوحَانَ صَدَقَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَمَّا قَوْلُهُ: (إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا). فَالرَّجُلُ يَكُونُ عَلَيْهِ الْحَقُّ وَهُوَ أَلْحَنُ بِالْحُجَجِ مِنْ صَاحِبِ الْحَقِّ فَيَسْحَرُ الْقَوْمَ بِبَيَانِهِ فَيَذْهَبُ بِالْحَقِّ وَأَمَّا قَوْلُهُ (إِنَّ مِنَ الْعِلْمِ جَهْلاً). فَيَتَكَلَّفُ الْعَالِمُ إِلَى عِلْمِهِ مَا لاَ يَعْلَمُ فَيُجَهِّلُهُ ذَلِكَ, وَأَمَّا قَوْلُهُ: (إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا). فَهِيَ هَذِهِ الْمَوَاعِظُ وَالأَمْثَالُ الَّتِى يَتَّعِظُ بِهَا النَّاسُ, وَأَمَّا قَوْلُهُ: (إِنَّ مِنَ الْقَوْلِ عِيَالاً). فَعَرْضُكَ كَلاَمَكَ وَحَدِيثَكَ عَلَى مَنْ لَيْسَ مِنْ شَأْنِهِ وَلاَ يُرِيدُهُ.

واتە: لە سەخری کوڕی (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی قسەی رەوان و رونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە، هەندێ زانست نەزانینە، هەندێ شیعر و هۆنراوە دانایی و حیکمەتی تێدایە، هەندێ قسە هەیە نەکردنی باشترە تۆ قسە بۆ کەسێ بکەی شایستە نەبێ و قسەکەی نەوێ). صەعصەعەی کوڕی صوحان وتی: بەڕاستی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم راست و دروستە، ئەوەی کە دەفەرموێت: (بەڕاستی قسەی رەوان و رونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە) پیاوی وا هەیە هەقی کەسێکی تری لەسەرە، بەڵام ئەم لە خاوەن هەقەکە قسەزان ترە، بە قسەی رەوان و دەربڕینی جوان چاوبەست و سیحر لە خەڵکەکە دەکات و هەقەکە بە نارەوا بۆ خۆی دەبات. ئەوەی کە دەفەرمووێت: (هەندێ زانست نەزانینە) - وەك ئەوە هەندێ لە زانایان بەزۆرەملێ زانستەکەیان تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن بە هەندێ شتی تر کە نایانزانن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە پایەی زانایان دابەزن و بچنە ریزی نەزانانەوە. ئەوەی کە دەفەرمووێت: (هەندێ شیعر و هۆنراوە دانایی و حیکمەتی تێدایە) وەك ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی کە خەڵك دەرس و پەند و عیبرەتیان لێ وەردەگرن. ئەوەی کە دەفەرمووێت: (هەندێ قسە هەیە نەکردنی باشترە) وەك ئەوە قسەیە بۆ یەکێ بکەی ئەو کەسە حەزی لەو باسە نەبێ و سەری لێ دەرنەکات).

٥٠١٣ - (صحيح) عن سعيد قال: مَرَّ عُمَرُ بِحَسَّانَ وَهُوَ يُنْشِدُ فِي الْمَسْجِدِ فَلَحَظَ إِلَيْهِ, فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أُنْشِدُ وَفِيهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ.

واتە: لە سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ دای بەلای حەساندا لەمزگەوت شیعر و هۆنراوەی دەخوێندەوە بە چاوی ئینکاریەوە سەیری کرد، وتی: هەر لەم مزگەوتەدا شیعر و هۆنراوەم خوێندۆتەوە لەوکاتەدا لەتۆ چاکتریش لەوێ بووە - کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو - .

٥٠١٤ - (صحيح) عن أبو هريرة , بِمَعْنَاهُ, زَادَ: فَخَشِيَ أَنْ يَرْمِيَهُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَجَازَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە، بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێشەوا عومەر بە رێگەپێدانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ترسا، بۆیە ئەویش رێگەی پێدا.

٥٠١٥ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ لِحَسَّانَ مِنْبَرًا فِي الْمَسْجِدِ فَيَقُومُ عَلَيْهِ يَهْجُو مَنْ قَالَ فِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ مَعَ حَسَّانَ مَا نَافَحَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوت مینبەرێکی دانا بۆ حەسان ئەویش لەسەر ئەو مینبەرە بەرپەرچی ئەوانەی دەدایەوە کە هەجویان دەکرد بە شیعر و هۆنراوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (جبریل لەگەڵ حەساندایە لەکاتێکدا کە بەرپەرچی هەجوی هاوبەش بۆ خوا دانەران دەداتەوە).

٥٠١٦ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: (وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ) فَنَسَخَ مِنْ ذَلِكَ وَاسْتَثْنَى فَقَالَ: (إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾سورة الشعراء:٢٢٤. واتە: ئایا نابینی کە ئەوانە (شاعیرەکان) بەهەموو دۆڵ و شیوێکدا بەسەر لێشێواوی دەڕۆن (شیعر دەڵێن). ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بەم ئایەتە: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾. سورة الشعراء:٢٢٧. واتە: جگە لەوانەیان بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە، وە یادو زیکری خوایان زۆر کردووە.

# ئەوەی هاتوە دەربارەی خەوبینین.

## ٩٧ - باب ما جاء في الرؤيا.

٥٠١٧ - (صحيح الإسناد) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ يَقُولُ: (هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا؟) وَيَقُولُ: (إِنَّهُ لَيْسَ يَبْقَى بَعْدِى مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ).

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە لەنوێژی بەیانی دەبوەوە دەیفەرموو: (ئایا هیچ کەسێ لەئێوە ئەم شەو خەوێکی دیوە؟). وە دەیفەرموو: (لەدوای من موژدەدەرانی پێغەمبەرایەتی نەماون بێجگە لە خەوی راست و چاك - کە موسڵمان خۆی دەیبینێ، یان خەڵکی تر پێوەی دەبینن -).

٥٠١٨ - (صحيح) عن عبادة بن صامت, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ).

لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەونی موسوڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

٥٠١٩ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ أَنْ تَكْذِبَ, وَأَصْدَقُهُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا, وَالرُّؤْيَا ثَلاَثٌ: فَالرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ بُشْرَى مِنَ اللَّهِ, وَالرُّؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ, وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ بِهِ الْمَرْءُ نَفْسَهُ, فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ). قَالَ (وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ, وَالْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِى الدِّينِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ). يَعْنِى إِذَا اقْتَرَبَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ يَعْنِى يَسْتَوِيَانِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ زەمانە نزیك بێتەوە - واتە کاتێ قیامەت نزیك بوویەوە یان شەو و رۆژ بەرابەر بوون -، زۆر نزیکە خەوی موسوڵمان راست دەرچێ کەم جار درۆ دەردەچێت، ئەو کەسەشتان خەونی راستە کە خۆی راستگۆیە، خەون سێ جۆرە: خەوی راست و چاك موژدەدانە بە بەندە لەلایەن خواوە، هەندێ خەویش خەم و خەفەتەو لە شەیتانەوەیە، هەندێ خەوی تریش دالغەو خەیاڵی دەروونە - کەسێ خەیاڵی لەلای شتێ بێ خەوی پێوە دەبینێ -، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو با هەستێ نوێژ بکات و لای کەس باسی نەکات). فەرمووی: (پێوەندم لە خەودا پێ خۆشە، چونکە نیشانەی دامەزراویە لەسەر دین، بەڵام زنجیری ملم لە خەودا پێ ناخۆشە). ئەبو داود دەڵێت: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ). واتە: کاتێ شەو و رۆژ یەکسان و بەرابەر بوون واتە ئەوەندەی یەك ماوەیان بوو.

٥٠٢٠ - (صحيح) عن أبو رزين قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ تُعَبَّرْ, فَإِذَا عُبِّرَتْ وَقَعَتْ). قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: (وَلاَ يَقُصُّهَا إِلاَّ عَلَى وَادٍّ أَوْ ذِي رَأْيٍ).

واتە: لە ئەبو رەزینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەون قەرار ناگرێ ئەگەر پیاو باسی نەکات و لێکدانەوەی بۆ نەکان نایەتەدی، بەڵام ئەگەر باسی بکات و لێکدانەوەی بۆ بکات دێتەدی).

٥٠٢١ - (صحيح) عن أبو قتادة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ, وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ, فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, ثُمَّ لْيَتَعَوَّذْ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ).

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا

صلی اللە علیە وسلم بوو دەیفەرموو: (خەوی لە خواوەیە، خەوی ناخۆش و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر كەسێكتان خەوێكی دی پێی ناخۆش بوو با لەلای چەپییەوە سێ جار تف رۆبكات، لەپاشدا پەنا بگرێ بە خوا لە شەڕ و خراپەی ئەو خەوە و - لە شەیتان و لەلای كەس باسی نەكات - ئیتر زیانی نابێ بۆی).

٥٠٢٢ - (صحيح) عن جابر, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاَثًا, وَيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِى كَانَ عَلَيْهِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێكتان خەوێكی دی پێی ناخۆش بوو با لەلای چەپییەوە سێ جار تف رۆبكات، لەپاشدا سێ جار پەنا بگرێ بە خوا لە شەیتان، لەسەر ئەو لایەی كە خەوتوە وەرچەرخێ بۆ لاكەی تری). - واتە ئەگەر لەسەر لای راست راكشابوو با وەرچەرخێ و لەسەر لای چەپ راكشێ - .

٥٠٢٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ). أَوْ (لَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ وَلاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەسێ لە خەوا من ببینێ، وەك ئەوە وایە كاتێ كە بێدارە و بەخەبەرە من ببینێ، شەیتان ناتوانێ خۆی بباتە سەر شێوەو شكڵی من و لەخەوا خۆی نیشانتان بدات).

٥٠٢٤ - (صحيح) عن ان عباس, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ صَوَّرَ صُورَةً عَذَّبَهُ اللَّهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا وَلَيْسَ بِنَافِخٍ, وَمَنْ تَحَلَّمَ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ شَعِيرَةً, وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ يَفِرُّونَ بِهِ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەدونیادا وێنەیە بکێشێ کە خاوەن روح بێ، لەڕۆژی قیامەتدا داوای لێ دەکرێ روح بکات بە بەر ئەو وێنەدا، هەرگیز ناشتوانێ روح بکات بەبەریا، هەرکەسێ لەدونیادا خەونێ بەدرۆوە هەڵبەستێ لەڕۆژی قیامەتدا زۆری لێ دەکرێ دوو دەنکە جۆ پێکەوە گرێ بدات، هەرگیز ناشتوانێ ئەو کارە بکات، هەرکەسێ گوێ بگرێ بۆ چپەی کۆمەڵێ لەکاتێکدا کە ئەوان نەیانەوێ و پێیان ناخۆش بێ لەڕۆژی قیامەتدا قوڕقوشمی سورۆکراوی تواوە دەکرێتە ناو کرکراگەی هەردوو گوێچکەیەوە).

٥٠٢٥ - عن أنس بن مالك, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ كَأَنَّا فِي دَارِ عُقْبَةَ بْنِ رَافِعٍ, وَأُتِينَا بِرُطَبٍ مِنْ رُطَبِ ابْنِ طَابٍ, فَأَوَّلْتُ أَنَّ الرِّفْعَةَ لَنَا فِي الدُّنْيَا, وَالْعَاقِبَةَ فِي الآخِرَةِ, وَأَنَّ دِينَنَا قَدْ طَابَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەوێ لەخەوما وەك لە ماڵی عوقبەی کوڕی رافیعدا بین وابوو، خورمای تەڕی تازەیان بۆ هێناین کە پێی دەڵێن: خورمای (ابْنِ طَاب)، منیش خەونەکەم بەم شێوەیە لێکدایەوە رافیع بە سەربەرزی دنیامان، عوقبەش بە سەرەنجامی باشی دوارۆژمان، خورمای (ابْنِ طَاب)یش بەوەی کە دینەکەمان باشەو دامەزراوەو جێگیر بووە).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی باوێشکدان.

## ٩٨ - باب مَا جَاءَ فِي التَّثَاؤُبِ.

٥٠٢٦ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ عَلَى فِيهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ یەکێك لە ئێوە باوێشکی هات با دەست بگرێ بە دەمیەوە، چونکە شەیتان دەیەوێ لەناو دەمیەوە بچێتە ژوورەوە).

٥٠٢٧ - (صحيح) عن سهيل, نحوه, قال: (فِي الصَّلاَةِ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ).

واتە: لە سوهەیلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، فەرمووی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژدا باوێشکی هات با ئەوەندەی دەتوانێ دەست بگرێ بە دەمیەوە بۆئەوەی شەیتان نەچێتە ژوورەوە).

٥٠٢٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ, وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ, فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ وَلاَ يَقُلْ: هَاهْ هَاهْ, فَإِنَّمَا ذَلِكُمْ مِنَ الشَّيْطَانِ يَضْحَكُ مِنْهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە پژمەی پێ خۆشەو، باوێشکی پێ ناخۆشە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی هات با ئەوەندەی دەتوانێ دەست بگرێ بە دەمیەودو نەڵێ: هاه هاه، چونکە ئەو باوێشکە لە شەیتانەوەیەو پێی پێ دەکەنێ).

## سەبارەت بە پژمە.

## ١٩٩- بباب فِي الْعُطَاسِ.

٥٠٢٩ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا عَطَسَ وَضَعَ يَدَهُ أَوْ ثَوْبَهُ عَلَى فِيهِ وَخَفَضَ أَوْ غَضَّ بِهَا صَوْتَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستوری وابوو کە دەپژمی دەم و لوتی خۆی بەدەستی یان بە جلەکەی دادەپۆشی و دەنگی خۆی کپ دەکرد.

٥٠٣٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ: رَدُّ السَّلَامِ, وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ, وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ, وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ, وَاتِّبَاعُ الْجَنَازَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێج شت واجبن لەسەر موسوڵمان بەرامبەر بە برا موسوڵمانەکەی: وەڵامدانەوەی سڵاو، پاڕانەوە بۆ پژمە - واتە ئەگەر پژمی و وتی: (الحَمْدُ لله)سوپاس بۆ خوا، پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ الله) خوا روحمت پێ بکات -، چوون بۆ دەعوەت، سەردانی نەخۆش و، شوێنکەوتنی جەنازە).

## ئەوەی هاتوە سەبارەت
## بە پاڕانەوە بۆ ئەو كەسەی دەپژمێ.

## ١٠٠ - باب ما جاء في تشميت العاطس.

٥٠٣١ - (ضعيف) عن هيلال بن يساف قال: كُنَّا مَعَ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ فَعَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, فَقَالَ سَالِمٌ: وَعَلَيْكَ وَعَلَى أُمِّكَ. ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ مِمَّا قُلْتُ لَكَ؟ قَالَ: لَوَدِدْتُ أَنَّكَ لَمْ تَذْكُرْ أُمِّي بِخَيْرٍ وَلاَ بِشَرٍّ؟ قَالَ: إِنَّمَا قُلْتُ لَكَ, كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, إِنَّا بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَعَلَيْكَ وَعَلَى أُمِّكَ). ثُمَّ قَالَ: (إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ). قَالَ فَذَكَرَ بَعْضَ الْمَحَامِدِ (وَلْيَقُلْ لَهُ مَنْ عِنْدَهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ وَلْيَرُدَّ - يَعْنِى عَلَيْهِمْ - يَغْفِرُ اللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ).

واتە: لە هیلالی كوڕی یسافەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ سالیمی كوڕی عوبەیدا بووین، پیاوێ پژمی وتی: سڵاوی خواتان لەسەر، سالیم وتی: سڵاوی خوا لەسەر خۆت و لەسەر دایكت، لەپاشدا وتی: لەوانەیە ئەوەی پێم وتی پێت ناخۆش بێ، وتی: خۆزگە نە بە چاك و نە بە خراپ ناوی دایكمت نەهێنایە، سالیم وتی: وەك ئەوەم پێ وتی كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی بە پیاوێ، جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین، پیاوێ پژمی لەدوای پژمەكە وتی: سڵاوی خواتان لەسەر، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سڵاوی خوا لەسەر خۆت و لەسەر دایكت). لەپاشدا فەرمووی: (ئەگەر یەكێك لە ئێوە پژمی با سوپاسی خوای گەورە بكات، ئەوانەی لەدەوروبەرینی پێی بڵێن: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) خوا ڕوحمت پێ بكات، ئەویش پێیان بڵێ: (يَغْفِرُ اللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ) خوای گەورە لە منیش و لەئێوەش خۆش بێ.

٥٠٣٢ - عَنْ خَالِدِ بْنِ عَرْفَجَةَ, عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ الأَشْجَعِيِّ, بِهَذَا الْحَدِيثِ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٥٠٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ, وَلْيَقُلْ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ, وَيَقُولُ هُوَ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ, وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ) سوپاس بۆ خوای گەورە لەهەموو حاڵەتێکدا، براکەی یان هاوڕێکەی پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خوا روحمت پێ بکات، ئەویش پێیان بڵێ: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ, وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) خوا ڕێنمایتان بکات و حاڵتان بۆ چاك بکات.

## تا چەند جار پێی بڵێی: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ).

## ١٠١ - باب كَمْ مَرَّةٍ يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ.

٥٠٣٤ - (حسن موقوف ومرفوع) عن أبو هريرة قال: شَمِّتْ أَخَاكَ ثَلاَثًا, فَمَا زَادَ فَهُوَ زُكَامٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر براکەت پژمی تا سێ جار پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ). ئیتر لەوە زیاتر هەلامەتە.

٥٠٣٥ - (حسن) عن أبو هريرة قال: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ أَنَّهُ رَفَعَ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بِمَعْنَاهُ.

٥٠٣٦ - ((ضعيف) عن عبيد بن رفعة الزوقي, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (تُشَمِّتُ الْعَاطِسَ ثَلَاثًا, فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُشَمِّتَهُ فَشَمِّتْهُ, وَإِنْ شِئْتَ فَكُفَّ).

واتە: لە عوبەیدی کوڕی ریفاعەی زورەقیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وتنی: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) خۆی تا سێ جارە، ئیتر لەوە زیاتر بەدەست خۆتە ئەتوانی لەوە زیاتر پێی بڵێ، وە ئەشتوانی لەوە زیاتر نەیڵێی و ئەوەندە بەسە.

٥٠٣٧ - (صحيح) عن سلمة بن الأكوع : أَنَّ رَجُلاً عَطَسَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ). ثُمَّ عَطَسَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الرَّجُلُ مَزْكُومٌ).

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پژمی، پێی فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) لەپاشدا پژمیەوە، فەرمووی: (ئەم پیاوە توشی هەڵامەت بووە).

## ئەگەر (ذمي)[1] یە پژمی چی پێ بوترێت.

## ١٠٠ - بباب كَيْفَ يُشَمَّتُ الذِّمِّيُّ.

٥٠٣٨ - (صحيح) عن أبو بردة, عن أبيه قال: كَانَتِ الْيَهُودُ تَعَاطَسُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, رَجَاءَ أَنْ يَقُولَ لَهَا: يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ, فَكَانَ يَقُولُ (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ).

---

(١) ئەو کەسانەی کە خاوەن نامەی ئاسمانین و لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا دەژین پێیان دەوترێ: (الذمي).

واتە: لە ئەبو بوردەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جوەکان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەپژمین، بە هیوای ئەوەی پێیان بفەرمویێت: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) خوا رەحمتان پێ بکات، بەڵام ئەو دەیفەرموو: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ, وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) خوا رێنمایتان بکات و حاڵتان بۆ چاك بکات.

## سەبارەت بە کەسێ بپژمێ و سوپاسی خوا نەکات.

## ١٠١ - باب فِيمَنْ يَعْطُسُ وَلاَ يَحْمَدُ اللَّهَ.

٥٠٣٩ - (صحيح) عن أنس قال: عَطَسَ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَتَرَكَ الآخَرَ, قَالَ: فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, رَجُلاَنِ عَطَسَا فَشَمَّتَّ أَحَدَهُمَا - قَالَ أَحْمَدُ أَوْ فَشَمَّتَّ أَحَدَهُمَا - وَتَرَكْتَ الآخَرَ. فَقَالَ: (إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ, وَإِنَّ هَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پژمین، بە یەکێکیانی فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، بەڵام بەوی تریانی نەفەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ). وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆ یەکێکیانت فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، بەڵام بەوی تریانت نەفەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، فەرمووی: ئەمەیان سوپاسی خوای کرد، بەڵام ئەمەیان سوپاسی خوای نەکرد.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## باسەكانی خەوتن.
## أبواب النوم

### سەبارەت بە پیاوێ لەسەر سكی راكشێت.
### ١٠٢ - باب فِي الرَّجُلِ يَنْبَطِحُ عَلَى بَطْنِهِ.

٥٠٤٠ - (ضعيف مضطرب غير أن الأضطجاع على البطن صحيح) عن يعيش بن طخفة بن قيس الغفاري قال: كَانَ أَبِي مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (انْطَلِقُوا بِنَا إِلَى بَيْتِ عَائِشَةَ). فَانْطَلَقْنَا, فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ أَطْعِمِينَا). فَجَاءَتْ بِحَشِيشَةٍ فَأَكَلْنَا ثُمَّ قَالَ (يَا عَائِشَةُ أَطْعِمِينَا). فَجَاءَتْ بِحَيْسَةٍ مِثْلِ الْقَطَاةِ فَأَكَلْنَا, ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ اسْقِينَا). فَجَاءَتْ بِعُسٍّ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبْنَا, ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ اسْقِينَا). فَجَاءَتْ بِقَدَحٍ صَغِيرٍ فَشَرِبْنَا ثُمَّ قَالَ (إِنْ شِئْتُمْ بِتُّمْ وَإِنْ شِئْتُمُ انْطَلَقْتُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ). قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا مُضْطَجِعٌ فِي الْمَسْجِدِ مِنَ السَّحَرِ عَلَى بَطْنِي إِذَا رَجُلٌ يُحَرِّكُنِي بِرِجْلِهِ, فَقَالَ: (إِنَّ هَذِهِ ضِجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللَّهُ). قَالَ: فَنَظَرْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە یەشیعەی كوڕی (طخفة)ی كوڕی قەیسی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: باوكم لە هاوڕێیانی (صفة) بوو - واتە یەكێ بوو لەو هەژارانەی لەمزگەوتی مەدینەدا دەژیان -، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وەرە لەگەڵمان بۆ ماڵی خاتو عائیشە). لەگەڵی رۆشتین، فەرمووی: (ئەی عائیشە خواردنمان بدەرێ). ئەویش (حَشِیشَة)ی بۆ هێنایین خواردمان - وەك

گەنمە کوتراوی خۆمانە بەڵام ئەوان گۆشت یان خورمایان تێ دەکرد -، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی عائیشە خواردنمان بدەرێ). ئەویش (حَيْسَة)ی بۆ هێناین وەك قەتێ وا بوو خواردمان - (حَيْسَة) لە خورماو رۆن و کەشك دروست دەکرێت - لەپاشدا فەرمووی: (ئەی عائیشە خواردنەوەمان بدەرێ). ئەویش لە جامێکی گەورەدا شیری بۆ هێناین خواردمانەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی عائیشە خواردنەوەمان بدەرێ). ئەویش لە جامێکی بچوکدا هێنای خواردمانەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ئەگەر دەتانەوێ شەو لێر بمێننەوە، ئەگەر دەشتانەوێ بڕۆنەوە بۆ مزگەوت)، وتی: لەبەر ژانێ لە سنگمدا، لەمزگەوت لەسەر سك ڕاکشابووم پیاوێ بە قاچی جوڵاندمی، فەرمووی: (خوای گەورە رقی لەم جۆرە پاڵکەوتنەیە). سەیرم کرد پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

## سەبارەت بە خەوتن لەسەر قەراغی سەربانێ ساتر(موحاجەرة)ی نەبێ.

## ١٠٣ - باب فِي النَّوْمِ عَلَى سَطْحٍ غَيْرِ مُحَجَّرٍ.

٥٠٤١ – (صحيح) عن عبد الرحمن بن علي - يعني ابن شيبان - , عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَيْسَ لَهُ حِجَارٌ فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەلیەوە - واتە ئیبنو شەیبان - لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەسەر بانێ بخەوێ سەتر (ساتر، موحاجەرە)ی نەبێت ئەوە بەڕاستی ئۆباڵی بە ئەستۆی خۆیەتی و لە پەناو ئەمانی خوای گەورە دەردەچێت).- ئەگەر کەوتەخوارەوە ئەوە سوچی خۆیەتی-.

# سەبارەت بە خەوتن لەسەر پاکی.

## ١٠٤ - باب فِي النَّوْمِ عَلَى طَهَارَةٍ.

٥٠٤٢ - (صحيح) عن معاذ بن جبل, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِرًا فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ فَيَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ).

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەسەر پاکی بە یادی خواوە بخەوێ، شەو خەبەری بێتەوە داوای خێری دونیاو قیامەت بکات لە خوای گەورە ئیللا خوا دەیداتێ).

٥٠٤٣ - (صحيح) عن ابن عباس, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَقَضَى حَاجَتَهُ, فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ, ثُمَّ نَامَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي: بَالَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەشەودا هەڵەسا دەستی بە ئاو دەگەیاند، لەپاشدا دەستەکانی و دەم و چاوی دەشت، ئینجا دەخەوتەوە. ئەبو داود دەڵێت: واتە: میزی دەکرد.

## باسی لەکاتی خەوتندا روو بکرێتە کوێ.

## ١٠٥ - باب كَيْفَ يَتَوَجَّهُ؟

٥٠٤٤ - (ضعيف) عن أبو قلابة, عن بعض آل أم سلمة قال: كَانَ فِرَاشُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوًا مِمَّا يُوضَعُ الإِنْسَانُ فِي قَبْرِهِ وَكَانَ الْمَسْجِدُ عِنْدَ رَأْسِهِ.

واتە: لە ئەبو قیلابەوە، لە یەکێ لە خزمانی ئەبو سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر لای راستی رادەکشا روو بەرەو قیبلە وەك چۆن مرۆڤ دەخرێتە گۆڕەوە لەسەر ئەو شێوەیە، هۆدەکەی لە رۆژهەڵاتی مزگەوتەوە بوو دەرگایەکی بۆ ناو مزگەوتی هەبوو لەگەڵ دەرگایە بۆ دەرەوە، کاتێ کە لە هۆدەکەی خۆیدا سەری لەڕووی مزگەوتەوە بوو. - ئەمەش ئاماژەیە بۆ چاکی رووکردنە قیبلە لەکاتی خەوتندا - .

## باسی کاتی خەوتن چی دەوترێت.

## ١٠٦ - باب مَا يُقَالُ عِنْدَ النَّوْمِ

٥٠٤٥ - (صحيح دون قوله: (ثلاث مرار) ) عن حفصة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْقُدَ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ, ثُمَّ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ قِنِى عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ). ثَلاَثَ مِرَارٍ.

واتە: لە حەفصەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە

وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ دەیویست راکشێ دەستی راستی دەخستە ژێر کولمی، لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە بم پارێزە لە سزاکەت ئەو رۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە کە رۆژی قیامەتە). سێ جار.

٥٠٤٦ - (صحيح) عن البراء بن عازب قال: قال لي النبي صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ, ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ وَقُلِ اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِى إِلَيْكَ, وَفَوَّضْتُ أَمْرِى إِلَيْكَ, وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِى إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ, لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ, آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِى أَنْزَلْتَ, وَنَبِيِّكَ الَّذِى أَرْسَلْتَ). قَالَ: (فَإِنْ مِتَّ مِتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ, وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (کاتێ کە دەتەوێ بچیتە سەر جێگای خەوتنەکەت وەك چۆن دەستنوێژ دەگریت بۆ نوێژ بەو شێوەیە دەستنوێژێکی جوان بگرە، لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ و بڵێ: (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِى إِلَيْكَ, وَفَوَّضْتُ أَمْرِى إِلَيْكَ, وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِى إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ, لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ, آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِى أَنْزَلْتَ, وَنَبِيِّكَ الَّذِى أَرْسَلْتَ). واتە: خودایە خۆم تەسلیمی تۆ کرد و کاروبارم بۆ لای تۆ گەڕاندەوە و سپاردم بە تۆ، پشتم بەستوە بە تۆ، ئومێدەوار و خۆشحاڵم بە پاداشتەکانت و دەترسم لە سزکانت، هیچ حەشارگەیەك نیە هەتا خۆم حەشار بدەم و هیچ رزگاربونێکیش نیە لە سزاکانت، جگە لەوە نەبێت کە بگەڕێمەوە بۆ لای تۆ، باوەڕم هێناوە بە قورئانەکەت کە داتبەزاندۆتە خوارەوە، هەروەها باوەڕیشم هێناوە بە پێغەمبەرەکەت کە موحەممەدە صلی الله علیه وسلم خۆت رەوانەت کردووە بۆ سەر خەڵك و جنۆکەکان.
فەرمووی: (جا ئەگەر لەپاش خوێندنی ئەم دوعایە لەو شەوەدا بمریت ئەوە لەسەر دینی پاکی ئیسلامەتی دەمریت، ئەم دوعایە بکە بە دواهەمین قسەت).

٥٠٤٧ - (صحيح) عن البراء بن عازب قال: قال لي النبي صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ وَأَنْتَ طَاهِرٌ فَتَوَسَّدْ يَمِينَكَ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (کاتێ کە چویتە سەر جێگای خەوتنەکەت و پاك بویت واتە دەستنوێژت هەبوو یان لەشگران نەبویت لەسەر لای راست راکشێ و دەستی راستت بخەرە ژێر سەرتەوە).

٥٠٤٨ - (صحيح) عن البراء بن عازب, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بهذا. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ أَحَدُهُمَا: (إِذَا أَتَيْتَ فِرَاشَكَ طَاهِرًا). وَقَالَ الآخَرُ: (تَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە، سوفیان راوی فەرموودەکە وتی: یەکێك لە راویەکان وتی: (کاتێ کە چویتە سەر جێگای خەوتنەکەت و پاك بویت واتە دەستنوێژت هەبوو یان لەشگران نەبویت، لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ ...). ئەوی تریان وتی: (کاتێ کە دەتەوێ بچیتە سەر جێگای خەوتنەکەت وەك چۆن دەستنوێژ دەگریت بۆ نوێژ بەو شێوەیە دەستنوێژێکی جوان بگرە، لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ .. ).

٥٠٤٩ - (صحيح) عن حذيفة قال: كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا نام قال: (اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَأَمُوتُ). وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ).

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە دەخەوت دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَأَمُوتُ). واتە: خودایە بە ناوی تۆ دەمرم و دەژیم.

کاتێ کە لەخەو هەستایە دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیانی بە بەرهێنااینەوەو دوای ئەوەی کە مراندینی زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

٥٠٥٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِى مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ, ثُمَّ لْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ, ثُمَّ لْيَقُلْ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِى وَبِكَ أَرْفَعُهُ, إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِى فَارْحَمْهَا, وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە یەکێ لەئێوە دەیەوێ بچیتە سەر جێگای خەوتنەکەیەوە با جێگەکەی بتەکێنێ چونکە ئێوە نازانن لەپاش ئێوە نوێنەکە چی تری تێ دەچێ - لەوانەیە مارێ یان دوپشکێ یا هەرشتێ زیان بگەیەنێ تێی چوبێ - لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ، ئینجا بڵێ: (بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِى وَبِكَ أَرْفَعُهُ, إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِى فَارْحَمْهَا, وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ). واتە: پەروەردگارم بە ناوی تۆ تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دانا، بە پشتیوانی تۆش بەرزی دەکەمەوەو لەخەو هەڵەسم، خودایە خۆ ئەگەر لەم خەوەدا روحەکەمت گرتەوەو روحت کێشام رەحمی پێ بکە، خۆ ئەگەر گەڕاندیشتەوەو لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزە لە تاوان و لە زیانی شەیتان و ئاگات لێی بێ، بەوەی کە بەندە چاکەکانی خۆتی پێ دەپارێزیت).

٥٠٥١ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه كان يقول: إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأَرْضِ, وَرَبَّ كُلِّ شَىْءٍ, فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى, مُنَزِّلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِى شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ, أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَىْءٌ, وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ

شَيْءٌ, وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ, وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ). زَادَ وَهْبٌ فِي حَدِيثِهِ (اقْضِ عَنِّى الدَّيْنَ, وَأَغْنِنِى مِنَ الْفَقْرِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كاتێ كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەچوە سەر جێگای خەوتنەكەی دەیفەرموو: (خودایە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی پەروەردگاری هەموو شتێك، تەقێنەرەی دانەوێڵەو ناوك و سەوزكردنی، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زیانی هەموو ئەو دروستكراوانەی خۆت كە جڵەویان بە دەست تۆیە، خودایە هیچ شتێكت لەپێشەوە نەبووەو دەمێنیت لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستكراوەكان و بەهێز و بە توانایت، هیچ شتێكیش لەسەرووی تۆوە نیە، هەموو دروستكراوەكان پێویستیان بەتۆیەو كەسیش نیە هاوشێوەی تۆ بێ). ئیبنو وەهەب لە فەرموودەكەیدا ئەمەی بۆ زیاد كرد: (سا خودایە قەرزاریمان لەسەر لابەرەو دەوڵەمەندیشمان بكە لە هەژاری).

٥٠٥٢ - (ضعيف) عن علي رضي الله عنه, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنه كان يقول: يَقُولُ عِنْدَ مَضْجَعِهِ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِوَجْهِكَ الْكَرِيمِ, وَكَلِمَاتِكَ التَّامَّةِ مِنْ شَرِّ مَا أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ, اللَّهُمَّ أَنْتَ تَكْشِفُ الْمَغْرَمَ وَالْمَأْثَمَ, اللَّهُمَّ لاَ يُهْزَمُ جُنْدُكَ, وَلاَ يُخْلَفُ وَعْدُكَ, وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ, سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ی ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر جێگای خەوتنەكەی دەیفەرموو: (خودایە پەنا دەگرم بە زاتی پیرۆزی تۆ، بە وشە تەواوەكانت لەشەڕی ئەوەی جڵەوی بە دەستی خۆتە، خودایە خۆت دەتوانی لەژێر باری قەرزاری و گوناهباری رزگارمان بكەی، خودایە سوپای تۆ قەت ناشكێ و بەڵێنی تۆ پاشگەزبوونەوەی بۆ نیە، ماڵ و سامانی دەوڵەمەند كەڵك و سودی پێ ناگەیەنێ، ئەوەی بەكەڵكی دێ تەنیا كردەوەی چاكە، تۆ پاك و بێ نەنگیت، من هەمیشە سوپاس و ستایشی تۆ دەكەم).

٥٠٥٣ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا, فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُئْوِىَ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی نان و ئاومان دەداتێ و تێر خواردن و تێر ئاوی کردووین، بێ پێویستی کردووین لە دروستکراوەکانی و رەحمی پێ کردووین و جێگەو رێگەی حەوانەوەی پێ داوین، لەکاتێکدا کەسانێك هەن نەشوێنیان هەیە تێیدا بژین و نەکەسیش دەیانگرێتەخۆ).

٥٠٥٤ - (صحيح) عن أبو الأزهر الأنماری: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: (بِسْمِ اللَّهِ وَضَعْتُ جَنْبِى, اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِى, وَأَخْسِئْ شَيْطَانِى, وَفُكَّ رِهَانِى, وَاجْعَلْنِى فِى النَّدِىِّ الأَعْلَى).

واتە: لە ئەبو ئەزهەری ئەنماریەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی دەیفەرموو: (بە ناوی خوا تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دانا، خودایە لە گوناهەکانم خۆشبە، شەیتانم لێ دووربخەرەوە و دەری بکە بۆم، گەردن ئازادیم بۆ فەراهەم بهێنە لەو هەق و مافانەی کە لەسەرمن، شادم بکە بە یارانی هەرە بالآ).

٥٠٥٥ - (صحيح) عن فروة بن نوفل, عن أبيه: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال لنوفل: (اقْرَأْ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا, فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ).

واتە: لە فەروەی کوڕی نەوفەلەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نەوفەلی فەرموو: (سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ). بە تەواوی بخوێنە، لەپاشد بخەوە، چونکە ئەم سورەتە بەری بوونە لە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان).

٥٠٥٦ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها قالت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ, ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا: وَقَرَأَ فِيهِمَا: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ, يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ, يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی هەموو شەوێ هەردوو لەپی خۆی دانا بەیەکەوەو فووی پێدا دەکردن، ئینجا ئەم سێ سورەتەی پێدا دەخوێندن: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ). لەپاشدا دەیهێنان بەجەستەی خۆیدا ئەوەندەی کە دەستی پێ بگەیشتایە، لەپێشدا دەیهێنان بە سەر و روخساریدا ئینجا بە بەری جەستەیدا، پاشان بەودیوی جەستەیدا، سێ جار ئەو کارەی دەکرد.

٥٠٥٧ - (ضعيف) عن عرباض بن سارية: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ الْمُسَبِّحَاتِ قَبْلَ أَنْ يَرْقُدَ, وَقَالَ: (إِنَّ فِيهِنَّ آيَةً أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ).

واتە: لە (عرباض)ی کوڕی ساریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش ئەوەی بخەوێ ئەو سورەتانەی دەخوێند کە تەسبیحاتیان تێدایە. وە فەرمووی: (ئایەتی وایان تێدایە لە هەزار ئایەت گەورەترە).
- ئەو سورەتانەش ژمارەیان حەوت سورەتە: بە (ماضی)لە رابوردودا (سبح) لە سێ سورەتدا: (سورة الحديد) و (سورة الحشر) و (سورة الصف)، بە (مضارع) لە رابوردودا (يسبح) لە دوو سورەتدا: (الجمعة) و (التغابن)، بە (أمر)فەرمان پێ کردن (سبح) لە (سورة أعلاء) دا. (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلى). وە (سبحان) لە (سورة الإسراء) دا -.

٥٠٥٨ - (صحيح الإسناد) عن ابن عمر أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى كَفَانِي وَآوَانِي, وَأَطْعَمَنِي وَسَقَانِي, وَالَّذِى مَنَّ عَلَيَّ فَأَفْضَلَ, وَالَّذِى أَعْطَانِي فَأَجْزَلَ, الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ, اللَّهُمَّ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ, وَإِلَهَ كُلِّ شَيْءٍ, أَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی بێ پێویستی کردووم لە دروستکراوەکانی و ڕەحمی پێ کردووم و جێگەو ڕێگەی حەوانەوەی پێ داوم، نان و ئاوی داومەتێ و تێر خواردن و تێر ئاوی کردووم، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەوپەڕی گەورەیی و چاکەی لەگەڵ کردووم، بەش و بەهرەی گەورەی پێ بەخشیوم، سوپاس و ستایش بۆ خوا لەهەموو حاڵەت و بارو دۆخێکدا، خودایە ئەی پادشاو پەروەردگاری هەموو شتێك، پەنات پێ دەگرم لە سزای ئاگری دۆزەخ).

٥٠٥٩ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ تَعَالَى فِيهِ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ, وَمَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك دابنیشێ لە کۆڕ و کۆمەڵێکدا زیکر و یادی خوای تێدا نەکرابێت ئەوە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا پەشیمانی بۆ دەمێنێتەوە، هەروەها هەرکەسێك پاڵکەوتبێ و زیکر و یادی خوای نەکردبێ ئەوە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا پەشیمانی بۆ دەمێنێتەوە).

## باسی ئەگەر کەسێ شەو خەوی لێ زڕا چی بڵێ.

## ١٠٧ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ.

٥٠٦٠ - (صحيح) عن عبادة بن صامت قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ حِينَ يَسْتَيْقِظُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, سُبْحَانَ اللَّهِ, وَالْحَمْدُ لِلَّهِ, وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ, وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ, ثُمَّ دَعَا رَبِّ اغْفِرْ لِي). قَالَ الْوَلِيدُ أَوْ قَالَ: (دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ, فَإِنْ قَامَ فَتَوَضَّأَ, ثُمَّ صَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك خەوی زڕا کاتێ کە خەبەری بویەوە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, سُبْحَانَ اللَّهِ, وَالْحَمْدُ لِلَّهِ, وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ, وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ, ثُمَّ دَعَا رَبِّ اغْفِرْ لِى). واتە: ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبە). وەلید وتی: یان فەرمووی: ئەگەر پاڕایەوە ئەوە پاڕانەوەکەی قبوڵ دەبێ، ئەگەر هەستا دەسنوێژی گرت و نوێژی کرد ئەوە نوێژەکەی قبوڵ دەبێ).

٥٠٦١ - (ضعيف) عن عائشة رضى الله عنها قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ أَسْتَغْفِرُكَ لِذَنْبِي, وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ, اللَّهُمَّ زِدْنِي عِلْمًا, وَلاَ تُزِغْ قَلْبِي بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِي, وَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا هەستایە لەخەو دەیفەرموو:

(لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ أَسْتَغْفِرُكَ لِذَنْبِى, وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ, اللَّهُمَّ زِدْنِي عِلْمًا, وَلاَ تُزِغْ قَلْبِى بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِى, وَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ). واتە: ئەی خودای پاك و بێگەرد هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێ بوردنت لێ دەکەم و لە گوناهەکانم خۆشبە، داوای سۆز و بەزەیی و میهرەبانیت لێ دەکەم، خودایە زانستم زیاد بکە، دڵم لەڕێی راست لامەدە دوای ئەوەی رێنماییت کردم، خودایە سۆز و بەزەیی خۆتم پێ ببەخشە، چونکە هەرتۆی خاوەنی بەخشندەیی زۆر و بێ هەژمار).

## دەربارەی زیکر و تەسبیحات کردن لەکاتی خەوتندا.

## ١٠٨ - باب فِي التَّسْبِيحِ عِنْدَ النَّوْمِ.

٥٠٦٢ - (صحيح) عن علي رضى الله عنه قال: شَكَتْ فَاطِمَةُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تَلْقَى فِي يَدِهَا مِنَ الرَّحَى, فَأُتِيَ بِسَبْيٍ, فَأَتَتْهُ تَسْأَلُهُ فَلَمْ تَرَهُ, فَأَخْبَرَتْ بِذَلِكَ عَائِشَةَ, فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرَتْهُ, فَأَتَانَا وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا, فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ, فَقَالَ: (عَلَى مَكَانِكُمَا). فَجَاءَ فَقَعَدَ بَيْنَنَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِى, فَقَالَ: (أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَا؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا فَسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ, وَاحْمَدَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ, وَكَبِّرَا أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ, فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (فاطمة) دەستهاڕی بەکاردەهێنا دەستی ماندو شەکەت دەبوو، لەلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سکاڵای کرد، بۆ ئەوەی خادمێکی بداتێ خزمەتی بکات، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خادمی بۆ هات، (فاطمة) چوو ماڵی باوکی داوای یەکێ لەوانەی لێ بکات، بەڵام باوکی لەماڵ نەبوو نەیدی، هەواڵەکەی بە عائیشە راگەیاند، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

هاتەوە عائیشە هەواڵەکەی (فاطمة)ی پێ ڕاگەیاند، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلامان ئێمەش چوبووینە سەر جێگای خەوتنەکەمان بۆ ئەوەی بخەوین، هەستاین بۆ ئەوەی پێشوازی لێ بکەین، فەرمووی: (لەشوێنی خۆتاندا بمێننەوە)، ئەویش هات لەنێوان هەردووکماندا دانیشت، هەتا هەستم کرد بە ساردی قاچەکانی لەسەر سنگم، فەرمووی: (شتێکتان نیشان بدەم لەوە خێر تر و چاکتر بێ بۆتان؟ کاتێ کە چوونە سەر جێگای خەوتنەکەتان بۆ خەوتن: سی و سێ جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێن: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێن: (اللَّهُ أَكْبر)، ئەوە دەکاتە سەد لە نۆکەر زۆر چاکترە بۆتان).

٥٠٦٣ -(ضعيف) عن علي قال لإبن أعبد: أَلاَ أُحَدِّثُكَ عَنِّى وَعَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَكَانَتْ أَحَبَّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ, وَكَانَتْ عِنْدِى فَجَرَّتْ بِالرَّحَى, حَتَّى أَثَّرَتْ بِيَدِهَا, وَاسْتَقَتْ بِالْقِرْبَةِ حَتَّى أَثَّرَتْ فِى نَحْرِهَا, وَقَمَّتِ الْبَيْتَ حَتَّى اغْبَرَّتْ ثِيَابُهَا, وَأَوْقَدَتِ الْقِدْرَ حَتَّى دَكِنَتْ ثِيَابُهَا, وَأَصَابَهَا مِنْ ذَلِكَ ضُرٌّ, فَسَمِعْنَا أَنَّ رَقِيقًا أُتِىَ بِهِمْ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: لَوْ أَتَيْتِ أَبَاكِ فَسَأَلْتِيهِ خَادِمًا يَكْفِيكِ. فَأَتَتْهُ, فَوَجَدَتْ عِنْدَهُ حُدَّاثًا, فَاسْتَحْيَتْ, فَرَجَعَتْ, فَغَدَا عَلَيْنَا وَنَحْنُ فِى لِفَاعِنَا, فَجَلَسَ عِنْدَ رَأْسِهَا, فَأَدْخَلَتْ رَأْسَهَا فِى اللِّفَاعِ حَيَاءً مِنْ أَبِيهَا, فَقَالَ: (مَا كَانَ حَاجَتُكِ أَمْسِ إِلَى آلِ مُحَمَّدٍ؟). فَسَكَتَتْ, مَرَّتَيْنِ, فَقُلْتُ: أَنَا وَاللَّهِ أُحَدِّثُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ هَذِهِ جَرَّتْ عِنْدِى بِالرَّحَى حَتَّى أَثَّرَتْ فِى يَدِهَا, وَاسْتَقَتْ بِالْقِرْبَةِ حَتَّى أَثَّرَتْ فِى نَحْرِهَا, وَكَسَحَتِ الْبَيْتَ حَتَّى اغْبَرَّتْ ثِيَابُهَا: سَلِيهِ خَادِمًا. فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ الْحَكَمِ وَأَتَمَّ.

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بە ئیبنو ئەعبودی فەرموو: ئایا بەسەرهاتێکت بۆ نەگێڕمەوە دەربارەی خۆم و (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بێگومان (فاطمة) خۆشەویست ترین کەس بوو لەلای، وتم: بەڵێ بۆم باس بکە، وتی: (فاطمة) دەستهاڕی بەکاردەهێنا دەستی ماندو شەکەت دەبوو، ئاوی دەکێشا و کاریگەری کردبوە سەر سنگی، ماڵی گسگ

دەداو پۆشاکەکانی تۆزاوی دەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نۆکەری بۆ هات، وتم: ئەگەر بێی بۆ لای باوکت داوای نۆکەر بکەیت دەتداتیێ، هات بۆ لای باوکی لەوکاتەدا خەڵکانێکی لیێ بوو قسەیان دەکرد، شەرمی کردو، گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، بۆ بەیانیەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلامان ئێمە لەناو جێگەدا بووین، (فاطمة) خۆشەویست ترین کەس بوو لەلای، وتم: بەڵێ بۆم باس بکە، وتی: (فاطمة) شەرمی لە باوکی کردو سەری خۆی کرد بەژێر لێفەکەوە، فەرمووی: (ئەی (فاطمة) دوێنێ هاتیت ئیشت چی بوو بە ئالی موحەممەد؟)، (فاطمة) لەشەرماندا بێدەنگ بوو، دوو جار، پێشەوا عەلی وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من بۆت باس دەکەم کە ئیشی چی بوو، چی دەوێت، دەستهاڕی بەکارهێناوە دەستی ماندو شەکەت بوە، ئاو دەکێشێ و کاریگەری کردۆتە سەر سنگی، کە تۆ نۆکەرت بۆ هات منیش فەرمانم پێکرد بێت بۆ خزمەتت داوای نۆکەرێکت لێ بکات بۆ ئەوەی لە تینی گەرما بیپارێزێ و لە ماندێتی بیحەسێنێتەوەو خزمەتی ماڵەکەی بۆ بکات..

- ئەم فەرمووده پێشتر بە ژمارە: (٢٩٨٨) هاتوە -.

٥٠٦٤ - (ضعيف) عن علي رضى الله عنه, بِهَذَا الْخَبَرِ, قَالَ فِيهِ: قَالَ عَلِيٌّ: فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ لَيْلَةَ صِفِّينَ فَإِنِّي ذَكَرْتُهَا مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَقُلْتُهَا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هەمان هەواڵ هاتوە، ڕاوی لە فەرموودەکەیدا وتی: پێشەوا عەلی وتی: ئیتر لەو کاتەوە بیستومە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وازم لێ نەهێناون لەپێش خەوتندا ئەم سیانەم خوێندووە سی و سێ جار: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار: (اللَّهُ أَكْبر)، تەنیا شەوی جەنگی (صفين) نەبێ ئەویش لەکۆتایی شەوەوە یادم کەوتەوەو خوێندنم.

٥٠٦٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (خَصْلَتَانِ - أَوْ خَلَّتَانِ - لاَ يُحَافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ, هُمَا يَسِيرٌ, وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ: يُسَبِّحُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ عَشْرًا, وَيَحْمَدُ عَشْرًا, وَيُكَبِّرُ عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ, وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ, وَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ, وَيَحْمَدُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ, وَيُسَبِّحُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ, فَذَلِكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ). فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ, قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, كَيْفَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ؟ قَالَ: (يَأْتِي أَحَدَكُمْ - يَعْنِي الشَّيْطَانَ فِي مَنَامِهِ – (فَيُنَوِّمُهُ قَبْلَ أَنْ يَقُولَهُ, وَيَأْتِيهِ فِي صَلاَتِهِ فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةً قَبْلَ أَنْ يَقُولَهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دوو شت هەن هەر بەندەیەکی موسوڵمان پارێزگاریان لێ بکات و بەردەوام بێ لەسەریان ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو دوانەش ئاسانن، بەڵام ئەوانەی کاریان پێ دەکەن کەمن، ئەوەیە لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە دە جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّه)، دە جار بڵێ: (الحَمدُ لِله)، دە جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبر)، ئەوە لە شەو و ڕۆژێکدا بە زمان دەکاتە سەدو پەنجا، بەڵام بەکێشانی تەرازووی کردەوەکان دەکاتە هەزار و پێنج سەد، دووەمیش ئەمەیە لەکاتی خەوتندا سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبر)، ئەوە بە زمان دەکاتە سەد، بەڵام بەکێشانی تەرازووی کردەوەکان دەکاتە هەزار). (عبد الله) وتی: بەڕاستی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە پەنجەکانی دەستی ڕاستی ئەم ویردانەی دەژمارد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن ئەو دوانە خۆیان ئاسانن، بەڵام ئەوانەی کاریان پێ دەکەن کەمن؟ فەرمووی: (کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێت بخەوێ شەیتان دەیخەوێنێ پێش ئەوەی بیانخوێنێ، لەکاتی نوێژیشدا ئیش و کارێکی خۆی بیردەخاتەوە پێش ئەوەی بیانخوێنێ).

٥٠٦٦ - صحيح) عن الفضل بن حسن الضمري: أَنَّ ابْنَ أُمِّ الْحَكَمِ أَوْ ضُبَاعَةَ ابْنَتَيِ الزُّبَيْرِ حَدَّثَهُ, عَنْ إِحْدَاهُمَا, أَنَّهَا قَالَتْ: أَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْيًا, فَذَهَبْتُ أَنَا وَأُخْتِي وَفَاطِمَةُ بِنْتُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَحْنُ فِيهِ, وَسَأَلْنَاهُ أَنْ يَأْمُرَ لَنَا بِشَيْءٍ مِنَ السَّبْيِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (سَبَقَكُنَّ يَتَامَى بَدْرٍ). ثُمَّ ذَكَرَ قِصَّةَ التَّسْبِيحِ, قَالَ عَلَى أَثَرِ كُلِّ صَلاَةٍ, لَمْ يَذْكُرِ النَّوْمَ. قَالَ عَيَّاشٌ: وَهُمَا ابْنَتَا عَمِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (فضل)ی کوڕی حەسەنی (ضمري)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو ئومی حەکەم - یان (ضُبَاعَةَ)ی کچی زوبێر - بۆی گێڕاوەتەوە، لە یەکێکیانەوە هاتوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خزمەتکاری بەرکەوتبو، من و خوشکەکەم و (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوین بۆ خزمەتی سکاڵای خۆمان کرد لەدەست قورسی ئیشوکاری ناوماڵ و بێ خزمەتکاری، داوامان لێ کرد فەرمان بدات بۆئەوەی خزمەتکارمان بداتێ بۆ خزمەتکردنی ماڵەکانمان، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەتیوەکانی جەنگی بەدر پێشتان کەوتن دانمان بەوان). جا راوی فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە، باسی لەدوا هەموو نوێژێکی کرد، بەڵام باسی خەوتنی نەکرد. عەیياش دەڵێت: هەردووکیان واتە: ئیبنو ئومی حەکەم و (ضُبَاعَةَ)ی کچی زوبێر کچی مامی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوون.

- ئەم فەرموودە پێشتر بە ژمارە: (٢٩٨٧) هاتوە -.

## باسی زیکر و ویردەکانی بەیانیان.

## ١٠٩ - باب مَا يَقُولُ إِذَا أَصْبَحَ.

٥٠٦٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن أبا بكر الصديق رضي الله عنه قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ, قَالَ: (قُلِ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ, عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ, رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ, أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي, وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ). قَالَ: (قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ, وَإِذَا أَمْسَيْتَ, وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە ئەبو بەکری صدیق رەزای خوای لێ بێ وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند وشەیەکم فێر بکە هەتا بەیانیان و ئێواران بیانخوێنم، فەرمووی: (بڵێ: خودایە ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زانا بە هەموو نهێنی و ئاشکرایە، ئەی پەروەردگار و پادشای هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی نەفس و دەروونم، هەروەها لە شەڕ و خراپەی شەیتان و هاوتا دانانی).

٥٠٦٨ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه كان يقول إذا أصبح: (اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا, وَبِكَ أَمْسَيْنَا, وَبِكَ نَحْيَا, وَبِكَ نَمُوتُ, وَإِلَيْكَ النُّشُورُ). وَإِذَا أَمْسَى قَالَ: (اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا, وَبِكَ نَحْيَا, وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەیانیان دەیفەرموو: (خودایە بە بخشش و نیعمەتی تۆوە بەیانی و شەومان

بەسەردا هات و بە بخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە). هەروەها ئێواران دەیفەرموو: (خودایە بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە ئێوارەمان بەسەردا هات و، بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، کاتێ زیندوودەبینەوە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ).

٥٠٦٩ - (ضعيف) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ أَوْ يُمْسِي: اللَّهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ, أَعْتَقَ اللَّهُ رُبْعَهُ مِنَ النَّارِ, فَمَنْ قَالَهَا مَرَّتَيْنِ أَعْتَقَ اللَّهُ نِصْفَهُ, وَمَنْ قَالَهَا ثَلاَثًا أَعْتَقَ اللَّهُ ثَلاَثَةَ أَرْبَاعِهِ, فَإِنْ قَالَهَا أَرْبَعًا أَعْتَقَهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەیانیان فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئێواران یان بەیانیان بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ). واتە: خودایە بەیانی بەسەرمدا هات و شایەتیت بۆ دەدەم و ئەوانەش کە عەرشەکەی تۆیان هەڵگرتووە و مەلائیکەکان و هەموو دروستکراوانت شایەتیت بۆ دەدەن، کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ، تاك و تەنیایت و هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نیە، هەروەها شایەتیش دەدەن کە موحەممەد صلی الله علیه وسلم بەندەو نێرراوی تۆیە.
هەرکەسێ جارێ بیخوێنێ خوای گەورە چارەکێکی جەستەی لە ئاگری دۆزەخ رزگار دەکات، هەرکەسێ دووجار بیخوێنێ خوای گەورە نیوەی جەستەی لە ئاگری دۆزەخ رزگار دەکات، هەرکەسێ سێ جار بیخوێنێ خوای گەورە سێ لەسەر چواری لە ئاگری دۆزەخ رزگار دەکات، ئەگەر چوار جار بیخوێنێ ئەوە خوای گەورە سەرجەم جەستەی لە ئاگری دۆزەخ رزگار دەکات).

٥٠٧٠ - (صحيح) عن بريدة, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ أَوْ حِينَ يُمْسِي: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, خَلَقْتَنِي, وَأَنَا

عَبْدُكَ, وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ, أَبُوءُ بِنِعْمَتِكَ, وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي, إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ. فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ أَوْ مِنْ لَيْلَتِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ).

واتە: لە بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەیانیان فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئێواران یان بەیانیان بڵێ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, خَلَقْتَنِي, وَأَنَا عَبْدُكَ, وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ, أَبُوءُ بِنِعْمَتِكَ, وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي, إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ). واتە: خودایە تۆ پەروەردگاری منی، تۆ دروستت کردووم، منیش بەندەی تۆم، خودایە من لەسەر بەڵێن و پەیمانەکەی خۆمم کە بە تۆم داوە ئەوەندەی لە توانامدا هەبێ، خودایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە، خودایە دان بەوەدا دەنێم کە تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا رشتووم، دانیش بە تاوانەکانمدا دەنێم و داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم، هیچ کەسێکیشلە لە تاوانەکان خۆش نابێ جگە لە تۆ.
هەرکەس ئێوارەی لێهات بیخوێنێت ئەو شەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەس کەوتە بەیانی بیخوێنێت ئەو رۆژە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە.

٥٠٧١ - (صحيح) عن عبد الله: أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يقول إذا أمسى: (أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ, وَالْحَمْدُ لِلَّهِ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ). زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ وَأَمَّا زُبَيْدٌ كَانَ يَقُولُ كَانَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سُوَيْدٍ يَقُولُ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ, وَلَهُ الْحَمْدُ, وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ, وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ, وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا, رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ, وَمِنْ سُوءِ الْكِبْرِ, أَوِ الْكُفْرِ, رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ, وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ). وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ: ذَلِكَ أَيْضًا (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ ...). قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ شُعْبَةُ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ (مِنْ سُوءِ الْكِبْرِ). وَلَمْ يَذْكُرْ سُوءَ الْكُفْرِ.

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر ئێوارەی لێ بهاتایە دەیفەرموو: (أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ, وَالْحَمْدُ لِلَّهِ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ). زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ وَأَمَّا زُبَيْدٌ كَانَ يَقُولُ كَانَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سُوَيْدٍ يَقُولُ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ, وَلَهُ الْحَمْدُ, وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ, وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ, وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا, رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ, وَمِنْ سُوءِ الْكِبْرِ, أَوِ الْكُفْرِ, رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ, وَعَذَابٍ فِي الْقَبرِ).

واتە: کەوتینە ئێوارەو هەر خوا خاوەنی موڵکە، سوپاس و ستایش بۆ خوا، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، پەروەردگارم داوای ئەو خێرەت لێ دەکەم کە لەم شەوەدا هەیە، داوای خێری دوای ئەوەشت لێ دەکەم، پەنا دەگرم بە تۆ لەو شەڕ و خراپەیەی لەم شەوەدا هەیە، پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی دوای ئەوەش، پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە تەمەڵی و سەرەنجامی خرپ، پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ و سزای ناو ئاگری دۆزەخ. کاتێ کە ئێوارەی لێ دەهات دەیفەرموو: (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ). واتە: کەوتینە بەیانی و هەر خوا خاوەنی موڵکە...).

٥٠٧٢ - (ضعيف) عن أبو سلام, أَنَّهُ كَانَ فِي مَسْجِدِ حِمْصٍ فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ, فَقَالُوا: هَذَا خَدَمَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَامَ إِلَيْهِ فَقَالَ: حَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, لَمْ يَتَدَاوَلْهُ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ الرِّجَالُ, قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا, وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا, وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً, إِلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُرْضِيَهُ).

واتە: لە ئەبو سەلامەوە دەگێڕنەوە، کە لە مزگەوتی (حیمص)دا بوو پیاوێ بە لایدا تێپەڕی، وتیان: ئەم پیاوە خزمەتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم

کردووە، ئەبو سەلام هەستا چو بۆ لای وتی: فەرموودەیەکم بۆ باس بکە کەس واسیتە نەبێ لەنێوان تۆ و پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم واتە خۆت لێت بیستبێ، وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێ ئێواران و بەیانیان بڵێ: (رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا, وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا, وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولا). واتە: رازین بەوەی (الله) پەروەردگارمان بێ و ئیسلام دینمان بێ و موحەممەد صلی الله علیه وسلم پێغەمبەرمان بێ. ئەوە دەبێ بە هەق لەسەر خوای گەورە کە رازی بکات.

٥٠٧٣ - ((ضعيف) عن عبد الله بن غنام البياضي: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ, فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ. فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ يَوْمِهِ, وَمَنْ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ حِينَ يُمْسِي فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ لَيْلَتِهِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی غنامی (بياضي)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەیانیان بڵێ: (اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ, فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ). واتە: (خودایە هیچ بەخشش و نیعمەتێك نیە پێمەوەو رۆژی لەتەکمدا کردبێتەوە، ئەو بەخششە لە لایەن تۆی تاك و تەنیاو بێ هاوەڵەوەیە، سوپاس و ستایشیش هەر بۆ تۆیە. ئەوە سوپاسگوزاری ئەو رۆژەی بەجێ هێناوە، هەرکەس ئێواران بیڵێ ئەوە سوپاسگوزاری ئەو شەوەی بەجێ هێناوە.

٥٠٧٤ - (صحيح) عن ابن عمر قال: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَعُ هَؤُلاَءِ الدَّعَوَاتِ حِينَ يُمْسِي وَحِينَ يُصْبِحُ (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ, اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَتِي). وَقَالَ عُثْمَانُ: (عَوْرَاتِي, وَآمِنْ رَوْعَاتِي, اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي, وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي, وَمِنْ فَوْقِي, وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ ئێوارەو بەیانیە وازی لەم پاڕانەوانە نەهێناوە: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ, اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَتِي). وَقَالَ عُثْمَانُ: (عَوْرَاتِي, وَآمِنْ رَوْعَاتِي, اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي, وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي, وَمِنْ فَوْقِي, وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي).

واتە: خودایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێ دەکەم لە دونیاو لە دواڕۆژدا، خودایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێ دەکەم لە دین و دونیاو خانەوادەو ماڵ و سامانم دا، خودایە عەیب و ناتەواوی و کەم و کورتیەکانم داپۆشە، خودایە ترسەکانم هێور بکەرەوەو دڵەڕاوکێم مەهێڵە، خودایە لە پێش و لەدواوە و لای ڕاست و لای چەپ و لای سەرووەمەوە پارێزگاریم لێ بکە - واتە لە هەموو ڕوویەکەوە بم پارێزە لە دەردو بەڵای خراپ -، خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لەژێرمەوە سزا بدرێم بە ڕۆچوون بە زەویدا لەناو بچم.

٥٠٧٥ - (ضعيف) عبد الحميد مولى بني هاشم, أن أمه حدثته وكانت تخدم بعض بنات النبي صلى الله عليه وسلم: أن ابنة النبي صلى الله عليه وسلم حدثتها, أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يعلمها فيقول: (قُولِي حِينَ تُصْبِحِينَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ, لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ, مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ, وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ, أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا, فَإِنَّهُ مَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُصْبِحُ حُفِظَ حَتَّى يُمْسِيَ, وَمَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُمْسِي حُفِظَ حَتَّى يُصْبِحَ).

واتە: لە (عبد الحميد) بەندەی ئازادکراوی بەنی هاشمەوە، دەگێرنەوە، کە دایکی خزمەتی یەکێ لە کچەکانی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دەکرد، ئەو کچەی بۆی گێڕاوەتەوە، کە باوکی فێری کردووە بەیانیان بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ, لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ, مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ, وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ, أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْما). واتە: پاك

و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، هیچ هێز و توانایە بەدەست کەس نیە جگە لەو هێزەی کە لە لای خوایە، ئەوەی خوا ویستوویەتی بووە، ئەوەی نەیویستووە نەبووە، بزانە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، زانستی خوا دەوری هەموو شتێکی داوە.
هەرکەس بەیانیان بیڵێ ئەوە خوای گەورە هەتا ئێوارە دەیپارێزێ، هەرکەس ئێوارە بیڵێ ئەوە خوای گەورە هەتا بەیانی دەیپارێزێ).

٥٠٧٦ - (ضعيف جدا) عن ابن عباس: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: (فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ) إِلَى (وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ) أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِي يَوْمِهِ ذَلِكَ, وَمَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُمْسِي أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِي لَيْلَتِهِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەیانیان ئەم ئایەتانە بخوێنێ: ﴿ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ ﴾. سورة الروم: ١٧ - ١٩.
واتە: ئا ئەوانە لە سزا(ی دۆزەخ)دا ئامادە دەکرێن. کاتێ ئێوارەتان لێ دێت و کاتێ بەیانیتان لێ دێت. وە سوپاس هەر بۆ خوایە لەئاسمانەکان و زەویدا، وە (پاکی و بێگەردی خوا بڵێن) لەشەودا و کاتێ نیوە ڕۆتان لێ دێت، وە سوپاس هەر بۆ خوایە لە ئاسمانەکان و زەویدا، وە(پاکی و بێگەردی خوا بڵێن) لەشەودا و کاتێ نیوە ڕۆتان لێ دێت. (خوا) زیندوو لەمردوو دەردێنێ و مردوو لەزیندوو دەردێنێ، وە زەوی زیندوو دەکاتەوە لەپاش مردن و وشك بوونی، وە هەر بەوجۆرە ئێوەش دەردەهێنرێن (لە گۆڕەکانتان).
خێر و پاداشتی ئەو کارە چاکانەی پێ دەگات کە لەو رۆژەیدا لەدەستی دەردەچێت، هەرکەس ئێواران ئەم ئایەتانە بخوێنێ خێر و پاداشتی ئەو کارە چاکانەی پێ دەگات کە لەو شەوەیدا دا لەدەستی دەردەچێت).

٥٠٧٧ - (صحيح) عن أبو عياش قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ, وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ, كَانَ لَهُ عِدْلُ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ, وَكُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ, وَحُطَّ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ, وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ, وَكَانَ فِي حِرْزٍ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُمْسِيَ, وَإِنْ قَالَهَا إِذَا أَمْسَى كَانَ لَهُ مِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ).

واتە: لە ئەبو عەیاشەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەیانیان بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ, وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاكی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.
وەك ئەوە وایە کۆیلەیەکی لەنەوەی ئیسماعیل رزگار کردبێ، دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، دە خراپەی بۆ دەسڕێتەوە، لە شەیتان دەپارێزرێت تاکو ئێوارە، ئەگەر ئێوارەش بیڵێ هەروەك ئەوەی بۆ هەیە تاکو بەیانی).

٥٠٧٨ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا أَصَابَ فِي يَوْمِهِ ذَلِكَ مِنْ ذَنْبٍ, وَإِنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي غُفِرَ لَهُ مَا أَصَابَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەیانیان بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ). واتە: خودایە بەیانی بەسەرمدا هات و شایەتیت بۆ دەدەم و ئەوانەش کە عەرشەکەی تۆیان هەڵگرتووە

و مەلائیکەکان و هەموو دروستکراوانت شایەتیت بۆ دەدەن، کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ، تاك و تەنیایت و هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نیە، هەروەها شایەتیش دەدەن کە موحەممەد صلی الله علیه وسلم بەندەو نێرراوی تۆیە.
ئەوە خوای گەورە لە تاوانەکانی ئەو رۆژەی خۆش دەبێت، ئەگەر ئێواران بیڵێ خوای گەورە لە تاوانەکانی ئەو شەوەی خۆش دەبێت.

٥٠٧٩ - (ضعيف) عن مسلم بن الحارث التميمى, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنّه أسرّ إليه فقال: (إِذَا انْصَرَفْتَ مِنْ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ فَقُلِ: اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّارِ. سَبْعَ مَرَّاتٍ, فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ, ثُمَّ مِتَّ فِي لَيْلَتِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا, وَإِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ فَقُلْ كَذَلِكَ فَإِنَّكَ إِنْ مِتَّ فِي يَوْمِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا). أَخْبَرَنِي أَبُو سَعِيدٍ عَنِ الْحَارِثِ أَنَّهُ قَالَ أَسَرَّهَا إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَحْنُ نَخُصُّ بِهَا إِخْوَانَنَا.

واتە: لە موسلیمی کوڕی (حارث)ی تەمیمیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نهێنی پێی فەرمووە: (کاتێ کە لەنوێژی شێوان بوویتەوە حەوت جار بڵێ: (اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّار). واتە: خودایە پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ.
چونکە ئەگەر ئەوەت وت لەپاشدا ئەو شەوە بمریت ئەوە خوای گەورە پەنات لە ئاگر بۆ دەنوسێت. ئەگەر نوێژی بەیانیشت کردو وتت ئەو رۆژە بمریت ئەوە خوای گەورە پەنات لە ئاگر بۆ دەنوسێت.

٥٠٧٩ - (ضعيف) عن مسلم بن الحارث التميمى, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنّه أسرّ إليه فقال: (إِذَا انْصَرَفْتَ مِنْ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ فَقُلِ: اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّارِ. سَبْعَ مَرَّاتٍ, فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ, ثُمَّ مِتَّ فِي لَيْلَتِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا, وَإِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ فَقُلْ كَذَلِكَ فَإِنَّكَ إِنْ مِتَّ فِي يَوْمِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا).

واتە: لە موسلیمی کوڕی (حارث)ی تەمیمیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نهێنی پێی فەرموەوە: (کاتێ کە لەنوێژی شێوان بوویتەوە حەوت جار بڵێ: (اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّارِ). واتە: خودایە پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ.
چونکە ئەگەر ئەوەت وت لەپاشدا ئەو شەوە بمریت ئەوە خوای گەورە پەنات لە ئاگر بۆ دەنوسێت. ئەگەر نوێژی بەیانیشت کردو وتت ئەو رۆژە بمریت ئەوە خوای گەورە پەنات لە ئاگر بۆ دەنوسێت.

٥٠٨٠ - (ضعيف) عن مسلم بن الحارث بن مسلم التميمي، عن أبيه: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال، نحوه الى قوله: (جِوَارٌ مِنْهَا). إلاَّ أَنَّهُ قَالَ فِيهِمَا: (قَبْلَ أَنْ تُكَلِّمَ أَحَدًا). قَالَ عَلِيُّ بْنُ سَهْلٍ فِيهِ إِنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ وَقَالَ عَلِيٌّ وَابْنُ الْمُصَفَّى بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ فَلَمَّا بَلَغْنَا الْمُغَارَ اسْتَحْثَثْتُ فَرَسِي فَسَبَقْتُ أَصْحَابِي وَتَلَقَّانِي الْحَيُّ بِالرَّنِينِ فَقُلْتُ لَهُمْ قُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ تُحْرَزُوا فَقَالُوهَا فَلاَمَنِي أَصْحَابِي وَقَالُوا حَرَمْتَنَا الْغَنِيمَةَ فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرُوهُ بِالَّذِى صَنَعْتُ فَدَعَانِي فَحَسَّنَ لِي مَا صَنَعْتُ وَقَالَ (أَمَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ كَتَبَ لَكَ مِنْ كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ كَذَا وَكَذَا). قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَأَنَا نَسِيتُ الثَّوَابَ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَمَا إِنِّي سَأَكْتُبُ لَكَ بِالْوَصَاةِ بَعْدِى). قَالَ فَفَعَلَ وَخَتَمَ عَلَيْهِ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ وَقَالَ لِي ثُمَّ ذَكَرَ مَعْنَاهُمْ وَقَالَ ابْنُ الْمُصَفَّى قَالَ سَمِعْتُ الْحَارِثَ بْنَ مُسْلِمِ بْنِ الْحَارِثِ التَّمِيمِيَّ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە موسلیمی کوڕی (حارث)ی کوڕی موسلیمی تەمیمیەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشووی فەرموو هەتا گەیشتە: (جِوَارٌ مِنْهَا). بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد فەرمووی: (پێش ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکات)، عەلی کوڕی سەهل لە فەرموودەکەیدا وتی: باوکم بۆی باس کردم، عەلی کوڕی سەهل وتی: ئیبنو

موصەفا وتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لەگەڵ لەشكرێكدا ناردینى بۆ غەزایە كاتێ كە نزیك بووینەوە لە جێگاى هێرش بردنە سەریان ئەسپەكەم خێرا بوو پێش هاوەڵەكانم كەوتم، دەنگى هات و هاوارى خەڵكەكە هات پێم وتن: بڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله). ئیتر سەر و ماڵ و سامانتان پارێزراو دەبێ، ئەوانیش وتیان: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، هاوڕێكانم سەرزەنشتیان كردم لەسەر ئەوەو وتیان: تۆ بێ بەشت كردین لە غەنیمەت و دەسكەوتى جەنگى، كاتێ كە ئەندامانى لەشكرەكە گەیشتەوە بە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵى ئەو كارەیان پێ راگەیاند كە من كردم، ئەویش بانگى كردم و دەسخۆشى لێ كردم - واتە: فەرمووى: (كارێكى زۆر زۆر چاكت كرد كە بانگت كردن بۆ سەر دینى ئیسلام) -، پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووى: (سوێند بە (الله) بۆ هەر كەسێ لەوانە ئەوەندەو ئەوەندە خێر و چاكەو پاداشتت بۆ دەنوسرێت). (عبد الرحمن) وتى: پاداشتەكەم لەیاد چوو كە چەندە، لەپاشدا پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووى: (بەڵام من وەسیەتێكت بۆ دەنوسم بۆ دواى مردنم). وتى: بۆى نوسیم و مۆرى كردو دایە دەستم و پێى فەرمووم، لەپاشدا فەرموودەكەى گێڕایەوە - واتە: فەرموودەى: (اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّار). واتە: خودایە پەنام بدە لە ئاگرى دۆزەخ) -.

٥٠٨١ - (موضوع) عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى: حَسْبِيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ, سَبْعَ مَرَّاتٍ كَفَاهُ اللَّهُ مَا أَهَمَّهُ صَادِقًا كَانَ بِهَا أَوْ كَاذِبًا.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتى: هەركەس بەیانیان و ئێواران حەوت جار بڵێ: (حَسْبِيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ). واتە: تەنیا خودام بەسە لەهەموو كارو بارێكمداو هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە ئەو نەبێت، پشتم بەو بەستوە، هەر ئەویش پەروەردگارى عەرشى گەورەیە.
هەركەس بەیانیان و ئێواران حەوت جار بیڵێ ئەوە خواى گەورە لە خەم و خەفەتى دونیاو دوارۆژ دەیپارێزێ ئیتر بەڕاستى بیڵێ یان نا.

٥٠٨٢ - (حسن) عن عبد الله بن خبيب قال: خَرَجْنَا فِي لَيْلَةِ مَطَرٍ وَظُلْمَةٍ شَدِيدَةٍ نَطْلُبُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيُصَلِّيَ لَنَا, فَأَدْرَكْنَاهُ, فَقَالَ: (أَصَلَّيْتُمْ؟). فَلَمْ أَقُلْ شَيْئًا, فَقَالَ: (قُلْ). فَلَمْ أَقُلْ شَيْئًا, ثُمَّ قَالَ: (قُلْ). فَلَمْ أَقُلْ شَيْئًا, ثُمَّ قَالَ: (قُلْ). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَا أَقُولُ؟ قَالَ: ((قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی خوبەیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەشەوەزەنێکدا دەرچووین باران دەباری داوامان کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرنوێژیمان بۆ بکات، دیتمانەوە لەو شەوە زەنگەدا، فەرمووی: (ئایا نوێژتان کرد؟) هیچی تری نەفەرموو، فەرمووی: (بڵێ) هیچی تری نەفەرموو، لەپاشدا فەرمووی: (بڵێ) هیچی تری نەفەرموو، ئینجا فەرمووی: (بڵێ) هیچی تری نەفەرموو، لەپاشدا فەرمووی: (بڵێ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، چی بڵێم؟ فەرمووی بڵێ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ). بەیانیان و ئێواران ئەم سێ سورەتە بخوێنە ئەوەندەت بەسەو لەشەڕ و خراپەی هەموو شتێ ئەپارێزرێی).

٥٠٨٣ - (ضعيف) عن أبو مالك قال: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَدِّثْنَا بِكَلِمَةٍ نَقُولُهَا إِذَا أَصْبَحْنَا وَأَمْسَيْنَا وَاضْطَجَعْنَا, فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَقُولُوا: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ, عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ, أَنْتَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ, وَالْمَلاَئِكَةُ يَشْهَدُونَ أَنَّكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, فَإِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ أَنْفُسِنَا, وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ وَشِرْكِهِ, وَأَنْ نَقْتَرِفَ سُوءًا عَلَى أَنْفُسِنَا, أَوْ نَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ.

واتە: لە ئەبو مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند وشەیەکم فێر بکە هەتا بەیانیان و ئێواران و کاتی خەوتن بیانخوێنین، ئەویش فەرمانی پێ کردن بڵێن: خودایە ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زانا بە هەموو نهێنی و ئاشکریە، تۆ پەروەردگاری

هەموو شتێکی، مەلائیکەکان شایەتیت بۆ دەدەن، کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ، پەنا دەگرین بە تۆ لە خراپەی نەفس و دەروونمان، هەروەها لە شەڕ و خراپەی شەیتان و هاوتا دانانی، پەنا دەگرین بە تۆ کە کارێکی خراپە بکەین بەرامبەر بە خۆمان، یان خراپەیە بدەین بەسەر موسوڵمانێکدا.

٥٠٨٤ - (ضعيف) قال أبو داود: عن أبو مالك قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَصْبَحَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ, اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا الْيَوْمِ؛ فَتْحَهُ وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ وَبَرَكَتَهُ وَهُدَاهُ, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ, ثُمَّ إِذَا أَمْسَى فَلْيَقُلْ مِثْلَ ذَلِكَ).

واتە: ئەبو داود وتی: لە ئەبو مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (کاتێ یەکێ لە ئێوە کەوتە بەیانیەوە با بڵێ: (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ, اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا الْيَوْمِ؛ فَتْحَهُ وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ وَبَرَكَتَهُ وَهُدَاهُ, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَه).
واتە: بەیانیم بەسەردا هات و هەر خوای پەروەردگاری جیهانیان خاوەنی موڵکە، خودایە من داوای ئەو خێرەت لێ دەکەم کە لەم ڕۆژەدا هەیە، داوای خێری دوای ئەوەشت لێ دەکەم وەك: گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو نور و ڕووناکی و زانست و کردەوە پێ کردنی و ڕۆزی پاك و خێر و بەرەکەت و ڕێنموویی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەو شەڕ و خراپەیەی لەم ڕۆژەدا هەیە، پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی دوای ئەوەش).
ئینجا ئێوارەش بە هەمان شێوە بڵێ، بەڵام لەجیاتی: (أَصْبَحْنَا وَ أَصْبَح...) بڵێ: (أَمْسَينَا وَ أَمْسَى ...).

٥٠٨٥ - (حسن صحيح) عن شَرِيقٌ الْهَوْزَنِيُّ قَالَ دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَسَأَلْتُهَا بِمَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْتَتِحُ إِذَا هَبَّ مِنَ اللَّيْلِ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ, كَانَ إِذَا هَبَّ مِنَ اللَّيْلِ كَبَّرَ عَشْرًا, وَحَمِدَ عَشْرًا, وَقَالَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ). عَشْرًا, وَقَالَ:

(سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ). عَشْرًا, وَاسْتَغْفَرَ عَشْرًا, وَهَلَّلَ عَشْرًا, ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ ضِيقِ الدُّنْيَا وَضِيقِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ). عَشْرًا, ثُمَّ يَفْتَتِحُ الصَّلاَةَ.

واتە: لە شەریقی هەوزەنیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوومە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ لێم پرسی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەو لەخەو هەستایە بەچی ویردێ دەستی پێ دەکرد؟ عائیشە وتی: تا ئێستا کەسی تر پێش تۆ ئەم پرسیارەی لێ نەکردووم، دە جار دەیفەرموو: (الله أکبر)، دە جار دەیفەرموو: (الحمد لله)، دە جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)، دە جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) دە جار دەیفەرموو: (أستغفر الله)، دە جار دەیفەرموو: (لا اله إلا الله)، لەپاشدا دە جار دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ ضِيقِ الدُّنْيَا وَضِيقِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ). واتە: خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە تەنگی و ناخۆشی و بێ دەرەتانی دونیاو دوارِۆژ. ئینجا دەستی دەکرد بە نوێژ کردن.

٥٠٨٦ - (صحيح دون لفظه (نعمة) فهي شاذة) عن أبو هريرة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ فَأَسْحَرَ يَقُولُ: (سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللَّهِ وَنِعْمَتِهِ وَحُسْنِ بَلاَئِهِ عَلَيْنَا, اللَّهُمَّ صَاحِبْنَا فَأَفْضِلْ عَلَيْنَا, عَائِذًا بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەفەردا بووایە کاتی دەمەو بەیان دەیفەرموو: (با ئەوەی گوێی لە منە دەربارەی سوپاس و ستایش نزاو پاڕانەوە با بە موسوڵمانانی تری رابگەیەنێ لەم بەرەبەیانەدا بپاڕێنەوەو بڵێن: خودایە بەهرەو ناز و نیعمەتی خۆت برژێنە بەسەرمانداو، بمانپارێزە و ئاگادارمان بە، پەنا دەگرین بە تۆ ئاگری دۆزەخ).

٥٠٨٧ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن أبو ذر قال: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: اللَّهُمَّ مَا حَلَفْتُ مِنْ حَلِفٍ, أَوْ قُلْتُ مِنْ قَوْلٍ, أَوْ نَذَرْتُ مِنْ نَذْرٍ, فَمَشِيئَتُكَ بَيْنَ يَدَىْ ذَلِكَ كُلِّهِ مَا شِئْتَ كَانَ, وَمَا لَمْ تَشَأْ لَمْ يَكُنِ, اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى, وَتَجَاوَزْ لِى عَنْهُ, اللَّهُمَّ فَمَنْ صَلَّيْتَ عَلَيْهِ فَعَلَيْهِ صَلاَتِى, وَمَنْ لَعَنْتَ فَعَلَيْهِ لَعْنَتِى, كَانَ فِى اسْتِثْنَاءٍ يَوْمَهُ ذَلِكَ, أَوْ قَالَ ذَلِكَ الْيَوْمَ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرکەس بەیانیان بڵێ: خودایە ئەوەی سوێندم لەسەر خواردبێ، ئەوەی وتومە، هەر نەزرێکم کردبێ بە ویستی تۆیە، ویستی تۆش جێبەجێکراوە، ئەگەر بتەوێ دەبێ، ئەگەر نەتەوێ نابێ، خودایە داوای لێ بوردنت لێ دەکەم و لێم خۆشبە، خودایە ئەوەی تۆ مەدحی دەکەیت مەدحی منیشی لەسەر بێ، ئەو کەسەی تۆ نەفرەتی لێ دەکەی و سەرزەنشتی دەکەی نەفرەتی منیشی لێ بێ.
ئەو رۆژە لەشەڕ و خراپەی زمانی سەلامەت دەبێ.

٥٠٨٨ - (صحيح) عن أبو مودود, عمن سمع أبان بن عثمان يقول: سمعت عثمان يعني ابن عفان يقول: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (مَنْ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِى لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَىْءٌ فِى الأَرْضِ وَلاَ فِى السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ, ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُصْبِحَ, وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُمْسِىَ). قَالَ: فَأَصَابَ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ الْفَالِجُ, فَجَعَلَ الرَّجُلُ الَّذِى سَمِعَ مِنْهُ الْحَدِيثَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ, فَقَالَ لَهُ مَا لَكَ تَنْظُرُ إِلَىَّ؟ فَوَاللَّهِ مَا كَذَبْتُ عَلَى عُثْمَانَ, وَلاَ كَذَبَ عُثْمَانُ عَلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَلَكِنَّ الْيَوْمَ الَّذِى أَصَابَنِى فِيهِ مَا أَصَابَنِى غَضِبْتُ فَنَسِيتُ أَنْ أَقُولَهَا.

واتە: لە ئەبو مەودودەوە، لە کەسێ کە گوێی لە ئەبانی کوڕی پێشەوا (عثمان) رەزای خوای لێ بێ بووە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا (عثمان)ی کوڕی

عەفان بوو دەیوت: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەر کەس سێ جار بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ الَّذِى لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَىْءٌ فِى الأَرْضِ وَلاَ فِى السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ). واتە: بەناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێ زەرەر و زیان ناگەیەنێ نە لەزەوی و نە لە ئاسماندا، ئەو خودایەیە کە بیسەر و بینایە.

هەرکەس ئێواران سێ جار بیڵێ هەتا بەیانی لەناکاو تووشی بەڵا نابێ، هەرکەسیش بەیانیان سێ جار بیڵێ هەتا ئێوارە لەناکاو تووشی بەڵا نابێ).

راوی وتی: ئەبانی کوڕی پێشەوا (عثمان) ئیفلیج بوو لایەکی شەلەل لێی دا، ئەو پیاوەی فەرموودەکەی لێ بیست سەیری کرد - وەك ئەوەی بڵێ خۆ تۆ ئەو ویردەت خوێندووە ئەی بۆچی ئیفلیج بووی - ئەبان پێی وت: ئەوە بۆچی بەو شێوەیە سەیرم دەکەی سوێند بە (الله) نە من بەناوی باوکمەوە درۆ دەکەم، نە باوکیشم بەناوی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم درۆ دەکات. بەڵام ئەو رۆژەی کە ئیفلیج بووم تووڕە بووم لەیادم چوو بیڵێم.

٥٠٨٩ - عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، لَمْ يَذْكُرْ قِصَّةَ الْفَالِجِ.

٥٠٩٠ - (حسن الإسناد) عن عبد الرحمن بن أبي بكرة أنه قال لأبيه: يَا أَبَةِ إِنِّى أَسْمَعُكَ تَدْعُو كُلَّ غَدَاةٍ: اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى بَدَنِى، اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى سَمْعِى، اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى بَصَرِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. تُعِيدُهَا ثَلاَثًا حِينَ تُصْبِحُ وَثَلاَثًا حِينَ تُمْسِى. فَقَالَ إِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو بِهِنَّ فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَسْتَنَّ بِسُنَّتِهِ. قَالَ عَبَّاسٌ فِيهِ وَتَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ تُعِيدُهَا ثَلاَثًا حِينَ تُصْبِحُ وَثَلاَثًا حِينَ تُمْسِى فَتَدْعُو بِهِنَّ فَأُحِبُّ أَنْ أَسْتَنَّ بِسُنَّتِهِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبو بەکرەوە دەگێڕنەوە کە بە باوکی وتوە:

باوكە گیان من گوێم لێتە هەموو بەیانی و ئێوارەیە سێ جار دەپاڕێیتەوەو دەڵێی: (اللَّهُمَّ عَافِنِى فِي بَدَنِى اللَّهُمَّ عَافِنِى فِي سَمْعِى, اللَّهُمَّ عَافِنِى فِي بَصَرِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، اللَّهُمَّ إِنِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ اللَّهُمَّ إِنِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ). واتە: خودایە ساغ و سەلامەتیم پێ ببەخشە لە جەستەو بیستن و بینینم دا، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ، خودایە پەنات پێ دەگرم لە بێ باوەڕی و لەهەژاری، هەروەها پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ.
باوكی وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو هەموو بەیانی و ئێوارەیە سێ جار دەیخوێندن بۆیە منیش حەز دەكەم شوێن سوننەت و رێبازی ئەو بكەوم و بیكەمە سەرمەشقی خۆم.
(حسن) قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ: اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو, فَلاَ تَكِلْنِى إِلَى نَفْسِى طَرْفَةَ عَيْنٍ, وَأَصْلِحْ لِى شَأْنِى كُلَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ).
راوی وتی: وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پاڕانەوەكانی لێ قەوماوان: (اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو, فَلاَ تَكِلْنِى إِلَى نَفْسِى طَرْفَةَ عَيْنٍ, وَأَصْلِحْ لِى شَأْنِى كُلَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ). واتە: خودایە ئومێدم بە رەحمەت و بەزەیی تۆیە، ئەوەندەی چاوتروكانێ بە خۆمم مەسپێرە، خودایە سەرجەم كارو بارەكانم بۆ ساز بكە، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ.

٥٠٩١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ, مِائَةَ مَرَّةٍ, وَإِذَا أَمْسَى كَذَلِكَ لَمْ يُوَافِ أَحَدٌ مِنَ الْخَلاَئِقِ بِمِثْلِ مَا وَافَى).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەیانیان و ئێواران سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ). ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا هیچ كەسێ وتەی وەها نایاب ناهێنێ مەگەر كەسێ ئەو كارەی كردبێ یان زیاتر.

## باسی ویردی بینینی مانگی یەك شەوە.

## ١١٠ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ.

٥٠٩٢ - (ضعيف الإسناد) عن قتادة: أنه بلغه أن نبي الله صلى الله عليه و سلم كان إذا رأى الهلال قال: (هِلاَلُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ, هِلاَلُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ, هِلاَلُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ, آمَنْتُ بِالَّذِى خَلَقَكَ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ يَقُولُ (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى ذَهَبَ بِشَهْرِ كَذَا, وَجَاءَ بِشَهْرِ كَذَا).

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، کە پێی گەیشتوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ مانگی یەك شەوەی دەبینی سێ جار دەیفەرموو: (مانگی نوێی خێر و ڕێنموویی، مانگی نوێی خێر و ڕێنموویی، مانگی نوێی خێر و ڕێنموویی، باوەڕم هێناوە بەو خوایەی کە تۆی دروستکردووە). لەپاشدا دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی فلانە مانگی ڕاوانەکردوو، فلانە مانگی هێنا).

٥٠٩٣ -(ضعيف الإسناد) عن قتادة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ صَرَفَ وَجْهَهُ عَنْهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَيْسَ عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى هَذَا الْبَابِ حَدِيثٌ مُسْنَدٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مانگی یەك شەوەی دەبینی ڕووی لێ وەردەگێڕا. ئەبو داود دەڵێت: لەم باسەدا هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتوە.

## باسی ویردی چوونەدەرەوە لەماڵ.

## ١١٣ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ.

٥٠٩٤ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: مَا خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَيْتِي قَطُّ إِلاَّ رَفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَّمَاءِ, فَقَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ, أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ, أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ من دەرنەدەچوو ئیللا سەری بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ, أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ, أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ). واتە: بەناوی خوا، بەپشتیوانی خوا، ئەی خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی لەڕێ دەربچم، یان کەسێ لەڕێ دەربکەم، یا تووشی هەڵەیە بم و بخلیسکێم، یا کەسێ تووشی هەڵەو هەڵخلیسکان بکەم، یا زوڵم و ستەم بکەم لە کەسێ، یا کەسێ زوڵم و ستەمم لێ بکات، یا نەفامی و ناپیاوی لەگەڵ کەسێ بکەم، یا کەسێ نەفامی و ناپیاویم لەگەڵ بکات.

٥٠٩٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ). قَالَ: (يُقَالُ حِينَئِذٍ هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ فَتَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ, فَيَقُولُ لَهُ شَيْطَانٌ آخَرُ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ کاتێ کە لەماڵ دەردەچێ بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ

عَلَى اللَّهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ). واتە: بەناوی پیرۆزی خوا، بەپشتیوانی خوا لەماڵ دەردەچم، هێزو توانایی هەر بەدەستی خوا خۆیەتی و بەس.
راوی وتی: (ئەو کاتە - مەلائیکەیە بانگی دەکات - پێی دەڵێت: هیدایەت درایت و کیفایەت کرایت و پارێزراویت، ئیتر شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە، شەیتانێ تر پێی دەڵێ: ئیتر چۆن دەتوانی کەسێ گومڕا کەیت کە بەڕاستی هیدایەت درابێ و کیفایەت کرابێ و پارێزراو بێ).

## باسی ویردی کەسێ چووە ماڵەوە

## ١١٤ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ.

٥٠٩٦ - (ضعيف) عن أبو مالك الأشعري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا وَلَجَ الرَّجُلُ فِي بَيْتِهِ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلِجِ, وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ, بِسْمِ اللَّهِ وَلَجْنَا, وَبِسْمِ اللَّهِ خَرَجْنَا, وَعَلَى اللَّهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا, ثُمَّ لِيُسَلِّمْ عَلَى أَهْلِهِ).

واتە: لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ چووە ماڵەوە با بڵێ: خودایە خێر و چاکەی ئەو شوێنەی دەچمە ناویەوە لەتۆ داوادەکەم، هەروەها خێر و چاکەی ئەو شوێنەش کە لێی دەچمە دەرەوە، بە ناوی خوا دەچینە ژوورەوە، بە ناوی خوا دێینە دەرەوە، پشت بە پەروەردگارمان دەبەستین، لەپاشدا سڵاو بکات لە کەس و کاری).

## باسی ویردی هەڵکردنی با

## ١١٥ - باب مَا يَقُولُ إِذَا هَاجَتِ الرِّيحُ.

٥٠٩٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (الرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ). - قَالَ سَلَمَةُ: فَرَوْحُ اللَّهِ - تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ, وَتَأْتِي بِالْعَذَابِ, فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَلاَ تَسُبُّوهَا, وَسَلُوا اللَّهَ خَيْرَهَا, وَاسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (با لە رەحمەتەکانی خوای گەورەیە). سەلەمە وتی: رەحمەتەکانی خوای گەورەش: رەحمەت دەهێنێ و، سزاش دەهێنێ،جا کاتێ با هەڵ دەکات جنێوی مەدەنێ، داوای ئەو خێر و چاکەیە بکەن کە پێوەیەتی، پەناش بگرن بە خوا لە شەڕ و خراپەکەی).

٥٠٩٨ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه و سلم قالت: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَطُّ مُسْتَجْمِعًا ضَاحِكًا حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ, إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ, وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْمًا أَوْ رِيحًا عُرِفَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْغَيْمَ فَرِحُوا رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ, وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَتْ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهِيَةُ, فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ, مَا يُؤَمِّنُنِي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ؟! قَدْ عُذِّبَ قَوْمٌ بِالرِّيحِ, وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ فَقَالُوا: (هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا).

واتە: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەدیوە زیادەڕۆیی بکات لەپێکەنین داو ئەوەندە پێ بکەنێ هەتا قوڵایی ناو دەمی دەرکەوێت، بەڵکو زەردەخەنەی دەکردو بەس، ئەگەر هەورێکی بدیایە یان بایە هەڵیکردایە

ئەوا ترسی لێ دەنیشت و بە سەر و سیماو روخساریدا دەزانرا کە پێی بێ تاقەتە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەگەر خەڵك هەورێك ببینن خۆشحاڵ دەبن بە هیوای ئەوەی بارانی تێدا بێت، کە چی تۆ دەبینم لەوکاتەدا بێزاری بە روخسارتەوە دەردەکەوێت، فەرمووی: (ئەی عائیشە، کێ لەوە دڵنیام دەکاتەوە کە ئەو هەورە سزای تێدا نیە، خوای گەورە قەومێکی بە با سزادا، کاتێ کە پێش وەخت بینی بوویان وتیان: (ئەمە هەورێکە بارانمان بۆ دەبارێنێ). بەڵام سزا بوو بۆیان.

٥٠٩٩ - (صحيح) عن عائشة قالت:أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَأَى نَاشِئًا فِي أُفُقِ السَّمَاءِ تَرَكَ الْعَمَلَ وَإِنْ كَانَ فِي صَلَاةٍ, ثُمَّ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا). فَإِنْ مُطِرَ قَالَ: (اللَّهُمَّ صَيِّبًا هَنِيئًا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەگەر بە کەناری ئاسمانەوە هەورێکی بدیایە بە تەواوی کۆنەبوایەتەوە وازی لەکار دەهێنا ئەگەر لە نوێژیش دا بوایە - دەترسا لەوەی کە سزای تێدا بێت -، لەپاشدا دیفەرموو: (خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی). ئەگەر باران بباریایە دیفەرموو: (خودایە بارانێکی بە پیت و بەرەکەت و پڕ رەحمەت بێ).

## باسی ئەوەی دەربارەی باران هاتوە.

## ١١٦ - باب مَا جَاءَ فِي الْمَطَرِ.

٥١٠٠ - (صحيح) عن أنس قال: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَطَرٌ فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَسَرَ ثَوْبَهُ عَنْهُ حَتَّى أَصَابَهُ, فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: (لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین باران باری، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جلەکانی خۆی هەڵماڵی و هەندێ لە جەستەی دەرخست بۆ ئەوەی باران لێی بدات، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە بۆ وا دەکەی؟ فەرمووی: (چونکە ئەم بارانە رەحمەتە تازە خوای پەروەردگاری باراندویەتی).

## باسی ئەوەی دەربارەی کەڵەشێر و ئاژەڵان هاتووە.

## ١١٧ - باب مَا جَاءَ فِي الدِّيكِ وَالْبَهَائِمِ.

٥١٠١ - (صحيح) عن زيد بن خالد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَسُبُّوا الدِّيكَ فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلاَةِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جنێو مەدەن بە کەڵەشێر چونکە خەبەرتان دەکاتەوە بۆ نوێژ).

- بێگومان بۆ شەو نوێژ و نوێژی بەیانی - .

٥١٠٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَسَلُوا اللَّهَ تَعَالَى مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا, وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر گوێتان لەدەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵ و چاکە بکەن لە خوای گەورە، چونکە ئەوە مەلائیکەی بینیوە، وە ئەگەر گوێتان لە زەڕەی کەر بوو پەنا بگرن بە خوای گەورە لە شەڕ و خراپەی شەیتان - بڵێن: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) - چونکە ئەوە شەیتانی بینیوە).

٥١٠٣ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلاَبِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ, فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لاَ تَرَوْنَ).

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەشەودا گوێتان وەڕینی سەگ و زەڕەی کەر بوو پەنا بگرن بە خوای گەورە، چونکە ئەمانە شتێك دەبینن کە ئێوە نایبینن).

٥١٠٤ - (صحيح) عن علي بن عمر بن الحسين بن علي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَقِلُّوا الْخُرُوجَ بَعْدَ هَدْأَةِ الرِّجْلِ فَإِنَّ لِلَّهِ تَعَالَى دَوَابَّ يَبُثُّهُنَّ فِي الأَرْضِ). قَالَ ابْنُ مَرْوَانَ: (فِي تِلْكَ السَّاعَةِ). وَقَالَ: (فَإِنَّ لِلَّهِ خَلْقًا). ثُمَّ ذَكَرَ نُبَاحَ الْكَلْبِ وَالْحَمِيرَ, نَحْوَهُ.

واتە: لە عەلی کوڕی عومەری کوڕی حوسەینی کوڕی پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بە شەوا لەماڵ دەرچوون کەم بکەنەوە ئەو کاتەی کە خەڵك بەگشتی ڕێ ناکەن چونکە خوای گەورە زیندەوەرانێ یان دروستکراوانێکی

هەیە لەو کاتەدا بڵاوەیان دەکاتەوە). جا راوی وەڕینی سەگ و زەڕەی کەری باس کرد، بە هەمان شێوەی فەرموودەی پێشو.

## سەبارەت بە بانگدان بە گوێی منداڵی تازە لەدایك بوودا.

## ١١٨ - باب فِي الصَّبِيِّ يُولَدُ فَيُؤَذَّنُ فِي أُذُنِهِ.

---

٥١٠٥ - (ضعيف) عن أبو رافع قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ - حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ - بِالصَّلَاةِ.

---

واتە: لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کاتێ کە (فاطمة) حەسەنی کوڕی عەلی بوو پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بانگی دا بەگوێی راستی دا.

---

٥١٠٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ فَيَدْعُو لَهُمْ بِالْبَرَكَةِ. زَادَ يُوسُفُ: وَيُحَنِّكُهُمْ وَلَمْ يَذْكُرْ بِالْبَرَكَةِ.

---

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: منداڵیان دەهێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ دەکردن. یوسوف ئەمەی بۆ زیاد کرد: خورمای دەمژی و دەیهێنا بەناو دەمیاندا. بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ دەکردن.

---

٥١٠٧ - عن عائشة رضي الله عنها قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (هَلْ رُئِيَ)، أَوْ كَلِمَةً غَيْرَهَا، (فِيكُمُ الْمُغَرِّبُونَ؟). قُلْتُ: وَمَا الْمُغَرِّبُونَ؟ قَالَ: (الَّذِينَ يَشْتَرِكُ فِيهِمُ الْجِنُّ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فِيكُمُ الْمُغَرِّبُونَ؟). عائیشە وتی: وتم: (الْمُغَرِّبُونَ) کێن؟ فەرمووی: (ئەوانەن کە جنۆکە - لەکاتی جووت بووندا - هاوبەشیان دەکەن).

## سەبارەت بە کەسێ پەنای بردە بەر خوا داوای پەنادانی کرد لە کەسێکی تر.

## ١١٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَسْتَعِيذُ مِنَ الرَّجُلِ.

٥١٠٨ - (حسن صحيح) عن ابن عباس, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ, وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِوَجْهِ اللَّهِ فَأَعْطُوهُ). قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: (مَنْ سَأَلَكُمْ بِاللَّهِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ پەنای بردە بەر خودا داوای پەنادانی لێ کردن پەنای بدەن، هەرکەسێ بە ناوی خواوە داوای شتێکی ڕەوای لێ کردن بیدەنێ).

- (صحيح) عن ابن عمر قال, قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ اسْتَعَاذَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ, وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ). وَقَالَ سَهْلٌ وَعُثْمَانُ (وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ). ثُمَّ اتَّفَقُوا (وَمَنْ آتَى إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ). قَالَ مُسَدَّدٌ وَعُثْمَانُ (فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَادْعُوا اللَّهَ لَهُ حَتَّى تَعْلَمُوا أَنْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ پەنای بردە بەر خودا داوای پەنادانی لێ کردن پەنای بدەن، هەرکەسێ بە ناوی خواوە داوای شتێکی ڕەوای لێ کردن بیدەنێ، هەرکەسێ بانگی لێ کردن وەڵامی بدەنەوەو





بچن بە دەم داواکەیەوە، هەرکەسێ چاکەیەکی لەگەڵ کردن پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتان بوو پاداشتی بدەنەوە دوعای خێری بۆ بکەن هەتا دڵنیا دەبن کە پاداشتتان داوەتەوە).

- ئەم فەرمووده پێشتر بە ژمارە: (١٦٧٢) هاتووە -.

## سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی وەسوەسە.

## ١٢٠ - باب فِي رَدِّ الْوَسْوَسَةِ.

٥١١٠ - (حسن الإسناد) عن أبو زميل قال: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: مَا شَيْءٌ أَجِدُهُ فِي صَدْرِي؟ قَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: وَاللَّهِ مَا أَتَكَلَّمُ بِهِ. قَالَ: فَقَالَ لِي: أَشَيْءٌ مِنْ شَكٍّ؟ قَالَ: وَضَحِكَ. قَالَ: مَا نَجَا مِنْ ذَلِكَ أَحَدٌ, حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (فَإِنْ كُنْتَ فِي شَكٍّ مِمَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكَ) الآيَةَ. قَالَ: فَقَالَ لِي: إِذَا وَجَدْتَ فِي نَفْسِكَ شَيْئًا فَقُلْ: (هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ).

واتە: لە ئەبو زومەیلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ئیبنو عەباسم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی؟ وتم: جاری وا هەیە شتێ دێ بە دڵما قورسە بە لامەوەو ناتوانم باسی بکەم ئەوەندە ناشیرین و خراپە، وتی: ئەو شتە چییە؟ وتم: سوێند بە (الله) باسی ناکەم، ئەبو زومەیل وتی: ئیبنو عەباس پێی وتم: شتێ لە وەسوەسەو شك و گومان؟ وتی: ئیبنو عەباس پێکەنی - چونکە زانی شەیتان خستویەتیە دڵیەوە -، ئیبنو عەباس وتی: دەی هیچ کەسێ لەوە ڕزگاری نابێ، هەتا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾. سورة یونس: ٩٤. واتە: ئەگەر تۆ لەگوماندای لەوەی کە ناردومانەتە خوارەوە بۆت، ئەوە پرسیار لەوانە بکە لە کتێبی ئاسمانی

شارەزان و دەیخوێننەوە لەپێش تۆ، سوێند بەخوا بەڕاستی بۆت هاتووە هەق و ڕاستی لەپەروەردگارتەوە، کەواتە لەدەستەی گومانداران مەبە.
ئەبو زومەیل وتی: پێی وتم: ئەگەر گومانێ لەدڵتدا دروست بوو بڵێ:
﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾. سورة الحديد: ٣.
واتە: هەر ئەوە یەکەمین و دواهەمین، وە دیارو نادیار وە ئەو بەهەموو شتێك ئاگایە.

٥١١١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: جَاءَهُ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا الشَّيْءَ نُعْظِمُ أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهِ أَوِ الْكَلاَمَ بِهِ مَا نُحِبُّ أَنَّ لَنَا وَأَنَّا تَكَلَّمْنَا بِهِ. قَالَ: (أَوَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ). قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: (ذَاكَ صَرِيحُ الإِيمَانِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەندێ لە هاوەڵانی هاتن بۆ خزمەتی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وەسوەسەی وا دێ بە دڵماندا ناتوانین و پێمان خۆش نیە باسی بکەین ئەوەندە ناشیرین و خراپە، فەرمووی: (ئەوەی کە شەیتان دەیخاتە دڵتانەوە ئێوە لێی رادەکەن و قبوڵی ناکەن و پێشتان ناخۆشە باسیشی بکەن). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (دەی ئەوە ئیمانی پاك و پوخت و سەریحە). - کە ڕێگری ئەوەتان لێ دەکات قبوڵی ئەوە بکەن شەیتان دەیخاتە دڵتانەوە - .

٥١١٢ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَحَدَنَا يَجِدُ فِي نَفْسِهِ - يُعَرِّضُ بِالشَّيْءِ - لأَنْ يَكُونَ حُمَمَةً أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ, فَقَالَ: (اللَّهُ أَكْبَرُ, اللَّهُ أَكْبَرُ, اللَّهُ أَكْبَرُ, الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ). قَالَ ابْنُ قُدَامَةَ (رَدَّ أَمْرَهُ). مَكَانَ (رَدَّ كَيْدَهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەسوەسەی وا دێ بە دڵی یەکێ لەئێمەدا ئەگەر

ببێتە خۆڵەمێش پێی خۆشترە لەوەی کە باسی بکات ئەوەندە ناشیرین و خراپە، فەرمووی: ((الله أكبر)، (الله أكبر)، (الله أكبر) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی ئەو مرۆڤەی داوە وەسوەسەی شەیتان رەتکاتەوەو قبوڵی نەکات بەلایەوە قورس و گران بێ باسیشی بکات) ئیبنو قودامە لەجیاتی (رَدَّ كَيْدَهُ). وتی: (رَدَّ أَمْرَهُ).

## کەسێ خۆی بخاتە پاڵ سەرپەرشتیاری جگە لە گەورەکەی.

## ١٢١ - باب فِي الرَّجُلِ يَنْتَمِي إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ.

٥١١٣ - (صحيح) عن سعد بن مالك قال: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي مِنْ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَنَّهُ قَالَ: (مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ, فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ).

واتە: لە سەعدی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەم دوو گوێچکەیە گوێم لە موحەممەد صلى الله عليه وسلم بوو، بەدڵیش وەرم گرت کە فەرمووی: (هەرکەسێ داخوازی و بانگەشەی ئەوە بکات کە کوڕی یەکێکی ترە جگە لە باوکی، بە مەرجێ سور بزانێ ئەوە باوکی خۆی نیە بەهەشت حەرامە لەسەری و ناچێتە ناویەوە).

٥١١٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ تَوَلَّى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ, فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ, لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله

علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خۆی خستە پاڵ سەرپەرشتیارێك جگە لە گەورەکەی خۆی نەفرینی خوا و مەلائیکە و سەرجەم خەڵکی لەسەر بێ، خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا نە نوێژی فەرز و نوێژی سوننەتی لێ وەرناگرێ).

٥١١٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ, أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ, فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ الْمُتَتَابِعَةُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێ داخوازی و بانگەشەی ئەوە بکات کە کوڕی یەکێکی ترە جگە لە باوکی، یان خۆی خستە پاڵ سەرپەرشتیارێك جگە لە گەورەکەی خۆی ئەوە بەردەوام نەفرینی خوای لەسەر بێ، هەتا رۆژی قیامەت).

## سەبارەت بە شانازی کردن بە رەچەڵەکەوە.

## ١٢٢ - باب فِي التَّفَاخُرِ بِالأَحْسَابِ.

٥١١٦ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ, وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ, مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ, وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ, أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ, لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ, أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الْجِعْلاَنِ الَّتِى تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتْنَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەئێوە وەك سەردەمی

نەفامی شانازی بكەن بە باب و باپیرانەوەو خۆتان بە زل بزانن، خەڵك دوو كەسن: یان كەسێكی موسوڵمانی لەخوا ترسە، یا كەسێكی بەدكاری بەدبەخت و چارەڕەشە، ئێوە هەمووتان لە نەوەی ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە، جا ئەوانەی كە شانازی دەكەن بەو هۆزە بەدكارانەوە كە بوون بە خەڵوزی دۆزەخ یان دەبێ وازبهێنن لەو كارەیان، یا لەلای خوای گەورە لە قالۆنچانە بێ بایەخ تر دەبن كە بە لوتیان پیسایی خڕ دەكەن).

## سەبارەت بە دەمارگیری و رەگەز پەرستی.

## ١٢٣ - باب فِي الْعَصَبِيَّةِ.

٥١١٧ - (صحيح موقوفا مرفوع) عن عبد الله بن مسعود قال: مَنْ نَصَرَ قَوْمَهُ عَلَى غَيْرِ الْحَقِّ فَهُوَ كَالْبَعِيرِ الَّذِى رُدِّىَ فَهُوَ يُنْزَعُ بِذَنَبِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەو كەسەی كە خزم و كەسوكاری خۆی سەردەخات لەسەر ناهەق و یارمەتیان دەدات وەك ئەو وشترە وایە كەوتبێتە ناو چاڵێكەوەو بە كلكی دەریبهێننەوە.

٥١١٨ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عبد لله, عن أبيه قال: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِى قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ, فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی (عبد الله)وە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: گەیشمە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خێمەیەكی بچوكی لە چەرم دروستكراودا بوو، جا راوی فەرموودەكەی بە هەمان شێوە گێڕایەوە.

٥١١٩ - (ضعيف) عن بنت واثلة بن الأسقع أنها سمعت أباها يقول: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَا الْعَصَبِيَّةُ؟ قَالَ: (أَنْ تُعِينَ قَوْمَكَ عَلَى الظُّلْمِ).

واتە: لە کچێکی (واثلة)ی کوڕی ئەسقەعەوە دەگێرنەوە، کە گوێی لە باوکی بووە دەیوت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەمارگیری چیە؟ فەرمووی: (یارمەتی خزم و کەسوکارەکەت بدەی لەسەر زوڵم و ستەم و ناهەقی).

٥١٢٠ - (ضعيف) عن سراقة بن مالك بن جعشم المدلجي قال: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (خَيْرُكُمُ الْمُدَافِعُ عَنْ عَشِيرَتِهِ مَا لَمْ يَأْثَمْ).

واتە: لە سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومی مودلەجیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆ دەداین فەرمووی: (چاکترین کەستان ئەو کەسەیە لەسەر خزم و هۆزی خۆی بکاتەوە بە مەرجێ خۆی تووشی گوناهو تاوان نەکات).

٥١٢١ - (ضعيف) عن جبير بن مطعم, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ, وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ, وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ).

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)وە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەسەر ڕێباز و بەرنامەی من نیە ئەو کەسەی بانگەواز بۆ دەمارگیری بکات، ئەو کەسەی لەپێناوی دەمارگیریدا بجەنگێ، وە ئەو کەسەی لەسەر دەمارگیری بمرێت).

٥١٢٢ - (صحيح) عن أبي موسى قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوشکەزای هۆزێ لەو هۆزەیە).

٥١٢٣ - (ضعيف) عن أبو عقبة - وَكَانَ مَوْلًى مِنْ أَهْلِ فَارِسَ - قال: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُحُدًا, فَضَرَبْتُ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ, فَقُلْتُ: خُذْهَا مِنِّى وَأَنَا الْغُلاَمُ الْفَارِسِىُّ, فَالْتَفَتَ إِلَىَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (فَهَلاَّ قُلْتَ خُذْهَا مِنِّى وَأَنَا الْغُلاَمُ الأَنْصَارِىُّ).

واتە: لە ئەبو عوقبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بەشداری جەنگی ئوحودم کرد، شمشێرێکم دا لە پیاوێکی موشریك و هاوبەش بۆ خوا دانەر، وتم: ها لێم وەربگرە من غولامێکی فارسیم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لایکردەوە بەلاماو فەرمووی: (ئەی بۆ نەتوت من غولامێکی ئەنصاریم).

## سەبارەت بە کەسێ
## هەواڵ بدات بەکەسێ کە خۆشی دەوێ.

## ١٢٤ - باب إِخْبَارِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ بِمَحَبَّتِهِ إِيَّاهُ.

٥١٢٤ - (صحيح) عن المقدام بن معديكريب, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ).

واتە: لە میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ کەسێکی خۆش بوێت با پێی رابگەیەنێ کە خۆشی دەوێت).

٥١٢٥ - (حسن) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَجُلاً كَانَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ هَذَا. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْلَمْتَهُ). قَالَ: لاَ, قَالَ (أَعْلِمْهُ). قَالَ: فَلَحِقَهُ, فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّكَ فِي اللَّهِ. فَقَالَ: أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بوو، پیاوێکیش بەلای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دا تێپەڕی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من ئەو پیاوەم خۆشدەوێت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئاگادارت کردۆتەوە کە خۆشت دەوێ؟). وتی: نا، فەرمووی: (دەی ئاگاداری بکەرەوە)، وتی: پیاوەکە دوای کەوت و پێی گەیشت، پێی وت: من لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت، ئەویش وتی: ئەو خوایەی کە تۆ لەبەر ڕەزامەندی ئەو منت خۆشدەوێ تۆی خۆش بوێت).

٥١٢٦ - (صحيح) عن أبو ذر قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ وَلاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَعْمَلَ كَعَمَلِهِمْ. قَالَ (أَنْتَ يَا أَبَا ذَرٍّ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ). قَالَ: فَإِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ (فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ). قَالَ فَأَعَادَهَا أَبُو ذَرٍّ, فَأَعَادَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەسێ کۆمەڵێکی خۆشدەوێ بەڵام ناتوانێ وەك ئەوان کارو کردەوەی چاك بکات، فەرمووی: (تۆ ئەی ئەبو (ذر) لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشت دەوێت). وتی: دەی من خواو پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێت، ئەبو (ذر) دووپاتی کردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دووپاتی کردەوە.

٥١٢٧ - عن أنس بن مالك قال: رَأَيْتُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرِحُوا بِشَيْءٍ لَمْ أَرَهُمْ فَرِحُوا بِشَيْءٍ أَشَدَّ مِنْهُ, قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, الرَّجُلُ

يُحِبُّ الرَّجُلَ عَلَى الْعَمَلِ مِنَ الْخَيْرِ يَعْمَلُ بِهِ وَلاَ يَعْمَلُ بِمِثْلِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دی زۆر دڵخۆش و شادومان بوون هەرگیز نەم دیبوون بەو شێوەیە دڵخۆش و شادومان بن، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەسێ کەسێکی خۆش بووێت لەسەر کارێکی خێر و چاکە کە کاری پێ دەکات بەڵام خۆی ناتوانێ وەك ئەو کاری پێ بکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی دەوێ ).

## سەبارەت بە پرس و ڕا

## ١٢٥ - باب فِي الْمَشُورَةِ.

٥١٢٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕاوێژکار ئەمیندارەو جێگەی باوەڕە).

## دەربارەی کەسێ ڕێگەی خێر نیشانی خەڵك بدات.

## ١٢٦ - باب فِي الدَّالِّ عَلَى الْخَيْرِ.

٥١٢٩ - (صحيح) عن أبو مسعود الأنصاري قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُبْدِعَ بِي فَاحْمِلْنِي. قَالَ: (لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكَ عَلَيْهِ, وَلَكِنِ ائْتِ فُلاَنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَحْمِلَكَ). فَأَتَاهُ فَحَمَلَهُ, فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخْبَرَهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ).

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم داوای وڵاخی سواری لێ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، زۆر شەکەت و ماندووم و پەکم کەوتوە لەبەر بێ وڵاخی، فەرمووی: (وڵاخم نیە هەتا سوارت بکەم، بەڵام برۆ بۆ لای فڵان کەس بەڵکو ئەو سوارت بکات). ئەویش رۆشت بۆ لای وڵاخێکی سواری دایە، رۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەکەی دایە، ئەویش فەرمووی: (کەسێ ڕێگەی خێر نیشانی کەسێ بدات خۆشی بەقەد خێر کەرەکە خێری دەگات).

## هۆشیاریدان سەبارەت بە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس.

## ١٢٧ - باب فِي الْهَوَى.

٥١٣٠ - (ضعيف) عن أبو الدرداء, عن النبي صلى الله عليه وسلم: (حُبُّكَ الشَّيْءَ يُعْمِى وَيُصِمُّ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: وتی: (کە تۆ شتێکت خۆشویست لەئاستی کەڕ و کوێر دەبیت و هەست بە خراپەی ناکەی).

## دەربارەی تکا بۆ یەکتر کردن.

## ١٢٨ - باب فِي الشَّفَاعَةِ.

٥١٣١ - (صحيح) عن أبو موسى قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اشْفَعُوا إِلَيَّ لِتُؤْجَرُوا, وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تکای باش بکەن بۆ خەڵك لەلام بۆئەوەی پاداشتی باشی لەسەر وەرگرن، خوای گەورە ئەگەر بیەوێ بە تەقدیری خۆی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ دەکات).

٥١٣٢ - (صحيح) عن معاوية قال: اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا, فَإِنِّي لأُرِيدُ الأَمْرَ فَأُؤَخِّرُهُ كَيْمَا تَشْفَعُوا فَتُؤْجَرُوا, فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا).

واتە: لە موعاویەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: تکای ڕەوا بکەن پاداشتی باشی لەسەر وەردەگرن، هەندێ جار دەمەوێ کارێ جێبەجێ بکەم دوای دەخەم تاکو ئێوە بێن تکای باش بکەن لەوبارەوە پاداشتی باشی لەسەر وەرگرن، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تکای ڕەوا بکەن پاداشتی باشی لەسەر وەردەگرن).

٥١٣٣ - عَنْ أَبِي مُوسَى, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, مِثْلَهُ.

## دەربارەی کەسێ نامەی نوسی لەخۆیەوە دەست پێ بکات.

## ١٢٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَبْدَأُ بِنَفْسِهِ فِي الْكِتَابِ.

٥١٣٤ – (ضعيف الإسناد) عن بعض ولد العلاء: أَنَّ الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ كَانَ عَامِلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْبَحْرَيْنِ, فَكَانَ إِذَا كَتَبَ إِلَيْهِ بَدَأَ بِنَفْسِهِ.

واتە: لە یەکێ لە کوڕەکانی عەلائەوە دەگێڕنەوە، کە عەلائی کوڕی (حَضْرَمِيِّ) سەرکاری بەحرەین بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، کاتێ کە نامەی دەنووسی بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یەکەمجار لەخۆیەوە دەستی پێ دەکرد. - واتە: بەم شێوەیە: لە عەلائی کوڕی (حَضْرَمِيِّ)ەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم -.

٥١٣٥ - (ضعيف الإسناد) عن العلاء بن الحضرمي: أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَدَأَ بِاسْمِهِ.

واته: لە عەلائی کوڕی (حَضْرَمِیّ)ەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە نامەی دەنووسی بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یەکەمجار لەخۆیەوە دەستی پێ دەکرد.

## باسی نامە چۆن دەنووسرێت بۆ (ذمي).

## ١٣٠ - باب كَيْفَ يُكْتَبُ إِلَى الذِّمِّيِّ

٥١٣٦ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ إِلَى هِرَقْلَ: (مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلَامٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى). قَالَ ابْنُ يَحْيَى: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ قَالَ: فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ فَأَجْلَسَنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا فِيهِ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلَامٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ).

واته: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە نامەی نووسی بۆ هیرەقل: (لە موحەممەدی کوڕی (عبد الله)ەوە بۆ هیرەقل گەورە و پاشای رۆم، سڵاو لەو کەسەی شوێن هیدایەت کەوتووە ...). ئیبنو یەحیا وتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێرنەوە، کە ئەبو سوفیان هەواڵی پێ داوە وتویەتی: کاتێ کە چووینە ژوورەوە بۆ لای هیرەقل و لەبەردەستی ئەودا دانیشتین، داوای نامەکەی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم کرد کە بۆی نووسی بوو، تێیدا نوسرابوو: ((بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ هیرەقل گەورە و پاشای رۆم، سڵاو لەو کەسەی شوێن هیدایەت کەوتووە، لەدوایی دا ...).

# سەبارەت بە چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك

## ١٣١ - باب فِي بِرِّ الْوَالِدَيْنِ.

٥١٣٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدَهُ إِلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ منداڵێ لە چاكەی باوك و دایكی دەرناچێ مەگەر كۆیلە بن بیانكڕێ و ئازادیان بكات).

٥١٣٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ وَكُنْتُ أُحِبُّهَا وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُهَا فَقَالَ لِي: طَلِّقْهَا, فَأَبَيْتُ, فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (طَلِّقْهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: هاوسەرێكم هەبوو زۆرم خۆش دەویست، بەڵام باوكم خۆشی نەدەویست، بۆیە پێی وتم: تەڵاقی بدە، منیش تەڵاقم نەداو گوێڕیەڵی فەرمایشتەكەی باوكم نەبووم، باوكم چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تەڵاقی بدە).

٥١٣٩ - (حسن صحيح) عن بهز بن حكيم, عن أبيه, عن جده قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: (أُمَّكَ, ثُمَّ أُمَّكَ, ثُمَّ أُمَّكَ, ثُمَّ أَبَاكَ, ثُمَّ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ).

واتە: لە بەهزی كوڕی حەكیمەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، كە

وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ کێ چاکە بکەم؟ فەرمووی: (دایکت، لەپاشدا دایکت، لەپاشدا دایکت، پاشان باوکت، لەپاشدا نزیکترین خزمت بەدوای یەکدا). - بەپێی دوور و نزیکیان -.

(حسن) وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَسْأَلُ رَجُلٌ مَوْلاَهُ مِنْ فَضْلٍ هُوَ عِنْدَهُ فَيَمْنَعُهُ إِيَّاهُ إِلاَّ دُعِىَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَضْلُهُ الَّذِى مَنَعَهُ شُجَاعًا أَقْرَعَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الأَقْرَعُ الَّذِى ذَهَبَ شَعْرُ رَأْسِهِ مِنَ السُّمِّ.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەسێ داوای شتێ بکات لەخزمێکی خۆی ئەو شتەی هەبێ و لەخۆی زیاد بێ و نەیداتێ، لە رۆژی قیامەتدا ئەو شتەی بۆ دەکرێت بە مارێکی کەچەڵی فرە ژەهراوی). ئەبو داود دەڵێت: (الأَقْرَعُ) مارێکە لەبەر زۆری ژەهرەکەی سەری مووی پێوە نەماوە.

٥١٤٠ - (ضعيف) عن كليب بن منفعة, عن جده: أَنَّهُ أَتَى النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: (أُمَّكَ, وَأَبَاكَ, وَأُخْتَكَ, وَأَخَاكَ, وَمَوْلاَكَ الَّذِى يَلِى ذَاكَ, حَقٌّ وَاجِبٌ وَرَحِمٌ مَوْصُولَةٌ).

واتە: لە کولەیبی کوڕی مەنفەعەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە چووتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ کێ چاکە بکەم؟ فەرمووی: (دایکت و، باوکت و، خوشکەکەت و، لەگەڵ ئەو خزمانەی کە بەهۆی ئەمانەوە دەبن بە خزمت، ئەمەش هەق و رەوایەو مافی خزمایەتیە دەبێ جێبەجێ بکرێت).

٥١٤١ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, كَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟! قَالَ: (يَلْعَنُ أَبَا الرَّجُلِ فَيَلْعَنُ أَبَاهُ, وَيَلْعَنُ أُمَّهُ فَيَلْعَنُ أُمَّهُ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (تاوانێکی گەلێك گەورەیە پیاو نەفرەت بکات لە دایك و باوکی خۆی). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا! صلی الله علیه وسلم: چۆن پیاو نەفرەت دەکات لە باوك و دایکی خۆی، ئایا شتی وا هەیە؟ فەرمووی: (ئەو جنێودەدات بەباوکی پیاوێك، ئەویش جنێودەدات بەباوکی ئەم، هەروەها ئەو جنێودەدات بەدایکی ئەو، ئەویش جنێودەدات بەدایکی ئەم) - ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك جنێو بەدایك و باوکی بدەن، کەواتە وەك ئەوە وایە خۆی جنێوی پێدابن - .

٥١٤٢ - (ضعيف) عن أبو أسيد مالك بن ربيعة الساعدي قال: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, إِذَا جَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَلْ بَقِيَ مِنْ بِرِّ أَبَوَيَّ شَيْءٌ أَبَرُّهُمَا بِهِ بَعْدَ مَوْتِهِمَا؟ قَالَ: (نَعَم, الصَّلاَةُ عَلَيْهِمَا, وَالاِسْتِغْفَارُ لَهُمَا, وَإِنْفَاذُ عَهْدِهِمَا مِنْ بَعْدِهِمَا, وَصِلَةُ الرَّحِمِ الَّتِى لاَ تُوصَلُ إِلاَّ بِهِمَا, وَإِكْرَامُ صَدِيقِهِمَا).

واتە: لە ئەبو ئوسەیدی مالیکی کوڕی ربیعەی ساعیدیەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: جارێ ئێمە لەلای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبووین لەو کاتەدا کابرایەکی هۆزی بەنی سەلەمە هاتە لای و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا لە چاکەکردنی دایك و باوکدا لە دوای مردنیان هیچ شتێك ماوە کە چاکەیان لەگەڵدا بکەم؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوەڵامدا فەرمووی: (بەڵێ، دوعایان بۆ بکە و، داوای لێبوردنیان لە خوا بۆ بکە، لەدوای خۆیان پەیمان و بەڵێنیان بۆ جێبەجێ بکەو، پەیوەندی خزمایەتیان بەجێ بهێنە ئەو خزمانەی کە بەهۆی ئەوانەوە دەبن بە خزمت، ڕێز لە دۆست و خۆشەویستەکەیان بگرە).

٥١٤٣ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ صِلَةُ الْمَرْءِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین کردەوەی چاکە ئەوەیە ئینسان لەدوای مردنی باوك و دایکی کەسوکار و ئاشنای باوك و دایکی بەسەر بکاتەوەو چاك بێ لەگەڵیان).

٥١٤٤ - (ضعيف الإسناد) عن أبو الطفيل قال: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ لَحْمًا بِالْجِعِرَّانَةِ, قَالَ أَبُو الطُّفَيْلِ: وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلَامٌ أَحْمِلُ عَظْمَ الْجَزُورِ, إِذْ أَقْبَلَتِ امْرَأَةٌ حَتَّى دَنَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَسَطَ لَهَا رِدَاءَهُ, فَجَلَسَتْ عَلَيْهِ, فَقُلْتُ: مَنْ هِيَ؟ فَقَالُوا: هَذِهِ أُمُّهُ الَّتِي أَرْضَعَتْهُ.

واتە: لە ئەبو (طفيل)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە جەعرانە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینی گۆشتی دابەش دەکرد، ئەبو (طفيل) وتی: لەوکاتەدا من منداڵێ بووم ئەمتوانی ئێسکی وشترێ هەڵبگرم، لەوکاتەدا ژنێ هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەتا لێی نزیك بوویەوە، ئەویش چوو بە پیریەوەو عاباکەی خۆی بۆ ڕاخست، ژنەکە لەسەری دانیشت، وتم: ئەوە کێ یە؟ وتیان: ئەوە دایەنەکەیەتی کە بە منداڵی شیری پێ داوە.

٥١٤٥ - ضعيف الإسناد) عن عمر بن السائب: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ جَالِسًا يَوْمًا فَأَقْبَلَ أَبُوهُ مِنَ الرَّضَاعَةِ, فَوَضَعَ لَهُ بَعْضَ ثَوْبِهِ, فَقَعَدَ عَلَيْهِ, ثُمَّ أَقْبَلَتْ أُمُّهُ فَوَضَعَ لَهَا شِقَّ ثَوْبِهِ مِنْ جَانِبِهِ الآخَرِ, فَجَلَسَتْ عَلَيْهِ, ثُمَّ أَقْبَلَ أَخُوهُ مِنَ الرَّضَاعَةِ, فَقَامَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَجْلَسَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ.

واتە: لە عومەری کوڕی سائیبەوە دەگێڕنەوە، کە ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوو باوکی شیری هات بۆ لای پێشوازی گەرمی لێ کردوو هەندێ لە پۆشاکەی بۆ ڕاخست، ئەویش لەسەری دانیشت، لەپاشدا

دایەنەکەی هات چوو بە پیریەوەو لە لایەکی تری پۆشاکەکەوە نیوەی پۆشاکەی بۆ راخست، ئەویش لەسەری دانیشت، ئینجا برایەکی شیری هات هەستا لەبەری و پێشوازی گەرمی لێ کردوو لەبەردەمی خۆیدا داینیشاند.

## فەزڵی ئەو کەسەی سەرپەرشتی هەتیو دەکات.

## ١٣٢ - باب فِي فَضْلِ مَنْ عَالَ يَتَامَى.

٥١٤٦ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ عَلَيْهَا, أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی کچی هەبێ زیندە بەچاڵی نەکات، سوکایەتی پێ نەکات و ریسوای نەکات و، فەزڵ و نازی کوڕی نەدا بەسەردا، ئەوە خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە).

٥١٤٧ - (ضعيف) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ عَالَ ثَلَاثَ بَنَاتٍ فَأَدَّبَهُنَّ وَزَوَّجَهُنَّ وَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ فَلَهُ الْجَنَّةُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك سێ کچی هەبێت، بە جوانی پەروەردەیان بکات و یارمەتیان بداو بەشوویان بداو چاك بێ لەگەڵیان ئەوە بەهەشتی بۆ دەبێ).

٥١٤٨ - (ضعيف) عن سهيل بهذا للإسناد بمعناه قال: (ثَلَاثُ أَخَوَاتٍ, أَوْ ثَلَاثُ بَنَاتٍ, أَوْ بِنْتَانِ, أَوْ أُخْتَانِ).

واتە: لە سوهەیلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە، وتی: (هەر کەسێك سێ خوشك یان سێ کچ یان دوو کچ یا دوو خوشکی هەبێ ...).

٥١٤٩ - (ضعيف) عن عوف بن مالك الأشجعي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَنَا وَامْرَأَةٌ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ كَهَاتَيْنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). وَأَوْمَأَ يَزِيدُ بِالْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةِ: (امْرَأَةٌ آمَتْ مِنْ زَوْجِهَا ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ حَبَسَتْ نَفْسَهَا عَلَى يَتَامَاهَا حَتَّى بَانُوا أَوْ مَاتُوا).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من و ئەو ئافرەتەی کە روومەتی چرچی تێ دەکەوێت وەك ئەم دووانە واین لە بەهەشتدا — واتە پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شایەتومانی - ) یەزید ئاماژەی کرد بە پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شایەتومان: (ئەو ئافرەتەی کە خاوەنی جوانی و بنەماڵەیە مێردەکەی دەمرێ و بە گەنجی بێوەژن دەکەوێ شووناکاتەوە هەتا هەتیوەکانی گەورە دەبن و لەخەم دەرەخسێن یان دەمرن).

## سەبارەت بە سەرپەرشتیار و بەخێوکەری هەتیو.

## ١٣٣ - باب فِي مَنْ ضَمَّ يَتِيمًا.

٥١٥٠ - (صحيح) عن سهل, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ). وَقَرَنَ بَيْنَ أُصْبُعَيْهِ الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ.

واتە: لە سەهلەوە دەگێرنەوە، کە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من و بەخێوکەری هەتیو وەك ئەم پەنجە واین لە بەهەشتدا) پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شایەتومانی لێك نزیك کردنەوە .

## سەبارەت بە مافی دراوسێ

## ١٣٤ - باب فِي حَقِّ الْجِوَارِ.

٥١٥١ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى قُلْتُ لَيُوَرِّثَنَّهُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جبریل ئەوەندە ئامۆژگاری کردم لەبارەی - مافی - دراوسێوە، هەتا فەرمموم: دراوسێ لە دراوسێ میرات دەگرێ).

٥١٥٢ - (صحيح) عن مجاهد: عن عبد الله بن عمرو أنه ذبح شاة فقال: أَهْدَيْتُمْ لِجَارِي الْيَهُودِيِّ؟ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ).

واتە: لە موجاهیدەوە، لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە (عبد الله) مەڕێکی سەربڕی، وتی: گۆشتان برد بۆ دراوسێ جوولەکەکەم؟ بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (جبریل ئەوەندە ئامۆژگاری کردم لەبارەی دراوسێوە، هەتا وام دەزانی دراوسێ لە دراوسێ میرات دەگرێ).

٥١٥٣ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْكُو جَارَهُ فَقَالَ (اذْهَبْ فَاصْبِرْ). فَأَتَاهُ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا فَقَالَ: (اذْهَبْ فَاطْرَحْ مَتَاعَكَ فِي الطَّرِيقِ). فَطَرَحَ مَتَاعَهُ فِي الطَّرِيقِ, فَجَعَلَ النَّاسُ يَسْأَلُونَهُ فَيُخْبِرُهُمْ خَبَرَهُ, فَجَعَلَ النَّاسُ يَلْعَنُونَهُ, فَعَلَ اللَّهُ بِهِ وَفَعَلَ وَفَعَلَ فَجَاءَ إِلَيْهِ جَارُهُ, فَقَالَ لَهُ: ارْجِعْ لاَ تَرَى مِنِّي شَيْئًا تَكْرَهُهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدەست دراوسێکەی سکاڵای کرد، فەرمووی: (برۆ ئارام بگرە). پیاوەکە دوو جار یان سێ جاری تریش هاتەوە سکاڵای کرد، فەرمووی: (دەی برۆ ماڵەکەت فڕێ بدە چەقی رێگەکە). ئەویش رۆیی ماڵەکەی فڕێ دایە ناو چەقی رێگەکە، خەڵك پرسیاریان لێ دەکرد لەو بارەوە، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕانەوە، ئیتر خەڵکەکە نەفرینیان لە دراوسێکەی دەکردو دەیانوت خوای گەورە واو وای لێ بکات بۆ خۆی و دراوسێیەتی، جا دراوسێکەی هات بۆ لای و پێی وت: بگەڕێرەوە کەل و پەلەکەت بهێنەرەوە ژوورەوە ئیتر کارێ ناکەم پێت ناخۆش بێ.

٥١٥٤- (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ, وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ, وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس باوەڕی بە خواو بە دوارۆژ هەیە با رێز لە میوانەکەی بگرێت، وە هەرکەس باوەڕی بە خواو بە دوارۆژ هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات، وە هەرکەس باوەڕی بە خواو بە دوارۆژ هەیە با قسەی چاك بکات یان بێدەنگ بێ).

٥١٥٥ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ لِي جَارَيْنِ بِأَيِّهِمَا أَبْدَأُ؟ قَالَ: (بِأَدْنَاهُمَا بَابًا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو دراوسێم هەیە لە کامیانەوە دەست پێ بکەم - واتە لەپێشەوە مافی کامیان جێبەجێ بکەم و چاکەی لەگەڵ بکەم و دیاری بۆ بەرم و هاتوچۆی بکەم - ؟ فەرمووی: (کامەیان دەرگاکەی زیاتر لێتەوە نزیکە لەوەیانەوە دەست پێ بکە).

# سەبارەت بە مافی بەندەو كەنیزەك.

## ١٣٥ - باب فِي حَقِّ الْمَمْلُوكِ.

٥١٥٦ - (صحيح) عن علي عليه السلام قال: كان آخر كلام رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ, اتَّقُوا اللَّهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: دوا وتە و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ هاوەڵ بەڕێزەكانی ئەمە بوو دەیفەرموو: (نوێژەكانتان، نوێژەكانتان، ئاگاتان لە نوێژەكانتان بێ و، لە خوا بترسن و لەگەڵ بەندەو كەنیزەكەكانی ژێر دەستان چاك بن و زوڵم و ستەمیان لێ مەكەن).

٥١٥٧ - (صحيح) عن المعرور بن سويد قال: رَأَيْتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ وَعَلَيْهِ بُرْدٌ غَلِيظٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ مِثْلُهُ, قَالَ: فَقَالَ الْقَوْمُ: يَا أَبَا ذَرٍّ لَوْ كُنْتَ أَخَذْتَ الَّذِى عَلَى غُلاَمِكَ فَجَعَلْتَهُ مَعَ هَذَا فَكَانَتْ حُلَّةً, وَكَسَوْتَ غُلاَمَكَ ثَوْبًا غَيْرَهُ؟! قَالَ: فَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: إِنِّي كُنْتُ سَابَبْتُ رَجُلاً وَكَانَتْ أُمُّهُ أَعْجَمِيَّةً فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ, فَشَكَانِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ). قَالَ: (إِنَّهُمْ إِخْوَانُكُمْ فَضَّلَكُمُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ, فَمَنْ لَمْ يُلاَئِمْكُمْ فَبِيعُوهُ, وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللَّهِ).

واتە: لە مەعروری كوڕی سوەیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە (ربذة) ئەبو (ذر)م دی پارچەیە شاڵی لەبەردا بوو، خوڵامەكەشی بە هەمان شێوە پارچەیە شاڵی لەبەردا بوو، وتی: خەڵكەكە وتیان: ئەی ئەبو (ذر) ئەگەر پارچە شاڵەكەی خوڵامەكەت و ئەوەی خۆت كۆكردایەتەوە دەبووە قاتێكی تەواو بۆ

خۆت؟ وتی: ئەبو (ذر) وتی: جارێ جنێوێکم دا بە پیاوێ دایکی عەرەب نەبوو توانجم لە دایکی دا، ئەویش چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شکاتی لێ کردم: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو (ذر) تۆ هێشتا رەگی سەردەمی نەفامیت تێدا ماوە). هەروەها فەرمووی: (ئەمانە براتانن خوای گەورە کردوونی بە ژێردەستەی ئێوەو فەزڵی ئێوەی داوە بە سەریاندا، ئەوەی بە کەڵکی ئێوە نایەو ناگونجێ بۆتان بیفرۆشن، سزای دروستکراوانی خوای گەورە مەدەن).

٥١٥٨ - (صحيح) عن المعرور بن سويد قال: دَخَلْنَا عَلَى أَبِي ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ فَإِذَا عَلَيْهِ بُرْدٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ مِثْلُهُ, فَقُلْنَا: يَا أَبَا ذَرٍّ لَوْ أَخَذْتَ بُرْدَ غُلاَمِكَ إِلَى بُرْدِكَ فَكَانَتْ حُلَّةً, وَكَسَوْتَهُ ثَوْبًا غَيْرَهُ؟! قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ, فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدَيْهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ, وَلْيَكْسُهُ مِمَّا يَلْبَسُ, وَلاَ يُكَلِّفْهُ مَا يَغْلِبُهُ, فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ).

واتە: لە مەعروری کوڕی سوەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چووین بۆ خزمەت ئەبو (ذر) لە (ربذة) م دی پارچەیە شاڵی لەبەردا بوو، خولامەکەشی بە هەمان شێوە پارچەیە شاڵی لەبەردا بوو، وتمان: ئەی ئەبو (ذر) ئەگەر پارچە شاڵەکەی خولامەکەت بدایەتە دەمی دەبووە قاتێکی تەواو بۆ خۆت و پۆشاکێکی ترت بکردایە بۆ ئەو؟ ئەبو (ذر) وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەمانە براتانن خوای گەورە کردوونی بە ژێردەستەی ئێوە، جا ئەگەر کەسێ لەئێوە ژێردەستەیەکی هەبوو با لە خواردن و پۆشاکدا خۆی لێ جیا نەکاتەوە ئەوە خۆی دەیخوات لەوەش بەشی ئەو بدات، چ پۆشاکێ لەبەردەکات لەو پۆشاکەش بۆ ئەو بکات، کاری قورس و گرانی پێ نەکات کە لە توانایدا نەبێ، خۆ ئەگەر چاری نەبوو کاری قورسی دا بەسەریدا خۆی یارمەتی بدات).

٥١٥٩ - (صحيح) عن أبو مسعود الأنصاري قال: كُنْتُ أَضْرِبُ غُلاَمًا لِي فَسَمِعْتُ مِنْ خَلْفِي صَوْتًا: (اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ). قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى مَرَّتَيْنِ (لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ). فَالْتَفَتُّ فَإِذَا هُوَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ. قَالَ: (أَمَا إِنَّكَ لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَلَفَعَتْكَ النَّارُ أَوْ (لَمَسَّتْكَ النَّارُ).

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: غولامێکم هەبوو جارێ لیم دا لەدوامەوە دەنگێکم بیست: (بزانە ئەی ئەبا مەسعود، بزانە ئەی ئەبا مەسعود، خوای گەورە زیاتر دەسەڵاتی هەیە بەسەر تۆدا هەتا تۆ بەسەر ئەو غولامەدا). لام کردەوە سەیر دەکەم پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەوا لەبەر رەزامەندی خوای گەورە ئازادم کرد، فەرمووی: (ئەگەر ئازادت نەکردایە ئەوا ئاگری دۆزەخ دایدەپۆشیت و دەیسوتاندی).

٥١٦٠ - (صحيح) عن الأعمش , بإسناده ومعناه, نحوه, قال: كُنْتُ أَضْرِبُ غُلاَمًا لِي أَسْوَدَ بِالسَّوْطِ, وَلَمْ يَذْكُرْ أَمْرَ الْعِتْقِ.

واتە: لە ئەعمەشەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان ماناو شێوە هاتووە، وتی: غولامێکم هەبوو بە قامچی لیم دا، بەڵام باسی ئازاد کردنەکەی نەکرد.

٥١٦١ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ لاَءَمَكُمْ مِنْ مَمْلُوكِيكُمْ فَأَطْعِمُوهُ مِمَّا تَأْكُلُونَ, وَاكْسُوهُ مِمَّا تَكْتَسُونَ, وَمَنْ لَمْ يُلاَئِمْكُمْ مِنْهُمْ فَبِيعُوهُ, وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللَّهِ).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەر ژێردەستەیە بەکەڵکتان هات لە خواردن و پۆشاکدا خۆتانی لێ جیا نەکەنەوە ئەوەی خۆتان دەیخۆن لەوەش بەشی ئەو بدەن، چ پۆشاکێ لەبەردەکەن لەو پۆشاکەش بۆ ئەو بکەن، ئەوەی بە کەڵکی ئێوە نایەو

ناگونجێ بۆتان بیفرۆشن، سزای دروستکراوانی خوای گەورە مەدەن).

٥١٦٢ - (ضعيف) عن رافع بن مكيث - وكان ممن شهد الحديبية مع النبي صلى الله عليه وسلم - أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (حُسْنُ الْمَلَكَةِ نَمَاءٌ - يُمن - , وَسُوءُ الْخُلُقِ شُؤْمٌ).

واتە: لە رافیعی کوڕی (مکیث)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکەکردن لەگەڵ بەندەو کەنیزەك و ژێر دەستە مایەی بەرەکەت و گەشبینیە، بەدرەفتاریش مایەی رەش بینی و نەگبەتیە).

٥١٦٣ - (ضعيف) محمد بن خالد بن رافع بن مكيث عن عمه الحارث بن رافع بن مكيث - وكان رافع من جهينة قد شهد الحديبية مع رسول الله صلى الله عليه وسلم – عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (حُسْنُ الْمَلَكَةِ – يُمن – نَمَاءٌ, وَسُوءُ الْخُلُقِ شُؤْمٌ).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی خالیدی کوڕی رافیعی کوڕی (مکیث)ەوە، لە مامیەوە (حارث)ی کوڕی رافیعی کوڕی (مکیث)ەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکەکردن لەگەڵ بەندەو کەنیزەك و ژێر دەستە مایەی بەرەکەت و گەشبینیە، بەدرەفتاریش مایەی رەش بینی و نەگبەتیە).

٥١٦٤ - (صحيح) عن عبد الله بنت عمرو قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ, كَمْ نَعْفُو عَنِ الْخَادِمِ؟ فَصَمَتَ, ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ الْكَلَامَ, فَصَمَتَ, فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّالِثَةِ قَالَ: (اعْفُوا عَنْهُ فِي كُلِّ يَوْمٍ سَبْعِينَ مَرَّةً).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ

خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رۆژی چەند جار لە خزمەتکار ببورین؟ بێ دەنگ بوو، لەپاشدا قسەکەی لێ دوپات کردەوە، هەر بێ دەنگ بوو، بۆ جاری سێیەم فەرمووی: (هەموو رۆژێ حەفتا جار لێی ببورە).

٥١٦٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: حدثني أبو القاسم نبي التوبة صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ وَهُوَ بَرِيءٌ مِمَّا قَالَ, جُلِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَدًّا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو (القاسم) پێغەمبەری تەوبە صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ بوختان بکات بۆ بەندەی خۆی بەڵام بەندەکە بێ تاوان بێ لەو قسەو بوختانە، ئەوە ئەو کەسە لەرۆژی قیامەتا داری حەدی لێ دەدرێت)

٥١٦٦ - (صحيح) عن هلال بن يساف قال: كُنَّا نُزُولاً فِي دَارِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ, وَفِينَا شَيْخٌ فِيهِ حِدَّةٌ وَمَعَهُ جَارِيَةٌ فَلَطَمَ وَجْهَهَا, فَمَا رَأَيْتُ سُوَيْدًا أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ ذَاكَ الْيَوْمَ, قَالَ: عَجَزَ عَلَيْكَ إِلاَّ حُرُّ وَجْهِهَا؟! لَقَدْ رَأَيْتُنَا سَابِعَ سَبْعَةٍ مِنْ وَلَدِ مُقَرِّنٍ وَمَا لَنَا إِلاَّ خَادِمٌ, فَلَطَمَ أَصْغَرُنَا وَجْهَهَا فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعِتْقِهَا.

واتە: لە هیلالی کوڕی یسافەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە ماڵی سوەیدی کوڕی موقەڕین دابەزین، پیاوێکی بە تەمەن لەوێ ئامادەبوو کەنیزەکێکی لەگەڵ بوو زللەیەکی دا لە ڕوومەتی، هەرگیز نەم دیوە سوەید بەقەد ئەو رۆژە ئەوەندە زۆر توڕە بێ، سوەید وتی: ئەوە نەتزانی لێدان لە کەنیزەك و بەندە کارێکی خراپە چ جای لە روومەتی کە کارێکی زۆر زۆر بەدتر و خراپ ترو نالەبارترە، ئێمە حەوت کوڕی موقەڕین بووین تەنها خزمەتکارێکمان هەبوو خزمەتی دەکردین برا بچوکەکەمان زللەیەکی دا لە روومەتی، پێغەمبەری خوا

صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردین لەسەر ئەو زللە ئازادی بکەین. - ئێمەش ئازادمان کرد -.

٥١٦٧ - (صحيح) عن معاوية بن سويد بن مقرن قال: لَطَمْتُ مَوْلًى لَنَا, فَدَعَاهُ أَبِي وَدَعَانِي فَقَالَ: اقْتَصَّ مِنْهُ, فَإِنَّا مَعْشَرَ بَنِي مُقَرِّنٍ كُنَّا سَبْعَةً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَيْسَ لَنَا إِلاَّ خَادِمٌ, فَلَطَمَهَا رَجُلٌ مِنَّا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْتِقُوهَا). قَالُوا: إِنَّهُ لَيْسَ لَنَا خَادِمٌ غَيْرَهَا. قَالَ: (فَلْتَخْدُمْهُمْ حَتَّى يَسْتَغْنُوا, فَإِذَا اسْتَغْنَوْا فَلْيُعْتِقُوهَا).

واتە: لە موعاویەی کوڕی سوەیدی کوڕی موقەڕینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خزمەتکارێکمان هەبوو زللەیەکم دا لە ڕوومەتی، باوکم ئەویش و منیشی بانگ کرد وتی: ئادەی تۆڵەی خۆتی لێ بکەرەوە، ئێمە کۆمەڵی نەوەی موقەڕین حەوت کوڕ بووین تەنها خزمەتکارێکمان هەبوو خزمەتی دەکردین، یەکێ لە لە ئێمە زللەیەکی دا لە روومەتی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئازادی بکەن). وتیان: جگە لەوە خزمەتکاری ترمان نیە هەتا خزمەتمان بکات، فەرمووی: (دەی با خزمەتتان بکات هەتا پێویستان پێیەتی، کاتێ کە پێویستان پێی نەما ئەوکاتە ئازادی بکەن).

٥١٦٨ - (صحيح) عن راذان قال: أَتَيْتُ ابْنَ عُمَرَ وَقَدْ أَعْتَقَ مَمْلُوكًا لَهُ فَأَخَذَ مِنَ الأَرْضِ عُودًا, أَوْ شَيْئًا, فَقَالَ: مَا لِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَسْوَى هَذَا, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ أَوْ ضَرَبَهُ فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ).

واتە: لە (راذان)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چووم بۆ لای ئیبنو عومەر خزمەتکارێکی هەبوو ئازادی کردبوو دارێك یان شتێکی بە دەستەوە بوو دەیخشاند لەسەر زەوی، وتی: بەقەد ئەم دارە پاداشت لەسەر ئازادکردنی ئەو خزمەتکارە

وەرنا گرم - چونکە لە کەفارەتدا ئازادی کردبوو -، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەس زللەیە بدات لەڕوومەتی خزمەتکاری خۆی یان لێی بدات کەفارەتەکەی بریتیە لەوەی ئازادی بکات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دڵسۆزی بەندە بۆ گەورەکەی

## ١٣٦ - باب مَا جَاءَ فِي الْمَمْلُوكِ إِذَا نَصَحَ.

٥١٦٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا نَصَحَ لِسَيِّدِهِ وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ اللَّهِ فَلَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو بەندەیەی کە دڵسۆز و چاك بێ بۆ گەورەکەی و مافی گەورەکەی جێبەجێ بکات و بەجوانی خوای گەورە بپەرستێ ئەوە دوو چەندان پاداشتی بۆ هەیە).

## باسی ئەوەی بەندەیە هەڵگێڕێتەوە لە گەورەکەی

## ١٣٧ - باب فِيمَنْ خَبَّبَ مَمْلُوكًا عَلَى مَوْلاَهُ.

٥١٧٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ خَبَّبَ زَوْجَةَ امْرِئٍ أَوْ مَمْلُوكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ژنی پیاوێ هەڵخەڵەتێنێ و خراپی بکات

و هەڵگێڕێتەوە لێی، یان بەندەکەی وا لێ بکات ئەوە لەسەر سوننەت و ڕێبازی ئێمە نیە). - ژنەکەی هەڵخەڵەتێنێ تەلاقی لێ وەرگرێ خۆی بیخوازێ یان بۆ یەکێکی تر، یان ژنەکەی یا بەندەو کەنیزەکەی هەڵخەڵەتێنێ و کاری بەدڕەوشتیان لەگەڵ بکات -.

## سەبارەت بە مۆڵەت وەرگرتن

### ١٣٨ - باب في الاِسْتِئْذَانِ.

٥١٧١ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ بَعْضِ حُجَرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَامَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِشْقَصٍ أَوْ مَشَاقِصَ, قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْتِلُهُ لِيَطْعُنَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ بەبێ مۆڵەت سەیری یەکێ لە هۆدەکانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سەرە رمێکەوە بۆی هەستا، وتی: وەك ئەوەی ئێستا چاوم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێ کە چۆن بە ماتە مات بۆی چوو تا لەپڕ بیکات بە چاویدا.

٥١٧٢ - (صحيح) عن أبو هريرة, أنه سمع النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنِ اطَّلَعَ فِي دَارِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَفَقَأُوا عَيْنَهُ فَقَدْ هَدَرَتْ عَيْنُهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (هەرکەس سەیری ماڵی قەومێ یان کەسێ بکات بەبێ مۆڵەتی ئەوان ئەگەر چاویان کوێر کرد هیچ تاوانێکیان لەسەر نیەو بە هەدەر دەڕوات).

٥١٧٣ - (ضعيف) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا دَخَلَ الْبَصَرُ فَلاَ إِذْنَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر سەیری ناو ماڵەکەی کرد ئیتر مۆڵەت وەرگرتن هیچ مانایەکی نیە). - چونکە وەك ئەوە وایە چوبێتە ژوورەوە - .

٥١٧٤ - (صحيح) عن هزيل قال: جَاءَ رَجُلٌ - قَالَ عُثْمَانُ: سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ - فَوَقَفَ عَلَى بَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَأْذِنُ, فَقَامَ عَلَى الْبَابِ - قَالَ عُثْمَانُ: مُسْتَقْبِلَ الْبَابِ - فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَكَذَا عَنْكَ أَوْ هَكَذَا, فَإِنَّمَا الاِسْتِئْذَانُ مِنَ النَّظَرِ).

واتە: لە هوزیلەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات - (عثمان) وتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص - لەبەردەم دەرگای ماڵی پێغەمبەرا صلى الله عليه وسلم راوەستا داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کرد، (عثمان) وتی: روو بەڕووی دەرگاکە راوەساتا، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (یان لەم لای دەرگاکەوە راوەستە یان لەو لایەوە چونکە مۆڵەت وەرگرتن لەبەر چاو دانراوە). - ئەگەر سەیری ناو ماڵەکەی کرد ئیتر مۆڵەت وەرگرتن مانایەکی نیە - .

٥١٧٥ - عَنْ سَعْدٍ, نَحْوَهُ, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

# باسی چۆنیەتی مۆڵەت وەرگرتن

## ١٣٩ - باب كَيْفَ الاِسْتِئْذَانُ.

٥١٧٦ - (صحيح) عن كلدة بن حنبل: أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ بَعَثَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَبَنٍ وَجِدَايَةٍ وَضَغَابِيسَ, وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَعْلَى مَكَّةَ, فَدَخَلْتُ وَلَمْ أُسَلِّمْ, فَقَالَ (ارْجِعْ فَقُلِ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ). وَذَاكَ بَعْدَ مَا أَسْلَمَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ.

واتە: لە کەلەدەی کوڕی حەنبەلەوە دەگێڕنەوە، کە صەفوانی کوڕی ئومەییە هەندێ شیر و گۆشتی بەچکە ئاسك و خەیاری بچوکی پێدا نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش لەوکاتەدا لەسەرووی مەککەوە بوو، چوومە ژوورەوە بۆ لای سڵاوم نەکرد، فەرمووی: (بگەڕێرەوە بڵێ: (سلام علیکم) سڵاوی خواتان لەسەر بێ). ئەمە لەدوای ئەوە روویدا کە صەفوان موسوڵمان بوو.

٥١٧٧ - (صحيح) عن رجل من بني عامر: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي بَيْتٍ, فَقَالَ: أَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِخَادِمِهِ: (اخْرُجْ إِلَى هَذَا فَعَلِّمْهُ الاِسْتِئْذَانَ, فَقُلْ لَهُ: قُلِ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, أَأَدْخُلُ؟). فَسَمِعَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, أَأَدْخُلُ؟ فَأَذِنَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ.

واتە: لە پیاوێکی نەوەی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ماڵەوە بوو، ئەویش چووە خزمەتی و مۆڵەتی وەرگرت و گوتی: ئەرێ بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خزمەتکارەکەی فەرمووی: (بچۆ بەدەم ئەم پیاوەوە فێری مۆڵەت وەرگرتنی بکە، پێی بڵێ:

كە بڵێ: سڵاوی خواتان لێ بێ، ئایا روخسەت هەیە بێمە ژوورەوە؟ پیاوەكە گوێی لێ بوو گوتی: سڵاوی خواتان لێ بێ، روخسەت هەیە بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رێگەی پێداو چووە ژوورەوە.

٥١٧٨ - عن ربعي بن حراش قال: أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِى عَامِرٍ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە ریبعی كوڕی حیراشەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێكی نەوەی عامیر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی كرد، جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە.

٥١٧٩ - عن رجل من بنى عامر: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ. قَالَ: فَسَمِعْتُهُ, فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, أَأَدْخُلُ؟

واتە: لە پیاوێكی نەوەی عامیرەوە دەگێڕنەوە، كە چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی كرد ....، وتی: گوێم لێ بوو وتم: سڵاوی خواتان لێ بێ، روخسەت هەیە بێمە ژوورەوە؟.

## باسی پیاو چەند جار داوای مۆڵەت بکات.

## ١٤٠ - باب كَمْ مَرَّةٍ يُسَلِّمُ الرَّجُلُ فِي الاِسْتِئْذَانِ.

٥١٨٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: كُنْتُ جَالِسًا فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ, فَجَاءَ أَبُو مُوسَى فَزِعًا, فَقُلْنَا لَهُ: مَا أَفْزَعَكَ؟ قَالَ: أَمَرَنِي عُمَرُ أَنْ آتِيَهُ, فَأَتَيْتُهُ, فَاسْتَأْذَنْتُ ثَلاَثًا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي, فَرَجَعْتُ, فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْتِيَنِي؟ قُلْتُ: قَدْ جِئْتُ فَاسْتَأْذَنْتُ ثَلاَثًا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي, وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاَثًا فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فَلْيَرْجِعْ). قَالَ: لَتَأْتِيَنِّي عَلَى هَذَا بِالْبَيِّنَةِ, قَالَ: فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: لاَ يَقُومُ مَعَكَ إِلاَّ أَصْغَرُ الْقَوْمِ. قَالَ: فَقَامَ أَبُو سَعِيدٍ مَعَهُ فَشَهِدَ لَهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە یەکێ لە کۆڕ و دانیشتنەکانی ئەنصاردا دانیشتبووم، ئەبو موسا بە ترس و شڵەژاوی هات بەرەو لامان، پێمان وت: بۆ وا پەشۆکاوی لەچی دەترسی؟ وتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ ناردبووی بە دوامدا فەرمانی پێ کردووم کە بڕۆم بۆ لای، منیش رۆشتم بۆ خزمەتی سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەم کرد، رێگەیان پێ نەدام بڕۆمە ژوورەوە، ئیتر گەڕامەوە، دیسان ناردیەوە بە شوێنمدا کە چووم وتی: چی رێگری لێ کردی پێشتر نەهاتی؟ وتم: هاتم سێ جار داوای مۆڵەتم کرد بەڵام رێگەیان پێ نەدام بۆیە منیش گەڕامەوە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد بەڵام رێگەیان نەدا ئەوە با بگەڕێتەوە). پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: لەسەر ئەم فەرمایشتە بەڵگە بێنە ئەگینا ئازارت دەدەم، راوی وتی: ئەبو سەعید وتی: دەبێ بچوکترین کەسی ئەم کۆڕە شایەتیت بۆ بدات واتە گەورەو بچوکی ئەم کۆڕە شارەزای ئەو فەرموودەن، راوی وتی: جا ئەبو سەعید هەستا لەتەکی رۆشت شایەتی بۆ دا.

٥١٨١ - (حسن الإسناد) عن أبو موسى: أَنَّهُ أَتَى عُمَرَ فَاسْتَأْذَنَ ثَلاَثًا, فَقَالَ: يَسْتَأْذِنُ أَبُو مُوسَى, يَسْتَأْذِنُ الأَشْعَرِيُّ, يَسْتَأْذِنُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ, فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ, فَرَجَعَ, فَبَعَثَ إِلَيْهِ عُمَرُ: مَا رَدَّكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَسْتَأْذِنُ أَحَدُكُمْ ثَلاَثًا, فَإِنْ أُذِنَ لَهُ, وَإِلاَّ فَلْيَرْجِعْ). قَالَ: ائْتِنِي بِبَيِّنَةٍ عَلَى هَذَا. فَذَهَبَ, ثُمَّ رَجَعَ, فَقَالَ: هَذَا أُبَيٌّ, فَقَالَ أُبَيٌّ: يَا عُمَرُ لاَ تَكُنْ عَذَابًا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ عُمَرُ: لاَ أَكُونُ عَذَابًا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە ڕۆشتوە بۆ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد، وتی: ئەبو موسا داوای هاتنەژوورەوە دەکات، ئەشعەری داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە دەکات، (عبد الله) ی کوڕی قەیس داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە دەکات، بەڵام ڕێگەیان پێ نەدا، ئەویش گەڕایەوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ ناردی بە دوایدا، کە هات وتی: وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد بەڵام ڕێگەیان نەدا ئەوە با بگەڕێتەوە). پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: لەسەر ئەم فەرمایشتە بەڵگە بێنە ئەگینا ئازارت دەدەم، ئەیش ڕۆشت و گەڕایەوە، وتی: ئەوە ئوبەی شایەتە، ئوبەی وتی: ئەی عومەر مەبە بەهۆی سزاو ئازار بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: باشە هەرگیز نابم بەهۆی سزاو ئازار بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

٥١٨٢ - (صحيح) عن عبيد بن عمير: أَنَّ أَبَا مُوسَى اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ, بِهَذِهِ الْقِصَّةِ. قَالَ فِيهِ: فَانْطَلَقَ بِأَبِي سَعِيدٍ, فَشَهِدَ لَهُ, فَقَالَ: أَخَفِيَ عَلَيَّ هَذَا مِنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلْهَانِي السَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ, وَلَكِنْ سَلِّمْ مَا شِئْتَ وَلاَ تَسْتَأْذِنْ.

واتە: لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو موسا داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد لە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، جا ڕاوی بە هەمان مانا فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە. لە فەرموودەکەیدا وتی: ئەبو سەعیدی لەگەڵ خۆی برد شایەتی بۆ دا، پێشەوا عومەر وتی: ئەو فەرموودەم لەکیس چووە کە فەرمانی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم بەهۆی سەرقاڵی بازرگانی و مامەڵەی بازاڕەوە، بەڵام ئەگەر ویستت سڵاو بکەو داوای مۆڵەت مەکەو وەرە بۆ لام.

٥١٨٣ - (صحيح الإسناد) عن أبو موسى, بِهَذِهِ الْقِصَّةِ, قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ لأَبِي مُوسَى: إِنِّي لَمْ أَتَّهِمْكَ, وَلَكِنَّ الْحَدِيثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَدِيدٌ.

واتە: لە ئەبو موسا - ی ئەشعەریە -وە دەگێڕنەوە، جا ڕاوی بە هەمان مانا بەسەرهاتی پێشووی گێڕایەوە. ڕاوی وتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بە ئەبو موسای فەرموو من تۆ تاوانبار ناکەم و گومانت لێ ناکەم لەبارەی ئەم فەرموودەوە، بەڵام حەز دەکەم بسەلمێ و فەرموودە گێڕانەوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم قورسە هەروا ئاسان نیە.

٥١٨٤ - (صحيح الإسناد) عن ربيعة بن عبد الرحمن, عن غير واحد من علمائهم في هذا, فَقَالَ عُمَرُ لأَبِي مُوسَى: أَمَا إِنِّي لَمْ أَتَّهِمْكَ وَلَكِنْ خَشِيتُ أَنْ يَتَقَوَّلَ النَّاسُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە، لە جگە لەیەکێ لە زاناکانیانەوە فەرموودەی پێشوو هاتووە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بە ئەبو موسای وت: من تۆ تاوانبار ناکەم و گومانت لێ ناکەم لەبارەی ئەم فەرموودەوە، بەڵام دەترسم خەڵك بەناوی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم درۆ بکەن.

٥١٨٥ - (ضعيف الإسناد) عن قيس بن سعد قال: زَارَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَنْزِلِنَا فَقَالَ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). فَرَدَّ سَعْدٌ رَدًّا خَفِيًّا. قَالَ قَيْسٌ: فَقُلْتُ: أَلاَ تَأْذَنُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: ذَرْهُ يُكْثِرْ عَلَيْنَا مِنَ السَّلاَمِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). فَرَدَّ سَعْدٌ رَدًّا خَفِيًّا, ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). ثُمَّ رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَاتَّبَعَهُ سَعْدٌ, فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي كُنْتُ أَسْمَعُ تَسْلِيمَكَ وَأَرُدُّ عَلَيْكَ رَدًّا خَفِيًّا لِتُكْثِرَ عَلَيْنَا مِنَ السَّلاَمِ. قَالَ: فَانْصَرَفَ مَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَمَرَ لَهُ سَعْدٌ بِغِسْلٍ, فَاغْتَسَلَ, ثُمَّ نَاوَلَهُ مِلْحَفَةً مَصْبُوغَةً بِزَعْفَرَانٍ أَوْ وَرْسٍ فَاشْتَمَلَ بِهَا, ثُمَّ رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ اجْعَلْ صَلَوَاتِكَ وَرَحْمَتَكَ عَلَى آلِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ). قَالَ: ثُمَّ أَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الطَّعَامِ فَلَمَّا أَرَادَ الانْصِرَافَ قَرَّبَ لَهُ سَعْدٌ حِمَارًا قَدْ وَطَّأَ عَلَيْهِ بِقَطِيفَةٍ فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ سَعْدٌ: يَا قَيْسُ اصْحَبْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ قَيْسٌ: فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ارْكَبْ). فَأَبَيْتُ, ثُمَّ قَالَ: (إِمَّا أَنْ تَرْكَبَ وَإِمَّا أَنْ تَنْصَرِفَ). قَالَ: فَانْصَرَفْتُ.

واتە: لە قەیسی کوڕی سەعدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەردانی کردین هات بۆ ماڵمان فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). راوی وتی: سەعد ئەوەندە بە هێواشی وەڵامی دایەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گوێی لێی نەبوو، قەیس وتی: وتم: ئایا مۆڵەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نادەی بێتەژوورەوە! وتی: وازی لێ بێنە با سڵاوی زۆرمان لێ بکات خێری زیاترمان بگات، بۆ دووەم جار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). سەعد ئەوەندە بە هێواشی وەڵامی دایەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گوێی لێی نەبوو، لەپاشدا بۆ سێیەم جار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). ئینجا گەڕایەوە، سەعد بە پەلە شوێنی

کەوت وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سڵاوەکانتم گوێ لێ بوو بەڵام من بە هێواشی وەڵامم دایتەوە بۆ ئەوەی سڵاوی زۆرمان لێ بکەیت و خێری زیاترمان بگات، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەڕایەوە لەتەکی رۆشت بۆماڵیان، سەعد داوای لێ کرد خۆی بشوات، ئەویش خۆی شت، پۆشاکێکی نەرمی بە زەعفەران یان وەرس رەنگ کراوی دایە بۆ ئەوەی بیپێچێ بە خۆیەوە، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دەیفەرموو: (خودایە سەڵاوات و رەحمەت و خێر و بەرەکەت بڕژێنە بەسەر خانەوادەو کەسوکاری سەعدی کوڕی عوبادەدا). راوی وتی: لەپاشدا نانی بۆ هێناو نانی خوارد، کاتێ کە ویستی تەشریف بەرێت و بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی سەعد گوێدرێژێکی لێ نزیك کردەوەو قەیفەیەکی خستە سەر پشتی بۆ لائەوەی نەرم بێت بۆ سواری، جا وتی قوربان سواربە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سواری گوێدرێژەکە بوو، سەعد وتی: ئەی قەیس، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رەوانە بکە و هاوڕێی بە، قەیس وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (تۆش سواربە لەگەڵم). منیش سوار نەبووم وەك رێزێ بۆی، لەپاشدا فەرمووی: (یان سواربە یا بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە). قەیس وتی: منیش رۆشتمەوە بۆ ماڵەوە.

٥١٨٦ - (صحيح) عن عبد الله بن بسر قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَى بَابَ قَوْمٍ لَمْ يَسْتَقْبِلِ الْبَابَ مِنْ تِلْقَاءِ وَجْهِهِ, وَلَكِنْ مِنْ رُكْنِهِ الأَيْمَنِ أَوِ الأَيْسَرِ, وَيَقُولُ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمُ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ). وَذَلِكَ أَنَّ الدُّورَ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا يَوْمَئِذٍ سُتُورٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بوسرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچوو بۆ ماڵێ روو بەڕووی دەرگاکەیان رانەدەوەستا بەڵکو لە سوچی لای راست یان لای چەپی دەرگاکەوە رادەوەستا، جا دەیفەرموو: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمُ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ). ئەو کاتە دەرگای ماڵەکان پەردەیان نەبووە.

## باسی مۆڵەت وەرگرتن بە دان لەدەرگا.

## ١٤١ - باب الرَّجُلِ يَسْتَأْذِنُ بِالدَّقِّ.

٥١٨٧ - (صحيح) عن جابر: أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دَيْنِ أَبِيهِ, فَدَقَقْتُ الْبَابَ, فَقَالَ: (مَنْ هَذَا؟). قُلْتُ: أَنَا. قَالَ: (أَنَا أَنَا). كَأَنَّهُ كَرِهَهُ.

واتە: لە جابیرەوە دەگێرنەوە، کە رۆشتوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ قەرزێکی باوکی، جابیر وتی: دام لەدەرگا، فەرمووی: (ئەوە کێ یە؟) وتم: منم، فەرمووی: (منم منم) وەك بڵێی پێی ناخۆش بێت - دەبێ بوترێت من فلان کەسم -.

## باسی دان لەدەرگا لەکاتی مۆڵەت وەرگرتن دا.

## ١٤٢ - باب دق الباب عند الإستئذان.

٥١٨٨ - (حسن الإسناد) عن نافع بن عبد الحارث قال: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى دَخَلْتُ حَائِطًا, فَقَالَ لِي: (أَمْسِكِ الْبَابَ). فَضُرِبَ الْبَابُ, فَقُلْتُ: (مَنْ هَذَا).

واتە: لە نافیعی کوڕی (عبد الحارث)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەرچووین هەتا چووینە ناو باخێکەوە، پێی فەرمووم: (دەرگای باخەکە دابخە لەناوەوە). لە دەرگاکە درا، وتم: (ئەوە کێ یە؟).

## ئەگەر کەسێ بانگ بکرێت، ئایا ئەوە دەبێتە مۆڵەت بۆی.

## ١٤٣ - باب فِي الرَّجُلِ يُدْعَى؛ أَيَكُونُ ذَلِكَ إِذْنَهُ.

٥١٨٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (رَسُولُ الرَّجُلِ إِلَى الرَّجُلِ إِذْنُهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ فروستادەیە بنێرێ بەشوێن کەسێکدا بانگی بکات بۆ لای، کە هات داوای مۆڵەت وەرگرتنی ناوێ).

٥١٩٠ - (صحيح بما قبله) عن أبو هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ, فَجَاءَ مَعَ الرَّسُولِ فَإِنَّ ذَلِكَ لَهُ إِذْنٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە بانگ کرا بۆ دەعوەتی نان خواردن، لەگەڵ فروستادەکەدا هات ئەوە مۆڵەت وەرگرتنی ناوێ).

## باسی مۆڵەت وەرگرتن کە سێ کاتە.

## ١٤٤ - باب الاِسْتِئْذَانِ فِي الْعَوْرَاتِ الثَّلاَثِ.

٥١٩١ - (صحيح الإسناد موقوف) عن ابن عباس قال: لَمْ يُؤْمَرْ بِهَا أَكْثَرُ النَّاسِ آيَةُ الإِذْنِ, وَإِنِّى لآمُرُ جَارِيَتِى هَذِهِ تَسْتَأْذِنُ عَلَىَّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئایەتی داوای ڕێگەپێدان زۆر کەس جێبەجێی ناکەن، بەڵام من فەرمانم کردووە بە کەنیزەکەم کاتێ هات بۆ لام لەو سێ کاتەدا داوای مۆڵەت بکات. - سێ کاتەکەش وەك لە ئایەتی: (٥٨)ی سورەتی (النور)دا هاتووە فەرموودەی دواتر باسی دەکات -.

٥١٩٢ - (حسن الإسناد موقوف) عن عكرمة: أَنَّ نَفَرًا مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ قَالُوا: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ كَيْفَ تَرَى فِي هَذِهِ الآيَةِ الَّتِى أُمِرْنَا فِيهَا بِمَا أُمِرْنَا وَلاَ يَعْمَلُ بِهَا أَحَدٌ؟ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ مِنْ قَبْلِ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلاَةِ الْعِشَاءِ ثَلاَثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلاَ عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ) قَرَأَ الْقَعْنَبِيُّ إِلَى (عَلِيمٌ حَكِيمٌ) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ اللَّهَ حَلِيمٌ رَحِيمٌ بِالْمُؤْمِنِينَ يُحِبُّ السَّتْرَ, وَكَانَ النَّاسُ لَيْسَ لِبُيُوتِهِمْ سُتُورٌ وَلاَ حِجَالٌ, فَرُبَّمَا دَخَلَ الْخَادِمُ أَوِ الْوَلَدُ أَوْ يَتِيمَةُ الرَّجُلِ وَالرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ, فَأَمَرَهُمُ اللَّهُ بِالاِسْتِئْذَانِ فِي تِلْكَ الْعَوْرَاتِ, فَجَاءَهُمُ اللَّهُ بِالسُّتُورِ وَالْخَيْرِ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا يَعْمَلُ بِذَلِكَ بَعْدُ.

واتە: لە عیکریمەوە دەگێڕنەوە، کە چەند کەسێ لە خەڵکی عێراق وتیان: ئەی ئیبنو عەباس رات چی یە بەرامبەر بە ئایەتە کە فەرمانمان پێ دەکات فەرمان بکەین بە بەندەو کەنیزەکانمان دوای مۆڵەت بکەن بۆ هاتنە لامان لەم سێ کاتانەدا بەڵام هیچ کەسێ لەئێمە جێبەجێی ناکات؟ فەرمایشتی خوای گەورە:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ سورة النور: ٥٨.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! با ئەو خزمەتکارو منداڵانەتان کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵغ بوون لە سێ کاتدا مۆڵەت بخوزان لە چوونە ژووری تایبەتی نوستنی دایك و باوك: پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ لەبەر گەرماو بۆ حەوانەوە پۆشاك دادەنێن، لە دوای نوێژی خەوتنان، ئەم سێ کاتە عەورەتن بۆ ئێوە، لە دوای ئەو سێ کاتە ئیتر تاوان لەسەر ئێوەو ئەوان نیەبگەڕێن بەسەر یەکترداو بچن بۆلای یەکتر، ئا بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ روون دەکاتەوە، خوای گەورە زاناو دانایە.

ئیبنو عەباس وتی: خوای گەورە هێدی و ئارام و بەخشندەو بە بەزەییە بەرامبەر بە باوەڕداران پەردەپۆشی و خۆداپۆشینی خۆش دەوێ، ئەوکاتە خەڵکەکە ماڵەکانیان بێ پەردە بوو جاری وا دەبوو پیاو لەگەڵ هاوسەری خۆی جووت دەبوو خزمەتکار و بەندە یان ئەو هەتیوانەی کە بەخێویان دەکردن لەوکاتانەدا خۆیان دەکرد بە ژووردا، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێ کردن مۆڵەت وەرگرن، بەڵام دوای ئەوەی کە خوای گەورە خێر و بەرەکەتی رژاند بەسەر موسوڵماناندا دەوڵەمەند بوون و دەرگاو پەنجەرەیان کرد بۆ ماڵەکانیان و پەردەیان دادەدایەوە ئیتر نەم دەبینی هیچ کەسێ ئەوە جێبەجێ بکات چونکە پێویستی بە مۆڵەت وەرگرتن نەدەکرد.

## سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی سڵاو.

## ١٤٥ - باب فِي إِفْشَاءِ السَّلاَمِ.

٥١٩٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا, وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا, أَفَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) کە نەفسی منی بە دەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ نیشان بدەم ئەگەر جێبەجێتان کرد یەکترتان خۆش بوێت؟ سڵاو لەناو خۆتاندا بڵاو بکەنەوە).

٥١٩٤ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: (تُطْعِمُ الطَّعَامَ, وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی: کام ئیسلام خێر و چاکە؟ فەرمووی: (خواردن ببەخشەو، سڵاو بکە لەو کەسەی کە دەیناسی وە لەو کەسەش کە نایناسی).

## باسی سڵاوکردن چۆنە؟

## ١٤٦ - باب كَيْفَ السَّلاَمُ؟

٥١٩٥ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ, ثُمَّ جَلَسَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَشْرٌ). ثُمَّ جَاءَ آخَرُ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَرَدَّ عَلَيْهِ, فَجَلَسَ, فَقَالَ: (عِشْرُونَ). ثُمَّ جَاءَ آخَرُ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ. فَرَدَّ عَلَيْهِ, فَجَلَسَ, فَقَالَ (ثَلاَثُونَ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم، وتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ)، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەڵامی دایەوەو، دانیشت، فەرمووی: (دە چاکە)، یەکێکی تر هات و وتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) وەڵامی دایەوەو، دانیشت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بیست چاکە)، یەکێکی تر هات و وتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، وەڵامی دایەوەو، دانیشت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سی چاکە).

٥١٩٦ - (ضعيف الإسناد) عن سهل بن معاذ بن أنس, عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِمَعْنَاهُ, زَادَ: ثُمَّ أَتَى آخَرُ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ وَمَغْفِرَتُهُ فَقَالَ: (أَرْبَعُونَ). قَالَ: (هَكَذَا تَكُونُ الْفَضَائِلُ).

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ی کوڕی ئەنەسەوە، لە وباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم، جا راوی فەرموودەی پێشووی بە هەمان مان گێڕایەوە، ئەمەی بۆ زیاد کرد: یەکێکی تر هات و وتی:

(السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ وَمَغْفِرَتُهُ)، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چل چاکە). فەرمووی: (بەم شێوەیە بەپێی سڵاوەکە پاداشت زیاد دەکات).

## سەبارەت بە فەزڵی ئەوانەی لەپێشەوە سڵاو دەکەن.

## ١٤٧ - باب فِي فضل من بدأ بالسلام

| ٥١٩٧ - (صحيح) عن أبو أمامة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللَّهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلاَمِ). |
|---|

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەپێشترینی کەسانێك لەلای خوای گەورە ئەوانەن کە لە پێشدِا سڵاوتان لێ دەکەن).

## سەبارەت بە کێ لەپێشترە سڵاوی لێ بکرێت.

## ١٤٨ - باب مَنْ أَوْلَى بِالسَّلاَمِ

| ٥١٩٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ, وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ, وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با بچوك سڵاو بکات لە گەورە، ئەوەی کە تێ دەپەڕێ سڵاو بکات لەوەی دانیشتووە، کەم سڵاو بکات لە زۆر).

٥١٩٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با سوار سڵاو بکات لە پیادە).

## ئەگەر کەسێ لە کەسێ جیابوویەوە لەپاشدا پێی گەیشتەوە ئایا سڵاوی لێ بکات؟

## ١٤٩ - باب فِي الرَّجُلِ يُفَارِقُ الرَّجُلَ ثُمَّ يَلْقَاهُ, أَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ؟

٥٢٠٠ - (صحيح موقوفا مرفوعا) عن أبو هريرة قال: إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أَوْ جِدَارٌ أَوْ حَجَرٌ, ثُمَّ لَقِيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ أَيْضًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر کەسێ لە ئێوە گەیشت بە برا موسوڵمانەکەی با سڵاوی لێ بکات، ئەگەر درەختێ یان دیوارێ یان بەردێکی گەورە کەوتە نێوانیانەوەو لێکی جودا کردنەوە، لەپاشدا گەیشتەوە پێی با دیسانەوە سڵاوی لێ بکاتەوە.

٥٢٠١ - (صحيح) عن عمر: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ, فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَيَدْخُلُ عُمَرُ؟.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە چووە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، لەوکاتەدا ئەویش لەژوورێکی بەرزی خۆیدا بووە، پێشەوا عومەر وتویەتی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ). ئایا ڕوخسەت هەیە عومەر بێتەژوورەوە؟

## سەبارەت بە سڵاوکردن لە منداڵان.

## ١٥٠ - باب فِي السَّلاَمِ عَلَى الصِّبْيَانِ.

٥٢٠٢ - (صحيح) عن أنس قال: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى غِلْمَانٍ يَلْعَبُونَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلای منداڵاندا تێ دەپەڕی سڵاوی لێ دەکردن.

٥٢٠٣ - (صحيح) عن أنس قال: انْتَهَى إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا غُلاَمٌ فِي الْغِلْمَانِ, فَسَلَّمَ عَلَيْنَا, ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي فَأَرْسَلَنِي بِرِسَالَةٍ, وَقَعَدَ فِي ظِلِّ جِدَارٍ - أَوْ قَالَ إِلَى جِدَارٍ - حَتَّى رَجَعْتُ إِلَيْهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: مناڵ بووم لەناو منداڵاندا یاریم دەکرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلاماندا سڵاوی لێ کردین، لەپاشدا دەستی گرتم و نامەیەکی پێدا ناردم، خۆشی لەسێبەری دیوارێکدا - یان لەبن دیوارێکدا - دانیشت هەتا گەڕامەوە بۆ لای.

## سەبارەت بە سڵاوکردن لە ئافرەتان.

## ١٥١ - بباب فِي السَّلاَمِ عَلَى النِّسَاءِ.

٥٢٠٤ - (صحيح) عن أسماء بنت يزيد قال: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نِسْوَةٍ فَسَلَّمَ عَلَيْنَا.

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێ ژندا بووم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەلاماندا تێ پەڕی سڵاوی لێ کردین.

## سەبارەت بە سڵاوکردن لە خاوەن نامەکان.

## ١٥٢ - باب فِي السَّلاَمِ عَلَى أَهْلِ الذِّمَّةِ.

٥٢٠٥ - (صحيح) عن سهيل بن أبو صالح قال: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي إِلَى الشَّامِ, فَجَعَلُوا يَمُرُّونَ بِصَوَامِعَ فِيهَا نَصَارَى فَيُسَلِّمُونَ عَلَيْهِمْ, فَقَالَ أَبِي: لاَ تَبْدَءُوهُمْ بِالسَّلاَمِ فَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (لاَ تَبْدَءُوهُمْ بِالسَّلاَمِ, وَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فِي الطَّرِيقِ فَاضْطَرُّوهُمْ إِلَى أَضْيَقِ الطَّرِيقِ).

واتە: لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵحەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ باوکم دەرچووین بۆ وڵاتی شام، عەوامی گاورەکان بەلای شوێنی خوا پەرستی گاورەکاندا تێ دەپەڕین گاوری تێدا بوو سڵاویان لێ دەکردن، باوکم وتی: ئێوە لەپێشەوە سڵاو مەکەن لە گاور و جولەکە، چونکە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم بۆی گێڕاینەوە، کە فەرموویەتی: (ئێوە لەپێشەوە

سڵاویان لێ مەکەن، ئەگەر لەڕێگادا پێیان گەیشتن ناچاریان بکەن با تەنگترین ڕێگەوە بڕۆن).

٥٢٠٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الْيَهُودَ إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدُهُمْ فَإِنَّمَا يَقُولُ: السَّامُ عَلَيْكُمْ, فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جولەکەکان ئەگەر کەسێکیان سڵاوتان لێ بکەن دەڵێن: (خوا بتانکوژێت) ئێوەش بڵێن: (وە ئێوەش)

٥٢٠٧ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالُوا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ يُسَلِّمُونَ عَلَيْنَا فَكَيْفَ نَرُدُّ عَلَيْهِمْ؟ قَالَ: (قُولُوا: وَعَلَيْكُمْ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە هاوەڵان بە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم وت: خاوەن نامەکان سڵاومان لێ دەکەن چۆن وەڵامیان بدەینەوە؟ فەرمووی: (بڵێن: وە ئێوەش).

## سڵاوی کەسێ ئەگەر ویستی لە نێو کۆڕێکدا هەستێ بڕوات

### ١٥٣ - باب فِي السَّلاَمِ إِذَا قَامَ مِنَ الْمَجْلِسِ.

٥٢٠٨ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَجْلِسِ فَلْيُسَلِّمْ, فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ, فَلَيْسَتِ الأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الآخِرَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان گەیشتە نێو کۆڕ و کۆمەڵێك با سڵاو بکات، کاتێ ویستی هەستێ و بڕوات با سڵاو بکات، چونکە سڵاوی یەکەم لەدووەم باشتر نیە).

## باسی وتنی: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ) کراهەتی هەیە.

### ١٥٤ - باب كَرَاهِيَةِ أَنْ يَقُولَ عَلَيْكَ السَّلاَمُ.

٥٢٠٩ - (صحيح) عن أبو جري الهجيمي قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: (لاَ تَقُلْ عَلَيْكَ السَّلاَمُ, فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَوْتَى).

واتە: لە ئەبو جورەیی هوجەیمیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتم: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ). فەرمووی: (مەڵێ: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ) چونکە ئەوە سڵاوی مردوانە). - بەڵکو بڵێن: (السَّلاَمُ عَلَيكُمْ).-

## ئەوەی هاتووە دەربارەی
## یەکێ لەجیاتی کۆمەڵێ وەڵام بداتەوە

## ١٥٥ - باب مَا جَاءَ فِي رَدِّ الْوَاحِدِ عَنِ الْجَمَاعَةِ.

| ٥٢١٠ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: (يُجْزِئُ عَنِ الْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ, وَيُجْزِئُ عَنِ الْجُلُوسِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ). |
| --- |

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کۆمەڵێ کە تێپەڕدەبن بەسە یەکێکیان سڵاو بکات، هەروەها دانیشتوانیش یەکێکیان وەڵام بداتەوە بەسە).

## سەبارەت بە تەوقەکردن.

## ١٥٦ - باب فِي الْمُصَافَحَةِ.

| ٥٢١١ - (ضعيف) عن البراء بن عازب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ فَتَصَافَحَا وَحَمِدَا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَاسْتَغْفَرَاهُ غُفِرَ لَهُمَا). |
| --- |

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دوو موسڵمان بەیەك گەیشتن و دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوەو سوپاسی خوایان کردو داوای لێ خۆشبوونیان کرد ئەوە خوای گەورە لە هەردووکیان خۆشدەبێ).

٥٢١٢ - صحيح) عن البراء قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا).

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر دوو موسڵمانێ کاتێ بەیەك گەیشتن تەوقەیان لەگەڵ یەك کرد پێش ئەوەی جیاببنەوە خوا لێیان خۆش دەبێت).

٥٢١٣ - (صحيح إلا أن قوله: وهم أول ... مدرج فيه من قول أنس) عن أنس بن مالك قال: لَمَّا جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ جَاءَكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ وَهُمْ أَوَّلُ مَنْ جَاءَ بِالْمُصَافَحَةِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ خەڵکی یەمەن هاتن بۆ مەدینە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خەڵکی یەمەن هاتوون بۆ لاتان ئەوان یەکەم کەسن کە تەوقەکردنیان داهێناوە).

## سەبارەت بە باوەش پیاکردن

## ١٥٧ - باب فِي الْمُعَانَقَةِ.

٥٢١٤ - (ضعيف) عن أيوب بن بشير بن كعب العدوي عن رجل من عنزة أنه قال لأبي ذر حيث سير من الشام: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ حَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: إِذًا أُخْبِرَكَ بِهِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ سِرًّا, قُلْتُ: إِنَّهُ لَيْسَ بِسِرٍّ, هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَافِحُكُمْ إِذَا لَقِيتُمُوهُ؟ قَالَ: مَا لَقِيتُهُ قَطُّ إِلاَّ صَافَحَنِي, وَبَعَثَ إِلَيَّ ذَاتَ يَوْمٍ وَلَمْ أَكُنْ فِي أَهْلِي, فَلَمَّا جِئْتُ أُخْبِرْتُ أَنَّهُ أَرْسَلَ إِلَيَّ, فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ عَلَى سَرِيرِهِ, فَالْتَزَمَنِي, فَكَانَتْ تِلْكَ أَجْوَدَ وَأَجْوَدَ.

واتە: لە ئەیوبی کوڕی بوشەیری عەدەویەوە، لە پیاوێکی هۆزی عەنەزەوە دەگێڕنەوە، کە کاتێ ئەبو (ذر) لەشام دەرچوو پێی وت: دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم لەبارەی یەکێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، وتی: بۆت باس دەکەم و پێت رادەگەیەنم بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ نهێنی بێ، وتم: ئەوە نهێنی نیە، ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بگەیشتایە پێتان تەوقەی لەگەڵ دەکردن؟ وتی: هەرگیز پێی نەگەیشتووم تەوقەی لەگەڵ نەکردبم هەر کاتێ پێی گەیشتبم ئیللا تەوقەی لەگەڵ کردووم، رۆژێ ناردی بە شوێنمدا لەماڵەوە نەبووم، کاتێ کە هاتمەوە هەواڵەکەیان پێ راگەیاندم یەکسەر چووم بۆ خزمەتی لەسەر چەرپایە یان لەسەر شوێنی خەوتنەکەی بوو، گوشیمی بەخۆیەوە، ئەو باوەش پێدا کردنە چاکترین و باشترین بوو.

## سەبارەت بە هەستان لەبەر خەڵك.

## ١٥٨ - باب مَا جَاءَ فِي الْقِيَامِ.

٥٢١٥ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ أَهْلَ قُرَيْظَةَ لَمَّا نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدٍ أَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَاءَ عَلَى حِمَارٍ أَقْمَرَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ). أَوْ (إِلَى خَيْرِكُمْ). فَجَاءَ حَتَّى قَعَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە جولەکەکانی (قُرَيْظَةَ) لەسەر حوکم و بڕیاری سەعد دابەزین و لە قەڵاکانیان هاتنەخوارەوە، بێگومان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەعدی ناردبوو بۆ لایان، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناردی بەشوێن سەعدا، سەعد بەسواری گوێدرێژێکی سپیەوە هات، فەرمووی: (هەستن لەبەر گەورەکەتان). یان (خێر و چاکترین کەستان). جا سەعد هات هەتا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشت.

٥٢١٦ - (صحيح) عن شعبة, بهذا الحديث قال: فَلَمَّا كَانَ قَرِيبًا مِنَ الْمَسْجِدِ قَالَ لِلأَنْصَارِ: (قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ).

واتە: لە شوعبەوە فەرموودەی پێشوو هاتووە، وتی: کاتێ کە سەعد نزیکی مزگەوت بوویەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە ئەنصارەکانی فەرموو: (هەستن لەبەر گەورەکەتان).

٥٢١٧ - (صحيح) عن أم المؤمنين عائشة رضي الله عنها قالت: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَشْبَهَ سَمْتًا وَهَدْيًا وَدَلاً - وَقَالَ الْحَسَنُ: حَدِيثًا وَكَلاَمًا, وَلَمْ يَذْكُرِ الْحَسَنُ السَّمْتَ وَالْهَدْيَ وَالدَّلَّ -, بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ فَاطِمَةَ كَرَّمَ اللَّهُ وَجْهَهَا, كَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَيْهِ قَامَ إِلَيْهَا فَأَخَذَ بِيَدِهَا وَقَبَّلَهَا وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ, وَكَانَ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا قَامَتْ إِلَيْهِ فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ فَقَبَّلَتْهُ وَأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِهَا.

واتە: لە دایکی باوەڕدارانەوە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هیچ کەسێکم نەدیوە هێندەی (فاطمة) ڕەزای خوای لێ بێ لە هەڵسوکەوت و شێوە و ڕەفتاریدا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بچێ، کاتێ کە (فاطمة) دەچووە خزمەتی لەبەری هەڵەساو دەستی دەگرت و نێوچاوانی ماچ دەکردو لە کۆڕ و دانیشتنی خۆیدا دایدەنیشاند.

## دەربارەی ماچ كردنی منداڵ لەلایەن باك و دایكەوە

## ١٥٩ - باب فِي قُبْلَةِ الرَّجُلِ وَلَدَهُ.

٥٢١٨ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ أَبْصَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُقَبِّلُ حُسَيْنًا فَقَالَ: إِنَّ لِي عَشْرَةً مِنَ الْوَلَدِ مَا فَعَلْتُ هَذَا بِوَاحِدٍ مِنْهُمْ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ئەقرەعی كوڕی حابس پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دی حوسەینی ماچ دەكرد، وتی: من دە منداڵم هەیە هێشتا هیچ كامیانم ماچ نەكردووە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەی رەحم نەكات رەحمی پێ ناكرێت). - واتە: ئەوكەسەی رەحم و بەزەیی نەبێ بەرامبەر بە خەڵك و گیانەوەران خوای گەورەش رەحم بەو ناكات - .

٥٢١٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: ثُمَّ قَالَ تَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَنْزَلَ عُذْرَكِ). وَقَرَأَ عَلَيْهَا الْقُرْآنَ, فَقَالَ أَبَوَايَ: قُومِي فَقَبِّلِي رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: أَحْمَدُ اللَّهَ لاَ إِيَّاكُمَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عائیشە موژدەت لێ بێ خوای گەورە ئایەتی پاكێتی و بەریبوونی تۆی دابەزاند). دایك و باوكم وتیان: هەستە سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماچ بكە، وتی: من سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەكەم.

## دەربارەی ماچ کردنی نێوچاوان

## ١٦٠ - بباب فِي قُبْلَةِ مَا بَيْنَ الْعَيْنَيْنِ.

٥٢٢٠ - إسناد جيد مرسل, وهو صحيح بشواهده) عن الشعبى, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَلَقَّى جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَالْتَزَمَهُ وَقَبَّلَ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ.

واتە: لە شەعبیەوە دەگێرنەوە، کە جارێ جەعفەری کوڕی (أبو طالب) لەسەفەرێ گەڕایەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێشوازی لێ کردوو باوەشی پێدا کردوو نێوچاوانی ماچ کرد.

## دەربارەی روومەت ماچ کردن.

## ١٦١ - باب فِي قُبْلَةِ الْخَدِّ.

٥٢٢١ – (صحيح الإسناد مقطوع ) عن إياس بن دغفل قال: رَأَيْتُ أَبَا نَضْرَةَ قَبَّلَ خَدَّ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ عَلَيْهِمَا السَّلَامُ.

واتە: لە ئیاسی کوڕی دەغفەلەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو (نَضْرَةَ)م دی روومەتی حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ ماچ کرد.

٥٢٢٢ – (صحيح) عن البراء قال: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ أَوَّلَ مَا قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَإِذَا عَائِشَةُ ابْنَتُهُ مُضْطَجِعَةٌ قَدْ أَصَابَتْهَا حُمَّى, فَأَتَاهَا أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ لَهَا: كَيْفَ أَنْتِ يَا بُنَيَّةُ؟ وَقَبَّلَ خَدَّهَا.

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: یەکەم گەیشتنی پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بۆ مەدینە منیش لەگەڵ ئەو بووم، عائیشە تای لێ هات بوو ڕاکشابوو، جا پێشەوا ئەبو بەکر چوو بۆ لای و پێی وت: کچی خۆم تۆ باشی؟ بەزەیی پیا هاتەوەو ڕوومەتی ماچ کرد.

## دەربارەی دەست ماچ کردن

## ١٦٢ - باب فِي قُبْلَةِ الْيَدِ.

٥٢٢٣ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر, وَذَكَرَ قِصَّةً, قَالَ: فَدَنَوْنَا - يَعْنِي مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - , فَقَبَّلْنَا يَدَهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە دەگێرنەوە، جا راوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، وتی: نزیك بووینەوە لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و دەستمان ماچ کرد.

## دەربارەی ماچ کردنی جەستە

## ١٦٣ - باب فِي قُبْلَةِ الْجَسَدِ.

٥٢٢٤ - (صحيح الإسناد) عن أسيد بن حضير - رجل من الأنصار - قال: بَيْنَمَا هُوَ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ - وَكَانَ فِيهِ مِزَاحٌ - بَيْنَا يُضْحِكُهُمْ, فَطَعَنَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَاصِرَتِهِ بِعُودٍ, فَقَالَ: أَصْبِرْنِي. فَقَالَ: (اصْطَبِرْ). قَالَ: إِنَّ عَلَيْكَ قَمِيصًا وَلَيْسَ عَلَيَّ قَمِيصٌ. فَرَفَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَمِيصِهِ, فَاحْتَضَنَهُ وَجَعَلَ يُقَبِّلُ كَشْحَهُ, قَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ.

واتە: لە ئوسەیدی کوڕی (حضیر)ەوە - پیاوێ بوو لە ئەنصار - دەگێڕنەوە، وتی: کە وتویەتی: جارێ قسەی بۆ کۆمەڵێ خەڵك دەکرد - گاڵتەو گەپی تێدا بوو - ئەوانیش بە قسەکانی پێ دەکەنین، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە گاڵتەوە دارێکی دا لە کەلەکەی، ئوسەید وتی: (دەبێ تۆڵەت لێ بکەمەوە)، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی ئامادەم تۆڵەم لێ بکەرەوە)، فەرمووی: (دەی تۆڵەی خۆت بکەرەوە)، ئوسەید وتی: تۆ پۆشاکت لەبەردایە دەبێ سکت رووت بکەی ئەوکاتە تۆڵەت لێ دەکەمەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پۆشاکەکەی بەرزکردەوە، ئوسەید باوەشی پێدا کردوو سەرووی کەلەکەی ماچ کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من ئەمەم دەویست نەك تۆڵەکردنەوە.

## دەربارەی قاچ ماچکردن

## ١٦٥ - باب قُبْلَةِ الرِّجْلِ.

٥٢٢٥ - (حسن دون ذكر الرجلين) عن زارع - وكان في وفد عبد القيس -قال: لَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَجَعَلْنَا نَتَبَادَرُ مِنْ رَوَاحِلِنَا, فَنُقَبِّلُ يَدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَرِجْلَهُ)

واتە: لە (زارع)ەوە - کە یەکێ بووە لە نوێنەرانی (عبد القیس) - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە گەیشتینە شاری مەدینە بە پەلە لە وڵاخەکانمان دابەزین دەستی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم ماچ کرد لەگەڵ هەردوو قاچی.

(صحيح) قَالَ: وَانْتَظَرَ الْمُنْذِرُ الأَشَجُّ حَتَّى أَتَى عَيْبَتَهُ فَلَبِسَ ثَوْبَيْهِ, ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ: (إِنَّ فِيكَ خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَنَا أَتَخَلَّقُ بِهِمَا أَمِ اللَّهُ جَبَلَنِى عَلَيْهِمَا؟ قَالَ: (بَلِ اللَّهُ جَبَلَكَ عَلَيْهِمَا). قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى جَبَلَنِى عَلَى خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ.

(زارع) وتی: (مُنْذِرُ)ی ئەشەج چوو بەلای بوخچەکەیەوە خۆی گۆڕی و دەستێ جلی جوانی لەبەرکرد، لەپاشدا هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بەڕاستی دوو رەوشتی جوان لەتۆدا هەن خوای گەورە خۆشی دەوێن کە بریتین لە هێمنی و لەسەرخۆیی). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من خۆم خووم پێوە گرتوون یان خوا کردن و خوای گەورە پێی داوم؟ فەرمووی: بەڵکو خوا کردن و خوای گەورە پێی داوی، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دوو رەوشتی وای پێ داوم خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن.

## سەبارەت بە کەسێ بڵێ: خوا بمکا بە قوربانت.

## ١٦٥ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ: جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ!

٥٢٢٦ - (حسن صحيح) عن أبي ذر قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (يَا أَبَا ذَرٍّ). فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَنَا فِدَاؤُكَ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو (ذر)، وتم: وەڵامی دوای وەڵامم هەیە لە گوێڕایەڵیتدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وە شوێنکەوتەی دوای شوێنکەوتەم بۆ دینەکەت وە من بە قوربانت بم.

## سەبارەت بە کەسێ بڵێ: (أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا).

## ١٦٦ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ: أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا.

٥٢٢٧ - (ضعيف الإسناد) عن عمران بن حصين قال: كُنَّا نَقُولُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا, وَأَنْعِمْ صَبَاحًا, فَلَمَّا كَانَ الإِسْلاَمُ نُهِينَا عَنْ ذَلِكَ. قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: قَالَ مَعْمَرٌ: يُكْرَهُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ: أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا, وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَقُولَ: أَنْعَمَ اللَّهُ عَيْنَكَ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامی دا دەمانوت: (أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا, وَأَنْعِمْ صَبَاحًا) واتە:. بەڵام کاتێ کە ئیسلام هات رێگری ئەوەی لێ کردین - و گۆڕی بۆمان بە: (السلام عليكم) - . (عبد الرزاق) وتی: مەعمەر وتی: باش نیە کەسێ بڵێ: (أَنْعَمَ اللَّهُ بِكَ عَيْنًا)، بەڵام هیچی تێدا نیە بڵێ: (أَنْعَمَ اللَّهُ عَيْنَكَ).

## سەبارەت بە کەسێ بە کەسێ بڵێ: خوا بتپارێزێ.

## ١٦٧ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لِلرَّجُلِ حَفِظَكَ اللَّهُ.

٥٢٢٨ - (صحيح) عن أبو قتادة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي سَفَرٍ لَهُ فَعَطِشُوا, فَانْطَلَقَ سَرَعَانُ النَّاسِ, فَلَزِمْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ فَقَالَ: (حَفِظَكَ اللَّهُ, بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّهُ).

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە

سەفەرێکیدا تینوی بوو، خەڵکەکە بە پەلە دەرچوون بۆ ئەوەی کۆماڵی ئاوی بۆ بکەن و ئاوی بۆ بهێنن، منیش ئەو شەوە لە خزمەتیدا مامەوە پاسەوانیم کرد، فەرمووی: (خوای پەروەردگار بتپارێزێ وەك چۆن تۆ پێغەمبەرەکەیت پاراست).

## سەبارەت بە کەسێ لەبەر کەسێ هەستێ.

## ١٦٨ - باب فِي قِيَامِ الرَّجُلِ لِلرَّجُلِ.

٥٢٢٩ - (صحيح) عن أبو مجلز قال: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ وَابْنِ عَامِرٍ فَقَامَ ابْنُ عَامِرٍ وَجَلَسَ ابْنُ الزُّبَيْرِ, فَقَالَ مُعَاوِيَةُ لِابْنِ عَامِرٍ: اجْلِسْ, فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ الرِّجَالُ, قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئەبو میجلیزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: موعاویە دەرچوو بۆ لای ئیبنو زوبێر و ئیبنو عامیر، ئیبنو عامیر هەستاو ئیبنو زوبێر دانیشت، موعاویە بە ئیبنو عامیری وت: دانیشە، چونکە من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەموو: (هەرکەسێ حەز بکات خەڵك لەبەری هەستن ئەوە با جێگەیە لە ئاگری دۆزەخدا بۆ خۆی دابنێ).

٥٢٣٠ - (ضعيف) عن أبو أمامة قال: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَوَكِّئًا عَلَى عَصًا, فَقُمْنَا إِلَيْهِ, فَقَالَ: (لاَ تَقُومُوا كَمَا تَقُومُ الأَعَاجِمُ, يُعَظِّمُ بَعْضُهَا بَعْضًا).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو هاتەدەر بۆ لامان خۆی دا بەسەر داردەستەکەیدا، ئێمەش

هەستاین لەبەری: فەرمووی: (هەڵمەسن وەك چۆن عەجەمەكان هەڵەسان، هەندێكیان هەندێكیانیان بە گەورە دادەناو لەبەریان هەڵەسان).

## دەربارەی کەسێ بە کەسێ بڵێ: فلان سەلامی لێ دەکردی.

## ١٦٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ فُلاَنٌ يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ.

٥٢٣١ - (حسن) عن غالب قال: إِنَّا لَجُلُوسٌ بِبَابِ الْحَسَنِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: حَدَّثَنِى أَبِي عَنْ جَدِّى قَالَ: بَعَثَنِى أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: ائْتِهِ فَأَقْرِئْهُ السَّلاَمَ. قَالَ: فَأَتَيْتُهُ, فَقُلْتُ: إِنَّ أَبِي يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ. فَقَالَ: (عَلَيْكَ وَعَلَى أَبِيكَ السَّلاَمُ).

واتە: لە غالیبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەبەر دەرگای حەسەندا دانیشتبووم پیاوێ هات وتی: باوکم لە باپیرمەوە بۆی گێڕامەوە، وتی: باوکم ناردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: برۆ بۆ خزمەتی سڵاوی منی پێ رابگەیەنە، منیش چووم بۆ خزمەتی، وتم: باوکم سڵاوی لێ دەکردی، ئەویش فەرمووی: (سڵاوی خوا لە خۆت و باوکت).

٥٢٣٢ - (صحيح) عن أبو سلمة, أن عائشة رضي الله عنها حدثته: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال لها: (إِنَّ جِبْرِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ). فَقَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ بۆی باس کردووە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (جبریل سڵاوی لێ دەکردی). عائیشەش وتی: سڵاو و رەحمەتی خوا لە جبریل.

## دەربارەی کەسێ کەسێ بانگ بکات ئەویش بڵێ: (لَبَّيْكَ).

## ١٧٠ - باب فِي الرَّجُلِ يُنَادِي الرَّجُلَ فَيَقُولُ لَبَّيْكَ.

٥٢٣٣ - (حسن) عن أبو عبد الرحمن الفهري قال: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُنَيْنًا, فَسِرْنَا فِي يَوْمٍ قَائِظٍ شَدِيدِ الْحَرِّ, فَنَزَلْنَا تَحْتَ ظِلِّ الشَّجَرَةِ, فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ لَبِسْتُ لأْمَتِي وَرَكِبْتُ فَرَسِي, فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي فُسْطَاطِهِ فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ قَدْ حَانَ الرَّوَاحُ, فَقَالَ: (أَجَلْ). ثُمَّ قَالَ: (يَا بِلاَلُ قُمْ). فَثَارَ مِنْ تَحْتِ سَمُرَةٍ كَأَنَّ ظِلَّهُ ظِلُّ طَائِرٍ فَقَالَ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَأَنَا فِدَاؤُكَ. فَقَالَ: (أَسْرِجْ لِي الْفَرَسَ). فَأَخْرَجَ سَرْجًا دَفَّتَاهُ مِنْ لِيفٍ, لَيْسَ فِيهِ أَشَرٌ وَلاَ بَطَرٌ , فَرَكِبَ وَرَكِبْنَا.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی فیهریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم بەشداری جەنگی حونەینم کرد، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا دەرچووین، لەژێر سێبەری درەختێکدا دابەزین، لەکۆتایی ڕۆژدا زریێ پۆشەکەم پۆشی و سواری ئەسپەکەم بووم، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە خێمەکەی خۆیدا بوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێ، ئێستا کاتی ڕۆشتنە، فەرمووی: (بەڵێ). لەپاشدا فەرمووی: (ئەی بیلال هەستە). بیلال لەژێی سێبەری درەختێکدا بوو سێبەرەکەی بە قەد سێبەری باڵندەیەك دەبوو ئەوەندە کەم بوو بە پەلە هەستا، وتی: وەڵامی دوای وەڵامم هەیە لە گوێڕایەڵیتدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وە بە قوربانیشت بم،

فەرمووی: (ئەسپەکەم بۆ زین بکەو ئامادەی بکە)، بیلال هەستا بۆی زین کرد ئەملاو لای زینی ئەسپەکەی لە ریشاڵی دار خورما بوو، زێدەڕوی نەبوو لە نیعمەتدا وە بۆ فیز و خۆ بەزلزانین نەبوو بەڵکو بۆ ئەوەی نەرم بێ بۆ سواری. جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سواری ئەسپەکەی بوو ئێمەش سواری وڵاخەکانی خۆمان بووین.

## دەربارەی کەسێ بە کەسێ بڵێ:
## خوا خۆشی و شادیت بەردەوام بکات.

## ١٧١ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لِلرَّجُلِ: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ.

٥٢٣٤ - (ضعيف) عن ابن كنانة بن عباس بن مرداس, عن أبيه, عن جده قال: ضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ, أَوْ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ.

واتە: لە ئیبنو کینانەی کوڕی عەباسی کوڕی میرداسەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێکەنی، پێشەوا ئەبو بەکر یان پێشەوا عومەر پێی وت: خوای گەورە خۆشی و شادیت بەردەوام بکات.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دروستکردنی خانووبەرە.

## ١٧٢ - باب مَا جَاءَ فِي الْبِنَاءِ.

٥٢٣٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أُطَيِّنُ حَائِطًا لِي أَنَا وَأُمِّي, فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا عَبْدَ اللَّهِ؟). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَيْءٌ أُصْلِحُهُ, فَقَالَ: (الأَمْرُ أَسْرَعُ مِنْ ذَاكَ!).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دیواری خانوەکەمان خراپ بوو بوو دیوارەکە خەلەلی هەبوو من و دایکم بە قوڕ چاکمان دەکردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلاماندا تێپەڕی، فەرمووی: (ئەوە چ دەکەی ئەی (عبد الله)؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم دیوارە چاك دەکەین بە قوڕ، فەرمووی: (مردن زۆر نزیکترە لە خراپ و بوون و رووخانی ئەو دیوارە کە تۆ دەترسی بڕووخێ ئەگەر چاکی نەکەیتەوە).

٥٢٣٦ - (صحيح) عن الأعمش, بإسناده بهذا, قال: مَرَّ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نُعَالِجُ خُصًّا لَنَا وَهَى, فَقَالَ: (مَا هَذَا؟). فَقُلْنَا: خُصٌّ لَنَا وَهَى فَنَحْنُ نُصْلِحُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَرَى الأَمْرَ إِلاَّ أَعْجَلَ مِنْ ذَلِكَ).

واتە: لە ئەعمەشەوە فەرمووودەی پێشوو هاتووە، وتی: خانویەکمان هەبوو بە قامیش و تەختە دروستکرا بوو ئێمەش چاکمان دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلاماندا تێپەڕی، فەرمووی: (ئەوە چ دەکەی ئەی (عبد الله)؟) وتمان: چاکی دەکەین، فەرمووی: (پێم وایە مردن زۆر لەوە نزیکترە).

٥٢٣٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ فَرَأَى قُبَّةً مُشْرِفَةً, فَقَالَ: (مَا هَذِهِ؟). قَالَ لَهُ أَصْحَابُهُ: هَذِهِ لِفُلاَنٍ, رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ, قَالَ: فَسَكَتَ وَحَمَلَهَا فِي نَفْسِهِ, حَتَّى إِذَا جَاءَ صَاحِبُهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ فِي النَّاسِ أَعْرَضَ عَنْهُ, صَنَعَ ذَلِكَ مِرَارًا, حَتَّى عَرَفَ الرَّجُلُ الْغَضَبَ فِيهِ وَالإِعْرَاضَ عَنْهُ, فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى أَصْحَابِهِ, فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُنْكِرُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالُوا: خَرَجَ فَرَأَى قُبَّتَكَ. قَالَ: فَرَجَعَ الرَّجُلُ إِلَى قُبَّتِهِ فَهَدَمَهَا حَتَّى سَوَّاهَا بِالأَرْضِ, فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ يَرَهَا, قَالَ: (مَا فَعَلَتِ الْقُبَّةُ؟). قَالُوا: شَكَا إِلَيْنَا صَاحِبُهَا إِعْرَاضَكَ عَنْهُ, فَأَخْبَرْنَاهُ, فَهَدَمَهَا, فَقَالَ: (أَمَا إِنَّ كُلَّ بِنَاءٍ وَبَالٌ عَلَى صَاحِبِهِ إِلاَّ مَا لاَ, إِلاَّ مَا لاَ). يَعْنِي مَا لاَ بُدَّ مِنْهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گومەزێکی بەرزی بینی، وەك ئەوەی ئینکاری کارەکە بکات فەرمووی: (ئەمە چییە؟). هاوەڵانی وتیان: ئەوە خانووی فلان کەسە، کە پیاوێکی ئەنصاری بوو، راوی وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو توڕەییەکەی دەرنەبڕی، هەتا کاتێ خاوەنەکەی هات لەناو خەڵکدا سڵاوی لێ کرد پشتی تێ کرد، چەند جارێ دووپاتی کردەوە، هەتا تێگەیشت کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لێی تووڕەیە بۆیە پشتی تێ دەکات، جا لەلای هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سکاڵای کرد وتی: سوێند بە (الله) دەبینم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێم تووڕەیە بەڵام نازانم هۆکارەکەی چیە! وتیان گومەزە بەرزەکەتی بینیوە، راوی وتی: بە پەلە گەڕایەوە گومەزەکەی رووخان هەتا تەختی زەوی کرد، رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە گومەزەکەی نەبینی، فەرمووی: (ئەوە گومەزەکە چی لێ هات بۆ شوێنەواری دیار نەماوە؟). وتیان: خاوەنەکەی سکاڵای پشت تێ کردنی تۆی لەلا کردین ئێمەش وتمان: بەهۆی ئەو گومەزەوەیە، ئەویش چوو روخاندی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەموو خانوویە ئۆباڵی لە ئەستۆی خاوەنەکەیەتی و زیانی هەیە بۆ خاوەنەکەی مەگەر ئەوەی پێویست بێ بۆی، مەگەر ئەوەی پێویست بێ بۆی).

## دەربارەی دروستکردنی ژوور لەقاتی سەرەوە.

## ١٧٣ - باب فِي اتِّخَاذِ الْغُرَفِ.

٥٢٣٨ - (صحيح الإسناد) عن دكين بن سعيد المزني قال: أَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْنَاهُ الطَّعَامَ, فَقَالَ: (يَا عُمَرُ اذْهَبْ فَأَعْطِهِمْ). فَارْتَقَى بِنَا إِلَى عِلِّيَّةٍ فَأَخَذَ الْمِفْتَاحَ مِنْ حُجْزَتِهِ فَفَتَحَ.

واتە: لە دوكەینی كوڕی سەعیدی موزەنیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: رۆشتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای خواردنمان لێ كرد، فەرمووی: (ئەی عومەر برۆ خواردنیان بدەرێ). ئەویش هاتەدەرەوەو بردینی بۆ لای ژوورێكی بەرز و كلیلەكەی لە پشتێنەی دەرهێناو كردیەوە.

## دەربارەی بڕینی درەختی سیدر

## ١٧٤ - باب فِي قَطْعِ السِّدْرِ.

٥٢٣٩ - (صحيح) عن عبد الله بن حبشي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً صَوَّبَ اللَّهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ). سُئِلَ أَبُو دَاوُدَ عَنْ مَعْنَى هَذَا الْحَدِيثِ فَقَالَ: هَذَا الْحَدِيثُ مُخْتَصَرٌ, يَعْنِي مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً فِي فَلَاةٍ يَسْتَظِلُّ بِهَا ابْنُ السَّبِيلِ وَالْبَهَائِمُ عَبَثًا وَظُلْمًا بِغَيْرِ حَقٍّ يَكُونُ لَهُ فِيهَا صَوَّبَ اللَّهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی حوبەشیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری

خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ دار مۆردێ ببڕێ خوای گەورە سەری شۆڕ دەکات لەناو ئاگردا). دەربارەی مانای ئەم فەرمووده پرسیار کراوە لە ئەبو داود، ئەویش وتی: ئەم فەرموودە کورتەیەکە: واتە: هەرکەسێ دار مۆردێ بە تاهەق ببڕێ لە چۆڵەوانیەکدا کە سێبەری هەبێ بۆ رێبوار و ئاژەڵان ئەوە خوای گەورە سەری شۆڕ دەکات لەناو ئاگردا.

٥٢٤٠ - عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ, يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, نَحْوَهُ.

٥٢٤١ - (ضعيف) عن حسان بن ابراهيم قال: سَأَلْتُ هِشَامَ بْنَ عُرْوَةَ عَنْ قَطْعِ السِّدْرِ وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَى قَصْرِ عُرْوَةَ, فَقَالَ: أَتَرَى هَذِهِ الأَبْوَابَ وَالْمَصَارِيعَ؟ إِنَّمَا هِيَ مِنْ سِدْرِ عُرْوَةَ, كَانَ عُرْوَةُ يَقْطَعُهُ مِنْ أَرْضِهِ, وَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ. زَادَ حُمَيْدٌ فَقَالَ: هِيَ يَا عِرَاقِيُّ جِئْتَنِي بِبِدْعَةٍ, قَالَ: قُلْتُ: إِنَّمَا الْبِدْعَةُ مِنْ قِبَلِكُمْ, سَمِعْتُ مَنْ يَقُولُ بِمَكَّةَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ قَطَعَ السِّدْرَ.

واتە: لە حەسانی کوڕی ئیبراهیمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی بڕینی داری مۆرد پرسیارم کرد لە هیشامی کوڕی عوروە کە پاڵی دابوو بە کۆشکەکەی عوروەوە کە دەرگاکانی لەداری مۆرد بوو، وتی: ئەو دەرگانە نابینی لەگەڵ لاشیپانەکەنیان؟ ئەوانە هەموویان مۆردی عوروەن، عوروە لە زەویەکەی خۆیدا بڕیونی و کردوونی بە دەرگا، وتی: ئەوە هیچی تێدا نیە، حومەید ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: ئەوە ئەی عێراقی بیدعەت بۆ هێناوم، وتی: وتم: بیدعە لەلایەن ئێوەوەیە، بۆ خۆم گوێم لێ بوو کەسێ لە مەککە — نەك لە عێراق - دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردووە لەو کەسەی داری مۆرد دەبڕێ.

## دەربارەی لابردنی ئازاریَ لەسەرە رێیەکدا.

## ١٧٥ - باب فِي إِمَاطَةِ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ.

٥٢٤٢ - (صحيح) عن بريدة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (فِي الإِنْسَانِ ثَلاَثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ مَفْصِلاً فَعَلَيْهِ أَنْ يَتَصَدَّقَ عَنْ كُلِّ مَفْصِلٍ مِنْهُ بِصَدَقَةٍ). قَالُوا: وَمَنْ يُطِيقُ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: (النُّخَاعَةُ فِي الْمَسْجِدِ تَدْفِنُهَا وَالشَّيْءُ تُنَحِّيهِ عَنِ الطَّرِيقِ فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فَرَكْعَتَا الضُّحَى تُجْزِئُكَ).

واتە: لە بورەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئادەمیزاد خاوەنی سیَ سەدو شەست جومگەیە بۆ هەموو جومگەیە لەسەریەتی چاکەیە بکات). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کیَ دەتوانیَ ئەو کارە بکات؟ فەرمووی: (تف و چڵم و بەڵغەمیَ لە مزگەوت بیشارێتەوە یان لای بات یان ئازاریَ لەسەرە رێگایەکدا لابەریَ، خۆ ئەگەر ئەمانەشی دەست نەکەوت ئەنجامدانی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بە قەد ئەمانە هەموویان خێری هەیە).

٥٢٤٣ - (صحيح) عن أبي ذر: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنِ ابْنِ آدَمَ صَدَقَةٌ, تَسْلِيمُهُ عَلَى مَنْ لَقِيَ صَدَقَةٌ, وَأَمْرُهُ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ, وَنَهْيُهُ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ, وَإِمَاطَتُهُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ, وَبُضْعَتُهُ أَهْلَهُ صَدَقَةٌ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, يَأْتِي شَهْوَتَهُ وَتَكُونُ لَهُ صَدَقَةٌ؟ قَالَ: (أَرَأَيْتَ لَوْ وَضَعَهَا فِي غَيْرِ حَقِّهَا أَكَانَ يَأْثَمُ؟). قَالَ: (وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ رَكْعَتَانِ مِنَ الضُّحَى).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

فەرموویەتی: (هەموو ڕۆژێك گشت جومگە و ئێسكێكی ئادەمیزاد خێرێكی دەكەوێتە سەر: گەیشت بە هەر موسوڵمانێ سەلامی لێ بكات خێرێكە، فەرمان بەچاكە خێرێكە، قەدەغەكردنی خراپە خێرێكە، شتێ ببێ بەهۆی ئازار لەڕێگەی خەڵكدا لایبات خێرێكە، بچێتە لای خێزانی خۆی خێرێكە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، یەكێ لە ئێمە كە دەچێتە لای خێزانی ئارەزووی خۆی جێ بەجێ دەكات بە خێر و چاكە بۆی دەنوسرێت؟ فەرمووی: (ئەی ئەگەر لە غەیری جێگەی خۆیدا واتە لە جێگەی حەرامدا جێ بەجێی بكات ئایا گوناهبار نابێت؟) - بێگومان پێی گوناهبار دەبێت، كەواتە بەو شێوەیە ئەگەر لە حەڵاڵدا جێبەجێی بكات بە خێر و چاكە بۆی دەنوسرێت - . فەرمووی: (ئەنجامدانی دوو ركات نوێژی چێشتەنگاو بە قەد ئەمانە هەموویان خێری هەیە).

- ئەم فەرموودە پێشتر بە ژمارە: (١١٨٥) هاتووە -.

٥٢٤٤ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ, بِهَذَا الْحَدِيثِ, وَذَكَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي وَسْطِهِ.

٥٢٤٥ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنه قال: (نَزَعَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ غُصْنَ شَوْكٍ عَنِ الطَّرِيقِ إِمَّا كَانَ فِي شَجَرَةٍ فَقَطَعَهُ فَأَلْقَاهُ, وَإِمَّا كَانَ مَوْضُوعًا فَأَمَاطَهُ, فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ بِهَا فَأَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاوێ لەتەمەنی دا هیچ چاكەیەكی نەكردبوو جارێ درەختێكی دڕكاوی لەسەر ڕێگایەكدا لابرد ئیتر درەختەكەی بڕی و لایبرد یان لقێكی درەختەكە ئازاری خەڵكی دەدا بڕی و لایبرد یا هەر لەسەر ڕێگاكەدا بوو لای برد، خوای گەورە بەهۆی ئەو كارەوە لەو پیاوە خۆش بوو خستیە بەهەشتەوە).

## دەربارەی کوژاندنەوەی ئاگر لەشەودا.

## ١٧٦ - بباب فِي إِطْفَاءِ النَّارِ بِاللَّيْلِ.

٥٢٤٦ - (صحيح) عن سالم عن أبيه, عن النبي صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ).

واتە: لە سالیمەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە دەخەون ئاگری ناو ماڵەکانتان بکوژێننەوە).

٥٢٤٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَاءَتْ فَأْرَةٌ فَأَخَذَتْ تَجُرُّ الْفَتِيلَةَ فَجَاءَتْ بِهَا فَأَلْقَتْهَا بَيْنَ يَدَىْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْخُمْرَةِ الَّتِى كَانَ قَاعِدًا عَلَيْهَا, فَأَحْرَقَتْ مِنْهَا مِثْلَ مَوْضِعِ الدِّرْهَمِ, فَقَالَ: (إِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوا سُرُجَكُمْ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدُلُّ مِثْلَ هَذِهِ عَلَى هَذَا فَتَحْرِقَكُمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: مشکێ فتیلەیەکی ڕاکێشا هێنای هەتا لەبەردمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم داینا لەسەر ئەو ڕاخەرەی کە لەسەری دانیشتبوو، ئەوەندەی جێگەی درهەمێکی لێ سوتاند، فەرمووی: (کاتێ کە دەخەون چراکانتان بکوژێننەوە چونکە شەیتان ڕێ بە وێنەی ئەمە نیشان دەدات کەل و پەل و ماڵەکانتان بسوتێنێ).

## دەربارەی کوشتنی مارەکان.

## ١٧٧ - باب فِي قَتْلِ الْحَيَّاتِ.

٥٢٤٨ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا سَالَمْنَاهُنَّ مُنْذُ حَارَبْنَاهُنَّ, وَمَنْ تَرَكَ شَيْئًا مِنْهُنَّ خِيفَةً فَلَيْسَ مِنَّا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەوەتی دوژمنایەتی کەوتۆتە نێوانمانەوە - واتە لەگەڵ مارەکان - هەتا ئێستا رێك نەکەوتوین و ئاشت نەبووینەتەوە، هەرکەس بیانبینێ و پەلاماری کوشتنیان نەدات لەترسان ئەوە لەسەر سوننەت و رێبازی ئێمە نیە).

٥٢٤٩ - (صحيح) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ كُلَّهُنَّ فَمَنْ خَافَ ثَأْرَهُنَّ فَلَيْسَ مِنِّى).

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو مارێ بکوژن ئەو کەسەی بترسێ لەوەی تۆڵەی لێ بکەنەوەو نەیانکوژێت ئەوە لەسەر سوننەت و رێبازی ئێمە نیە).

٥٢٥٠ – (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَرَكَ الْحَيَّاتِ مَخَافَةَ طَلَبِهِنَّ فَلَيْسَ مِنَّا, مَا سَالَمْنَاهُنَّ مُنْذُ حَارَبْنَاهُنَّ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس تەرکی کوشتنی مارەکان بکات لەترسی ئەوەی نەوەکا تۆڵەی لێ بکەنەوە ئەوە لەسەر سوننەت

و ڕێبازی ئێمە نیە، لەوەتی دوژمنایەتی کەوتۆتە نێوانمانەوە هەتا ئێستا ڕێك نەکەوتوین و ئاشت نەبووینەتەوە).

٥٢٥١ - (صحيح) عن العباس بن عبد المطلب: أنه قال لرسول الله صلى الله عليه و سلم: نُرِيدُ أَنْ نَكْنِسَ زَمْزَمَ, وَإِنَّ فِيهَا مِنْ هَذِهِ الْجِنَّانِ - يَعْنِى الْحَيَّاتِ الصِّغَارَ -! فَأَمَرَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِهِنَّ.

واتە: لە عەباسی کوڕی (عبد المطلب)ەوە دەگێرنەوە، کە بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم وتوە: دەمانەوێ بیری زەمزەم پاك بکەینەوە بەڵام ئەم مارە بچوکانەی تێدایە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە کوشتنیان.

٥٢٥٢ - (صحيح) عن سالم عن أبيه: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ, وَذَا الطُّفْيَتَيْنِ, وَالأَبْتَرَ, فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ الْبَصَرَ, وَيُسْقِطَانِ الْحَبَلَ). قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقْتُلُ كُلَّ حَيَّةٍ وَجَدَهَا فَأَبْصَرَهُ أَبُو لُبَابَةَ أَوْ زَيْدُ بْنُ الْخَطَّابِ وَهُوَ يُطَارِدُ حَيَّةً, فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نُهِىَ عَنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو مارێ بکوژن بە تایبەتی ئەو مارانەی کە دوو هێڵی ڕەش وەك هێڵی پەلکە خورما وا بە سەر پشتیاوەو ماری ئەبتەریش، چونکە ئەو دووانە ئاوی چاو دەبەن و، سك لەباری ژن دەبەن). ڕاوی وتی: (عبد الله) خۆی ڕێی لەهەر مارێ بکەوتایە دەیکوشت، جارێ ئەبو لوبابە یان زەیدی کوڕی (خطاب) بینی مارێکی ڕاودەنا وتی: مەیکوژە چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردووە لە کوشتنی ماری ناو ماڵەکان.

٥٢٥٣ - (صحيح) عن أبو لبابة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ الَّتِى تَكُونُ فِى الْبُيُوتِ, إِلاَّ أَنْ يَكُونَ ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ, فَإِنَّهُمَا يَخْطِفَانِ الْبَصَرَ وَيَطْرَحَانِ مَا فِى بُطُونِ النِّسَاءِ.

واتە: لە ئەبو لوبابەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردووە لە کوشتنی ماری ناو ماڵەکان، مەگەر ئەو مارانەی کە دوو هێڵی ڕەش وەك هێڵی پەلکە خورما وا بە سەر پشتیاوە و ماری ئەبتەریش، چونکە ئەو دووانە ئاوی چاو دەبەن و، سك لەباری ژنان دەبەن.

٥٢٥٤ - (صحيح الإسناد) عن نافع: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ وَجَدَ بَعْدَ ذَلِكَ - يَعْنِي بَعْدَ مَا حَدَّثَهُ أَبُو لُبَابَةَ - حَيَّةً فِي دَارِهِ, فَأَمَرَ بِهَا فَأُخْرِجَتْ, يَعْنِي إِلَى الْبَقِيعِ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عومەر لەدوای ئەوەی ئەبو لوبابە ئەو فەرمایشتەی بۆ گێڕایەوە دەبارەی ماری ماڵەکان کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردووە لە کوشتنیان، مارێ لەناو ماڵەکەیاندا هەبوو فەرمانی پێ کرد دەرچوو، واتە بەرەو بەقیع.

٥٢٥٥ - (حسن الإسناد) عن نافع في هذا الحديث, قال نافع: ثُمَّ رَأَيْتُهَا بَعْدُ فِي بَيْتِهِ.

واتە: لە نافیعەوە فەرموودەی پێشوو هاتووە، نافیع وتی: لەپاشدا مارەکەم بینی لە ماڵەکەیدا.

٥٢٥٦ - (ضعيف) عن محمد بن أبو يحى: أَنَّهُ انْطَلَقَ هُوَ وَصَاحِبٌ لَهُ إِلَى أَبِي سَعِيدٍ يَعُودَانِهِ, فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ فَلَقِينَا صَاحِبًا لَنَا وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهِ, فَأَقْبَلْنَا نَحْنُ فَجَلَسْنَا فِي الْمَسْجِدِ, فَجَاءَ فَأَخْبَرَنَا أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْهَوَامَّ مِنَ الْجِنِّ, فَمَنْ رَأَى فِي بَيْتِهِ شَيْئًا فَلْيُحَرِّجْ عَلَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَإِنْ عَادَ فَلْيَقْتُلْهُ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو یەحیاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم بۆی

گێڕامەوە، کە خۆی و هاوڕێیەکی رۆشتوون بۆ سەردانی ئەبو سەعید، کاتێ کە هاتنەدەرەوە لەلای گەیشتین بە هاوڕێیەکی ترمان ئەویش دەیویست بچێتە ژوورەوە بۆ سەردانی ئەبو سەعید، بەرەو مزگەوت رۆشتین و لەمزگەوت پێکەوە دانیشتین، هاوڕێکەی ترمان هات هەواڵی داینێ کە بۆ خۆی لە ئەبو سەعیدی خودری بیستوە دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو جرِ و جانەوەرانەی لەناو ماڵەکاندان لە جنۆکەن، هەرکەس شتێ لەو جۆرەی بینی لە ماڵەکەیدا با هەتا سێ جار ئازاری بدات و دەری بکات پێی بڵێ ئەگەر نەڕۆی ئەتکوژم ئەگەر نەڕۆشت ئەوە با بیکوژێت چونکە ئەوە شەیتانێکە لە شەیاتینەکانی جنۆکە).

٥٢٥٧ - (حسن صحيح) عن أبو سائب قال: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ, فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَهُ سَمِعْتُ تَحْتَ سَرِيرِهِ تَحْرِيكَ شَيْءٍ, فَنَظَرْتُ فَإِذَا حَيَّةٌ, فَقُمْتُ, فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: مَا لَكَ؟ فَقُلْتُ: حَيَّةٌ هَا هُنَا. قَالَ: فَتُرِيدُ مَاذَا؟ قُلْتُ: أَقْتُلُهَا. فَأَشَارَ إِلَى بَيْتٍ فِي دَارِهِ تِلْقَاءَ بَيْتِهِ, فَقَالَ: إِنَّ ابْنَ عَمٍّ لِي كَانَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الأَحْزَابِ اسْتَأْذَنَ إِلَى أَهْلِهِ وَكَانَ حَدِيثَ عَهْدٍ بِعُرْسٍ فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَمَرَهُ أَنْ يَذْهَبَ بِسِلاَحِهِ فَأَتَى دَارَهُ فَوَجَدَ امْرَأَتَهُ قَائِمَةً عَلَى بَابِ الْبَيْتِ, فَأَشَارَ إِلَيْهَا بِالرُّمْحِ فَقَالَتْ لاَ تَعْجَلْ حَتَّى تَنْظُرَ مَا أَخْرَجَنِي. فَدَخَلَ الْبَيْتَ فَإِذَا حَيَّةٌ مُنْكَرَةٌ فَطَعَنَهَا بِالرُّمْحِ, ثُمَّ خَرَجَ بِهَا فِي الرُّمْحِ تَرْتَكِضُ, قَالَ: فَلاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا كَانَ أَسْرَعَ مَوْتًا: الرَّجُلُ أَوِ الْحَيَّةُ, فَأَتَى قَوْمُهُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَرُدَّ صَاحِبَنَا. فَقَالَ: (اسْتَغْفِرُوا لِصَاحِبِكُمْ). ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ أَسْلَمُوا بِالْمَدِينَةِ فَإِذَا رَأَيْتُمْ أَحَدًا مِنْهُمْ فَحَذِّرُوهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ, ثُمَّ إِنْ بَدَا لَكُمْ بَعْدُ أَنْ تَقْتُلُوهُ فَاقْتُلُوهُ بَعْدَ الثَّلاَثِ).

واتە: لە ئەبو سائیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: رۆشتم بۆ لای ئەبو سەعیدی خودری، کاتێ کە لەلای دانیشتبووم لەژێر راخەرەکەیدا دەنگی جووڵەی شتێکم بیست، سەیرم کرد مارێ بوو، هەستام، ئەبو سەعید وتی: ئەوە چییە بۆ هەستای؟

وتم: ئەوە مارێکە لەوێدا، وتی: دەتەوێ چی بکەیت؟ وتم: دەکەوێ بیکوژم، ئاماژەی کرد بۆ ژوورێ لە ژوورەکانی بەرامبەری کرد، وتی: کوڕێکی مامم لەمماڵەدا بوو، لەڕۆژی جەنگی (الأحزاب)دا تازە زاوا بوو مۆڵەتی وەرگرت لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی ماڵەوە بکات، ئەویش روخسەتی داو فەرمانی پێ کرد فەرمووی: (چەکەکەت لەگەڵ خۆت بەرە). کاتێ کە رۆشتەوە هاوسەرەکەی بینی لەبەردەم هەردوو دەرگاکەدا راوەستاوە، ئەویش رمەکەی لێ بەرزکردەوە پیایدا بکێشێ، وتی: پەلە مەکە تۆ جارێ بڕۆرە ژوورەوە بە چاوی خۆت ببینە بزانە بۆچی لەژوورەکەم هاتومەتەدەرەوەو ماڵەکەم چۆڵ کردووە، کاتێ کە چووە ژوورەوە دەبینێ مارێکی گەورەی لێ یە رمەکەی تێ چەقاند و هێنایە دەرەوە بۆ حەوشە رمەکەی داچەقاند مارەکە دەجووڵا، ئەبو سەعید وتی: کەس نەیزانی کامیان لەپێشەوە مردن مارەکە یان پیاوەکە، خزمەکانی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتیان: بپاڕێرەوە لە خوای گەورە با زیندووی بکاتەوە بۆمان، فەرمووی: (داوای لێ خۆشبوون بکەن بۆ هاوڕێکەتان)، لەپاشدا فەرمووی: (هەندێ جنۆکە لە مەدینە موسوڵمان بوون، ئەگەر یەکێکتان لەوانە بینی سێ جار ئاگاداری بکەنەوەو بیترسێنن، لەدوای سێ جارەکە ئەگەر بۆتان دەرکەوت ناڕوات بیکوژن).

٥٢٥٨ - (حسن صحيح) عن ابن عجلان بهذا الحديث مختصرا, قال: (فَلْيُؤْذِنْهُ ثَلَاثًا فَإِنْ بَدَا لَهُ بَعْدُ فَلْيَقْتُلْهُ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ).

واتە: لە ئیبنو عیجلانەوە فەرموودەی پێشوو هاتوە بە کورتی، وتی: (سێ جار ئاگاداری بکاتەوەو داوای لێ بکات بڕوات لەدوای سێ جارەکە ئەگەر بۆی دەرکەوت ناڕوات بیکوژێ چونکە ئەوە شەیتانە).

٥٢٥٩ - (صحيح) عن أبو سائب مولى هشام بن زهرة: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ, فَذَكَرَ نَحْوَهُ وَأَتَمَّ مِنْهُ, قَالَ: (فَآذِنُوهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَإِنْ بَدَا لَكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فَاقْتُلُوهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ).

واتە: لە ئیبەوە بەندەی ئازاد کراوی هیشامی کوڕی زوهرەوە دەگێڕنەوە، کە چووەتە خزمەت ئەبو سەعیدی خوردری، جا راوی فەرمووودەکەی گێڕایەوە وەك فەرمووودەی پێشوو، لەو تەواو تریش، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تا سێ رۆژ ئاگاداری بکاتەوەو داوای لێ بکات بڕوات لەدوای سێ رۆژەکە ئەگەر بۆتان دەرکەوت ناڕوات بیکوژن چونکە ئەوە شەیتانە).

٥٢٦٠ - (ضعيف) عن أبو ليلى: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنْ حَيَّاتِ الْبُيُوتِ, فَقَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُنَّ شَيْئًا فِي مَسَاكِنِكُمْ فَقُولُوا: أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِى أَخَذَ عَلَيْكُنَّ نُوحٌ, أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِى أَخَذَ عَلَيْكُنَّ سُلَيْمَانُ أَنْ لاَ تُؤْذُونَا, فَإِنْ عُدْنَ فَاقْتُلُوهُنَّ).

واتە: لە ئەبو لەیلاوە دەگێڕنەوە، کە بۆ ماری ناو ماڵەکان پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش فەرمووی: (ئەگەر لەناو ماڵەکانتاندا لەو مارانەتان بینی بڵێن: سوێندتان دەدوەین بەو پەیمانەی کە نوح سەندوویەتی لێتان، سوێندتان دەدوەین بەو پەیمانەی کە سولەیمان سەندوویەتی لێتان ئازارمان مەدەن، ئەگەر لەدوای ئەوە هاتنەوە بیانکوژن).

٥٢٦١ - (صحيح موقوف) عن ابن مسعود قال: اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ كُلَّهَا إِلاَّ الْجَانَّ الأَبْيَضَ الَّذِى كَأَنَّهُ قَضِيبُ فِضَّةٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەموو مارەکان بکوژن ئیللا ماری سپی نەبێ کە وەك پارچە زیو وان.

# دەربارەی کوشتنی شەوگەردەکان

## ١٧٨ - باب فِي قَتْلِ الأَوْزَاغِ.

٥٢٦٢ - (صحيح) عن سعد بن أبي وقاص: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِ الْوَزَغِ, وَسَمَّاهُ فُوَيْسِقًا.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دەدا بە کوشتنی شەوگەرد، ناویشی نا: لەڕێ دەرچوو.

٥٢٦٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً, وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّانِيَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً أَدْنَى مِنَ الأَوَّلِ, وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً أَدْنَى مِنَ الثَّانِيَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە یەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێت ئەوەندەو ئەوەندە خێر و چاکەی بۆ هەیە، هەرکەس بە دووەم لێدان شەوگەردێ بکوژێت ئەوەندەو ئەوەندە خێر و چاکەی بۆ هەیە بەڵام کەمتر لە یەکەم، هەرکەس بە سێیەم لێدان شەوگەردێ بکوژێت ئەوەندەو ئەوەندە خێر و چاکەی بۆ هەیە بەڵام کەمتر لە دووەم).

٥٢٦٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ سَبْعِينَ حَسَنَةً).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە یەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێت حەفتا خێر و چاکەی بۆ دەنوسرێت).

## دەربارەی کوشتنی مێرووڵەی بچوك.

## ١٧٩ - باب فِي قَتْلِ الذَّرِّ.

٥٢٦٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ, فَأَمَرَ بِجَهَازِهِ فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا, ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَأُحْرِقَتْ, فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ فَهَلاً نَمْلَةً وَاحِدَةً).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یەکێ لە پێغەمبەران لەژێر درەختێکدا دابەزی پشویەك بدات مێرولەیە پێوەی دا، فەرمانی دا بارگەو بنەکەی دەگوێزنەوە، لەپاشدا فەرمانی دا شارە مێرووڵەکەیان سوتاند، خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە تۆ مێرووڵەیە پێوەی دای شارە مێرووڵەیەکت بۆ سوتاند).

٥٢٦٦ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن رسول الله قال: (إِنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ, فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ فِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یەکێ لە پێغەمبەران مێرولەیە پێوەی دا، فەرمانی دا شارە مێرووڵەکەیان سوتاند، خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە تۆ مێرووڵەیە گەستیتی کەچی تۆ ئوممەتێکت لە ئوممەتەکان فەوتاند کە تەسبیحاتیان دەکرد).

٥٢٦٧ - (صحيح) عن أبن عباس قال: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ النَّمْلَةُ وَالنَّحْلَةُ وَالْهُدْهُدُ وَالصُّرَدُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردووە لە کوشتنی ئەم چوار گیان لەبەرە: مێروولەو، هەنگ و، پەپو سولەیمانەو، (الصُّرَدُ) - باڵندەیەکی سەر گەورەو دەنوك گەورەیە جرِ و جانەوەری بچوك ڕاو دەکات - .

٥٢٦٨ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ, فَرَأَيْنَا حُمَّرَةً مَعَهَا فَرْخَانِ فَأَخَذْنَا فَرْخَيْهَا, فَجَاءَتِ الْحُمَّرَةُ فَجَعَلَتْ تُعَرِّشُ, فَجَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَنْ فَجَعَ هَذِهِ بِوَلَدِهَا؟ رُدُّوا وَلَدَهَا إِلَيْهَا). وَرَأَى قَرْيَةَ نَمْلٍ قَدْ حَرَّقْنَاهَا, فَقَالَ: (مَنْ حَرَّقَ هَذِهِ؟). قُلْنَا: نَحْنُ. قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ رَبُّ النَّارِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووین، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ سەرئاو، باڵندەیەکی بچوکی وەك چۆلەکەمان دی دوو بەچکەی لەگەڵ بوو، بەچکەکانمان گرت، دایکەکەیان هات بەدەورماندا باڵەکانی بڵاوکردبنەوە لەزەوی نزیك بوو بۆوە دەستی کرد بە باڵە تەپە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتەوە فەرمووی: (ئەوە کێ ئەو کارەساتەی بەسەر ئەو باڵندەیەدا هێناوەو بەچکەکانی لێ سەندوە؟ با بۆی بگێڕێتەوە). سەیری کرد شارە مێرولەیەکیان سوتاندوە، فەرمووی: (کێ ئەمەی سوتاندوە؟)، وتمان: ئێمە، فەرمووی: (بەڕاستی هیچ کەسێك بۆی نیە سزاو ئازاری هیچ ڕۆح لەبەرێك بدات بە ئاگر جگە لە خاوەنی ئاگر نەبێت کە (الله)یە).

## دەربارەی کوشتنی بۆق

## ١٨٠ - باب فِي قَتْلِ الضِّفْدَعِ.

٥٢٦٩ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عثمان: أَنَّ طَبِيبًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ, فَنَهَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِهَا.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی (عثمان)وە دەگێڕنەوە، کە پزیشکێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە بۆق وەك دەرمان بەکار دەهێنێ بۆ چارەسەری نەخۆش، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگری کوشتنی بۆقی لێ کرد.

## دەربارەی پەلە پیتکە هاویشتن

## ١٨١ - باب فِي الْخَذْفِ.

٥٢٧٠ - (صحيح) عن عبد الله بن مغفل قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْخَذْفِ, قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَصِيدُ صَيْدًا, وَلاَ يَنْكَأُ عَدُوًّا, وَإِنَّمَا يَفْقَأُ الْعَيْنَ, وَيَكْسِرُ السِّنَّ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی موغەففەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردووە لە پەلە پیتکە هاویشتن، فەرمووی: (ئەمە نە نێچیری پێ ڕاو دەکرێ، نە دوژمنی پێ کوڵەوار دەکرێ، بەڵکو چاوی پێ کوێر دەکرێ و، ددانی پێ دەشکێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خەتەنەکردن.

## ١٨٢ - باب مَا جَاءَ فِي الْخِتَانِ.

٥٢٧١ - (صحيح) عن أم عطية الأنصارية: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَخْتِنُ بِالْمَدِينَةِ, فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تُنْهِكِي فَإِنَّ ذَلِكَ أَحْظَى لِلْمَرْأَةِ, وَأَحَبُّ إِلَى الْبَعْلِ).

واتە: لە ئوممو (عطية)ی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە ئافرەتێ لە مەدینە کچ و کوڕی منداڵی خەتەنە دەکرد. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (زێدەڕۆیی مەکە لەبڕینی واتە زۆریان لێ مەبڕە چونکە ئەوە بەسوود ترە بۆ ئافرەت و خۆشی و لەزەتی زیاتری لێ دەبینێ لەکاتی جووت بووندا، هەروەها بۆ پیاویش خۆشترە).

## دەربارەی ڕۆشتنی ئافرەتان لەگەڵ پیاوان بە ڕێگادا.

## ١٨٣ - باب فِي مَشْيِ النِّسَاءِ مَعَ الرِّجَالِ فِي الطَّرِيقِ.

٥٢٧٢ - (حسن) عن أبو أسد الأنصاري: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ - وَهُوَ خَارِجٌ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاخْتَلَطَ الرِّجَالُ مَعَ النِّسَاءِ فِي الطَّرِيقِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلنِّسَاءِ - : (اسْتَأْخِرْنَ, فَإِنَّهُ لَيْسَ لَكُنَّ أَنْ تَحْقُقْنَ الطَّرِيقَ, عَلَيْكُنَّ بِحَافَاتِ الطَّرِيقِ). فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بِالْجِدَارِ حَتَّى إِنَّ ثَوْبَهَا لَيَتَعَلَّقُ بِالْجِدَارِ مِنْ لُصُوقِهَا بِهِ.

واتە: لە ئەبو ئوسەیدی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە بۆ خۆی گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو - : لە دەرەوەی مزگەوت بوو ژن و پیاو تێکەڵ دەبوون لە ڕێگادا، بە ئافرەتانی فەرموو: - (خۆتان دوابخەن لە پیاوان هەتا ئەوان دەڕۆن، چونکە بۆتان نیە لە ناوەڕاستی ڕێگاوە بڕۆن، بەڵکو بۆتان هەیە لە قەراغ ڕێگاوە بڕۆن). ئیتر ئەوەندە لە قەراغ ڕێگاوە دەڕۆشتن جاری وا دەبوو ئافرەت پۆشاکەکانی دەگیرایە دیوار ئەوەندە لێی نزیك دەبۆوە.

٥٢٧٣ - (موضوع) عن ابن عمر, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَمْشِيَ - يَعْنِي الرَّجُلَ - بَيْنَ الْمَرْأَتَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردوو لەوەی پیاو لە نێوان دوو ئافرەتدا ڕێ بکات.

## دەربارەی کەسێ جنێو بدات بە ڕۆژگار.

## ١٨٤ - باب فِي الرَّجُلِ يَسُبُّ الدَّهْرَ.

٥٢٧٤ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ: يَسُبُّ الدَّهْرَ, وَأَنَا الدَّهْرُ, بِيَدِيَ الأَمْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: ئادەمیزاد کە جنێو بە ڕۆژگار دەدات، جنێوەکەی ڕوو دەکاتە من چونکە من هەڵسوڕێنەی سەرجەم کارو بارەکانم شە و ڕۆژ دێنم بەدوای یەکدا). - خوای گەورە زیانی پێ ناگات و کەسیش ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ -.

**بە پشتیوانی خوای گەورەو باڵادەست تەواو بوو**

# لە کۆتایی دا

ئەوەندەی خوای پەروەردگار خۆی پێی خۆش بێ و بیەوێ سوپاس و ستایشی دەکەم، بە پشتیوانی خوای گەورە و باڵادەست رۆژی یەك شەممە ٢ / ٣ / ٢٠١٥ ی زایینی بەرامبەر بە ١٤٣٦ ی کۆچی لە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە بوومەوە: (سوننەنی ئەبو داود) کە پێنج بەرگە، لەماوەی چوار ساڵدا تەواوم کردووە.

دواکارم لە خوای گەورە رەنجمان بە با نەچێ و بیکاتە سەدەقەی جاریەو زانستی بەسوود بۆمان، پێشەوا ئەبو داود و منیش بخاتە بەر شەفاعەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

جا ئەگەر هەر کەم و کوڕیەکی هەبێ ئەوە لەخۆمەوەیە بێگومان بێ کەم و کوڕیش نابێ، ئەوەشی پێکابێتم لە خواوەیە. داوا لە خوێنەرانی خۆشەویست دەکەم هەر هەڵەیەکیان بینی وەك برایەکی موسوڵمان کە ئاوێنەی موسوڵمانە پێم رابگەیەنێ بۆ ئەوەی راستی بکەمەوە، ئەگەر بۆ خوا رەخنە دەگرێ و مەبەستی رەزامەندی خوایە، ئامۆژگاری و رێنماییەکانتان دەخەمە سەرچاوم دەستی دڵسۆزیتان دەگوشم، بە سنگی فراوانەوە لێتان وەردەگرم، ئێمە خۆمان بە کوڕی ئەو مەیدانە نازانین و هەرگیز بانگەشەی ئەوەشمان نەکردووە کە زانایین، بەڵام بە ئێوە دەڵێم هەتا کەی ئەم فەرموودانەی رابەر و ئازیز و خۆشەویستمان صلی الله علیه وسلم نەکرێنە کوردی؟

## راستکردنەوە

١- فەرمودەی ژمارە (١٠٧٩) بەرگی دووەم لاپەڕە (٧٤) مانای (التحلق) بە هەڵە نوسراوە واتە: حەلەقاتی دەرس و دەور و وانە وتنەوە، داوای لێ بوردن لەخوێنەران دەکەم، خوای گەورە لە هەموومان ببورێت.
٢- لە فەرمودەی (٢٧٦٥) لە بەرگی سێیەم دا نوسراوە عورووەی کوڕی مەسعود، راستیەکەی عورووەی کوڕی ئیبنو مەسعودە.
٣- فەرمودەی (٢٧٧٣) لە بەرگی سێیەم دا پەڕیوە ئەمەش فەرموودەکەو ماناکەی.

## دەربارەی بەخشین بە موژدەدەر

### ١٧٣ - باب في إعطاء البشر

٢٧٧٣ – (صحيح) عن كعب بن مالك قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ, ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ. وَقَصَّ ابْنُ السَّرْحِ الْحَدِيثَ, قَالَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلاَمِنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ, حَتَّى إِذَا طَالَ عَلَيَّ تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ - وَهُوَ ابْنُ عَمِّي - فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلاَمَ, ثُمَّ صَلَّيْتُ الصُّبْحَ صَبَاحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا, فَسَمِعْتُ صَارِخًا يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ أَبْشِرْ. فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي نَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ فَكَسَوْتُهُمَا إِيَّاهُ, فَانْطَلَقْتُ حَتَّى إِذَا دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ, فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّأَنِي.

واتە: لە كەعبی كوڕی مالیكەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەفەر دەگەڕایەوە یەكەم جار دەچووە مزگەوت دوو ركات نوێژی دەكرد، لەپاشدا لەناو خەڵكدا دادەنیشت، ئیبنو سەرح بەسەرهاتی فەرمووودەكەی گێڕایەوە، ئەو سێ كەسەی كە لەغەزای تەبوك دواكەوتبوین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری كرد لە موسوڵمانان كە قسەمان لەگەڵ بكەن، هەتا رۆژێ رۆشتم بە شورای باخەكەی ئەبو قەتادەی ئامۆزامدا سڵاوم لێ كرد، سوێند بە (الله) وەڵامی نەدامەوە. لەدوای پەنجا شەو لەسەربانی یەكێ لەماڵەكانی خۆم نوێژی بە یانیم دەكرد، گوێم لە هاوارێ بوو: ئەی كەعبی كوڕی مالیك موژدەت لێ بێ، كاتێ كە هات لە خۆشیان پۆشاكەكەی خۆمم كردە بەری، رۆشتم هەتا گەیشتمە ناو مزگەوت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوت دانیشتبوو، (طلحة)ی كوڕی (عبید الله) هەستایەوە بە (هەروەلە)نەرمە غار هات بەرەو پیریم و تەوقەی لەگەڵ كردم و پیرۆزبایی قبوڵ بوونی تەوبەكەمی لێ كردم.

# بەرهەمەکانی ناصح سازانی

١- فەزڵی نوێژ و کاریگەری لەسەر تەزکیەی نەفس.

٢- خواپەرستی و کاریگەری لەسەر پەروەردەی دەروون.

٣- پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا: ١ / ٢ .

نوسینی: دکتۆر. (عبد الله ناصح علوان) وەرگێڕان.

٤- گەشتی قیامەت.

٥- دایەو بابە فێرم بکەن چۆن نوێژ بکەم.

٦- هۆشیاریدان سەبارەت بە هەڵەی هەندێ لەنوێژخوێنان وەرگێڕان.

٧- سوننەنی ئەبو داودی سەجستانی: ١ / ٥ وەرگێڕان.

٨- پوختەی عەقیدەی سەلەفی صاڵح. نوسینی:

(عبدالله بن عبد الحميد الأثري) وەرگێڕان.

بە پشتیوانی خوای پەروەردگار چاوەڕوانی (سنن الترمذي)بن

# نـــاوەڕۆك